**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **ئەفراندن و ئازادی**
- **نووسینی:** بابەك ئەحمەدی
- **وەرگێڕانی:** مەسعود بابایی
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** وریا بوداغی
- **چاپ: یەکەم – بەرگی دووەم ٢٠١٠**
- **ژمارەی سپاردن:** ٨٢٤
- **نرخ:** ٤٠٠٠ دینار
- **تیراژ:** ٧٥٠ دانە
- **چاپخانە:** چاپخانەی خانی (دهۆك)

**زنجیرەی کتێب (٤٤٦)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com



**وەرگێڕانی ئەم کتێبە:**

*** پێشکەشە بەجوانیی ژن**

*** جوانی بەرگەگرتنی تەنیاییەکانی من.**

*** پێشکەشە بە مەهابادی هاوسەرم**

*** شەوارەکانی وەگێڕانی ئەم پەرتووکە تاقەت پڕوکێنە.**

## ناوەرۆك

## بەرایی وەرگێڕ

**"ئەفراندن و ئازادی"** پەرتوکێکە لەبارەی هێرمێنۆتیك و جوانیناسی.ئەزموونی وەگێڕ لە پاچەڤەی بەرهەمەکانی نووسەرێکی فرەروانگە و رەخنەکارێکی جەنجاڵیی وەك "بابەك ئەحمەدی" لە"پێکهاتەو راڤەی دەق" کە رەنگە یەکێك لە دژوارەترین بەرهەمەکانی نووسەر بێت دەستی پێکردوە.لەماوەیەکی چوارساڵەدا ئەم پەرتوکە کاتێکی زۆری بۆ تەرخان کرا کە بە دڵنیاییەوە لەگەڵ هەموو کەم وکوورییەکانی توانی تابۆی هەندێ پێشداوەری و پێشگریمان بشکێنێ و سەلماندی کە زمانەکەمان توانای ئەوەی هەیە خۆی لە قەرەی چەمك و واتاکانی هێرمێنۆتیك و هێرمێنۆتیکی مودێڕن بدات و ئەگەر لاوازییەك هەبێ لە لاوازیی زمان نیە بەڵکو لە ترس و دڕدۆنگییەکدایە کە هەندێ جار نووسەران و خامەبەدەستانمان تووشی دەبن.

بۆچوونی وەرگێڕ رەنگە لەمەڕ بەکارهێنانی زمان هەندێ جیاوازیی لە گەڵ دید و بۆچوونی نووسەر و وەرگێڕی دیکە هەبێ و ئەمەش وادەکات هەندێ دژواری لە خوێندنەوەی ئەمجۆرە دەقانە بخولقێنێ.کێشەی تێگەیشتن

لە دەق کێشەیەکی تازە نیە، هەر لقێکی زانست و ئەپستمۆلۆژیا سەرەڕای بەکارهێنانی بیچمی گشتیی زمان،کۆمەڵێك تایبەتمەندیی هەیە کە پەیوەستە بە زاراوە و چەمکی پێویست لەو بوارەدا.چەمکسازی و زاراوەسازی پێ بەپێی گەشە و پەرەی زمان دەرەخسێن و هەر دۆزینەوەیەکی تازە بەواتای دروستبوونی وشە و چەمك و زاراوە و لێکدانەوەو راڤەی هەمەچەشنە. هەمەچەشنیی راڤەکان هەمەچەشنیی چەمکەکان دەخولقێنێ و ئیدی لێرەدا دووزمان دروست دەبن،زمانی هزر و زمانی گوتن.زمانی گوتن زمانی ئاخاوتنە و وشەکانی تایبەتن بە ژیانی رۆژانە. ئاخاوتن هێڵی ئاسۆیی زمانە و راپەڕاندنی کاروباری رۆژانەی زۆرینەی خەڵك بەوەوە دەلوێ.بەڵام زمانی هزر لە هێڵی ستونیی زماندایە و بیرکردنەوە و راڤە و شیکردنەوە لەزەینی داهێنەرەوە دەڕژێتە سەر پەڕاوگ. نووسین گەڕانە بەدوای نەمریدا، هەربۆیە زمانەکەی پەیامی رۆژانەی کاروباری رۆژانە نیە،بەڵکو زمانی داهاتوی نەتەوەیەکە.بەباوەڕی وەرگێڕ زمانی کوردی تا ئێستاش بەدوای خۆیدا وێڵە، واتە هێشتا تەواوی بڕشت و توانای خۆی نەدۆزیوەتەوەو زمانێکە بەقەد جۆگرافیاکەی، نەك قەتیسکراو لە دیالکتێکدا.هەرچەند نووسەر بەکرمانجیی خوارو ئەم پەرتوکەی پاچەڤە کردوە بەڵام لە



کرمانجیی خواروودا قەتیسی نەکردۆتەوە.فۆرمی سەرەکیی وەرگێڕانەکە هەوڵدراوە کوردی بێت و ئیدی وەکو دیالێکت سەیری نەکراوە.هەموو دیالکتەکان پێکەوە - هەڵبەت بە رەچاوی توانای وەرگێڕ- بەشدارن لەم وەرگێڕانەدا ، نەك ئەوەی بڵێم تەنیا بۆ تەرخان کردنی پشکێك بۆ دیالکتەکان و نەخوازەڵا سۆزو بەزەیی، بەڵکو لەبەرئەوەی لە کرمانجیی خواروودا وشەی شیاو و دەربڕینی شیاو دەست نەکەوتوە.هەربۆیە هەندێ جار خوێنەر گلەیی لە دژواریی وشەکان دەکات،ئەمە لە حاڵێکدایە وەرگێڕ رەچاوی واتای شیاو و دروستی کردوە. کەوابوو نابێ وەرگێڕ ببێتە قوربانیی تێگەیشتنی خوێنەر.چوونکە تێگەیشتنی خوێنەر رۆژبەرۆژ دەچێتەسەر. ئەمڕۆ یان سبەی دەتوانێ هەمان خوێنەر کە پێمان وابوو لەبەر قورسیی وشە و زاراوەکان ناتوانێ لە دەق تێبگا دواجار رەنگە لەبەر هەمان هۆ ببێتە رەخنەگر و راڤەگەرێکی شێلگیری هەمان دەق و خزمەتێکی گەورەش پێشکەش بە بەرهەمهێنەری دەقەکە بکات.دڵنیام دیالکتێك بەتەنیا و لە چوارچێوەی وشەکانی خۆیدا ناتوانێ پاچەڤەی زمانی هزربێت، بەڵام ئەگەر دیالێکت و زار و شێوەزارەکانی دیکە هاوکاری بن و ئەویش دەست لە دەمارگرژی هەڵبگرێ دەتوانێ نەك دیالێکت بەڵکودەتوانێ ببێتە مۆرکی سەرەکیی زمان و بە رەزامەندییەوە وەکو زمانی بیرکرنەوەو نووسین سەیر بکرێت.لام وایە کرمانجیی خواروو لەبەر لایەنی جوانیناسانەو...هتد —نەك دەوڵەمەندی- لە وەرگرتنی وشەو زاراوەی دیالێکتەکانی دیکە ناسڵمێتەوەو ئەمەش دەتوانێ لە دۆخی

دیالێکت دەری بێنێ و گشتگیری بکات.هەربۆیە بە رەچاوی ئەوەی گوترا و بەرەچاوی هەستیاریی کارەکە،لەم وەرگێڕانەدا کۆمەڵێك وشەو زاراوە و دەستەواژە دەبینرێن کە وەرگێڕ لەو باوەڕەدایە تا رادەیەك رۆحی واتایان پێکاوە و بە بێ هیچ دەمارگرژییەك پشکی شێر لەزاراوە و وشەکاندا بەر دیالێکتەکانی زمانی کوردی دەکەوێ و ئەمەش بەڕای وەرگێڕ مایەی دەوڵەمەندییە.ئەوەی گوترا دەتوانن لە فەرهەنگۆکەدا ببیننن و هەڵی سەنگێنن.

❊❊❊

خوێنەران و لێکۆڵەرانی بوارەکانی تیۆریی هونەر و هونەرەجوانەکان و هێرمێنۆتیك و بەگشتی فەلسەفەی هونەر و جوانیناسی دەتوانن سود لەم پەرتوکە وەربگرن.بەهیوام چاوپۆشی لە هەڵەکان نەکرێ و یارمەتی وەرگێڕ بدرێت لە راستکردنەوەی هەڵەکان و لە هەمان کاتدا وەکو "خوێنەری کوشندە" نەخوێنرێتەوە.

## پەراوێزی چاپی دووەم

لە سەر چاپی دووەمی ئەم پەرتووکە سێ باستەوەرم زێدە کردوە کە هەر سێکیان لە بەشێکی جیادا لە کۆتایی پەرتووکەکەدا هاتون. وتاری" تەنیایی بیرگمان" لە ژمارەی پێنجەم(١٦ی جۆزەردانی ١٣٧٣) بلاڤۆکی" فیلم و سینما" و وتاری "رۆمێری فەرەنسی؟" لە ژمارەی سێهەمی (١٩ی بانەمەڕی ١٣٧٧) هەمان بلاڤۆك بلاوکراونەتەوە. لە راستیدا، ئەم دوو نوسینە دەبێ لە بەشی "تاقیکارییەکان"ی ئەم پەرتوکە جێ بکەینەوە. نوسینێکی دیکە "کەتوار لە فیلمدا"یە، کە لە سەر بنچینەی گوتارێك نوسراوە کە لە یەکەمین کۆبوونەوەی دواندەرییەکانی " ئەنجومەنی دیکۆمێنت سازانی سینەمای ئێران" لە " خانەی سینەما" لە ڕێکەوتی ٥ی ڕێبەندانی ١٣٧٧ پێشکەش کرا و بە تەواوکەری بەشی چوارەمی باستەوەری "هونەر و کەتوار" دێتە ئەژمار (لاپەڕەکانی ٢٩٧ تا ٣١٠ ی ئەم کتێبە) .

بێگومان خوێنەر دەسبەجێ تێبینی ئەوە دەکات کە بنەماکانی مێتۆدۆلۆژیکی دوو باستەوەری " پرسیارە ناکۆتاکان" و "تەنیایی بیرگمان" (کە مەودایەکی حەوت ساڵە لە نێوانیاندایە) دژبەری یەکدین. یەکەمیان لە ڕێگەی وردبوونەوە لەکۆی بەرهەمەکانی سینەماکارێکی گەورە واتانێوەکییەکانی گشت فیلمێکی ئەو پەیجۆر دەکا و دوومیان وەها شێوەیەکی توێژینەوە بێسود دەناسێنێ و تەنانەت بانگەشە دەکا هەرکات لەم ڕێگەوە برۆینە پێشێ، تاکمەندی و شوێنگەی بنیاتیی واتاناسانەی هەموو فیلمێك لەنێو دەبەین. هاونشینیی ئەم دوو هەلێنجانە کە بەئاشکرا جیاوازی لە دووتوێی هەلێنجانەکان و مێتۆدەکان نیشان دەدەن هێرمێنۆتیك وەکو قەڵەمڕەوی ئازادی دەنوێنێ: ئازادیی تێهزرین و راڤەکردن و لەم ڕێگەیەوە بنەماکانی فامکردنی خۆی بەرەو ڕێگەیەکی تازە و بە شێوازێکی رەخنەکارانە گەڵاڵەڕێژ دەکا. یەکێك لە ئەرکەکانی بەرهەمی هونەری ئەمەیە کە ئێمە لە ئازادییەك نزیك دەکاتەوە کە ریشە و بونیادی چنینی تان و پۆی ژیانمانە.

دەتوانین هەبوونی وەها جیاوازیگەلێکیش لە ڕێگەگەلی جیاوازەوە تێبگەین. دەکرێ بێژین کە ئێمە لەم تاقیکارییانەدا لە تەك کۆمەڵە کایەیەکی زمانیی هەمەچەشن بەرەوڕوو دەبین و پەیڕەوی لەم فرەچەشنییە لە راستیدا دەرخەری زاڵبوونی بنەتایی ئاخێوی رەخنەگرانە و جوانیناسانە (لە پشتەوەی نۆرمەکان و ڕێساگەلی جیاوازی هونەری و فەرهەنگی) لە سەر



ئاگایی رەخنەگرن. ئەمە هەلێنجانێکە کە لەگەڵ بنەماگەلی تیۆری و فیکریی باستەوەری " تەنیایی بیرگمان" زیاتر یەکانگیرە. بەڵام دەتوانین لە ڕێگەیەکی دیکەشەوە لە مەسەلەکە ورد بینەوە، ڕێگەیەك کە جەخت لەسەر ئاگایی و ئەزمونی ناسکار دادەنێ و مێژوی ژیانێك یا هەڵکەوتەکانی ژیاننامەیی و دەروناسانە زەق دەکاتەوە. لەم دۆخەدا دەتوانین بڵێین لە نێوان" دوو مرۆڤی جیاواز"* کە ئەم دوو وتارەیان نووسیوە حەوت ساڵ ئەزموون، تاڵی و ناخۆشی و هیراکانی ژیان، مەودایان دروست کردوە. ئەم دوو کەسە لە دوو ڕێگاوە(و) بە دوو نیگاو بە دوو شێوە، ژیان، جیهان، ئەوانیدی و خۆیان ناسیوە. وەها هەلێنجانێك زیاتر لە بنەماگەلی تیۆریی باستەوەری " پرسیارە ناکۆتاکان"وە نزیکە .

خاکەلیوەی ١٣٧٨ (ی هەتاوی)

* خوێنەر ئاگادار بێ کە ئەم دوو مرۆڤە، مرۆڤانی نووسەرن و مەبەست نمونەی گریمانکراوی دوو کەسایەتی جیاوازە و تەنیا بۆ هێنانەوەی نموونەی بەراوردییە و بەس ئەم دوو مرۆڤەش خودی نووسەران. (و)

## پەراوێزی چاپی یەکەم

لەم پەرتوکەدا چوار باستەوەر لە سێ بەشدا هاتوون. ئامانجی باستەوەرەکان رەخساندنی باس و خواس لە بارەی ئاسۆی راڤە، لوژیکی ئاخێوی هێرمێنۆتیك، کەوشەنەکانی راڤە لە ئاخێوی هونەری و تاقیکاریی هێرمێنۆتیکی بەرهەمە هونەرییەکانە. هەموو ئەمانە بۆ باسگەلێکی تازە لە فەلسەفەی زیندوی وشکارۆی (قارە) ئەوروپا دەگەڕێنەوە. بەڵام بەردەوام دەپرسین: فەلسەفە لە رۆژگاری ئێمە چی لە دەست دێ؟

سەردەمێکی نەچەندان دوور، لودڤیك ڤیتگنشتاین گوتبووی کە ئامانجی ئەو لە فەلسەفەدا نیشاندانی رێگەی هەڵاتنی مێشێکە کە لە بوتڵی مێشگیردا تووش بووبێ. ئەم دەربڕینە، لە یەکەم نیگادا زیاتر لە گاڵتەیەك دەچێ. بەڵام وەکو تێکڕای تەنزەکانی تایبەت بەو هزرڤانە واتایەکی قووڵی هەیە: فەلسەفە هەوڵێکە لە راستەڕێی رزگاریدا. هەڵبەت نیگای ڤیتگنشتاین بەدەر لە لوتبەرزیی فەلسەفی نیە، وەها دەدوێ کە گوایە خۆی شارەزای رێگەی هەڵاتنە. بەڵام، پێم وانیە، کەسێك ئاگاداری ئەم رێگەیە بێت. فەلسەفە تەنیا تێکۆشانێکە بۆ پەیداکردنی رێگەی دەربازبوون و پێدانی هەواڵێك لە ئازادی وەکو راڤەیەك، تێگەیشتنێك، هەڵێنجانێك. فەلسەفە چالاکییە نەك رێباز، لەم رووەوە ناتوانێ هیرایەك بۆ رزگاری بێ. ناتوانی پەیجۆری ئازادی کۆتاییهاتوو لە قەڵەم بدەیت. فەلسەفە داخوازی ئازادییە، نەکا رۆژێ ملکەچی خەیاڵکردێکی سووك و چروك لە ئازادی کە رۆژگار بۆتی هێڵبەندی کردوە و کێشاویەتەوە، ببی.

کەسێك کە لەگەڵ رۆژەگارکەیدا سازابێ، شتێکی تازە ناخوازێ و عەوداڵی سازکردن نابێت. تەنیا ئەو کەسەی کە نەچێتە ژێرباری سەردەمەکەی خۆی و بەپڕنەهامەتی و دژواری بزانێ، قۆڵی رزگاری هەڵدەماڵێ. نۆڤالیس دەیگوت: " رۆژگاری ئاسودە و خۆش، خودان فەلسەفە نیە" و هێگل وەبیری دەهێنایەوە کە کوندەبوی مینروا، یەزدانی ئاوەز، تەنیا لە تاریکیی وێرەگادا لە شەقەی باڵ دەدا.

خاکەلێوەی ١٣٧٧



"ئاوەزی هێرمێنۆتیك" لە سەر بنەمای دواندەرییەك لە " ئەنجومەنی حیکمەت و فەلسەفە لە رێکەوتی ١٦ی بانەمەڕی ١٣٧٢نوسراوە، بەڵام لەو چڕوپڕترە.

دەقی ئەو دواندەرییە لە بلاڤۆکی **کێلك** (ژمارە٣٩) ، لە رێکەوتی جۆزەردانی ١٣٧٢بڵاو کرابوویەوە. برێك لە خاڵەکانی "هونەر و ئازادی" لە گوتارێك لە کولێژی زانستە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆی ئازادی تاران، لە رێکەوتی ١٦ی رەشەمەی ١٣٧٥ و "هونەر و کەتوار" لە گوتارێك لە کۆلێژی هونەرەجوانەکانی زانکۆی تاران لە ١٣ی خەزەڵوەری ١٣٧٦ پێشکەش کران. " نیارڤان" (ئەکتەر =بازیگر) بەرین کردنەوەی دەقی دواندەرییەکە لە " ئەنجومەنی نیارڤانانی سینەمای ئێران" کە لە ٢٨ی سەرماوەزی ٧٤ پێشکەش کرا و بەشێکی لە مانگنامەی **فیلم** ژمارە ٢٠٠، لە رەشەمەی ١٣٧٥ بڵاو کرایەوە. " پرسیارە ناکۆتاکان" لە (گۆڤاری) **فیلم**، (ژمارە) ١١٩، رێبەندانی ١٣٧٠، " بایەخی جیهان" لە **کێلك** ٤١ی گەلاوێژی ١٣٧٢، ناو لە (گۆڤاری) **فیلم**، ژمارە ١١٦ سەرماوەزی ١٣٧٠، " ... نە بەراییەك هەیە و نەکۆتاییەك ..." لە ژمارەی تایبەت بە " رۆمانی نوێ" لە **کێلك**، ژمارە ٦٦ خەرمانانی ٧٤ لەگەڵ چەند جیاوازییەك بڵاوکرانەوە. دەقی " سەرما" بە بۆنەی دەیەمین ساڵوەگەڕی مەرگی ئاندری تارکۆفسکی لە **فیلم** ژمارە ١٩٧ بەفرانباری ١٣٧٥ چاپ کرا و " کوکتوی شاعێر" (کە) مەجید ئیسلامی نوسیویەتی و لەم کتێبەدا چاپ و بڵاوکراوەتەوە:

ژ. کوکتو، **اورفە**، ترجمەی م. اسلامی، نشرنی، ١٣٧٦، صص ١٠٥-٩٩.

شایانی گوتنە رێنوسی تێکڕای ئەو کتێبانەی کە لێرەدا ناویان هاتوە بە پێی جۆری دارشتنی کتێبەکە گۆڕاوە .

## ئاوەزی هێرمێنۆتیك

**(١)**

بە شێوەیەکی نەریتی هێرمێنۆتیکیان بە تیۆری یا زانستی لێکدانەوە و راڤە زانیوە. هەڵبەت ئەمڕۆ، ئەم واتایانە چەندان ورد و کتومت نایەنە بەرچاو. زاراوەی هێرمێنۆتیك بۆ پەیڤی یونانیی hermeneuein دەگەڕێتەوە کە واتای راڤە یا گەڕاندنەوە و هەڵگێڕانەوەی گوتەیەك بە زمانی شیانی فامکردن بۆ بەرامبەر (گوێگر- خوێنەر) ، رۆشنکردنەوەی شتێك و دەربڕینی بەچەشنێك کە شیانی تێگەیشتن بێ، بوو. بەمجۆرە، وادێتەبەرچاو کە هەر لەسەرەتاوە مەسەلەی نێوەندیی هێرمێنۆتیك هەم "ناسین" بووە و هەم زاراوەگەل و لۆژیکێکی زمانی بووە کە کەسێك پێویستی پێیانە تاکو(بتوانێ) بناسێت. ئەم خاڵە رۆشن دەکاتەوە کە بۆچی فەیلەسوفان بەردەوام تێکۆشاون تا هێرمێنۆتیك کە تکنیکی لێکدانەوەی دەقگەلی پڕراز و رەمزی دینی و عیرفانی و لە هەمەکیترین بیچمدا هاوتەراز لە تەك وشەناسیی مێژویی (philology) بوو، لە پانتایی ئەپستمۆلۆژی بنەجێی بکەن. هێرمێنۆتیکی ئەمڕۆیی، لە پاش **هەبوون و هەڕەت** ی مارتین هایدگێر، هەم سروشتی ئەپستمۆلۆژیکی هێرمێنۆتیك و راڤەی لە بەرانبەر سروشتی هایدنناسانەی بێبایەخ زانیوە و هەم برەو و متمانەی ئەو " یەك کەس"ەی وەلاناوە. بەڵام تا باسی ئێمە بگاتە ئەم قۆناخە پێشکەوتوە، هەروا ناچارین تا لۆژیکی مێژوویی لە ئاستی زماننناسی، واتە رەچەڵەکناسیی وشەکان بگرینەبەر. رەچەڵەکی وشەی "هێرمێنۆتیك" ناوی یەکێك لە خواوەندانی یونانی بە ناوی ( هێرمس) ە کە تەتەری نێوان خواوەندان بوو و پەیامە رەمزئاساکانی خواوەندانی بە مرۆڤان دەگەیاند و چاوساخی زیندوان لە سەفەرە زەمینییەکان و رۆحی مردوان لەو دنیا بوو. بەم چەشنە، هێرمێنۆتیك لەگەڵ سەفەر و مەرگ گرێ درابوو، و لێیان جیا نەدەبوویەوە. دواتر دەبینین کە هەر راڤەیەك سەفەرێکی ناکۆتایە لە قەڵەمڕەوی واتا کە لە مەرگی واتای بنەتایی و خودباوەڕ هەواڵێکمان بۆ دێنێ. هێرمسیان بە رۆڵەی زئۆس و مائیا دەزانی. زئۆس یەزدانی یەزدانان بوو، کەڵترین هێز. مائیا گەورەترین خوشك بوو، لە ریزی خوشکانی حەوتەوانەی پلیادس، کە دەرخەری گۆڕانی وەرزەکان دەناسران و وەکو کۆماگێك لە حەوت ئەستێران لە ئاسماندا دەدرەوشانەوە تاکو نیشان بدەن کە کەی کاتی نەمام چاندن و تۆو چاندنە. هەندێ لە توێژەران لەو باوەڕەدان کە ریشەی ناوی هێرمس وشەی یونانیی heramae ە، بە واتای تاوێرێك کە وەکو نیشانەی



تخوب و کەوشەنە بە کار دێت.[١] هرمس جگە لەوە ئەرکەکانی سەرشانی تەتەربوونی خواوەندان و چاوساخیی گەشتکەران و مردوان بوو، کارانێکی دیکەشی لە ئەستۆ بوو. ئەو یەزدانی رێگاکان، بازەرگانان، دزان، خەو، خولیا و هەروەها بەستێنسازی بەختی باشی مرۆڤان بوو. یونانییەکان مرۆڤی بەختیاریان بەhermaion ناودێر دەکرد، واتە کەسێك کە دیارییەکی لە هێرمس وەرگرتوە. لە دوایین **سرودی ئیلیاد**، هێرمس لە زمانی زئۆسەوە وەها ناسێنراوە:

" وە تۆ گوێ لە داخوازییەکانی مرۆڤان دەگری و یاوەریانی".[٢] ئەم وەبیرخستنەوەی خدەی یارمەتیدەرە، رەنگە هێمایەك بێ

بە هەمان بەستێنسازیی بەخت و چارەی مرۆڤان بەدەستی هێرمس. ئەفلاتون لە وتووێژی **کراتیلۆس**، لە زمانی سوکراتەوە ناوی (هێرمس) ی نواندنەری راڤەکردن(hermeneus) ناساندوە و بە ئاخاوتن، پاچەڤەکردن، پەیام بردن، زمانی رەمزیی دزان، هەڵپەتەکاری (**مغلطە** = **سفسطە** گەری ) و زمانی رەمزیی مامەڵەچیانیش گرێ داوە و لە درێژەدا گوتویەتی: " وەك دەزانی زمانپاراوی و زمان هەراوی کرۆکی هەموو ئەو کارانەیە".[٣]

هەڵبەت ئەفلاتون ریشەی ناوی هێرمس بۆ وشەی herame ناگەڕێنێتەوە، بەڵکو بە وشەی eiermesدەیبەستێتەوە، بە واتای کەسێك کە خەیاڵگەریی خۆی لە زماندا دەردەبڕێ و دەنوسێ کە ئەم ناوە لە دوو پاژی ئاخاوتن (eirein) و خەیاڵگەری (mesato) بیچمی گرتووە و بەرە بەرە بە پێی رێسای خۆش ئاوازی بوتە" هێرمس".[٤] ئەوەی کە باسکرا، تەنیا لەبەر چێژوەرگرتن لە گشت و گوزار لە جیهانی ئوستورە یونانییەکان نەنوسراون (هەرچەند، ئەمە چێژێکی کەمیش نیە) . یادکردن لە سەرچاوەی ئوستورەیی دەتوانێ دەربڕینی واتاگەلێ بێت کە لە وشەی هێرمێنۆتیکدا وەشێراون و هەمبەری نێوان زمان لەگەڵ مەرگ و پێوەندیی

---

1- M.C.Howatson ed, the oxford companion to classical literature, oxford university press,1993, p.273

2- Homer ,liliade , trans. E. lasserre, paris,1989,p.407

هومر، **ایلیاد**، ترجمەی س. نفیسی، تهران ،١٣٦٨، ص ٧٨٢

٣- افلاطون، **دورە** اثار، ترجمەم . ح. لطفی ، تهران ،١٣٦٨، ص ٧٦٦.

٤- مخابن پاچەڤەی فارسیی کراتیلۆس تێکڕا و تەواو نیە و ئەم قسانەی سوقرات لەودا کورت کراوەتەوە. من لەم وەرگێڕانە فەرەنسیە کەڵکم وەرگرتوە.

Platon , lon. Ménexene, Euthyéme, cratyle, trans.l.meridier paris,1992,p.136

هێز لەتەك زاوزێ، سنوربەندی، چاو ساخی، خولیا و لە هەمو گرنگتر لەگەڵ زمان نیشان دەدەن.

ئەگەر کەسێك بپرسێ: لە نێوان خولیا و زمان چ شتێکی هاوبەش هەیە؟ بە وردبوونەوە لە رەچەڵەکی ئوستورەیی وشەی هێرمێنۆتیك دەتوانین بێژین: ئەم دوانە رێگە بۆ راڤە (herméneus) خۆش دەکەن و هەرچییەك بەرهەڤ بکەن بە راڤەوە دەزانرێت. هەر بەمجۆرە، هەرکە گوتەی ئەفلاتون کە دەڵێ" زمان پاراوی و زمان هەراوی کرۆکی هەموو ئەو کارانەیە" وەبیر خۆمان بێنینەوە، لە تێهزرین لە راڤە، چەمکی زمان وەکو بنیاتی باسەکە دەخەینە روو. کەوابوو، ئەگەر کەسێکی وەکو شلایرماخێر بڵێت: "هێرمێنۆتیك بەمانای گەڕانەوە بۆ راڤەیە"، دەتوانین گوتەی ناوبراو وەها تێروتەسەل بکەین کە ئەمە گەڕانەوە بۆ "بنچینەی زمانی"یە و ئێمە لە هێرمێنۆتیك بەردەوام لەتەك بیچمگەلێ لە دەربڕین و زمان سەروکارمان هەیە.

وشەی هێرمێنۆتیك ئەمڕۆ لە تێکڕای زمانە ئەوروپاییەکان بەکار دێت و پاچەڤەشی ناکەن. لە فارسیی ئەمڕۆدا بە " زانستی لێکدانەوە" ،" زانستی راڤە"، "مێتۆدی راڤە" و " هونەری راڤە" پاچەڤەیان کردوە، بەڵام کاری راست و دروست ئەوەیە کە ئێمەش لە زاراوەی هێرمێنۆتیك کەڵك وەرگرین، چونکە ئەو هاوواتایانە گەیەنەری کتومتی ئەو واتایە (هێرمێنۆتیك) نین و تەنانەت دەبنە هۆی لێکەوتنەوەی هەندێ بەدحاڵیبون. بۆ نموونە، ئەم درك پێکردنە چەوتەیان لێ دەکەوێتەوە کە راڤە و لێکدانەوە رێخۆشکەری دەستڕاگەیشتن بە جۆرێك زانستی تایبەتین. هێرمێنۆتیك زانست نیە و ئەگەر پێشمان وابێ مێتۆدە — بەو واتایەی لە ئاستی زانست باوەڕیی ئەمڕۆیی دێتە زەینەوە —دەبێ بێژین مێتۆدیش نیە. هێرمێنۆتیك چالاکییەکی درك پێکەرانە و پێوەندیکارانەیە، کە دەتوانی بۆ ئاستی تیوریگەلێ دابیەزێنی کە لەگەڵ ئەزمونی راڤە، روونکردنەوە، باسکردن و لێکدانەوەی دیاردەکان سەروکاریان هەیە و پێشینەیان بۆ رۆژگارانی ئێجگاری دووری رابردوو دەگەڕێتەوە، واتە بۆ رۆژگاری تێکۆشان بە مەبەستی درك پێکردنی دەقگەلی سپیتا(مقدس)ی هیندی، میسری، ئێرانی، یونانی و...هتد و هەروەها کۆمەڵە دەقێکی سپیتا کە بە زمانە کەوناراکانی ئاسوری، عیبرانی، کلدانی نوسراون. تێکۆشان بۆ باس و خواس و روونکردنەوەی ئەم دەقانە، نەیدەتوانی بە ئاکام بگا، ئەگەرکو تیۆریگەلێ لە بارەی راڤە و لێکدانەوەی دەقەکان لە گوڕێدا نەبان. ئەمڕۆکە، ئەم بیردۆزانە بەشێوەیەکی چەوت لەدیدی هەندێ لەتوێژەران "سەرەتایی"ن،



ئەمە لە کاتێکدایە کە بەهیچ چەشنێك سەرەتایی نین و ژمارەیەك لەوان چەند قات لە تیۆریگەلی مودێڕن کاملتر و تێکچڕژاوترن.

رێکەوەندێکی تایبەت، رستەیەکی کورت و تەنانەت وشەیەکیش دەکرێ" مانا بکەیتەوە". زۆر جاران وشە لە رێگەی گرێدانی لەتەك گوتەیەکی تایبەت مانا دەکەین، بەڵام درك پێکردنی واتای وشە لە رێگەی وردبوونەوە لە هاونشینیی وشەکان لە رستەیەکیشدا دەلوێ. بۆ تێگەیشتن لە وشەیەك کە بەشێوەیەکی تاککەوتو دێتەئاراوە، ناچارین کە بە ئاخێوێکی گریمانی گرێدراوی بکەین. هەرکە تێدەگەین" سەرمایە" ناونیشانی پەرتوکێکە، وای بۆ دەچین کە بابەتەکەی ئابورییە. هەڵبەت بەم وێنا و پێشگریمانە بەردەوام بە بەرەنجامی راست و دروست یا تەواو ناگەین، هەربەو جۆرەی کە لە مەڕ پەرتوکی کلاسیکی مارکس (واتە) **سەرمایە** بۆچوونی ئێمە هەمەلایەن و تەواو نیە، چونکە بابەتەکەی تەنیا ئابووری نیە. کاتێك دەبیسین کەسێك دەڵێ" ئەمشەو ئەو دێت" بە یارمەتیی کردار(فعل) و ئاوەڵفرمانی کات(قید زمان) شیمانی رووداوێك لە داهاتوویەکی نزیك پێشبینی دەکەین و "ئەو" بە پێی پێشبینیەکی دیکە وێنادەکەین. لێرەدا ئەو شتەی کە بیستومانە لێکدانەوەی لەبارەوە دەکەین، یاخۆ راوڕایەڵ و راڤەی دەکەین. تا ئێرە هەموو ئەمانەم بە یەك واتا بەکار هێناوە، بەڵام بە پێشڤەچوونی (باسەکە) جیاوازیی سەرەکیی نێوان زاراوەکانی "لێکدانەوە" و " راڤە" رۆشن دەکەمەوە. درك پێکردنی بەرایی و هەڵەشە (کەلەسەر بنچینەی گومان رەخساوە) هەڵێنجان و هەندێ جار بە "هەڵێنجانی تاکەکەس" ناودێری دەکەین. پێشڤەڕۆترین و تێکچڕژاوترین راڤەکانی ئێمەش لە یاسای بنچینەیی ئەم هەڵێنجانە تاکە کەسییە جیا نین، واتە هەموویان لەسەرکۆڵەکەی گومان بەرهەڤ دەبن. کردەی ناسین یا درك پێکردن بەردەوام لەم پێشگریمانانە دەست پێ دەکا و ئێمە شتێکی تازە بە شتانێك کە پێشتر زانیومانن " پەیوەست دەکەین". پاشان، هەر لەم پێوەندییە سوود وەردەگرین تا زانینی تازەی خۆمان بخەینە سەر گەنجینەی زانراوەکانی پێشومان، یا خۆ روونی بکەینەوە.

هێرمێنۆتیك پێوەندیی بە ناسین و باسلێکردنەوە هەیە. تێدەکۆشین تا " پەیام"ی دێڕە شیعرێکی حافز فام بکەین و بۆ ئەم کارە ئەو دێڕە شیعرە راڤە یا خۆ مانا دەکەینەوە. منالێك مۆنکردن یا مڕوموچی دایکی بە تووڕەیی راستەقینەی ئەو یا خۆ تووڕە نیشاندانی ئەو لێك دەداتەوە. کۆمپییۆتەرێك داتاکان مانا دەکاتەوە. ژەنیارێك یا رابەری ئۆرکێسترا کۆپلەیەکی مۆسیقا لێك دەداتەوە و بە پێشکەشکردنی کۆپلەکە راڤەی خۆی وەدی دێنێ.

وەرگێڕێگ دەقێك لە زمانێك بۆ زمانێکی دیکە پاچەڤە دەکات. هەندێك کەس دەتوانن خولیای خەڵکی راڤە بکەن. کاری پێشگۆیی یونانی ئەمە بوو کە داخواز و ویستی خواوەندان روون بکاتەوە، واتە رازی حەشاردراو لەدیاردەکاندا ئاشکرابکات. جادوگەری، هەورەبروسکە بە تووڕەبوونی هێزە ئاسمانییەکان راڤە دەکات. تا ئێرە لێکدانەوە، پاچەڤە، باسلێکردن، لێکدانەوە و راڤە، هەموویان وشەگەلێکن کە لە بەرانبەر وشەی فەرەنسیی interPretation بە کارهاتوون و هێشتا هیچ جیاوازییەکمان لە نێوانیاندا دانەناوە.

دەبینن کە دیاردە یا بابەتی ئەم لێکدانەوانە، بەردەوام وشەیەك، دەستەواژەیەك یا ناوێك نیە، بەڵکو دەتوانێ رووداوێك، کردە و چالاکییەك، نۆرمێکی کۆمەڵایەتی، باوەڕێکی تاکەکەسی یا کۆمایی (جمعی) ، یا روداوێکی سروشتی بێ. لەگەڵ ئەوەی مەرج نیە بابەتی راڤە زمانی بێ، بەڵام دەتوانێ (و لە راستیدا دەبێ) قەڵافەتی نیشانەگەلی زمانی بەخۆوە بگرێ. تەنانەت درك پێکردنی ئاماژە پێکراوێك لە زەیندا، لە رێگەی بەیانکردنی زەینی واتە گۆڕینی بۆ نیشانەگەلی زمانی دەلوێ. دەتوانین ئەم بابەتە لە زۆر لاوە گشتگر بکەین و لە ئاخێو، کردە، روداو، نۆرم، باوەڕ و زۆر شتی دیکەش یاد بکەین. گادامێر زۆرجاران لە " tex analogues –" دواوە، کە رەنگە باشتر بێ بە "هاوشێوەییەکانی دەق" ناودێری بکەین‌و مەبەستی ناوبراویش بابەتەکانی راڤە واتە ئاخێو، روداو، کردە، نۆرم و ... هتدیە.

پێشتر نووسیم کە هێرمێنۆتیك پێوەندیی بە تێکۆشان بۆ ناسین و باسلێکردنەوە هەیە. ئەگەر ورد بنەوە تێبینی دەکەن کە کردارەکانی تەعبیر کردن، لێکدانەوە، ماناکردنەوە، راڤە کردن، باسلێکردن، وەرگێڕان، پاچەڤە، روونکردنەوە و ...هتد، کە ئێمە لەگەڵ هێرمێنۆتیك هاوپێناومان زانیون، بەردەوام بە خەیاڵی ناسین و درك پێکردن هاتوونەتە گۆڕێ. هەڵبەت لە دیدی هایدگێرەوە، هێرمێنۆتیك، راڤەو تێگەیشتن لە قەڵەمڕەوی هایدنناسی بنەجێ دەبن و نەك تەنیا لە قەڵەمڕەوی ناسینەناسی =(ئەپستمۆلۆژی) epistemology = . بەڵام لە هێرمێنۆتیکی کۆن و هێرمێنۆتیکی رۆمانتیك ئەم خاڵە جێی پەسند بوو کە هۆی بووندارانە و پاساوی هەر چەشنە باسلێکردن و روونکردنەوە، ئامانجەکەی دروستکردنی درك پێکردنی هاوبەش، لێك تێگەیشتن، هاوبیری و هاودڵی یە. بێگومان، هەندێ جار روونکردنەوە بە ئەنقەست بە ئامانجی گومڕا کردن و تەفرەدانی ئەویدی دێتە گۆڕێ. لە راستیدا لەم دۆخەدا ئێمە لە تەك یەکێك لە چەشنەکانی روونکردنەوە واتە روونکردنەوەی چەوت بەرەوڕووین، هەر بەو چەشنەی کە کاتێك خۆمان دەکەوینە هەڵەوە و دەقێك بەشێوەیەکی چەوت لێك دەدینەوە،



هەمدیس کارمان لە قەڵەمڕەوی ئەپستمۆلۆژی جێی خۆش کردوە و بە یارمەتیی پێوەرەکان و ریساگەلی ئەپستمۆلۆژیك دەشێ راست بکرێنەوە. دەبێ پەسندبکەین کە روونکردنەوە مەرج نیە بەردەوام بە خەیاڵی دەستڕاگەیشتن بە راستییەکی لە پێشان هەبوو بخرێتە روو. هەر بەم چەشنە، روونکردنەوە بەردەوام سادە نیە و لە نزیکترین رێگەوە رێ ناکات، بە پێچەوانەوە، زۆرجاران بە یارمەتی خوازەکانی دەربڕین بیچم دەگرێ و لەم روەوە سازدەری تەمتومانی واتاییە. ئەمە تەنیا تایبەتمەندیی زمانی هونەری و شاعیرانە نیەو ئیدی زانیومانە کە بەکارهێنانی نیشانەگەلی زمانی دروستکەری مەودایە لە نێوان ئاماژەپێکەر و ئاماژە پێکراو، واتە لە نێوان پەیڤ و واتا، یا لە نێوان وشەکان‌و شتەکان. خاڵێکی گرنگی دیکە ئەمەیە کە تێکڕای بیرمەندانێك کە لەبارەی هێرمێنۆتیك نووسیویانە (چ هێرمێنۆتیکی رۆمانتیکی شلایر ماخێر، یا هێرمێنۆتیکی مێژوویی دیلتای، یا هێرمێنۆتیکی ئەمڕۆیی گادامێر و ریکۆر) (ناسین) یان بە هەرامەیەکی جڤاتی زانیوەو ئەم خاڵەیان رەت کردۆتەوە کە بتوانی لە چالاکییەکی تەنیا تاکەکەسی بەرتەسکی بکەیتەوە. ناسین بەردەوام روونکردنەوەیەکی لەگەڵدایە کە لە ژینی جڤاتی وەبەر دێت و لە رەخساندنی پێوەندیدا بەکاردێت. ئەم روونکردنەوە ئەگەر بەیان نەکرێت و رێگە بۆ پێوەندییەکی نێوانزەینی خۆش نەکات، هەمدیس لە هەمان دۆخی دەربڕینی زەینیی خۆی خودان چەند لایەنێکی زمانی‌و کۆمەڵایەتییە.

## (٢)

هەنووکە دەتوانین سەرقاڵی مەسەلەی جیاوازی لە نێوان، "تەفسیر" و "تەئویل" بین.

لە زمانەکانی عەرەبی و فارسی پەیڤی (تەفسیر)  بە واتای ئاشکرا کردن و پەیدا کردن، دەربڕینی واتاگەلی ڕواڵەتی لە قەڵەم دەدرێت. تەفسیر (لێکدانەوە)  درککردنی دەقە بەو چەشنەی لە ڕواڵەتی ئەدەبی و دەربڕانەی خۆی خۆدەنوێنێ: ناسینی واتای سەراسای وشەکان لە کۆی واتاگەلی پەیوەست بەو، درککردنی تەکووزمەندیی گەردانگەری، سینتاکسی و ڕێزمانیی ڕستەو دەستەواژە لەسەر بنەمای ڕێساگەلی ناسراوی زمانی، تێگەیشتن لە بنەواشە ئەدەبی و ڕێساگەلی پەیوەندیدار بە "تیۆریی دەربڕین" (rhêtorique)  و سەرەنجام ناسینی ئاماژەگەلی باندەقی. بەڵام تەئویل (ڕاڤە)  لەگەڵ تەفسیر (لێکدانەوە)  جیاوازە، *بە واتای پەیدا کردنی ڕێگەیەك بۆ دەستڕاگەیشتن بە واتا یا واتاگەلی نێواخنی کە لەپشت ڕواڵەتەکەیاندا خۆیان وەشێراوە. ئەگەر ئێمە بڕوامان بە هەبوونی وەها واتا یا واتاگەلی شاراوە بێ و دانەدوی دۆزینەوە یا باسلێکردنیان بکەین (یا لە سەر بنەمای تیۆرییە هێرمێنۆتیکییە ئەمڕۆژییەکان پەسند بکەین خۆمان دەتوانین واتا گەلێك بۆ دەق بخولقێنین)، کارەکەمان "تەئویل کردن"** دەبێت.

---

* لێرەدا  نووسەر جیاوازییەك لە نێوان (تەفسیر)  و (تەئویل)  دادەنێ. هەرچەند بە پێی نێوەرۆك ڕەنگە ئەوەندەش جیاوازییان نەبێ. زاراوەی (interpretation)  لە فەرهەنگدا بە هەر دوو ك واتای (تەفسیر و تەئویل)  بە کار دێت. بەڵام جیاکاری ئەم زاراوەیە لەم کتێبەدا بە مەبەستی جۆرێك پۆلێن بەندی ئەنجام دراوە. ئێمەش تا کۆتایی ئەم پەرتوکە ڕاڤەو لێکدانەوە بە دوو واتای جیاواز بە کار دێنین، هەرچەند کە زاراوەی ڕاڤە  بە هەر دووك واتاکە بە کار دێت: بۆ واتای interPretation بڕواننە ئەم ژێدەرە:

ـ داریوش آشوری، فرهنگ علوم انسانی، نشر مرکز، چاپ سوم، ١٣٨١ ، ص ١٨٧.

** لێرەدا ئەگەر سەیرێکی ڕستەکە بکەین، نووسەر دەیەوێ جیاکارییەك لە نێوان (تفسیر و تەئویل)  ڕایەڵ بکات. ئێمە دەشتوانین هەمان ڕاڤە بە کار بێنین. هەندێجار ڕەنگە لە دەقەکەدا وشەکانی ڕاڤەو لێکدانەوە بە پێی بەکارهێنان لە زمانی کوردیشدا  بە پێی شێوەی دارِشتن جیاواز بن، ئێمە دەتوانین واتای جیاوازییان بۆ دابنێین. پۆلێن بەندیی ئەم دوو زاراوەیە لە ڕووی چەمکییەوە لەم ئاڵۆزییانە ڕزگارمان دەکات. لە کۆتایی بەرتوکەکەدا بە چڕوپڕی لەم بابەتە دەدوێم، لێرەشدا من لێکدانەوە و ڕاڤە بە دوو واتای جیاواز بەکار دێنم. ڕاڤە (تاویل)، لێکدانەوە (تفسیر) . (وەرگێڕ) .



لە بەکارهێنانی تیۆریی هێرمێنۆتیکی ئەمڕۆیی لەمەڕ دروستکردنی واتاگەلی تازە بۆ دەق، هەندێ مەسەلەی گرنگ دێنە پێشێ، کە من لێرەدا تەنیا هێما بە دوو نموونەیان دەکەم:

١) ـ ئایا کەسانێك کە ئیمانیان بە دەقگەلی سپیتا هەیە، دەتوانن خۆیان واتاگەلی تازە دروست بکەن، یا خۆ مەرج نیە کارەکەیان لە دۆزینەوەی واتاگەلی هەبوو و هەنووکەیی و شاراوەی دەق قەتیس بمێنێتەوە؟ بەدەربڕینی دی: ئایا دەبێ لامان وابێ دوو دەستە دەق هەن، دەستەی یەکەم دەقگەلی ئاسمانی کە تێدەکۆشین تاکو واتا نێواخنییەکانیان بدۆزینەوە و دووەم دەقگەلی زەمینی (دنیایی)  کە دەکرێ واتاگەلی تازەیان بۆ دروست بکەین؟

٢) ـ ئایا ڕاڤەگەر لە ڕەوتی چێکردنی واتا تازەکان دەتوانێ لە خودی دەقدا "ڕێنوێنیکەرە نێوەکییەکان" پەیدا بکات؟ بە دەربڕینی دی ئایا ڕاڤەگەر تەنیا لە سەر بنچینەی نیازەکان، داخوازەکان، سەمەدگەلی ئاگاو ناخودئاگاو پێشانناسینەکانی خۆی دەق ڕاڤە دەکا، یا دەقیش وەکو بوونەوەرێکی چالاك لە توانایدایە لە کاری ئەودا هەندێ چوارچێوەو بەرتەسکی بخولقێنێ، یا بە پێچەوانەوە ئاوەڵاییەك ساز بکات؟ جیا لەوەی چ وڵامێك بەم پرسیار و مەسەلە هاوچەشنانە بدەینەوە، دەبێ بڵێین کە خودی هاتنە گۆڕی وەها خاڵگەلێ بە باشی نیشان دەدات کە ئێمە لە قۆناخێك  لە ناسینی دەق، بەهەرحاڵ، ناچارین کە لە ئاستی لێکدانەوەی سادەی زمانی و ڕێزمانی بانتر هەڵکشێین و لە تەك کێشەی واتا شاراوەکانی دەق بەرەوڕووبین.

لە بەر گرنگیی ئەم واتا نیوەکی، شاراوە یا نیواخنی، پێشنیار دەکەم کە لە بەرانبەر پەیڤی لاتینی interpretaio وشەی لێکدانەوە بە کار نەبەین و کەڵك لە وشەی ڕاڤە وەربگرین کە ئامانجەکەی دۆزینەوە (دروستکردن) ی واتاگەلی تازەیە. کاتێك کەسێك سەرقاڵی کاری فیکری دەبێ کە ئێمە بە شێوەیەکی نەریتی بە "لێکدانەوەی دەق" ناودێری دەکەین، چاکتر وایە وردبینەوە و دڵنیا بین کە بەرینایی و سنوورەکانی کاری ئەو چیە. ئەگەر ئەو ئەرکی سەرشانی خۆی بە تەنیا ناسینی زمانی دەق دانابێ، یا خۆ سەرقاڵی مەسەلەکانی شێواز، شێوەی دەربڕین و دۆزینەوەی واتاگەلی ڕواڵەتی لەم ڕێگەوە بێت، هەمان پەیڤی ڕاڤە ورد و دەقاودەقە، بەڵام هەرکات کاری ئەو لەم قۆناخە بانتر هەڵکشێ (کە زۆرجاران ئاوەها دەبێ)  و تێبکۆشێ تا بچێتە نێو قەڵەمڕەوی بیچمە سیمبۆلیکەکانەوە و واتاگەلی نێواخنی و نێوەکیی دەق بدۆزێتەوە، چاکترە ئەم کارە بە ڕاڤەی دەق ناودێر بکەین. لە بەختی باش،

ئەمجۆرە زراڤ بینی و جیاوازیی لێکدانەوە و راڤە لە فەرهەنگی ئێمە و بە تایبەتی لە باسەکانی "هێرمێنۆتیکی قورئانی" مێژینەی هەیە.(٥)

وشەی لاتینی interpretation کە رەچەڵەکی interpretationە، بە هەر دووك واتای "روونکردنەوە" و "پاچەڤە کردن" بە کار دەهات و لە هەر دووکیاندا، بنەواشەی واتای نێوەکی وەشێراوە. کردەی interpretation ناتوانێ لە باسلێکردنی ساکاری مەسەلەگەلی زمانی و ئاخاوتەیی لە کورتیدا ببڕێتەوە، بەڵکو پشت ئەستورە بە گریمانی هەبوون یا ئەگەری هەبوونی واتایەکی نێواخنی.(٦)

بە پێشڤە چوونی باسەکە دەبینین کە لە دیدی بیرمەندێکی هێرمێنۆتیکی ئەمڕۆیی، واتە پۆل ریکۆر(یش) راڤە کتومت بە واتای "دۆزینەوەی واتای نێواخنیی دەق"ە. پەیڤی کۆنی "ڕاڤە" (تأویل) لە زمانی عەرەبی بە واتای "گەڕاندنەوە" بوو. لە راستیدا واتای دەقاودەقی (تأویل ) گەڕاندنەوەی شتێك بە بنەچەکەی، واتە سەرچاوەکەی بوو.

ناسر خوسرۆ داناو ئاخاوتەوانی ئیسماعیلی لە پەرتوکی **جامع الحكمتين** دا نووسیویەتی:

"وە (تأویل) گەڕاندنەوەی گوتەیە بۆ سەرەتاکەی و سەرەتای هەموو بوونەوەران داهێنانە کە ئەوەش پشتڕاستە بە ئاوەز و ئاوەز جێ پەسندی تێکڕای پەیامبەرانە"(٧) وشەی interpretation کە راڤە (تأویل) وەکو هاو واتا لەبۆی بەکار دەبەین، هەر لە سەرەتاوە

٥- لەمبارەوە بڕوانە: ب. احمدی، ساختارو تاویل متن، تهران، ١٣٧٠، ج ٢، صص ٥٠٣ ـ ٥٠٨.

ئەم کتێبە لە لایەن وەرگێڕەوە کراوەتە کوردی:

ب. ئەحمەدی، پێکهاتەو ڕاڤەی دەق، و. م. بابایی، سەنتەری نما، بەرگی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٥.

* خوێنەر ئاگادار بێت ئەم جیاکارییە لەلایەن نووسەرەوە پێدانی بارێکی واتاییە بە دەق بەو چەشنەی کە لە هێرمێنۆتیکی مودێڕندایە، ئەگینا واتای نەریتیی comment و interpretation هەمان ڕاڤەیە، لەم پەرتوکەدا وەرگێڕ لێکدانەوە و ڕاڤە بە دوو واتای جیاواز بە کار دێنێ، ئەمەش تەنیا بۆ جیاکاریی واتاییە. (وەرگێڕ)

٦- G. Gusdorf ,Les origines de L'hermeneutiaue paris , 1988 , pp.19 - 20

٧- ناصر خسرو قبادیانی، **جامع الحكمتين**، تصحیح ە. کربن و م. معین، تهران، چاپ دوم، ١٣٦٣ ص ١١٦.



دروستکەری دژواریی زۆر و زەوەندە. رەچەڵەکی ئەم وشەیە پەیڤی لاتینی intrpresە، بە واتای کەسێك لە نێوان دوو شوێندا لە هاتووچۆدا بێ.(*)

کەوابوو دەتوانین هاتووچۆی نێوان دوو هۆکار یا دوو دەقیش بە گرێدراوی interpretation بزانین و لە تەك ژاك دێریدا هاوڕابین کە راڤە(تاویل) ی بە "هەڵوەدا بوون لە نێوان دوو(یا زۆر جاران) چەندین دەق" ناودێر کردوە، بەم پێیە رازی دەق لەبەر ئەم هۆیە لە گۆڕێدایە کە بۆ ژێدەر یا چاوگەیەکی تاقانە و هەمیشەیی ناگەڕێتەوە. هەنووکە دەشێ بپرسین کە ئایا دەتوانرێ کاری وەرگێڕێك کە واتاکان "دەگوازێتەوە"، واتە لە جەرگەی کۆمەڵە نیشانەیەکی زماننناسانەی تازە" دەریان دەبڕێ"، بە راڤە ناودێر بکرێ؟ ئایا کاری زەینێکی هۆشمەند یا دەزگایەك کە بە شێوەیەك لە شێوەکان نیشانە ژمارەییەکان (digital) و نیشانە بەراودییەکان رایەڵگۆڕی دەکا، راڤەیە؟ رەنگە چاکتر بێ کە ئەم واتا بەرتەسکە، واتە گوزەر لە دەزگایەکی نیشانەناسانە بۆ دەزگایەکی دیکەی نیشانەناسانە بە "لێکدانەوە " و "پاچەڤە" ناودێر بکەین و لە بەرانبەردا بۆ کارێکی چەندقات تێکچڕژاوتر، واتە دۆزینەوەی واتاگەلی نێواخنی یا ئەفراندنی واتاگەلی تازە ناونیشانی راڤە بەکار بێنین.

تاقمێك لە هزرڤانان کە دەیەی رابردوودا لەبارەی هێرمێنۆتیکی تازەوە نووسیویانە، لێکدانەوەیان بە چالاکییەکی سادە زانیوە: هەوڵدان بۆ پەی بردن بە واتایەك. ساکارترین درك پێکردنی هەستەکی، بۆ نموونە تێگەیشتن لە دەنگێك پاش بیستنی دەتوانین بە لێکدانەوە ناودێر بکەین. کاری وەرگێڕیش- لە رواڵەتدا- لەم ئاستە دایە، چونکە ئەوەی لەو چاوەڕوان دەکرێ ئەوەیە کە رستەکان لە زمانی دووەم(مەبەست) بگوازێتەوە یا دەربڕێ. بۆ راپەڕاندنی ئەم کارە ئەو ناچارە کە هەڵێنجانی خۆی رۆشن بکاتەوە، زۆر جاران فرەڤاقیی واتاکان وەلابنێ و تەنیا یەك لێکدانەوە بکاتە بناخە و بنمیچی کارەکەی، واتە یەك واتا بە باڵادەست و رەوا بزانێ و بناسێ و رستەیەك بە زمانی دووەم( مەبەست) بنوسێت. هەڵبەت زۆر وێدەچێ کە لە زمانی دووەم(مەبەست) یشدا رستەیەکی تازە رێگە بۆ راڤەگەلی تازە و فرەچەشن ئاوەڵا بکا و فرە واتایی بێت.

* هەروەك دەبینن هەر دووك وشەی (تأویل) و intrpres لە ڕووی رەچەڵە کناسییەوە لێك دوورن. (ڕاڤە) بە واتای لە سەر رۆیشتن و درێژە پێدانو هەڵڕشتن و پەیجۆری بابەتێکە. (وەزرین) یشی پێ دەوترێ. پێم وایە ئەم واتایە لە هاتووچۆ و (تاویل) قووڵترە.(و)

دۆزینەوەی واتایەك ئەگەر ببێتە ڕێخۆشکەری واتاگەلی دیکە و لەو نێوەدا واتاگەلی نێواخنیی دەق، لە قەڵەمڕەوی ڕاڤەدا جێدەگرێ. لێرەا دەتوانین بپرسین کە ئایا بەردەوام درك پێکردنی تاك واتایی درك پێکردنی فرە واتایی لێ دەکەوێتەوە؟ ئەو نیشانانەی کە تەنیا بە واتایەك دەزانرێن، چەندان زۆر نین، بەڵام بەهەرحاڵ هەن و لە بەرەنجامدا ڕێگەی ڕاڤە دادەخەن. وێنەی ژنێك لە جل وبەرگی پەرەستاریدا کە قامکی شادەی* لەسەر لێو داناوە بە واتای هەرە پێویستیی ڕەچاوکردنی بێدەنگییە و تا ئەو جێیەی کە لە قەڵەمڕەوی فەرهەنگێکی تایبەتدا وەها هێمایەك (بەپێی ڕێککەوتنێکی نیشانە ناسانە) شیانی فامکردن بێ، تەنیا یەك واتا دەدا بەدەستەوە. هەر بەوچەشنەی کە داگیرسانی چرایەکی سوور لە چوارڕێیەکاندا جگە لە هەرە پێویستبوونی ڕاوەستان واتایەکی دیکەی نیە. هیچکەس ناتوانێ بە بیانوی ئەگەری ڕاڤەی ئەم نیشانانە واتایەکی دیکەیان بۆ دابتاشێ، بەڵام دەتوانی گریمان بکەیت کە کەسێك لە سەرچاوە یا ڕێککەوتنی نیشانەناسانە بێ ئاگابێ و لە بەرەنجامدا لێکدنەوەیەکی"چەوت" لەوان وەدەست بێنێ.

لە دەقە ئەدەبییەکاندا ڕێکەوەند**یا شیعرێك، لە نیگای یەکەمدا، "تاك واتایی" دێتە بەرچاو. چەند دێڕە شیعرێك لە غەزەلە دلْدارییەکانی سەعدی لەم خدە تاك واتاییەوە نزیك کەوتوونەتەوە. کاتێك ئەو دەهۆنێتەوە:

من ندانستم از اول که تو بی مهر و وفایی
عهد نابستن از آن به که ببندی و نپایی
(وەرگێڕانی شیعری:
من نەزانیم کە تۆ بێ سۆز و وەفا بووی لە بەرێ
سۆز نەبەستن چاترە تا بی بەستی و نەیبەیتەسەرێ)

* : قامکی چوارەمە لە نێوانی قامکی ناوەندی و کەڵەموست(قامکی گەورە) ، فەرهەنگی کوردستان، گیوی موکریانی /لە بەرانبەر (انگشت اشارە) ی فارسی. وەرگێڕ

** " عبارت"، ڕێکەوەند وەکو: بەو بایە دەژیم کە لە لای تۆوە دێ/ سەلاح پایانیانی، فەرهەنگی زارەکیی موکریان، ب.چاپخانەی ڕێباز، سلێمانی،٢٠٠٨، ل ١٤



واتایەکی ئەڤینداارانە و پڕگلە و گازەندە دێنێتە گۆڕێ. لە ڕواڵەتدا ساکاریی دەربڕین کە لە ورتەورتێکی ئەڤیندارانە دەچێ ڕێگەی ڕاڤەگەلی دیکەی ئەم دێڕە شیعرە دادەخا( هەڵبەت هەر لەم غەزەلەدا، هێمای دیکەش هەن کە ئەگەری ڕاڤە دەڕەخسێنن:" تۆ گەورەی و لە ئاوێنەی بچوکدا نانوێنی") تەنانەت ئەگەر بتوانی سروشتی تاك واتایی بۆ سەرلەبەری غەزەلەکەش گشتگیر بکەیت( کە وادێتە بەرچاو وەها کارێك ئەنجامدانی نالوێ) بە هیچ شێوەیەك بە مانای لاوازیی شیعری سەعدی نیە. بە پێچەوانەوە، ڕەخنەگر لە پاش فامکردنی واتای سادە و تاقانە ئەوجا تێدەگا شێوەی دەربڕینی شاعیر واتە ڕادەی زاڵبوون و دەسەڵاتی ئەو لە بەکارهێنانی ڕەوانبێژیی شیعریی و ڕێساگەلی تیوریکی دەربڕین چەندەیە. جێی سەرنجە کە هەرچەند تێگەیشتنی واتا لە نموونەی سەرەوەدا سادەیە، بەڵام درکی شێواز یا مێتۆدی دەربڕینی شاعیر بە هەمان بارتەقا دژوارە. لە بەرانبەردا، دەتوانین نموونەگەلی دیکەش بەدی بکەین کە لەواندا درك پێکردنی واتای یەکەم، ڕێخۆشکەری ناسینی واتاگەلی دیکە دەبێت. فامکردنی واتای زۆر لە دێڕە شیعرەکان لە غەزەلەکانی حافزدا دژوارە. هەندێ جار وای بۆ دەچین دەستمان بە واتایەك ڕاگەیشتوە، وەلێ بە زوویی تێبینی ئەوە دەکەین ڕێگەی گەڵاڵە بوونی کۆمایەك لە واتا جیاوازەکان و ڕەهەندە جۆر بە جۆرەکان ئاوەڵا کراوە. واتای ئەڤیندارانەیان کە لە یەکەم نیگادا دەردەکەوت، واتاگەلی دیکەی دەشاردەوە کە بە یارمەتی و لە ڕەوتی ڕاڤەدا، ئاسۆیەکی واتایی تازە و لەم ڕێڕەوەدا هەرە پێویستیی گەڵاڵەی چەمکگەلی تازە لە مێتۆدی دەربڕین دێنێتە پێشێ.

لە سادەترین ڕوداوەکانی ژیانی ڕۆژانەشدا لەگەڵ ڕاڤە وەکو پلەیەکی پێشکەوتو لە کردەی داوەری کە لە درك پێکردنی هەستەکیو تاوتوێی زمانی بانترهەڵدەکشێ، سەروکارمان هەیە. تابلۆیەکی دیواری (پوستێر) کە خێزانێك نیشان دەدا لە ڕۆژێکی پشودا بە ئوتۆمبێلی خۆیان چوونەتە زۆزان، بە دیوار داکوتراوە. باوك لە تەك دوو کوڕیدا لە مێرگدا خەریکی یاری تۆپی پێن و دایك و کچەکەی خەریکی ئامادە کردنی سفرەی (فراڤین) ن. ئوتۆمبێلی خۆشڕەنگ، نوێ و خاوێن لە بەر هەتاو دا دەدرۆشێتەوە و ناو و مۆدێلەکەی بە نیشانەگەلی نڤیسیاری ریکلامی بۆ کراوە. راڤەی ١) کڕینی ئەم ئوتۆمبێلە بەختەوەریی ئەم خێزانە بێکەمایەسی و

* نانی نیوەڕۆ (فراڤین) وشەیەکە لە دەڤەری بادینان، گیو موکریانی، فەرهەنگی کوردستان. لە بەرامبەر وشەی "نهار"ی فارسی. (وەرگێڕ)

پوخت دەکا. ڕاڤەی ٢) بەختەوەری تەنیا لە ژینگەی بنەماڵەدا وەچنگ دەخرێ، لەم ڕۆژە بەهارییەو لەم مێرگەدا ئەگەر لەگەڵ بنەماڵە و خێزانتدا نەبی، بەختەوەر نابێ. ئەم ڕاڤە تەواوکەری ڕاڤەی یەکەمەو زۆر وێدەچێ بەرهەڤکەرانی ئەم تابلۆ دیوارییە ئەم باوەڕە گشتی یا ئایدیۆلۆژیکەشیان لا مەبەست بووە. ڕاڤەی ٣) لە کۆمەڵگای پیاوسالاردا ژنان سەرقاڵی کاروباری ماڵەوەن و کیژۆڵەش لە یەکەم ساڵانی ژیانیدا فێر دەبێ لە ئامادە کردنی سفرەی خواردنو خۆراکدا یارمەتی دایکی بدا.

لە کاتێکدا وەرزش، شادیو کەڵك وەرگرتن لە "کاتەکانی حەسانەوە" هی پیاوان و مێرمندالانی بنەماڵەیە. ڕاڤەی ٤) لە کۆمەڵگای مودێڕندا خۆشبەختی بەستراوەتەوە بە ڕێژەو جۆری خەرج و گوزەران، ئەو بنەماڵانەی تازەترین مۆدێلی ئۆتۆمبێلیان لە بەردەستدا بێ، خوشبەختترن. دەتوانی ڕێچکەی ڕاڤەکان بەرنەدەیت و پەیامگەلی تازە پەیدا بکەیت. پەیامگەلێ کە نێردەری (بەهەڤکارانی پوستێر) بیریان لێ نەکردتۆتەوە و ئێمە وەکو "دۆزینەوەی نائاگایی دەق" دەیانخەینە ڕوو. بەڵام دەبێ بپرسین کە کەوشەنەکانی ئەم ڕاڤە پەسندییە لە کوێیە؟ ئایا بۆ "دروستکردنی واتاگەلی تازە" ئاستێکیش هەیە؟ لایەنێکی ئەم چالاکییە ڕاڤەکاریی پێشداوەرییەکان و پێش گریمانکارییەکانی وەرگری پەیام یا ڕاڤەکارە. ئەوە کە لە سەر بنەمای ڕادەی دانایی خۆی، سیستمی باوەڕە فەرهەنگییەکانی خۆیو تەنانەت لە سەر کۆڵەکەی خودئاگایی خۆی بۆ هەر دەقێك واتایەکی تازە دادەهێنێ. هیچ ڕاڤەیەك جیا لەم سیستمی زانراوەکانی پێشوو هەڵبەت ویستی ڕاڤەکەر ناگاتە بەرەنجام. دەلوێ شتێك کە لە نیگای یەکەمدا بە لای ڕاڤەکەرێکەوە "تاك واتایی" بێ، لە دیدی ڕاڤەکەرێکی دیکەوە فرە واتایی پڕ ڕاز و ڕەمز بێ.لایەنێکی دیکەی ڕاڤەکاری ئەگەرەکانی وەشێراوی دەقە. گاڵتە جاڕییە ئەگەر بێتو گوتەی فەرمانبەرێك لە گومرکی فڕۆکەخانە کە تەنیا پێتان دەڵێ: "گوزەرنامە passport ـبە واتایەك ڕاڤە بکەن جگە لەو واتایەی کە داخوازی نیشاندانی گوزەرنامەیە. بۆ منداڵێك کە ـ لەو نموونەیەی کە پێشتر هێنامەوە ـ ناچار بووە مۆنکردنی دایکی بە تووڕەیی ئەو یا خۆ تووڕە نواندنی دایکی لێك بداتەوە، ئەگەرێکی ترسناك لەئارا دایە: ڕەنگە ڕاڤەی چەوتی ئەو ببێتە هۆی ئەوە لێدانێکی چاك بخوات. هەمدیس لێرە هەندێ مەسەلەی تازە دێنە گۆڕێ: ئایا بەرەنجامەکانی ڕاڤەدەتوانن ڕۆشنگەری ڕاست ودروستیی بن؟ ئایا لە بنەڕەت ڕا پێوەرێك بۆ لێك هاوێر کردنی ڕاستی و چەوتیی ڕاڤە هەیە؟



## (٣)

سەرنج لە یەکێك لە یەکەمین وگرنگترین بەڵگەنامەکانی مێژوی هێرمێنۆتیك بدەین: وتووێژی **ئەیون** لە نووسینی ئەفلاتون. لەم وتووێژەدا سوکرات لەگەڵ ئەیونی چیرۆك گێڕەوە، دواندەر و لێکدەرەوەی بە ناوبانگی شیعرەکانی هۆمیرۆس لەمەڕ هونەری دواندەری و لەم ڕێڕەوەدا لە بارەی هونەری ڕاڤەو لێکدانەوەی دەق باس دەکا و پێی دەڵێ:" لێوەشاوەییەك کە تۆ لە لێکدانەوەی (ڕاڤە = hermenia ) شیعرەکانی هۆمیرۆس هەتە، هونەری نیە، چونکە وەبەرهاتوی هێزێك نیە کە لە تۆوە هەڵقولا بێ، بەڵکو هێزێکی یەزدانی دنەی تۆدەدا، کتو مت وەکو هێزێك کە لە بەردێکدایە کە ئورپیید بە ئاسنکێش (موگناتیس) ناودێری کردوە و ئێمە بە هێراکلیا ناوی دێنین .[٨] سوکرات باسەکە لە سەر بنەمای ئەم ئەلیگۆرییە درێژە دەدا و دەڵێ کە شاعیران بە هێزی خورپەو ئیلهام لە دۆخی سەرمەستی و بێخودی و بێئاگایی لە تەك خواوەندی شیعر پێوەندی دەگرن و وەکو هەڵقەیەك لە زنجیرێکی ئاسنین کە لە بەردێکی موگناتیس دەخشێت، لە هێزی ئەو بەردە لێوڕێژ دەبێت. هەڵقەکانی دیکەی ئەم زنجیرە گێڕەرەوە و لێکدەرەوانن کە لە ڕێگەی پێوەندیگرتن لەگەڵ شاعیران و شیعرەکانیان هەر کام لەوان پشکی خۆیان لە هێزی موگناتیسی شاعیرانە دەبەن و لە دۆخی بێخودی خەریکی لێکدانەوەی شیعر دەبن. سەرەنجام، پاشماوەی هەڵقەکانی بێ ئەژماری زنجیر کە بەرامبەران (بیسەر ـ خوێنەر)ی شیعرن، لە ڕێگەی پێوەندی لەگەڵ لێکدەرەوانن و دەقگەلی لێکدانەوەیی ئەوان لە هێزی موگناتیس و ئیلهامی شاعیرانە پشك دەبەن. شاعیران بە هێزی خوایی و هەڵقە زۆر و زەوەندەکانی لێکدەرەوان، بە شاعیران و ئاپۆڕەی بێ ئەژماری بەرامبەران (بیسەر ـ خوێنەر) و بە هەموو لێکدەرەوەیەك بەستراونەتەوە.[٩]

ئەگەر وەکو سوکرات شیعر بە لەخۆدەرچون بزانین، ئەو کات دەبێ پەسند بکەین کە شاعیر نەك لە سەر ستونی ئاگایی، بەڵکو لەسەر بنیاتی ناخودئاگایی و لە دۆخی دیناوێکی مەعنەوی شیعر دەڵێ (خاڵێك کە زۆر لە شاعێرانیش پەسندی دەکەن). بەم چەشنە، شاعیر دەستی بە واتای ڕاستەقینەی شیعرێك کە هۆنیویەتیەوە، لە ئاستی خودئاگایی خۆیدا، ڕاناگات و لێی ئاگادار نیە. بە دەربڕینی دی، بەرەنجامی کاری شاعیرانەی لە لای خۆیشی بە

---

٨- ئەفلاتون، پیشین (دوره اثار) صص ٦١٠ ـ ٦١١

٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٦١٢.

نەدۆزراوە دەمێنێتەوە و دەبێ قبووڵ بکا کە نیاز و مەبەستێك کە لە کاتی هۆنینەوەی شیعر لە ناخیدا بوە ڕەژیدەی * واتای شیعری ئەو نەبوە. هەڵبەت لێرەدا دەتوانین ناکۆکییەك لە نێوان ئەم بڕیارە لەتەك گوتەکانی پێشوی سوکراتی ئەفلاتون لە ئەیون دا پەیدا بکەین: " (ئێوە گێڕەوەکان)** ناچارن لەگەڵ دواندەرانی ناودار لە سەروی هەموویانەوە هۆمیرۆس کە شاعیرێکی مەلەکوتییە، سەروکارتان هەبێ و نەك تەنیا شیعرەکانی لەبەر بکەن، بەڵکو پەی بە پێشینەی هزرەکانی بەرن. خۆ ئەگەر کەسێك واتای گوتەی شاعیر فام نەکات، ناتوانێ لێکدەرەوەی شیعرەکانی ئەو بێت و ئەرکی سەرشانی گێڕەرەوە ئەمەیە کە هزرەکانی شاعیر و خاڵگەلێ کە لە شیعرەکانیدا وەشێراون لێك بداتەوە و ئاشکرایە کە ئەگەر گێڕەرەوە خۆی نەتوانێ لەو واتایانە تێبگا لە بەجێهێنانی ئەرکی سەرشانی خۆی دۆش دەمێنێ".[۱۰]

جیا لەم گوتەیە،کە ئەرکی سەرشانی لێکدەرەوە ناسینی پێشینەی هزرەکانی شاعیر دەزانێ، خاڵی سەرنجڕاکێش ئەو دەستە لە هێماکانی سوکرات لە **ئەیون** دا یە کە بە ناخودئاگایی شاعیر لە کاتی هۆنینەوەی شیعر گرێ دەدرێن.

هێرمێنۆتیکی ئەمڕۆیی، بە تایبەتی لە باسکردن لە ئاخێوی هونەری، ئیدی پەسند ناکات کە واتای دەق هەمان واتایە کە بە زەینی ڕەخسێنەرەکەیدا تێپەڕیوە و پەیامنامەی ڕاڤەکەر یا بەرامبەر(بیسەر- خوێنەر) ی بەرهەمی هونەری تەنیا دۆزینەوەی ئەم نیازە زەینییانەیە و بەس. سەرچاوەی ئەم نکۆڵییە لە "نیازی دانەر" بە بڕێك لە باسەکانی سەدەی نۆزدەهەم لە بواری جوانیناسی دەگات، بەڵام بیچمی دەقاودەق و وشیارانەی یەکەمجار لە نووسینەکانی فۆرمالیستە روسییەکان (ڤیکتۆر شکلۆفسکی، رومەن یاکۆبسێن و ...) و بەرهەمەکانی نووسەرانی" ڕەخنەی نوێ"کە لە قەڵەمڕەوی کولتوری ئەنگلۆساکسۆن دەیان نوسی (کلینت بروکس، و. د. وایمست و...) وهەروەها بەرهەمگەلێ لە ڕەخنەکارانی وەك تی.ئێس ئیلیۆت و پۆل ڤالێری وەشێراوە. لە قەڵەمڕەوی هێرمێنۆتیکدا، ئەم باسە پێشینە و بوارێکی فەلسەفیشی لە نووسینەکانی مارتین هایدگێردا هەیە، چوونکە ئەو بوو کە بەلاوەنانی ناسکار ڕێگەی بۆ نکۆڵیکردن لە ڕۆڵی نیازی دانەر لە دیاریکردنی واتای بنەتایی، تاقانە و لێبڕاوی

* سازندە .ف .

** تێبینی لە نووسەرە

۱۰- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ۶۰۵-۶۰۶



دەق ئاوەڵا کرد.دەتوانین دوو هۆی سەرەکی لە بۆ بێبرەویی نیازی دانەر بێنینەوە: ۱) - ناخودئاگایی دانەر لە سەروبەندی ئەفراندنی بەرهەمی هونەری ۲) - زاڵبوونی زمان و ئامرازی دەربڕین بەسەر دانەردا. بە پێی یەکەمین هۆ ئەو شتەی هونەرمەند دەیهێنێتە گۆڕێ، تەنیا پشت ئەستور بە زانین و جیهانبینی ئەو نیە و لە ئەزموونەکانی وشیارانەی ئەو لە ژیان قەتیس نابێتەوە. بەرهەمی کاری ویژدانی ناخودئاگای* دانەرە و بە بێ ئەوەی خولقێنەرەکەی بزانێ یا بیهەوێ، پەیوەست دەبێ بە هەندێ لایەن و ئاقاری کەسایەتیی کە بەلای خودی ئەو کەسەشەوە ئاشکرا نیە. بەرهەم لە ڕێڕەوی ناخودئاگایی دانەرەوە باندۆر وەرگری دەقەکان و بەرهەمگەلی دیکەیە. ئەم خەیاڵکردە کە دانەر خۆی بە شێوەیەکی تەواو زانیویەتی دەیەوێ چ بڵێ و چ ئەنجام بدا و هەروەها لە گوتن و ئەنجامدانی ئەو شتەی مەبەستی بووە سەرکەوتنی بەدەستهێناوە، ساویرێکە پەیوەستە بە گریمانی هەبوونی ناسکارێکی دانا و چەلەنگ. ناسکارێك لەو جۆرەی کە دیکارت هێناویەتە پێشێ. کەسێك کە لە هەر ئان و ساتێکی ژیانیدا لە هەڵکەوتگەلی هایدنناسانە و دەرونیی خۆی ئاگادارە و لەسەر بناخەی ئاگایی ئاوەز باوەڕانەی خۆی جیهانی بەرناسەکان دەناسێ و لەودا گۆڕان چێدەکات. هەبوونی وەها کەسێك، هەروەك هایدگێر نیشانی داوە گریمانێکی میتافیزیکییە نەك کەتوارێك. بە پێی دووەمین بەڵگە کە لە بەرتەکدانەوەی" هەڵپەتەگەریی نیازی ڕەخسێنەر"دێتە ئاراوە، بەردەوام لە ڕەوتی ئەفراندنی بەرهەمە هونەرییەکاندا چەند ئان و ساتێك پێش دێن کە زمان یا ئامرازی دەربڕین بەسەر هونەرمەند دا زاڵ دەبن و وەك دەوترێ ئەو" لەگەڵ خۆیاندا دەبەن". لەم دۆخەدا، هونەرمەند بێ ئەوەی کە بیهەوێ یا بزانێ، دەبێتە ملکەچی زمانی بەرهەمی هونەری، شێوەکانی دەربڕین و تەڵەکەگەلیخوازەیی. لێرەداخوازەکانی دەربڕین و سەرباشقە (paradigm)کانی دەربڕینی هونەری ڕێگەی خۆیان پەیدا دەکەن و هونەرمەند لە چوارچێوەی پێڕستبەندیی داناییی سەردەمی خۆی گەمارۆ دەدرێ و دەچێتە ژێر ڕکێفی ئاخێوەوە. لەم روەوەیە کە شاعیرێك بێئاگا ودەستەوەستان زاڵبوونی زمانی شاعیرێکی دیکە پەسند دەکا، یا تەمتومانێکی واتاناسانە دەخولقێنێ. بە کورتی، نیاز یا مەبەست و ئامانجی بەرایی هونەرمەند تەنیا یەکێك لە هۆکارەکانی بێ ئەژماری ڕەژیدەی بەرهەمی هونەرییە و

* ضمیر ناخوداگاە: دەتوانین بە " جێناو" یا "من" ego بە واتا فرۆیدییەکەی پاچەڤە بکەین. وەرگێڕ

هەڵەیەکی گەورەیە کە تەنیا ئەم یەك خاڵە (تازە ئەگەر شیانی ناسین بێ) بە پێوەری لێك هاوێرکردنی واتای بەرهەم و یاگرنگترین هۆکار لە دروستبوونی ئەو واتایە بزانین.

هێرمینۆتیکی ئەمڕۆیی، لەگەڵ پێکهاتەگەراییی ئەدەبی لە پلارگرتن لە چەقبەستی نیازی خولقێنەری بەرهەم هاوئاخێوە. تەنانەت لەو بانتر هەڵدەکشێ و روانگەی خۆی لە بەرگرەوەی هەر چەشنە ئەفراندنی فیکری دەکا. بە نکۆڵی لە نیازی خولقێنەر وەکو رەژیدەی واتا، پێوەری ناسینی بەرهەم لایەنی رەهای خۆی لە دەست دەدا و دەبێتە پێوەرێکی رێژەیی و مێژویی. بە دەربڕینێکی دیکە پێوەری ناسینەوە بۆ هەموو کەس دەبێتە راڤەیەك کە ئەو خۆی لە دەق دەیخاتە روو. هەڵبەت رێگەی وتووێژی نێوان راڤەکاران ئاوەڵایە و ئەوان تێدەکۆشن تا بە دانانی پێوەرگەلی بەرهەستتر کە لە بەرەنجامی گفتوگوی رەخنەگرانەیان وەدەست دێن، بە جۆرێك لە لێك تێگەیشتن بگەن و درك پێکردنێکی هاوبەش بونیاد بنێن. بەڵام گیانی ئاخاوتە لێرەدایە کە ئەوان ناتوانن ئەم پێوەرە بەدەستهاتوو و هاوبەشانە بە کۆمەڵە پێودانگێکی راست و دروست، لێبڕاو و بێ ئەملاوئەولا بناسن. بە پێچەوانەوە، دەبێ قبووڵ بکەن کە تێکڕای پێوەرگەلێ کە خۆیان" دایانناون" روویەکی کاتی، رێژەیی و مێژوییان هەیە. لێرەدا ناسین بە واتای پەیداکردنی رێگەیەکی بنەتایی بۆ چوونە نێو کرۆکی نێوەکی و نێواخنیی بەرهەم نیە، بەپێچەوانەوە واتایەکی بەرتەسك و رێژەیی پەیدادەکا. هەر راڤەیەك یەکێك لە چرکەساتەکانی ناسینە و توخمێکە لە ئاسۆی ئاماژەکانی بەرهەم. لە کورتیدا دەیبڕمەوە: درك پێکردن و رەخنەکاریی دەق بە مانای هێنانە ئارای راڤەیەکی کاتی لە دەقە. راستی و دروستیی ئەم راڤەیە ئەرخەیانکەرەوە نیە و واتایەکی بنەتایی، لێبڕاو، هەرمان و خودباوەڕ نادا بە دەستەوە، بەڵکو واتایەکی بەرتەسك و بە شێوەیەکی رێژەیی دروست دەخاتە روو کە ئامادەی هەڵسەنگاندنە. واتە هەر راڤەیەك بەردەوام بە راڤەیەکی دیکە هەڵدەسەنگێنرێ و لە رەوتی وتووێژێکی فەرهەنگی و دیمۆکراتیك یا چەند ئاقارێکی رەت دەکرێتەوە و یا بە پێچەوانەوە، هەڵویستێکی تا رادەیەك پتەوتر لە شوێنگەی پێشوی خۆی پەیدا دەکا. هیچ راڤەیەك بنەتایی و بە شێوەیەکی تەواو دروست نیە، لە پشتیەوە ئەزمونێك نایەتە دەربڕین، بەڵکو خۆی خودی ئەزمونە، کۆبەندی نیە، بەڵکو چرکەساتێك لە تێکۆشانێکی واتاناسانە و لەپسان نەهاتویە.

ئەم "راڤەی کاتی"یە کە تا هەنووکە بە راست و دروست گریمان کراوە هەتاکو لە رەوتی تاوتوێی رەخنەکارانە پتەو یا لاواز بێت، بەر لە هەموو شتێك هەر دەڵێی وتووێژێکە لەگەڵ دەقدا. جۆرێك دانوستانێکی فیکرییە لە نێوان راڤەکەر و دەق. لە رەوتی ئەم وتووێژەدایە کە



واتاگەلی تازە دەخولقێن. چەمکی" ئەفراندنی واتاگەلی تازە" هەمان ئەو شتەیە کە رێگەی هێرمێنۆتێکی ئەمڕۆیی لە رێچکەی پێکهاتەگەرایی جیادەکاتەوە. تیۆرەوانانی پێکهاتەگەرا کە لە بواری ئەدەبیاتدا نووسیویانە لانیکەم لە یەکەمین قۆناخی کاری خۆیان بە عەوداڵی دۆزینەوەی رێساگەلی بنیاتی" زانستی ئەدەبی"یان لە مێشکیاندا را و رایەڵ دەکرد و دەیانهەویست بە یارمەتی و رێنوینیی خودی دەق، واتاکەی" بدۆزنەوە". ئەوان دانیان بە بوونی پێشینەی واتا دادەنا و دەیانهەویست بە مێتۆدێك کە تا رادەیەك هاوشێوەی شێوازی کاری زانایانی پۆزەتیڤیست بوو، لە رێگەی شیکاریی دەق، واتاکەی پەیدا بکەن.

گرنگییەك کە ئەوان بۆ زماناسی وەکو باشقەیەك دایان دەنا و چەمکگەلی باشارگەلی دوانی و توخمگەلی هاونشین کە لە شیکاریی دەقە ئەدەبییەکان دەیانهێنایە پێشێ، شەیدایی ئەوان لە پەیداکردنی مێتۆدی بنەتایی شیکاریی" زانستی"ی دەق نیشان دەدا.کت و مت لەبەر ئەم هۆیە بیرمەندانێك کە باوەڕیان بە نەلواوبوونی دۆزینەوەی تێکڕای واتای دەق هەبوو، کاری ئەوانیان رەت دەکردەوە و بە تێکۆشانێکی مەحکوم بە تێکشکان لە قەڵەمیان دەدا. ریکۆر راستی دەگوت، کە دەیگوت، بەم چەشنە لەگەڵ دەقدا وەکو کەلاکێك مامەڵە دەکرێت نەك بوونەوەرێکی زیندوو.

چەمکگەلێ وەکو" ئاسۆی واتایی"،" شاراوەگەری" و "رازی دەق" کە هایدگێر هێنایەگۆڕێ، کەمایەسیی وەها شیکاریگەلی زانستی نیشان دەدەن. لەهێرمێنۆتیکی ئەمڕۆییدا بە سەرەنجدان لە هزرەکانی هایدگێر لە" رازی دەق"ئێجگار دەدوێن. هێرمێنۆتیکی ئەدەبی ئەم" راز"ە لە ئاسۆی ئاماژەکانی دەق بە حەشاردراو دەزانێ، ئاسۆیەك کە تێکڕای واتای دەقی ناسیوە، ئاسۆیەك کە بەردەوام بە رووی داهاتوو، واتە بە رووی راڤەکان و واتا تازەکان ئاوەڵایە. گادامێر کە لە یەکەمین بەشی کاری گرنگی فەلسەفیی خۆی (واتە **هەقیقەت و مێتۆد** ئاخێوی جوانیناسی تاوتوێ کرد، سەرنجی لە چەمکی "کایە"دا. لە کایەدا ئەو کەسەی کە بە پێی رێساکان کایە دەکا، دەتوانێ دڵی خۆی خۆش بکا بەوەی کە رێساکانی ناسیوە و یا تەنانەت خۆی دروستی کردون، بەڵام راستیەکە ئەمەیە کە ئەو خۆیشی لە لایەن رێساکانەوە یاری پێدەکرێ. رێساکان بە کایەی نیارڤان خۆیان دێننەدی و لە راستیدا "ئەمە یارییە، کە یاری بە یاریکەر دەکا".[11] وەهایە کایەی دەق لەگەڵ بەرامبەر(خوێنەر- بیسەر) و لەگەڵ خولقێنەرەکەیدا و وەهایە کایەی زمان لەگەڵ ئاخێوەر و نووسەر. هایدگێر گوتەنی"

---

11- H.G.Gadamer.truthand method, London, 1979, p.95.

زمانە،کە دەدوێ". هایدگێر ئەم تێڕوانینە زانستگەرا و پۆزەتیڤیستیە کە زمان جگە بە ئامرازێك لە راژەی ئەرککگەلی مرۆیی و کۆمەڵایەتی نازانێ رەت کردەوە و نیشانی دا کە زمان لەگەڵ سروشتی مرۆڤ لەپێوەندی دایە و هەڵکەوتی ئاوەڵایی هایدنە بە رووی مرۆڤدا. کولتورە مێژوویەکان لە زمان و لە رێگەی زمانەوە توانیویانە ئاسۆی کیانیی خۆیان و جیهانی تایبەتی خۆیان بخۆڵقێنن. لە زمان و بە زمانە کە هایدن- لەوێ یا "دازاین" هەیە و لە "هەبوون-لە- جیهاندا"، جیهانێتی جیهان" و هەبوون لەگەڵ ئەوانیدی پرسیار دەکا[١٢] زمان شوێن یا فەزای هەبوونی دازاین و بە گوتەی بە ناوبانگی هایدگێر"خانوی بوونمانە". هەر چەند مرۆڤ زمان بە پێی ئەرکە کۆمەڵایەتییەکانی و لە راژەی پێوەندیی نێوان مرۆیی و نێوان زەینی دەکار دەکا، بەڵام سەرەنجام دەکەوێتە ژێر رکێفی زمانەوە، چوونکە زمان خۆی دەکاتە هۆکاری زاڵبوون بەسەر ئەم ئەرك و پێوەندییانە. ئایا جگە لەوەیە کە مرۆڤ تەنیا لە دەفری زماندا لە شوێنگە و هەڵکەوتەکان ئاگادار دەبێ و تەنیا بە یاریدەی زمان دەتوانێ ئەزموونەکانی خۆی فام بکا و کەسانی دی لەوان ئاگادار بکاتەوە؟ ئایا ئەم هەواڵە بە سنورداری و بەرتەسکییەکانی خوازەکانی دەربڕین و تەڵەکەکانی دەربڕین بەرتەسك نابێتەوە و لەگەڵ جیهانی راستەقینە مەودا ناگرێ؟ شیعر نموونەیەکی باڵایە بۆ درك پێکردنی وزە و باڵادەستیی زمان کە لە هەڵکەوت و شوێنگە ئاشنا و بە رواڵەت دروستکراوەکانی مرۆڤ بانتر هەڵدەکشێ و هزری مرۆڤ بە دوی خۆی رادەکێشێ. شیعر نیشان دەدا کە شتێك بانتر لە زمانی رۆژانە، واتە زمانی پێوەر لە ئارادایە کە لە ئاسۆیەکی دیکەوە، جیهانێکی دی و ئەزمونگەلی دیکە هەواڵمان بۆ دێنێ.

12- M.Heidegger,acheminement vers la parole, trans, j.beaufret



**(٤)**

بۆ ناسینی گرنگترین خاڵگەلێ کە لە هەمبەری هێرمێنۆتیك و واتاناسی دەزانرێن گوزارەیەك بە خاڵی دەسپێکی کارەکەمان دادەنێین و بە گوزارەی بەرایی ناودێری دەکەین: ئامانجی راڤە دۆزینەوەی واتای دەقە.

ئامانجی دۆزینەوەی واتای دەق دەتوانێ لەم دوو شێوەی خوارەوە دانەدوو بکرێت: شێوەی A) لە دەقدا پەیجۆری ئەو شتە بکەین کە دانەر دەیەویست دەری ببڕێ. ئۆمبێرتۆئێکۆ ئەم خاڵەی بە زاراوەی لاتینی intentioauctoris دەستنیشان کردوە.[١٣] شێوەی B) لە دەقدا پەیجۆری ئەو شتە دەکەین کە دەق خۆی سەربەخۆ لە نیازی دانەر دەیڵێ. ئۆمبێرتۆئێکۆ لەمبارەوە intention opers بەکاردێنێ. ئەگەر شێوەی A لە بەرچاو بگرین یەکێك لەم دۆخانەی خوارەوە دەلوێ: ١) عەوداڵی تاقانە واتای دەقین. بۆ نمونە لە دەسپێکی پەرتووکی **مێتافیزیك** ی ئەرەستۆ دەخوێنیینەوە: " تێکڕای مرۆڤان لە سروشتی خۆیاندا پەیجۆرکەری زانینن".[١٤] کاتێك پەیجۆری تاقانەواتای دەق دەکەین وادێتە بەرچاو کە ئەگەر بزانین ئەرەستۆ بە چ شتانێکی دەوت" مرۆڤ"، سروشتی مرۆیی،"زانین"، "خوازیاری و پەیجۆر"، دەتوانین واتای بڕیارەکە بزانین.٢) عەوداڵی واتاگەلی فرەچەشنین کە دانەر هێناویەتە گۆڕێ. نموونەکە لە هەمان یەکەم لاپەڕەی **مێتافیزیك** ی ئەرەستۆ دێنمەوە: " بینایی زیاتر لە هەموو هەستەکانمان یارمەتیمان دەدا تا بناسین و هەروەها جیاوازییەکان بۆ ئێمە ئاشکرا دەکا". دەتوانین بێژین کە نیازی ئەرەستۆ جگە لە سەلماندنی سەرتر بوونی هێزی بینایی( لە سەروی هەمو هێزەکانەوە) * هێنانە ئارای ئەم خاڵەش بووە کە ئاشکراکردنی جیاوازییەکان خۆی دەسەرێکە** هەنوکە پرسیارگەلی دیکەش دێنەگۆڕێ: رۆڵ و دەوری هەستەکانی دیکەی ئێمە لە ئاشکراکردنی جیاوازییەکان چیە؟ ئایا لە نێوانیاندا زنجیرە پلە( هیرارکی) یەك هەیە؟ و ...هتد.٣) عەوداڵی واتا یا ئەو واتایانەین کە مەبەستی دانەرن، بەڵام لە رەوتی ئەم پەیجۆرەدا واتاگەلی دیکە دێنە بەردەممان کە دانەر وەدیاری نەخستون و رەنگە بەهیچ شێوەیەك مەبەستی ئەو نەبوونە، وەلێ بۆ ئێمە هاتوونەتە گۆڕێ.

13- U.ECO,Les limites de l interpretation, trans .M.Bouzaher, Paris , z992, pp.29-32

١٤- ارسطو، میتافیزیك، ترجمەی ش. خراسانی، تهران، ١٣٦٦، ص ٣

* تێبیی لە وەرگێڕە.

** مزیت / امتیاز داشتن و ممتاز بودن/ هەنبانە بۆرینە: هەژار

هەمدیس نموونە لە هەمان دەقی ئەرەستۆ دێنمەوە: " گیانەوەران(بەدەر لە مرۆڤ)*** لەگەڵ وێناکان یا خەیاڵکردنەوەکان و بیرەوەرییەکاندا دەژین، بەڵام ئەزموونێکی ئێجگار کەمیان هەیە".

دەتوانین بپرسین: هەمبەری ئەزموون لەگەڵ خەیاڵگەری، وێناو بیرەوەری کامەیە؟ هەمبەری درك پێکردنی هەستەکی لە تەك هەرکام لەوانە چیە؟و ...هتد. بە ئاشکرا، وڵامی ئەم پرسیارانە لە یەکەمین لاپەڕەکانی مێتافیزیکی ئەرەستۆ پەیدا ناکەین. بە دەربڕینی دیکە ئێمە لە ئاسۆی باسی ئەرەستۆ دەچینە دەرێ و کۆمەڵە مەسەلەیەك لە لامان گەڵاڵە دەبن کە مەبەستی ئەو نەبوونە.

ئایا خوێنەر دەتوانێ لە دانەر پێشەوەتر بچێ؟ ئەم پرسیارە بۆ گومانکاران و سۆفیستەکان لە ئارادا بووە. کانت یەکێك لە فەیلەسوفانی سەردەمی نوێیە کە سەرنجی لەم خاڵە داو لە باسکردن لە بیرۆکەی ئەفلاتون لە **هەڵسەنگاندنی ئاوەزی پەتی** دا نووسی رێی تێدەچێ کە بیسەر نیازی ئاخێوەر باشتر لەو تێبگا:"ئەمە بە هیچ شێوەیەك نائاسایی نیە کە چ لە گفتوگۆی باو و ئاسایی، چ لە رێگەی نووسراوەکانەوە، لە رێگەی هاوهەڵسەنگێنیی هزرگەلێ کە دانەر لە بارەی بەرامبەری خۆی دەریان دەبڕێ، روانینی دانەر تەنانەت باشتر لە خۆی تێبگەیت، خۆ دەلوێ ئەو، ماناو چەمکی خۆی بە پێی پێویست دیاری نەکردبێ و لەو رووەوە بە دژی مەبەستی تایبەتی خۆی دوابێ یا تەنانەت تێهزرییێ".(١٥)

هەڵبەت کانت بە وردی مەسەلەکەی شرۆڤە نەکردو باسی لە لایەنە ئاڵۆزە تیۆریکەکانی نەکرد. لە پاش ئەو شلایر ماخێر لە نووسینەکانیدا لە بارەی هێرمێنۆتیك هێمای بەوە کرد کە هەندێجار ناسینی مەبەستی دانەر لە لایەن راڤەگەرەوە دەتوانێ زیاتر لە ناسینی دانەر لە مەبەستی خۆی بێ.(١٦) بە هەرحاڵ، راستیەکە ئەوەیە کە ئێمە زۆرجاران ناتوانین بەڵگەنامەیەك پەیدا بکەین کە هەواڵێکی وردو دەقاودەق لە خودئاگایی و نیازی دانەر بدا بەدەستەوە. کاتێك کە کارەکە لە ناسینی نیازی دانەر قەتیس بکەینەوە، ناچار دەبین کە لە بەر سنورداربوونی بەڵگەنامەگەلی ژیاننامەیی و مێژوویی، زۆر جاران لە سەر بنەمای گریمانە هەڵەشە و خەیاڵگەرانەکان، نیازگەلێ بدەینە پاڵ دانەر.

*** تێبینی لە وەرگێڕ.

١٥ـ إ. کانت، سنجش خرد ناب، ترجمەی. م. ش. ادیب سلطانی، تهران، ١٣٦٢، ص ٤٠٢

16- F.D.E. Schleiermacher,Hermeneutque, trans. C.berner,paris,1987.pp. 170-173



لە تاوتۆیی ئەدەبیاتی کلاسیك ئەم خاڵە بە رۆشنیو هێز وگوڕ و تینی زیاترەوە دەردەکەوێ، چونکە قەبارەی بەڵگەنامەکان لە مەڕ ژیانی دانەران‌و نووسەرانی سەدەکانی دوور لە دەستڕاگەیشتنی ئێمە هێندە کەمە کە بە راستی هیچ یارمەتییەکمان بۆ وەدیار خستنی نیازەکانیان نادەن. ئەگەر هەموو زانراوەکانی خۆمان لە ژیانی حافز و عەتتاری نیشابووری) بنوسین، کۆمەڵە نووسراوێك وەدەست دێن کە قەبارەیان لە چەند لاپەڕەیەك تێناپەڕێت.

هەندێجاریش کە کۆمەڵە بەڵگەنامەیەکمان لەمەڕ ژیانی شاعیران‌و نووسەران لە بەر دەستدایە یا بە وردیو بڕوا پێکراو، نایانناسین، چونکە دەبینین زیاتر زادەی خەیاڵپەروەریی نەوەکانی دواترن، یا خۆ تێبینی ئەوە دەکەین خوێندنەوەی پەیتاپەیتای ئەو بەڵگەنامانە رێگەیەك بۆ تێگەیشتنی واتاکان‌و تێکچڕژاویی بەرهەمەکانی هونەرمەندان ئاوەڵا ناکات. بە زانیاریی ئێجگار کەم لە ژیان، بەرهەمە راستەقینەکان، مەبەستەکان و ئاماجەکانی دانەرانی کۆن، چۆن دەتوانین درککردنی نوسراوەکان و هۆنراوەکانیان بە فامکردنی نیازە زەینییەکانیان ببەستینەوە؟

بە بێبایەخ بوونی واتای جێی مەبەستی دانەر، شێوەی (A) کە دەبوایە بەو پێیە لە دەقدا پەیجۆری ئەو شتەمان کردبایە کە دانەر دەیهەویست دەری ببڕێ، وەلا بنرێ. هەنووکە شێوەی (B) دێنینە ئاراوە کە بەو پێیە دەبێ لە دەقدا پەیجۆری ئەو شتە بکەین کە دەق خۆی بەدەر لە نیازی دانەر دەیڵێ. ئەگەر لە بارەی ئەم جێگرەوەیە (ئالتەرناتیڤ) زیاتر تێهزرین، تێبینی ئەوە دەکەین کە ئەم دۆخانەی خوارەوە دەرەخسێنێ:

١) ـ لە دەقدا پەیجۆری ئەو واتایە دەکەین کە لە رێگەی گەڕاندنەوەی بۆ بەستێنی هاوچەشنی توخمە نێوەکییەکانی و سەرنجدان لە سیستمی ئاماژەکان و واتادارەکانی دێتە گۆڕێ. ئەمە کارێکی دژوارەو پێشکەوتنی پەیوەستە بە رێژەی دانایی ئێمە لە ژانری بەرهەم، ئاسۆی ئاماژەکانی، بە سەرنجدان لە پێڕستبەندیی دانایی سەردەمێك کە لەودا سەری هەڵداوەو هەندێك هۆکاری دیکە. بە دەربڕینی دی ئەم گریمان یا رێ نیشاندەرە کە ئێمە دەبێ بە شێوەیەکی تەواو لە نێو کەوشەنەکانی خودی دەقدا خۆمان لە قاڵب بدەین، شیاو نیە. هەڵبەت نموونەگەلێ لە کارەکانی فۆرمالیستە رووسییەکان‌و پێکهاتە گەرایان لە بەر دەستماندان کە لە ئارمانجی تاوتوێ لە چوارچێوەی دەق نزیك بوونەتەوە. یەکێك لەو نموونانە وتارێکی بە ناوبانگە کە یاکۆبسێن و لیۆشتراوس لە ساڵی ١٩٦٢ لە شیکاریی پێکهاتەی شیعری "پشیلەکان"ی بودلێر نووسیویانە.(١٧)

17- R.jacoson, Questins de poetigue, paris, 1973, pp.401 -420.

نموونەیەکی دیکە نووسینێکی ژێرارژێنێت بە ناوی "ئاخێوی چیرۆك"ە لەبارەی رۆمانی **گەڕان لەدووی کاتی لەدەستچووی** مارسێل بروست.[18]

١ـ بە پێی ئەم مێتۆدە، تێکۆشانی فیکریی ئێمە لە پێناوی پەیداکردنی وەڵامێك بۆ ئەم پرسیارەیە: دەق چۆن دروست کراوە؟ ٢ـ لە دەقدا واتایەك لەسەر بنەمای گەڕاندنەوە بۆ سیستمی ئاماژەکانی زەینی خۆمان (لەسەر بنچینەی پێشگریمانەکان، یا ئەو شتەی هایدگێر و گادامێر بە"پێشداوەری" ناودێریان کردووە دروست دەکەین. لەم دۆخەدا، ئێمە واتایەکی پێشان هەبوو پەیجۆرناکەین، بەڵکو واتایەکی تازە سازدەکەین. واتاکان لەسەر بنەمای هەستپێکراوەکان، داخوازەکانی خۆمان و تەنانەت سەمەدگەلی لێڵۆ ناڕوون کە لەگەڵیاندا بەرەو روو دەبینو چەندان لە سازوکاریان سەرەدەرە ناکەین، دروست دەکەین. پەیڕەوانی جوانیناسیی وەرگرتن بۆ ئەم حاڵەتە لە زاراوەی"ستراتیژیی دەق" دواون، شتێك کە ئۆمبێرتۆئێکۆ بە intenit Lectoris ناودێری کردووە. نموونەی وەها مێتۆدێك تاوتوێی هانس رۆبێرت یاس لە بارەی شیعری"خەو، ٢"ی بودلێرە کە لە ساڵی ١٩٨٢ بڵاو بۆتەوە.[19]

هەنووکە دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ گوزارەی سەرەکیمان کە پێشتر وەها بەیانمان کردبوو: ئامانجی راڤە دۆزینەوەی واتای دەقە. بە سەرنجدان لە خاڵگەلێ کە لە سەرەوە باس کران، دەتوانین گوزارەی سەرەکی وەها بگۆڕین: ئامانجی راڤە ناسین (واتە دۆزینەوە یا ئەفراندن) ی واتاکانی دەقە. لێرەدا گەلاڵەی راشکاوی چەمکی ئەفراندن یا دروست کردن ئێجگار گرنگە، چونکە سنووری نێوان واتاناسی و هێرمێنۆتیك بە باشی دەکێشێتەوە. ئەفراندن هەمان توخمە کە یونانییەکان بە بەکارهێنانی پەیڤی poesis لە مەڕ تاوتوێی چۆنایەتیی بیچمگرتنی پێکهاتەو ئاسۆی ئاماژەکانی دەقگەلی ئەدەبیو هونەری سەنجیان لێدا. واتای "پوئسیس" لە ژیانی رۆژانەی ئەواندا سازکردن و ئەفراندن بوو. ئەم وشەو پەیڤەی "پۆیەتیك" کە لەوەوە داڕێژراوە، ئەمڕۆکەش دەبێ واتای ئەفراندن لە زەیندا بخوڵقێنن.

18- G.Genette, Figurs, 3, paris, 1972, pp. 67-275.

19- H.R.Jauss, pour une herméneutique Litteraire, paris, 1988, pp. 357-442.



**(٥)**

لە یەکەمین لاپەڕەکانی وتووێژی **ئەیون** ی ئەفلاتون، سوکرات تێدەکۆشێ تا گرنگیی کاری هۆنەران بێجگە هۆمیرۆس وەبیر ئەیون بێنێتەوە، وەلی ئەیون بە جەختەوە دەڵێ کە تەنیا بە خوێندنەوەی شیعرەکانی هۆمیرۆسو راڤەیان دەتوانێ لەگەڵ جیهانی دی پێوەندی رایەڵ بکات و جگە لە شیعرەکانی ئەم شاعیرە شتێکی دی بەدی ناکا کە رێنوێنی ئەو بەرەو دیناوێکی مەعنەوی بێ.[20] لە راستیدا، ئەم دیدگایەی ئەیون لەنێو ئەدیبانی یونانی کەونارا برەوی هەبوو. بەلای یونانییەکانەوە شیعری هۆمیرۆس بەردەوام بنچینەیەکی ئوستورەییو رێخۆشکەری واتاگەلی سیمبۆلیك ئەژماردەکرا. باسلێکردنی کارەکانو گوتنەوەی گوتەکانی خواوەندان و قارەمانان لە داستانە قارەمانانێتییەکانی هۆمیرۆس لە دیدی بیرمەندانی یونانی دروستکەری چەمکگەلی کلیلیی جیهانی مەعنەوی و سەرنموونە (archetype)ی هێزە سروشتییەکان بوو. زۆر لەوان بە رێنوێنیی هۆمیرۆس، دووفاقێتییان لە سەر بنەمای جیاوازی نێوان زەویو ئاسمان دەناسی.واتاگەلی رواڵەتییان دەدایە پاڵ زەویو واتاگەلی نێواخنییان دەدایە پاڵ ئاسمان. واتای نێواخنی بە "بنیات"ی ئەو شتەی کە دەردەکەوێ، دەزانرا. لە گەنگەشە ئەدەبییەکانی یونانییەکاندا وشەی hyponia بە واتای ژێرخان یا هەمان واتای نێواخنی، لە جێی تەمسیل یا ئەلێگۆری (allegory) بە کار دەهات. ئەم خاڵە زۆرجاران دەهاتە گۆڕێ کە لە هەموو دەقێکدا واتاگەلێ شاردراونەتەوە، کە لە ژێر، یا لە نێو دەقدا بنەجێ و شاردراونەتەوە و بە ئاسانی نادۆزرێنەوە.

ئەفلاتونیش پەیڕەوی لە باوەڕی هۆمیرۆس کرد کە پێی وابوو واتاگەلی شاراوە هەن و تەنانەت دەتوانین هەر ئەم خاڵە بە سەرچاوەی پەیدا بوونی چەمکی"بیرۆکە" لە هزری ئەودا بزانین. لەبەر باوەڕهێنان بە هەبوونی واتاگەلی نێوەکی بوو کە ئەفلاتوون لە **کۆماردا** گێڕانەوەی چیرۆکە خەیاڵی و شاعیرانەکانی لە ئارمانجشار(یۆتۆپیا) utopia=ەکەیدا قەدەغە کرد:

"زۆربەی ئەو نەزیلانەی کە ئەمڕۆکە بۆ منداڵانیان دەگێڕنەوە دەبێ رایان بگرین... (چیرۆکگەلێ) * وەکو چیرۆکی جەنگی خواوەندان کە هۆمیرۆس گوتونی، هەر چەند خودان

٢٠ـ افلاطون، پیشین، ج٢، صص ٦٠٦-٦٠٧.

* تێبینی لە نووسەرە.

واتای قووڵ بن لە جڤاکی ئێمەدا خاشەبڕ نابن، چوونکە منداڵان و لاوان توانای تێگەیشتنیان لەو واتایانە و وەدەیارخستنی ئەمە کە نێوەرۆکی ئەم چیرۆکانە میتافۆرە یان نا، نیە و لە ساواییەوە هەر چییەك لە زەینیاندا نەخش ببەستێ ناسڕێتەوە".[٢١] لە ڕاستیدا، ئەفلاتون لەو واتایانەی کە منداڵان لە زەینی خۆیاندا دروستیان دەکەن، دەترسا. لەم ڕووەوە، ئەو بنەمای واتای نێواخنیی هۆمیرۆسی لە دژی خودی هۆمیرۆس و تێکڕای شاعیران و چیرۆکبێژان بەکار دەهێنا. ئەو وەکو تێکڕای کەسانێك کە لە پانتایی ژیانی فەرهەنگیدا چاوەدێریی سەرەڕۆیانە لە سەر بیرودەربڕین بە ڕەوا دەزانن، تەنیا گێڕانەوەی ئەو چیرۆکانەی لە ئارمانجشاردا بە ڕێپێدراو دەزانی کە واتاکەیان لە دیدی ڕەوشتی و فێرکارییەوە جێی پەسندی خۆی بن و بە ناوی یاسا و ئاوەزەوە لەگەڵ هەر چەشنە واتایەکی بەدەر لە چاوەدێری دژایەتی کرد:" ئێمە تەنیا لە کۆمەڵگاکەماندا ڕێگە بەو شیعرانە دەدەین کە نێوەرۆکەکەیان پەسنی خواوەندان و پێداهەڵگوتنی پیاوانی بەشەرەف بێ. ئەگەر ڕێگە بۆ شیعرەکانی دیکە چ تراژیدی و چ قارەمانێتی بدەی کە بێنە ولاتەوە، ڕکێفی کۆمەڵگا دەکەوێتە دەستی چێژ و ژان، یاسا و ئاوەز کە لە هەموو ئان و سات و شوێنێکدا باشترین فەرمانڕەوان، بارگەیان دەپێچنەوە و کۆمەڵگاکەت بە جێ دێڵن".[٢٢]

بەڵام ئەرەستۆ بە پێچەوانەی مامۆستاکەی بە گوتنی ئەمە کە شیعر دەربڕی هەرامەیەکی هەمەکی و لەم ڕووەوە بڵێندباڵایە، لێڵی و تەمتومانی واتایی زمانی شاعیرانەی پەسن کرد. ئەو لە وتارنامەی **پۆیەتیك** دا نووسی:"(مێژوونوس) *لەو پێشهاتانە دەدوێ کە لە ڕاستیدا روویان داوە و ئەویدی(شاعیر) * لە بارەی ئەو پێشهات و ڕووداوانە دەدوێ کە دەلوێ ڕوو بدەن. لەم ڕووەوەیە کە شیعر لە هەرامەیەکی هەمەکی (امر کلّی) دەدوێ و لە کاتێکدا مێژوو باس لە هەرامەیەکی هەندەکی (امر جزئی) دەکا".[٢٣] ئەرەستۆ دەڵێ مەبەستی ئەو لە هەرامەی هەمەکی ئەنجامدانی کارەکان بە پێی شیمان و یا هەرە پێویستێتی یە. هەرامەی

٢١- پیشین ،ج٢، صص ٩٤١و ٩٤٣.

٢٢- پیشین ،ج٢، صص ٩٤١و ٩٤٣.

* تێبینی لە نوسەرە

* تێبینی لە نوسەرە

٢٣- ارسطو، فن شعر، ترجمەی ع. زرین کوب ، چاپ چهارم، تهران، ١٣٥٣، صص٤٧-٤٨



هەمەکی کە بەشێکی گرێدراوی داهاتوویە، لێوڕێژە لە شیمان و ئەگەر و لەبەرگرەوەی ئالتەرناتیڤە لاوەکانە. لە کاتێکدا کە ڕووداو لە سروشتی خۆیدا هاویەکە و تەنیا دەتوانی بە شێوەی جۆراوجۆر و تەنانەت جیاواز و دژیەك، ڕاڤەی بکەیت. لۆنگینۆس، زۆر شیمان دەکرا باندۆری لە ئەرەستۆ وەرگرتبوو کە لە وتارنامەی **لە بارەی شکۆمەندی** وەبیری هێنایەوە کە واتا لەبڕگەی ئەدەبیدا چەندقات زیاتر و قووڵتر لەو شتەیە کە بەرگوێی بیسەر یا بەرچاوی خوێنەر دەکەوێ.[٢٤] ئەرەستۆ خۆیشی لە پاری بیست و دووەمی **پۆیەتیك** دا لێڵیی زمانی شاعیرانەی تا ئەو جێیەی کە گرفتی فامکردنی واتاکان سازنەکات، پەسن کرد و ئەوەشی بە شێوەی دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی پەیڤگەلی سواوی ژیانی ڕۆژانە (ئەو پەیڤانەی کە واتاکانیان بەخێرایی دەزانرێن) بەمەرجی" بڵێندیی ئاخاوتە" و دووری لە هەرزەیی زانی.[٢٥]

لە سەدەکانی ناڤیندا بە هاتنەئارای تێڕوانینی گنوسی و ئوتۆریتەی ڕوو لە زێدەبوونی بەریانی هێرمسی، دەستەیەك لە دەقەکان کە بەئەنقەست پڕەمز و ڕاز و سەرپۆشراو دەنووسران(وەکو دەقگەلی کیمیاگەری و بڕێك لە دەقە ئەدەبییەکان، یا دەستەیەکی دیکە کە لۆژیکی ئاخێوی تایبەتیان ڕازگەریی دەخواست و پاساوی دەدا(وەکو دینی و عێرفانی) پەسن دەکران. تەنانەت نووسینە فەلسەفی و ئاخاوتەوانییەکان کە لە هەرجێ کە بە شێوەیەکی ئاشکرا خودان تایبەتمەندیی فرە واتایی بوون، زیاتر پەسند و پەسن دەکران. هەڵبەت تەشقی ئەم هەڵێنجانە دەتوانین لە ڕاڤەکان و باسلێکردنەکانی کتێبی پیرۆز بەدی بکەین. هەم سۆفیانی یەهودی (کە چاکترین نموونەی کارەکانیان لە ڕێبازی قەواڵە دەرکەوت) و هەم یەزداننانسانی مەسیحی، پێ بە پێی متمانەی ڕوو لە زێدەبوونی سەرباشقەی (paradigm) دەقگەلی فرەواتایی، لە نووسینە سپیتاکانی(مقدس) جێی پەسندی خۆیان کۆمەڵە بەرهەمێکی پڕڕاز و ڕەمز و لە دۆزین نەهاتوویان دەرەخساند. ئەوان برەویان بەم باوەڕە دەدا کە دۆزینەوەی تێکڕای نهێنییەکانی ئەم نووسینانە نالوێ و ڕێگەی گەیشتن بە بڕێك لەوانیش تەنیا دەتوانێ کاری هەڵکەوتوانی چاوکراوە و دڵئاگا بێ. ئەوان ساکارترین ڕێساگەلی دەقە دینیەکانیان خاوەنی واتاگەلی ڕازئاسا دەزانی. ئەم تێڕوانینە لەم سەدانە رابردودا کەوتە بەر ڕەخنەگرتن. گرۆیەك پلاریان لە باوەڕی بنچینەی هێرمسی گرت و نکۆڵییان لە فرەواتایی دەق

24- longinus, on the sublime, trans.t.s.dorsch, London, 1974 p.100

٢٥- ارسطو، پیشین، ص ٩٤.

کرد و گرۆیەکی دیکە لێکەوتە کۆمەڵایەتی و کولتورییەکانی وەها باوەڕێکیان خستەبەر پلار، بێ ئەوەی کە بونیادەکەی ڕەت بکەنەوە. سپینۆزا لە نوسینی بەناوبانگی خۆی( بەناوی) **وتارنامەی خواناسی- سیاسی** نووسی کە گریمانی فرە واتاییبوونی دەق ڕاستە، بەڵام دەبێ لەوەوە مافی هەموان لە ڕاڤەی **کتێبی پیرۆز** و دەقگەلی پیرۆزی دیکە بەرەنجامگیری بکەیت، نەك مافێك کە لە پاوانی خاخامەکان و قەشەکان بێ.(٢٦)

باوەڕ بە تێڕوانینی تاك واتایی دەق، پاش بەسەرچوونی سەدەکانی ناڤین و لەگەڵ سەرهەڵدانی لۆژیك و ئاخێوی ئاوەزباوەڕی مودێرن لە فەلسەفە و زانست هاتەگۆڕێ. لێرەدا فرەچەشنیی ناسینی تاقانە دیاردەیەك پەسند کرا، بەڵام بەم گریمانە کە سەرەنجام ئەگەری گەیشتن بە ناسینێکی یەکانگیر بۆ دیاردەیەك لە ئارادایە. بە پێی ئەم تێڕوانینە ڕەنگبێ واتایەکی تاقانە بە چەشنێکی دەسبەجێ نەزانرێت، وەلێ بەهەر حاڵ لە شێوەی" هەقیقەت" بوونی هەیە. هەقیقەت هەمان ئەو چەمکەیە کە لە بنەتادا، تاقانە بوونی واتا، واتە ڕاست و دروستیی ڕاڤەی بنەتایی و لێبڕاو دەستەبەر دەکا. زانست بە پەیجۆری دژواری "هەقیقەت" دەزانرێت و هەر تیۆری و ناسینێکی زانستی هەنگاوێکە لەم پێناوەدا. لە ڕەوتی کاری زانستیدا هەندێ جار پێشڤەدەچین، برێ جار ڕادەوەستین و تەنانەت دەگەڕێیینەوە دواوە، بەڵام ڕێچکەی سەرەکی بە سەرکەوتنی زانست و عەقڵی مرۆڤ کۆتایی پێدێت.

لە ڕوانگەی مێژوویی و لە درێژماوەدا ڕێچکەی زانست پێشکەوتنە بەرەوپێشێ و سەرەنجام ئەگەری گەیشتن بە ئامانج، واتە بە هەقیقەت، لە گۆڕێدایە. ئەم هەڵێنجانە ئاوەز باوەڕانەیە لە شتەکان و جیهان چەند سەدەیەك بە بیچمگەلی جۆربەجۆر ڕێگەی فەیلەسوفان و زانایانی دیاری کرد و لە پۆزەتیڤیزمدا گەیشتە تەشقی خۆی. هەڵبەت، جاروبار کۆمەڵە گومانێکی لەمەڕ ڕاست و دروستیی پێشگریمانەکانی وروژاند و زۆر گەنگەشەی فەلسەفی لێ کەوتەوە. زۆر لەم باسانە لە سەدەکانی ڕابردو، لەسەر هەمبەری نێوان کەتواری ئەزموونی و دەربڕینی ئەم کەتوارە لەڕێگەی زمانەوە چڕ بوویەوە. هەرچەندیش ئەزموونی زانستی هەل بڕەخسێنێ تا ئێمە پەی بە هەقیقەتێك بەرین، ئەم هەقیقەتە دەبێ لە ڕێگەی زمانەوە بەیان بکرێتو زمان زایەنەری تەمتومانە واتاییەکانە. فەیلەسوفێکی وەکو کارناپ بۆ ئەم خاڵە وڵامێکی پێ نەبوو، مەگەر ئەوەی کە لە یەکەمین لاپەڕەکانی ئەم پەرتوکە سادەو پاراوەی خۆیدا بنووسێ:

26-B.spinoza, theolagico – political treatise, trans, R.H.M.Elwes, new York , 1953



جێی داخو کەسەرە کە زمانی ئێمە خودان وەها لێڵیو تەمتومانێکە کە چاوگەی زۆربەی بەدحاڵیبوونەکانە".(٢٧) دووکتێبی ئەو کە لە بارەی زمان، لۆژیکی سینتاکسیو واتاناسی نووسراون، لە وڵامی مەسەلەی نێوەندیی هەمبەری نێوان ئەزمون و دەربڕینی ئەزمون، لە گوتنی مەخابن و بەداخەوە تێناپەڕن.(٢٨) ڕادیکاڵترین ڕەخنەکاریی زانست باوەڕیو ئاوەز باوەڕی، نووسینەکانی نیچە بوو. ئەو بە هێنانە پێشی ئەم خاڵە کە ویستی هەقیقەت هەمان ویستی هێزە و هەقیقەت زادەی زامانپاراوی و ڕاڤەکانی ئێمەیە، لێڕوانینی تاك واتایی بۆ دەق ڕەت کردەوە. هزرەکانی نیچە ڕێگەیەکی نوێی لە باسگەلی تیۆریکی هێرمێنۆتیك ئاوەڵاکرد و بەریانی زانست باوەڕی لە چوارچێوەی ئەم ئاخێوە فەلسەفییە بۆڕدا.باوەڕ بە تاقانە ڕاڤەی ڕاستو دروست، کە بە درێژایی سەدەی حەڤدەهەم بە تایبەتی لە کەوشەنی ئاخێوی زانستی گەشەی کردبوو و ببوو بە ڕێخۆشکەری هزرڤانانی ڕۆشنگەری، لە ڕێگەی میراتی ڕۆشنگەری لە قەڵەمڕەوی ئاخێوی هێرمێنۆتیك، بۆ نموونە لە نووسینەکانی ویلهۆلم دیلتای مایەوە. لەگەڵ برشتی نیچە و بە تایبەتی دوابەدوای "هێرمێنۆتیکی هایدنناسانە"ی هایدگێری ڕێگەیەکی تازە کرایەوە.

باس لە واتاگەلی فرەفاقیی دەقو باوەڕ بە هەبوونی واتاگەلی شاراوە کە هەر وەك دیتمان جێی پەسندی نووسەران و هزرڤانانی یونانیو سەدەکانی ناڤین بوو، لە تەك باسی هێرمێنۆتیکی ئەمڕۆیی لەم لایەنانەوە بە تەواوی یەکانگیر نیە. فەیلەسوفانی یونانی، ڕۆمانی و سەدەکانی ناڤین لەو باوەڕەدابوون کە واتاگەلی شاراوە دەبێ بدۆزرێنەوە و بۆ ئەم دیناوە مێتۆدو شێوازی هەمەچەشنیان پێشنیار دەکرد. وەلێ بەپێی ڕوانگەی هێرمێنۆتیکی ئەمڕۆیی، واتاکان دەبێ بخوڵقێن. هەنوکە، وەها بەڵگە دێنینەوە کە تەنانەت ساکارترین بیچمی درك پێکردنی هەستەکی، لەو جێیەدا کە نە تۆماری سادەی هەست، بەڵکو بریتی یە لە درك پێکردنی ڕاڤە ئەژمار دەکرێ. گادامێر نووسیویەتی: تێکڕای بیچمەکانی درك پێکردن،، بیچمگەلێکن لە ڕاڤە.(٢٩)

٢٧- ر. کارناپ، **مقدمه‌ای بر فلسفه‌ی علم**، ویراستەی م. گاردنر، ترجمەی ی. عفیفی،تهران،١٣٦٣،ص١٨

28- R. carnap, Meaning and Necessity, The University of Chicago press, 1975.

R.Carnap.The Logicalsyntax of Languoge, London,1971.

29- Gadamer,op. cit,p. 373.

ئەم خاڵە رەگو ریشەی بۆ برِگەگەلی بەناوبانگی سیویەكو سیودووی پەرتوكی **هەبوون و هەرِەت** ی هایدگێر دەگەرِێتەوە، كە لەواندا باس لە هاویەكبوونی درك پێكردن و راڤە كراوە. هێرمێنۆتیك لەم گریمانە (Premise) بانتر هەڵكشاوە و تێكۆشاوە تا بە وردبینكردنی واتای راڤە، سنورگەلی تازە لە بەردەم ئەپستمۆلۆژی لەمەرِ "مەسەلەی درك پێكردن" ئاوەڵا بكات. تیۆریی هێرمێنۆتیك باڵادەستیی خۆی لە كارایی سروشتێكی سیمبۆلیك كە واتایەك لە جیێ واتایەكی دی دادەنیٚو لە بەرەنجامدا ئەگەری رادەستكردنەوەی واتاكان بەیەكدی، دەخولقێنیٚ، وەدەست دێنیٚ.

لە پێناسەیەك كە پۆل ریكۆر بۆ راڤە هێناویەتە گۆرِیٚ، وردبینەوە:"راڤە چالاكیی زەینیی دۆزینەوەی واتای نێواخنیی دەقە كە لە پشت واتای رواڵەتی وەشێرابیٚ، واتە ئاشكرا بوونی پلە نێوەكییەكان (یا توێژە نێوەكییەكان) * ی واتایە كە لە واتای ئاشكرادا وەشێراون".[٣٠] ئەم پێناسەیە لەم دیدەوە كە جەخت لە سەر فرە فاقێتی واتاكان و بوونی واتاگەلی نێواخنی دەكا، نوێخوازە، بەڵام دەبینین كە هێشتا زیندانیی" دۆزینەوەی واتا"یە و لەودا هێمایەك بە خاڵی گرنگی "ئەفراندنی واتاكان" نەكراوە. هەڵبەت نابیٚ لە یادمان بچیٚ كە لە سەرجەمی بەرهەمەكانی رێكۆردا رۆڵی راڤەكەر زەق بۆتەوە و ئەو چەندین جار لە " گرنگیی ئەفراندنی واتا" دواوە و بەشێكی گرنگ لە كتێبی **هەرِەت و راپۆرت** ی خۆی بۆ باسەكانی دروستكردنی واتا لە رەوتی خوێندنەوەی دەقدا تەرخان كردوە. لەم ساڵانەی رابردودا، هیچ كتێبێكی شێلگیر لە بواری **دیاردەناسیی خوێندنەوە** و **جوانیناسیی وەرگرتن** نەنوسراوە،** كە بۆ باسەكانی رێكۆر لە مەرِ خوێندنەوەی دەق و ئەفراندنی واتا لە زەینی بەرامبەر(بیسەر- خوێنەر) پێگە و گرنگییەكی لە ئاست نووسینەكانی یاس و ئایزێر دانەنابیٚ. ریكۆریش دەورێكی گرنگی لەم هیرایە دا هەیە كە واتای نێواخنیی دەق" خاڵێك لە گریمان" واتە شتێك نیە كە بەر لە راڤە لە دەقدا" وەگەرِ خرابیٚ"، بەڵكو هەرامەیەكە كە دەبیٚ ساز بكریٚ و سازكردنیشی كاری راڤەكارە. ریكۆر بەردەوام جەختی كردوە كە لە رەوتی وەرگرتنی دەقدا ئامرازێك جگە لەو ئامرازەی كە دەق دەیخاتە بەردەست هەیە كە چەند قات گرنگتر و یەكلاكەرەوەترە و ئەوەش

---

*  تێبینی لە نوسەرە.

30- pR.icouer,les cojn fitsdes des interpretations, paris , 2969, p.16

**  لە دەقە فارسییەكە دا نووسراوە( نوشتە شدە)  واتە نوسراوە، بەڵام لام وایە هەڵەی چاپە .(و)



هەمان زانیاری، جیهانبینی، دەروونناسی، شوێنگەی كۆمەڵایەتی( چینایەتی، رەگەزی) ی راڤەكارە. "جیاوازیی راڤەكان" نەك رووداوێكی لادەرانە لە رێچكەی ناسین، بەڵكو هەڵكەوتێكی پۆزەتیڤە. هەر لەبەرئەم هۆیە ریكۆر راڤە بە "كردەیەك لە پانتایی لۆژیكی وتووێژ" دەناسێنیٚ: وتووێژی بیسەر —خوێنەر لەگەڵ دەقدا، وتووێژی بەرامبەران(بیسەر- خوێنەر)  لەگەڵ یەكدی، وتووێژی ئاسۆ جۆربە جۆرەكانی ئاماژەكان.

چەمكی "جیاوازی لە راڤەكاندا" تەنیا بۆ پەسندكردنی ئەفراندنی واتاگەلی تازە لە زەینی راڤەكاردا ناگەرِێتەوە. تەنانەت لە نێوان بیرمەندانی رۆژگاری كەونارا( یونانی كۆن، رۆم، ئاخاوتەوانانی یەهودی، مەسیحی، موسوڵمان و...)  رەوایی فرە فاقیی راڤەكان پەسندكرابوو. ئەو كەسانەی كە برِوایان كە " بوونی پێشینی"ی واتاگەلی فرەفاقی هەیە، ناچارن لانیكەم جاروبار جیاوازیی راڤەكان قبووڵ بكەن. راڤە جۆراوجۆرەكان وەكو متمانەیەكی ناسینەیی (epistmic) دەزانران كە بۆ چەقی واتایی دەق چەشنی هەقیقەت (یٚك) دەگەرِێنەوە.

دەستەبەندیی بە ناوبانگی سێنت ئۆگۆستین كە تا رۆژگاری رێنسانس لە راڤەی دەقەكاندا برەودار دەزانرا، ناتەبایی راڤەكانی بە شتێكی حاشاهەڵنەگر دەزانی، بەڵام رێگەیەك بوو بۆ تەكووزداركردنی چەشنەكانی راڤەكان و رەواندنەوەی ناتەباییەكانی نێوان خاوەن را و شارەزایان. بەبۆچوونی سێنت ئۆگۆستین دەتوانین لە چوار رێگەی جیاوازەوە **كتێبی پیرۆز (ئینجیل)** بخوێنینەوە و لە هەر رێگەیەكدا هەودایەك لە راڤەگەلی جیاواز چیٚ دەبیٚ كە لە هەمان كاتدا لەگەڵ یەكدیش كۆمەڵە لێكچونێكیان هەیە. ئەم رێگانە بریتین لە مێژوویی، ئەلیگۆریك، رەوشتی و مەعنەوی. سێنت ئۆگۆستین و پەیرِەوەكانی ئەم چوار شێوەیان تەنانەت لە مەرِ خوێندنەوەی دەقگەلێك كە دینییش نین، برەودار و جێی متمانە دەزانی. دانتی لە نامەی بەناوبانگی خۆی ١٣١٩ (نامەیەك كە بە پێی گوتەیەكی بە ناوبانگ، نەك لێبرِاوانە، دەڵێن ئەو نووسەرەكەیەتی) بە دەست پێكردن لەم چەشنانەی خوێندنەوە، وەها شێوەی جیاواز بخوێنرێنەوە، بەڵكو ئەم شیعرانە لە بنچینەی خۆیاندا خوازیاری فرەفاقێتی خوێندنەوەن. راڤەی دانتی لە شیعرێكی فەلسەفی كە خۆی هۆنیبوویەوە، لە پەرتوكی **خوان** دا هاتوە و ئەمە یەكێك لە گرنگترین دەقەكانە لە مێژووی هێرمێنۆتیكدا. لە مێژووی ئیسلامیشدا دەقێكی درەوشاوە هەیە كە راڤەی شاعیرێكە لە هۆنراوەی خۆی.( واتە)  **ترجمان الاشواق** لە نووسینی (ابن عربی) . دوو نوسەری ناوبراو بە شێوەیەكی جێی پەسن و ستایش تێكۆشاون تا "بازنەكانی لێكدانەوە" تەكووزدار بكەن. وەلیٚ جیا لەم تێكۆشانە، هەمان گومانكاری و

دڕدۆنگی لە کارەکەیاندا سەری هەڵداوە کە بۆتە ڕێخۆشکەری کاری ڕەخنەکارێکی سەردەمی ئێمە. ڕۆلان بارت لە بارەی خوێندنەوە، گومانکارانە نووسیویەتی"نازانم کە ئایا خوێندنەوە لە سەر بناخەی توخمە پێکهێنەرەکانی، پانتاییەکی فرەئاقار لە کردەگەلی پەرەوازە و باندۆرگەلی سادە نەکراوەیە یان نا. لە بەرەنجامدا نازانم کە ئایا خوێندنەوەی خوێندنەوە(واتە) * بان – خوێندنەوە، دەتوانێ شتێك جگە لە تەقینەوەی، چەمکەکان، ترسەکان، تامەزرۆییەکان، خۆشییەکان و سەرکوتەکان بێ؟".(٣١)

## (٦)

ئێمە ناتوانین پێوەری تۆکمەیی دەقێك بەو چەشنەی شیکاریی زمانناسانە دەیخاتە بەردەستمان، قەناعەت پێکەر بزانین. هەڵبەت دەتوانین بێژین کە چەشنەکانی بنچینەبەندیی لۆژیکی( هاوشێوەی ئەوانە کە بەسەر سیستمگەلی وشەیی، ڕێزمانی و سینتاکسیی زمانە جۆربەجۆرەکان فەرمانڕەوایی دەکەن و بەسەر "ئەرکگەلی فرەواتایی" فۆرمەکانی بەیانگەری زمانی، زاڵن) لە دەقە جۆراو جۆرەکانیشدا بەدی دەکرێن، بەڵام گریمان بتوانین تێکڕای ئەم بنچینەبەندییانە بدۆزینەوە، هەمدیس دەبێ بزانین کە ئەمە تەواوی مەسەلەکە نیە. دەتوانین پەسند بکەین کە بیچمە زمانییەکان باڵادەستیی سەرەڕۆیانەیان هەیە( ڕۆلان بارت جارێکیان گوتبووی زمان فاشیستە) ، خودان ئامانجن، خوڵقێنەرن و دەتوانن بە چالاکییەکی تەکووز(منظم ) ڕەخسێنەری ئاماژەکان و واتاگەلی دەقەکان، بەرهەم و بە شێوەیەکی تایبەت بەرهەمە هونەرییەکان بن. بەڵام بە دۆزینەوەی ئەم باڵادەستیانە کاری ئێمە کۆتایی نایەت، چونکە تەنانەت ئەگەر پێوەری لێبڕاوانەی تۆکمەیی دەق و بەرهەم لە جەرگەی ڕێسا زمانییەکاندا پەیدا بکەین( کارێك کە ئەنجامدانی لە ڕادەبەدەر دژوارە) هەمدیس خاڵێکی گرنگمان لە کیس دەچێ، ئاگایی خوێنەر کە گیرخواردوی ئاسۆی ژیانێکی دیکەی جیا لە ئاسۆی پەیدابوونی دەقە، تا ڕادەیەك بە دەر لە کۆت و بەندی ئەو باڵادەستییە سەرەڕۆیانەی زمان بیچم دەگرێت،(ئاگایی خوێنەر) چەند پێش- فامێك دێنێتە گۆڕێ و دێتە نێو ئەزمونی

* تێبینی لە نوسەرە.

31- R.Barthes. “surlalecture” in: oeuvres completes, paris, 1995.p.377.



ڕاڤەوە و شوێنگەی خۆی، ئازادیی خۆی و ئەگەر و کەرەستەکانی ئاگابوونەوەی زیاتری خۆی هەڵ دەسەنگێنێ و بە پوختی و لەیەك گوتەدا جیهانێکی تازە لە دژوارییە تیۆریك و ڕاڤەییەکانی سەرڕێگامان دەخوڵقێنێ.

مخابن لە پێکهاتەگەراییدا واتای "بەرهەم" چەندقات کەمتر لە واتای "دەق" باس و خواسی لەبارەوە کراوە. زۆربەی پێڕەوانی ئەم ڕێبازە لە هەندێ لایەنەوە ئەگەریش لەم زاراوەیە نزیك بووبنەوە، واتایەکی ناڕوونیان لێ هەڵکڕاندوە. بە پێچەوانەوە، لە کۆڕی یارانی هێرمێنۆتیکدا، بەرهەم متمانە و برەودارییەك هاوشان و هاوئاستی لەتەك دەقدا هەیە. وۆلفگانك ئایزێر لە پێڕەوانی ڕێبازی جوانیناسیی وەرگرتن لەمەڕ بەرهەمی هونەری دەنوسێ:" بەرهەم کیانی بیچمگرتوی دەقە لە ئاگایی خوێنەردا"(٣٢). ئایزێر هەرچەند نەك مکور و پەیگرانە زاراوەی "دەق" بە واتای"پێکهاتەیەکی ماتریالیی ئۆبژەکتیڤی دەربڕین کە دەستنیشانەنکراوە" بەکار دەبا و دەڵێ:" دەقێك بیچم دەگرێ تا کامڵ بکرێ"، واتە دەقێك بیچم دەگرێت تا لە ئاگایی خوێنەر ببێتە بەرهەم. هەتا شیعرێك لە زەینی شاعیر یا لە سەر لاپەڕەی پەڕاوگ نوسرابێ و هێشتا نەبووبێتە ئامرازی پێوەندیی هونەری، دەقێکە، بەڵام هەرکە لە ئاگایی خوێنەر یا بیسەردا جێبگرێ دەگۆڕێت بۆ بەرهەم.

بۆ فامکردنی چەمکی بەرهەم خراپ نیە سەرنج لەواتای فەلسەفیی ئێجگار تاقیکراوەی (ئەم چەمکە) لە نوسینەکانی بیرمەندێك کە هێشتا لە چوارچێوەی ئاوەزی هێرمێنۆتیك لە بیسەر و خوێنەر تێ نەدەهزری، واتە شلایر ماخێر، بدەین. ئەو لە وانە گوتارەکانی لەمەڕ هێرمێنۆتیك بەرهەمی بە بەروبوومی کاری مرۆیی شۆبهاند.(٣٣) "کار" هەرچەند سروشتێکی کۆمەڵایەتی هەیە، بەڵام لە بوون و پێشکەوتنی خۆی منەتباری تاکەکەسە، واتە کەسێك کە" ئەگەری واتای کار" دەڕەخسێنێ. زمان ئامرازی کارە و بەوەوە بەرهەمی ئەدەبی بیچمدار یا پێکهاتەدار دەبێ. هەندێ جار وادێتە بەر چاو کە شلایر ماخێر واتای بەرهەم یا" بیچمی سەقامگرتو لە زمان"ی بە ژانرەوە گرێ دەدا. ئەگەر وەها بێ، دەبێ بوترێ تەنیا کەسانێك کە پێشتر لە تەك ژانردا ئاشنا بووبن دەتوانن لەوە تێبگەن کە دانەر لە کوێدا پەیڕەوی بەندوباو و ڕێککەوتن بووە و لە چ شوێنێ لێی بانتر هەڵکشاوە و بەرهەم لە ڕاستیدا چ هەڵکەوتێکی هەیە. بەڵام زراڤ بینی لەم خاڵەدا دژوارە. یەکێك لە هۆیەکانی ئەم دژوارییە ناڕوونیی واتای

32- W.Iser, lactde lecture, trans.e.sezneycer, bruxelles, 1985, p.47
33- schleirmacher, op.cit,pp.153-188

ژانره. چۆن دەتوانین پەی بەوەبەرین کە وەسفی دیمەنەکانی جەنگ لە رۆمانی **شەڕو ئاشتی** ی تۆلستۆی لە داستانەکانی کۆنی ئێسلاو یا لە **ئیلیاد** ی هۆمیرۆس ئاخێزاوە؟ ئایا دەتوانین بە وردی دیاری بکەین کە رۆمانی **دوکتۆر فاستۆس** ی تۆماس لاساییکردنەوەی ژانرێکی ئەدەبیی کۆنە کە باس لە پێشهاتەکانی ژیانی قددیسەکان دەکا یان نا؟ کرۆکی ئاخاوتە لێرەدایە کە هەر بەرهەمێك بە کۆماگێك لە ژانرەکان دەبەسترێتەوە و هەمبەرێتیە نێواندەقییەکان چەند قات ئالۆزترن لەوەی کە لە یەکەم نیگادا دێنەبەرچاو. لە لایەکی دیکەوە هەر بەرهەمێك، کەم تا زۆر نیشانەی شێوە نوسینێکی تاکەکەسی پێوە دیارە. ئەمە شێواز یا مێتۆدێکی دەربڕینە کە لە لێك هاوێرکردنی بەهەڵەدا ناچی، چونکە لە تەك بەرهەمێکی دیکە لەم دەربڕینەدا هاوبەش نیە و چەندقات لە رێساگەلی رەمزەکان بانترهەڵدەکشێ. مێتۆدی دەربڕین دیاریمەندیی لێ دەرباز نەهاتو و لە سڕان نەهاتوی* بەرهەمە.ئەم چەشنە لە توێژینەوەی ژانر نەك ئەوەی بوترێ بەکار نایەت، بەڵام هەموو مەسەلەکە نیە. لە جێیەکی دیکەدا شلایرماخێر لە سێ دیاریمەندیی بەرهەم- واتە پێکهاتە دۆزی، ئەندامەتی لە ژانردا و مێتۆدی دەربڕین- دوا. بەڵام دەبێ بە جەختەوە بڵێین کە تەنیا مێتۆدی دەربڕین- نڤیسیاری یا گوتاری- یە کە تایبەتمەندینوێنی بەرهەم ئەژمار دەکرێ و چارەنوسی دەقەکان لە ئاستی مێتۆدی دەربڕین دیاری دەکرێ، واتە رێ خۆش دەبێ تا( ئەو دەقانە) بزانرێن.

هۆسرێل لە بڕگەی ١٢٤ی **بیرۆکە رێخۆشکەرەکان بۆ دیاردەناسی** کە لە بارەی واتای" لوژیکی"ی شتەکانە، گوتویەتی کە" واتا" بەردەوام هەمان" گەیاندنی واتای شتێك"ە، بەڵام مەسەلەکە لێرەدایە کە ئێمە کەمتر لە تەك یەك شت بەرە و رووین، بە پێی لوژیکی ئاماژەی زمانی و بە پێی هەڵێنجانە زەینییەکان لە هەر شتێك، لەگەڵ" توێژگەلی" لێك ئالاوی واتاکان و گەڕاندنەوە گەلی(واتایی) فرەچەشن کە" تێك دەتەنرێن" بەرەو روو دەبین".[٣٤] ناتوانی دەق بە توێژاڵ توێژاڵ بناسیت، واتە پەیتا پەیتا توێژێك هەڵدەیتەوە تاکو توێژێکی دیکە ئاشکرا بێ. چونکە" سەرتوێژ" لە نێو "بن توێژ" تەنراوە و ئەم تان و پۆیەش ناکرێ لێك جیابکرێتەوە، مەگەر ئەمە کە هەمووی شڕو شیتاڵ بکەی. دەق لە کۆمەڵە قاڵییەك کە

* لە بەرامبەر گریزناپذیر و نازدودنی، هەر چەند گۆکردنی" دەرباز نەهاتو" و لە سڕان نەهاتو" قورسە، بەڵام وەرگێڕانەکەی دەقا و دەقە.

34- e Husserl, ides directrices pour une phenomenology, trans p.ricoeur, paris, 1985,pp.417-423



لە سەریەك هەڵچنرابن ناچێ، یا هاوشێوەی توێژە جیاجیاکانی زەوی نیە، بەڵکو هاوشێوەی کۆی ئۆرگانیکێکە و کە لەودا واتاکان بەیەکەوە دوراون و تێك تەنراون. دێرێدا گوتەنی:"هەر ئەمە ناچارمان دەکا کە میتافۆری زەویناسانەی تۆیژەکان لە مەڕ ئەو شتەی بەڕاستی وێنەگەریی" دەقی"(یا بە دەربڕینی دیکە دەستچنراو*) دەزانرێت، بەلاوە بنێین". [٣٥] ئەم دەستچنراوانە دەقەکانن. هەر بەو جۆرەی کە والتێر بنیامین لە وتاری" وێنەی پروست" کاری پنەلوپەی بە دروستکردنی دەق چواندبوو:" خالێ سەرەکی (بە لای پروستەوە)** نەك ئەو شتەی ئەزمونی کردوە، بەڵکو گەلاڵە و نەخشەی بیرەوەرییەکانی ئەوە، واتە کارێك وەکو کردەی پنەلوپە لە وەبیرهێنانەوەی بیرەوەری و رەنگە باشتر بێ کە بڵێم کردەی پنەلوپە لە یادبردنەوەی بیرەوەرییەکان"[٣٦] جێی سەرنجە کە لە هەر دەقێکدا خاڵگەلی ئاخێوئاسا(ئەگەر بتانەوێ دەتوانین بە "واتاکان" ناودێریان بکەین) لەگەڵ خاڵگەلێ کە هێشتا دەرنەبڕاون، خاڵگەلی دەرەکی (کۆمەڵایەتی، نێواندەقی، پێوەندیی نائاخاوتەیی) گرێ دەدرێن. لە سەر بنەمای بنچینەبەندیی دەق( باشقە زمانییەکان، ژانر و ...هتد) توێژە زمانی و نازمانییەکان تێکەڵ دەبن. لە ئاگایی بەرامبەر یا خوێنەر کەلەودا دەق دەبێتە" بەرهەم" تیشکێکی تازە بە سەر دەستچنراوی ئێمە، واتە دەق دەپڕژێت. پێکهاتەی بەرهەم، بەم جۆرە، تەنیا لە زەینی بەرامبەر(بیسەر- خوێنەر) ، یا وردتر بێژین لە راڤەی بەرامبەر دا دێتە زانین.

ئەم گۆڕینی دەق بۆ پێکهاتەی بەرهەم چ مەسەلەگەلێ دێنێتە پێشێ؟ هەر چەند نامەوێ دەق لە دەقی نڤیسیاری قەتیس بکەمەوە، بەڵام بە پێی باشقەی دەقی نڤیسیاری خاڵگەلی گرنگ رۆشن دەبنەوە. ئەو دەستە لە دەقەکان کە ئاخێوگەلی نڤیسیارین (و لەم روەوە لە جیاکاریی سۆسێری لە نێوان زمان بە واتای رەها یا سیستمی زمانی و گوتار یا بەکارهێنانی زمانی بە ئاستی پێکهاتەیی ئاخاوتن پەیوەستن بەردەوام بە مێتۆدێکی شیانی بەراورد لەگەڵ هەڵکشانی زمانی دەشێ تاوتوێ بکرێن، چونکە دەقەکان تەنیا کردەگەلی پەتی نین، بەڵکو بە شێوەیەکی توانامەند بەرهەمن، واتە دەشێ لە زەینی هەر بەرامبەر (بیسەر- خوێنەر) یکدا

* هەر شتێك بە دەست بچنرێ وەکو دەستەوانە و شتی لەم چەشنە.(و)

35- J.Derride,marges de philosophie, paris, 1972,p.191

** تێبینی لە نوسەرە

٣٦- و.بنیامین، **نشانەای بەرهایی**، ترجمەی ب. احمدی، تهران.١٣٦٦، ص٩٨.

راڤە بکرێن. هەتاکو لەگەڵ دەقدا سەروکارمان هەیە و نامانەوێ دەستوەردانی راڤەی بەرامبەر(بیسەر-خوێنەر) و توخمە دەرەکییەکان لە تاوتوێی خۆماندا بخەینەگەڕ، ئەم خاڵەش پەسند ناکەین کە ئەو توخمانە لە دەقدا تێك تەنراون. واتە هێشتا ئەم خاڵە ناخەینە روو کە چارەنوسی دەق گۆڕانیەتی بۆ بەرهەم، چارەنوسەکەی راڤەیە، لەبەر ئەم هۆیە پێك دێت تا فام بکرێت، لەم روەوە رەمزدانانی بۆ ئەنجام دەدرێ تا رۆژێك لە رۆژان رەمز ئاوەڵایی بکرێت و ئەوەش نەك تەنیا بەیەك شێوە و بە پێی تاقە رێسایەك. هەر چەند لە یەکەم نیگادا وا دێتەبەر چاو کە وەها هەڵێنجانێکی پێکهاتەگەرایانە لە دەقدا قەتیس دەمێنێتەوە و توانستی تێگەیشتن لە بەرهەم لە کیس دەدا، بەڵام هەر بەو شێوەیەی کە رێکۆر چەندین جار گوتویەتی بە بێ ئەوە، کاری تاوتوێی دەق و بە تایبەت ناسینی شێوەی گۆڕانی دەق بۆ بەرهەم نەلواو دەبێ. بناخەی مێتۆدۆلۆژیکی کار لە شیکاریی پێکهاتەگەرایانەی دەقەکاندا بوو کە بەرەبەرە لە جەرگەی کارو کردەوەی زمانناسیی مێژویی و شیکاریی رێزمانی زمانەکان سەری هەڵدا و لە هەمووش زیاتر لە هزرەکانی سۆسێر، فۆرمالیستە روسییەکان و ئۆستورەناسیی پێکهاتەیی کلۆدلیۆشتراوس پەروەردە کرا و تا سەردەمێکی نزیك لە رۆژگاری ئێمە درێژەی کێشا و هەڵبەت لە چەندین روەوە گۆڕدرا و لە توێژینەوەکانی ئیمیل بنۆنیست، ئا.ژولین گێرماس، کلۆدبیرمۆن لە یەکەمین کارەکانی رۆلان بارت، ژولیا کریستوا، تزڤیتان تۆدۆرۆڤ و ئۆمبیرتۆئێکۆ رووی لە کامڵبوون نا. یەکەمین بنەواشەی لۆژیکیی ئەم تیۆرییە خوازیاری بەرینبوونەوەی مێتۆدی پێکهاتەگەرایانەیە، کە لە هەنگاوی یەکەمدا بەستراوەتەوە کە دەنگناسیو واتاناسی زمانی لە"یەکەکانی بچوکی زمان"(تاك بڕگەکان، فۆنیمەکانو سینتاکسەکان) و نەك رستەکان یا ئاخێو. وەلێ لە هەنگاوەکانی دواتردا بە هەودای وەك دەوترێ "یەکە گەورەگان"(رستەکان، دەربڕینە راڤەییەکان کە بە پێی نیاز راڤە کراون) دەگا.[٣٧] دەبێ بوترێ کە کتومت لەم هەنگاوانەی دواتردا واتە لە گۆڕاندنو گۆڕانکاریدایە کە کەموکووڕیی شیکاریی پێکهاتەیی ئاشکرا کراوە. باس لە راڤە پێویستیی بە تیۆرییەکی پتەو و هەمەکییە، تیۆرییەك کە گەیشتن پێی یا باشتر بڵێم گەیشتن بە چەشنەکانی بابەتی هێرمێنۆتیك بووە و هێشتاش هەیە.

[٣٧] R. Barthes, "Introduction a l'analyse structurale des Técits", in: op. cit, vol2, p.75.



دەبێ قبووڵ بکەین کە تێك تەنران، یا بە شێوەیەکی سیستماتیكو شێوەدار رۆنان و دانان ئیدی دەسەری پاوانکراوی زمان نیە، بەڵکو تایبەتمەندینوێنی هەمو کۆماگێکی واتاکانو ئاماژەکان لە قۆناخە بەرزترەکانی وەکو پێڕستبەندیی دانایی، ئوستورە، ئایدیۆلۆژی، ژانر و... هتدیەو بۆ شیکردنەوەشی هەروەك کە فۆکۆ نیشانی داوە پێویستمان بە تیۆرییەك لەمەڕ ئاخێو و نەك تەنیا تیۆرییەکی زمانی. ئەگەر سادەگەرایانە وەها گریمان بکەین کە "توخمگەلی زمانی"ی هەر دەقێك بە شێوەیەکی سیستماتیك بە یەکەوە گرێ دەدرێنو چەند کۆماگێکی ئاماژە ئاسای لێکجیا دەخولقێننو لێرەوە جۆرە هاوڕاییەك پێ دەگرێ (کە"هاوشێوەی شتێکە کە دانەر مەبەستی بووە") دەتوانین بەرۆکی خۆمان بەردەینو رابگەیەنین کە پێویستمان بە هێرمێنۆتیك نیە. بەڵام ئەم گریمانە هەڵەیە. هەر کە بمانەوێ ئەو کۆماگانە وەسف بکەین، "توخمگەلی زمانی"ی (کۆماگەکانی پێشو) دەبێ بە ئاشکرا جیاواز لە توخمە زمانییەکانی کۆماگێکی دیکە دەرکەون، لە بەر ئەم هۆ سادەیە کە لەگەڵ توخمە نازمانییەکانی خودی دەق تەنراون. کاری پێکهاتەگەرای ئۆرتۆدۆکس ئەمەیە کە تەنیا تاوتوێی ئەو شتە بکا کە دەیبینێ، ئەم کارە لانیکەم پاش فرۆید، نیچەو مارکس چەوتە و بە چەوت لە قەڵەم دەدرێ. نەست، واتای شاراوە، ژێرخان، ویستی شاراوەی هێز، بە کورتی هەر شتانێك کە ناکەونە بەرچاو، پەیتاپەیتا پێ دەگرن و چەوت دەبێ ئەگەر پشتگوێیان بخەین، یا لە مەیدانی تاوتوێ وەدەریان بنێین، یاخۆ بە ساکارییەوە رابگەیەنین کە لە هیرارکیی دیکەو لە ئاستی پێکهاتە یا بنچینەیەکی دیکەدا هەن. لە بیرمان نەچێ کە ئەم دیتەیەی ئێمە کە بەرپلارانیش دەکەوێ، بە هەر حاڵ لە "پێکهاتەی بڕگەیەکی نڤیسیاری" قەتیسە، کە بە تێکۆشانی کریستیەن مێتز لە یەکەمین بەرهەمەکانیدا گوازرایەوە بۆ قەڵەمڕەوی وێنەو بەرەنجامگەلی تیۆریکشی بەهەر حاڵ بەر تەسك و پڕکەمو کووڕی بوو.

دەق هەواڵی لیڵی و تەمتومانی کەتوارمان بۆ دێنێ و نیشان دەدا کە چۆن راڤە بکەین. راڤە لێبڕاو و بنەتایی نیەو وەها خۆدەنوێنێ کە کەتوار لە خزمەتیدایە. راڤە بە دەگمەن دەتوانێ لە چنگ لیڵی رابکاتو هەر ئەمەش خدەیەکی ناسەقامگیر و خەیاڵی پێ دەبەخشێ و بەردەوام وادەنوێنێ کە لە مەترسیی هەڵە، لە رادەبەدەربایەخدان و گۆترەبێژی یە. وەك بڵێی دەق جگە لەمە رێگەیەکی دیکەی نیە تاکو بە ئێمە ئەگەری قووڵبوونەوە لەبارەی نیشانە ببەخشێ. ئەمڕۆکە، زۆر کەس دەڵێن کە کەتوار تەنیا کۆماگێك لە نیشانەکانەو تەنیا رەخسانی زانیارییەکی راڤەیی بە ئێمە دەبەخشێ، هەرگیز بەرهەست نیەو ناتوانێ

بەرهەڤکەری ئەرخەیانی بێ. ئایا وەها گوتەیەك جگە لە دانپیانان بە راستودروستیی بڕیارەکەی نیچەیە کە (بریتی بوو لەوەی) کە ئێمە تەنیا لە تەك راڤەکان بەرەوڕووین‌و جیهان‌و کەتوارەکان شتێك نین جگە لە راڤەگەلێ کە لە راڤەکانی دیکەوە دێنە ئاراوە؟ هەر تاك روخساریك، لە بەرینترین واتای ئەم زاراوەیە، کە هەڵبەت رەگاژۆی لە شێوەکاریدایە، بەڵام وێنەیەك لە رومانێکیش دەگرێتەوە، تەنیا قۆناخێکی راڤەیە کە لە نیشانە لێڵ و ناڕوونەکان پێك هاتووەو لەوەش گرنگتر ئەمەیە کە لە بارەی ئەم نیشانانەیە، واتە رێگەیەك بۆ درك پێکردنی (واتە راڤە) ئەم نیشانانە پەیدا دەکا. هەر تاك روخسارێك دەستبژێرێکە لە نێوان واتاگەلی زۆر و زەوەند کە هەر مرۆڤێك ناچارە بیانداتە پاڵ دیاردەکانی ئەم جیهانە.

هەروەك تا ئێرە دیتمان، چەمکی راڤە نیشان دەدا کە ئێمە لە بارودۆخێکی لێڵ‌و نادیار داین. راڤە ناتوانێ لێبڕاو بێ، ناتوانێ سەلماندنی لێبڕاوێتی خۆی‌و یا شتێك بێ. ئەفراندنی یەك تاك روخسار، راڤەکردنە، بەکارهێنانی نیشانەگەلی لێڵە لەمەڕ شتێك کە مۆڵەت نادا تا بە تەواوی تیشکی بخەینە سەر. ئەم لێڵی، توانج بێژی و دڕدۆنگییە، سروشت‌و پێگەی تایبەتی شتەکانە. لە بەر ئەم هۆیە ناکرێ بە سانایی نیشانی بدەین یا باسی لێوە بکەین، بەڵکو دەبێ بەرەوپیری مەترسیی راڤە بچین. بەم چەشنە مەترسیی راڤە زادەی خووخدەی مەتەڵئاسای ژیانە. ئەگەر لە نەبوونی ئەم خووخدە مەتەڵییە، هەمووشتێك چارەسەر و ئاشکرا و لەبەرەنجامدا هاوسان و دووپاتە، وەڕسکەر و لێگەڕێن بڵێم قێزەون بوایە، شتێك بۆ ناسین لە گۆڕێدا نەدەبوو، مرۆڤەکان لە بەر ئەوەی پەناکار* نەدەبوون لە ئەنجامدا تاقەت پڕوکێنیش دەبوون. ئاندرەمالرۆ جارێکیان گوتبووی کە مرۆڤ لە بنەڕەت را ئەو شتەیە کە دەیشارێتەوە. بۆ ساتێك لە جوانیی(ئێدت) و (ژیلبێرت) لە رۆمانی (مارسێل) پروست تێهزرن. ئەگەر بۆنێکی لێڵ‌و پڕتەمتومانیان نەبایە، چ کەڵکیان دەما؟ لێڵی، رازئاوێتەیی، توانج بێژی هاوڕێیانی هەمیشەیی دەربڕینی تەنزئاسا‌و خشتەبەر** و یارانی گیانی بە گیانیی دەربڕینی تەوساوین. لەوەش گرنگتر، نێواخنێکی فریودەریان هەیە کە لە یەك واتادا دروستکەری ئێرۆتیزم‌و چێژە. لەمبارەوە پەرتوکی **چێژی دەق ی** بارت رۆشنگەرە، یا کتێبی ژیل دێلۆز (بە ناوی) **پروست‌و نیشانەکان** کە لەودا لە چەشنەکانی "لێڵیی پروستی" دەدوێ و دەڵێ کە

* ئەو کەسەی لە پەنادا کاردەکا / پنهان کار. ف.

** سخرەگر/ف.



جیهانی نیشانەکان دنیای لێڵییەکانە کە پێویستیی خولێکی فێربوونی راڤە دەسەپێنێ:"لە کۆتایی پەیجۆردا، راڤەکار تێدەگا کە چ شتێك لە دەستی دەرچووە..."(٣٨)

هەر راڤەیەك ئێمە دێنێتە نێو پانتایی فرەفاقێتی‌یەوە. بارت گوتویەتی: "ڕاڤەی دەقێك، بە واتای بەخشینی واتاگەلێ (کەم تا زۆر پاساودار، یا زۆر و کەم ئازاد) نیە. بەڵکو، کارکردن‌و فێربوونی ئەم خاڵەیە کە چەند فاقی لە چ شتانێك پێك هاتووە".(٣٩) راڤە لەبەرگرەوە و خوازیاری نەبوونی دیاریکاریی رەمزەکانە. دەبینین کە تەنانەت ئەو پەناکاریەش خۆی لە پەنا دەخا و پەیتاپەیتا لە ئێمەدا بەم خەیاڵەوە، تەشەنە بەم بەدحالیبوون‌و هەڵێنجانە لووتبەرزانەیە دەدا کە (گوایە) دەستمان بە واتا راگەیشتوە. ئێمە پەیتاپەیتا تێدەکۆشین تاکوو لە بیر خۆمان بەرینەوە کە پەناکاری‌و هەم فرە واتایی بەرەوڕوومانن و کاری ئێمە دژوار دەکەن. پێکهاتەگەرایی باشترین دەربڕینی ئەم فەرامۆشییەیە. هێرمێنۆتیك بە پێچەوانەوە رازەکە دێنێتە ئاراوە و لەگەڵ ئەوەشدا لە زانست باوەڕی و مێتۆدە چەقبەستو و پۆزەتیڤیستییەکان رزگار دەبێ و بانگەشەی ناسین دەخاتە جێی هەودای ناکۆتای راڤەکان.

ناتوانی دەق بە جیهانێکی داخراوە و لە خۆوە لەقەڵەم بدەیت، شتێکی تەواوکەر کە ئێستە دەبێ رەمزئاوەلایی بکرێت. دەق سەرەڕای فۆرمی سەقامگرتوی مەتریالیی خۆی، دەسکەلایەکی نابەرپرسیار نیە کە نەتوانێ وڵامی هیچ شتێك بداتەوە و نەتوانێ شتێك بپرسێ. راستە کە دەق دەبێتە گوێڕایەڵی راڤە، بەڵام هەر لەبەر ئەم هۆیە وەکو بوونەوەرێکی زیندو کار دەکا. خوێندنەوەی دەق واتە بردنەپێشی چەمك، سەرەڕای خۆی و سەرەڕای نیازی دانەرەکەی. ئەفلاتون لە **فایدروس** دا دەقی بە منداڵێکی هەتیو چواندوە کە باوکی ئیدی ناتوانێ یاریدەی بدا، چونکە نائامادەیە.(٤٠) راستە کە دەق باوکی نیە، بەڵام دەبێ بۆ پێشەوە بچین و بە شێوەیەکی فرۆیدی بێژین دەق باوکی خۆی کوشتوە. دانەر دەمرێ و دەق بەڕاڤە بەردەوام تازە دەبێتەوە. تازەیی دەق و زەینی راڤەگەر وەبەر هاتوی یاسای بنچینەیی فرە واتایی یە، کە هیچکەس رێگە چارە و رێی هەڵاتنی نیە. فرە فاقێتی بە شێوەیەکی ناچارانە لە گۆڕێدایە و رەمزەکان نادیاریکارن و هەر راڤەیەك شتێك لە بەستێن دەڵێ، واتە لە دەرەوەی دەق و واتایەك بۆ دەق گریمان دەکا و خۆی دەبێتە یەکێك لە واتاکان.

38- G.Deleuze, Proust et les signes, paris, 1979.p.36-51.
39- R.Barthes, S/Z, Paris, 1976,PP.11-12

٤٠- افلاطون دوره **اثار**، پیشین، ج٣، صص ١٣٥٠-١٣٥٥

فره فاقێتیی* ڕاڤە، دەستەبەری تەناهیی وەبارهێنانی دەق و دەوڵەمەندیی(مەعنەوی)ەتی و لە دژی بیچمگەلێ کە دەق تاك کەوتو، بەرتەسك، نەزۆك، بێگیان و لە قالبدراو دەکەن، دەجەنگێ. ئەم فرەفاقێتی(PLURALITY) یە، دەق دەکاتە مێژویی و کاتمەند و ئیدی دەق ناتوانێ خۆی بە شێوەیەکی ڕاشکاو و لێبڕاوانە لە ڕاڤەی خۆی جیابکاتەوە. فرەیی(pluralism) بە واتای بەرەو زانین و پەسندکردنی فرەچەشنی و جیاوازی، لە دەق کەش و هەوایەکی دیمۆکراتیك و پێوەندییەك دەڕەخسێنێ کە لەودا بەرەوڕووبوونەوەکان ڕوو دەدەن. دەق لە لایەکەوە دەبێتە هاوشێوەی سەکۆی گفتوگۆیەکی دیمۆکراتیك لە نێوان ڕاڤەکان و لە لایەکی دیکەوە لە گۆڕەپانی جەنگ دەچێ، جەنگێك لە نێوان پێشگریمانەکان، پێشداوەرییەکان، پێش- فامەکان و باوەڕەکان. ڕاڤە بە وەلانانی باڵادەستییە چەقبەستوەکان کە عەودالی سەپاندنی واتایەکی بنەتایی، خودباوەڕ و لێبڕاوانە( کە بە زۆری ڕاستەقینە" لە قەڵەم دەدرێت) بە سەر دەق دان، ڕۆژنەکان ئاوەڵا دەکا، هەوای تازە دێنێ. فرەچەشنیی ڕاڤەکان ڕشخەنگایەکە بە ڕاڤەیەك کە ڕادەگەیەنێ: من هەمان هەقیقەتم.

لە بەر ئەوەی کە دەق شتێکە کە دەبێ" بخوێنرێتەوە"، وەربگیرێ و فام بکرێ، ناتوانێ لە شێوەی وەرگرتنی خۆی لە لایەن خوێنەر یا ڕاڤەگەرەوە جیا بێت. دەقێك کە هێشتا ڕاڤە نەکرا بێ، دەقێکی مردووە، وەلێ دەبێ بپرسین کام ڕاڤە زیندوکەرەوەی دەقە؟ نیچە هەندێ جار لە "ڕاڤەی زێدەڕۆیانە" دەدوا و دەتوانین هاوشێوەکەی لە زاراوەی یونانیی "Ephexis" کە تا ڕادەیەك بە واتای "دڕدۆنگی لە داوەری" یە، پەیدا بکەین.[٤١] ئەم دڕدۆنگییە لە فەلسەفە" هونەری باش خوێندنەوە" دروست دەکا.

جارێکیان نیچە وەها لەم هونەرە دوابوو: توانایی ئەمە کە "نیوکاژێر لەبارەی شەش دێڕ تێهزرین".[٤٢] ئەم وردبوونەوەیە ترسان لە ڕاڤەی زێدەڕۆیانەیە. پەیتا پەیتا هەوڵ دەدەین تا ڕاڤەی خۆمان تاقی بکەینەوە. بەڵام پێوەری ئەم تاقیکارییە کامەیە؟ هیچ گومانم نیە لە پاش

* لە زمانی کوردیدا وشەی" دوفاقی" بە واتای دووڕوویی و درۆزنیش دێت ئەمە لە کاتێکدا کە بەدەر لە " باری ڕەوشتیی" وشەکە واتای فرە لایەنی و فرە ئاقاری دەگەیەنێ، وشەی "فرە فاقێتی" لەو وشەوە داڕێژراوە.(و)

41- F.nietzsche,antichrist, trans.r.g.hollingdale, London, 2971,pp,169-170
42- f.blondel,"inter preting texts with and without Nietzsche, in. g.i.ormiston and a.d.schrift eds, trans forming  the hermen eutic context, trans .g.l.ormistan, state university of new York press, 1990, p.78



نیوکارێژ تێهزرین لە شەش دێڕ واتای بنەتایی ئەو دێڕانەمان لا ئاشکرا دەبێ، بەڵام دڵنیام کە نیوکارێژ لە ژیانمان بە فیڕۆ نەچووە. ئێمە هیچ پێوەرێکمان لە بەردەستدا نیە کە بڵێین دەق دەتوانێ لە دەرەوەی ڕاڤەگەلی چەند لایەنەی خۆی جێ بگریت. هەر ڕاڤەیەك دەتوانێ دروست، بێ سەروبەرە، دادپەروەرانە، ستەمکارانە، زبروتوخس، یا ناکامڵ بێت، وەلێ بەردەوام بایەخ بە دەق بدات. نیچە خوێنەری سەرەمرەی کتێبی پیرۆز، دەڵێ کە ئەمە دەتوانێ جۆرێك کەڵکئاوەژو(missbrauch) بێ کە دەق و ڕاڤە بە هەڵە بە یەك شت بزانین، بەڵام چ بکەین کە مەترسی نەك لە چەند فاقیبوونی دەق، بەڵکو لە قەتیس کردنەوەیەتی؟ قەتیس کردنەوە واتە نەزۆك کردنی دەق، بەخشینی تاقانەییەکی چەقبەستو و بەرجەوەنێکی ئێجگار تەسك و داخراو بە دەق. ڕەنگە ڕاڤە لە دەق بچێتە دەرێ و وازی لێ بێنێ، پشتی تێبکات، بەڵام سەرەنجام خۆی دەهاوێتە نێو دەقەوە، واتە دێتە نێو جۆرە کایەیەکی نێوەکیی دەقەوە. هەر ڕاڤەیەك بەردەوام ئەگەری پووچەڵبوونەوەی هەیە و متمانەکەی کاتی و مەرجدارە. لەم ڕووەوە هیچ سود و قازانجێکی نیە کە بەردەوام لە مەترسییەکانی ڕاڤەی زێدەڕۆیانە ڕاڤەگەلی پاشکۆیی کە پشت لە دەق دەکەن، بدوێین.

## (٧)

لە چەند دەیەی ڕابردودا، ئاوەزیانی هێرمێنۆتیکی زیاتر لە جەرگەی دوو ئاخێوی فەلسەفی و هونەری بیچمی گرتوە. هەڵبەت یارانی هێرمێنۆتیك، باسیان لە بوارەکانی یەزدانناسی، ڕەوشت، تیۆریی کۆمەڵایەتی و سیاسی، کۆمەڵناسی، پێوەندیناسی و فەلسەفەی زانست(یش) کردوە، بەڵام وا دێتە بەرچاو کە ئەگەر نەك تێکڕای ئەوانەی ناویان هات، بەڵکو بەشی زۆریان لە سایەی ئاخێوی هێرمێنۆتیك هاتوونەتە ئاراوە. تەنانەت جیانی ڤاتیمۆ کە بە ڕاشکاوی هێرمێنۆتیکی بە " ئاخێوی زاڵ"یا زمانی کوئینی سەردەمی ئێمە ناودێر کردوە، بەناچار ئەم خاڵەشی پەسند کردوە کە هێشتادەتوانرێ مەودایەك لە نێوان هێرمێنۆتیك و ئاخێوی زانستی پەیدابکەیت.[٤٣] هۆی ئەم خاڵە دووریی بەرەبەرە بەڵام لێبڕاوانەی هێرمێنۆتیك لە ئایدیالێکە کە وەکو میراتێك لە سەردەمی پۆزەتیڤیزم ماوەتەوە و بە " زانست باوەڕی" یا " ئایینی پەرەستنی زانست" ناودێری دەکەین. یەکێك لە لایەنە

43-  G.Vatimo, Ethique de I interpretation, trans.J.rolland , paris, 1991, p45.

سەرەکییەکانی ئەم ئایدیالە، گەیشتن بە مکوڕیی دەربڕین لە ڕێگەی باشقە تاك واتاییەکان لە ئاخێوی زانستی و هەوڵدان بۆ سڕینەوەی "خلّتە واتاناسانەکان" بوو. ئارمانجی ئاخێوی زانستی گەیشتن بە ڕێساگەلی نیشانەناسانە بوو کە تەنیا واتای ڕاشکاو، لە سەر بنەمای ڕێککەوتنێکی پەسندکراو، بخاتە ڕوو، ئیدی جێیەك بۆ واتاکان و ئاماژە پەنانەکییەکان نەهێڵێتەوە. لەم دیدەوە ئاخێوی زانستی(نەك لە کەتوار و هەنوکەیی، بەڵکو لە ئاستی ئایدیالی) کت ومت خاڵی بەرانبەر و پێچەوانەی ئاخێوی شاعیرانە و هونەری دەبێت. هەر چەند ژمارەیەك لە هونەرمەندان، هەندێ جار هەوڵیان دا تا لە ئاخێوی تاك واتایی نزیك ببنەوە، بەڵام وەکو ڕێسایەکی هەمەکی دەتوانین بێژین کە ئاخێوی هونەری پشت ئەستورە بە لێڵی و تەمتومانی واتاناسانە. لە لایەکی دیکەوە هەروەك کانگیم، کوهێن، فیرابێند، فۆکۆ و ژمارەیەك لە بیرمەندانی ئەمڕۆیی مێژوی زانست نیشانیان دا" تاك واتایی" لە قەڵەمڕەوی ئاخێوی زانستیش جگە ئایدیال و خەیاڵ شتێکی دی نیە. زاناکان لە دەربڕینی ئەزمون و دۆزینەوە زانستییەکانی خۆیان ناچارن سود لە زمان وەربگرن و سەرەنجام (چ بیانەوێ یان نا، چ بزانن یا نەزانن) لە کۆتی خوازەکانی دەربڕین و ڕێساکانی تیۆریی دەربڕین دەمێننەوە و هەرگیز ئارەزویان لە دەستڕاگەیشتن بە دەربڕینێکی ورد و کامڵ کە یەکسەر یەکانگیر بێ لەگەڵ دیاردەگەلی بەرهەست و هەبوو، نایەتەدی.

سەرنج لە شێوەی نووسینی یەکێك لە سەرترین نموونەکانی ئاخێوی زانستی بدەین: **گوتارێك لە بارەی دوو سیستم** لە نووسینی گالیلۆ. لەم پەرتوکەشدا زانای بیرکاریزان و ئەستێرەناسی سەدەی شانزدەهەم تێدەکۆشا تا دەربڕینی زانستی بە ڕێسا لێبڕاوەکان تەیار بکات. ئەو دەیهەویست وەها بنوێنێت کە تا دواین ئاستی لواو لە ڕەوانبێژی و خوازەکانی دەربڕین دوور بکەوێتەوە و لە زمانی لێبڕاوانەی نیشانە ماتماتیکیەکان نزیك بکەوێتەوە. گالیلۆ هەوڵی دا تا ئەم باوەڕە کە تا داتاگەلی ئەزمونی لە کێش و ڕەنگ و بۆن و ... هتد جگە" جیاکاریگەلێ لە چەندایەتی"نین، لە شێوەی نووسینی خۆیشیدا ڕەچاو بکا. بناخەی باوەڕی ئەو کە دەکرێ هەمو شتێك لە دەربڕینێکی ماتماتیکی قەتیس بکەیتەوە، ڕێنوێنی نووسینی ئەو بوو. ئێدمۆند هۆسرێل لە دواین و گرنگترین کاری فەلسەفیی خۆی واتە **قەیرانی زانستەئەوروپاییەکان و دیاردەناسیی بەرین** پلاری لەم "هەڵێنجانی سەر سوڕهێنەر"ی گالیلۆ گرت و ڕەخنەی لە هەوڵی ناوبراو لە ماتماتیکی دیتن و ماتماتیکی کردنی دیاردە سروشتییەکان گرت و (هۆسرێل) بەرەنجامی ئەم کارەشی کردە بنچینەی ڕەخنەکاریی خۆی لە ئاوەز باوەڕیی



مودێڕن. ئەو بە دروستی جەختی کرد کە ناتوانی هەموو شتێکی ژین- جیهان بۆ جیاکارییە هەمەکییەکان دابەزێنێ.(٤٤) ئارمانجی نووسەری زانستە سروشتی و فیزیکییەکان کە بتوانێ شتێك بە شێوەیەکی تەواو" یەکانگیر لە تەك کەتوار" دەربڕێ و مەودای شتەکان و وشەکان نەهێڵێت، هەرچەند تێك ڕماوە، بەڵام دەرخەری خاڵێکی گرنگە: ئاراستەدان بە ئەزمونە زانستییەکان بە درێژایی سەدەکان. نابێ بەم گریمانە کە تەنیا ئارمانج و ئارەزوو بوو و لە ئاکامدا گرنگییەکی ئەوتۆی نەبوو و کاریگەری لە سەر شتێك دانەنا، فەراموش بکەین کە چەندین سەدەی دوور و درێژ دەربڕینی ئەزمونگەلی زانستی لە سەر بناخەی ئەم" ئارمانج"ە ئاراستەمەند بوو و وتارنامە و پەرتوکگەلی زانستی نووسران. ڕمانەکەی شتێکی ئەوتۆ لە گرنگیی ئەو هەوڵانە و باندۆرێك کە لەسەر فراژووبوونی بیری زانستی و ڕێچکەی فەرهەنگی داینا، کەم ناکاتەوە.

ئاخێوی زانستی هەرچەند بەناچار مل بۆ لێڵی و تەمتومانی دەربڕین دادەنەوێنێ، بەڵام بە پێی هەمان ئایدیالی کۆن تێدەکۆشێ تا ڕوبەری خاڵگەلی لێڵ و پڕ تەمتومان کەم بکاتەوە. ئەم تێکۆشانە بۆ کەمکردنەوەی خاڵگەلی لێڵ و نارِوون، دژایەتی هەیە لەگەڵ تێکۆشانی ئاخێوی هونەری کە لق‌و پۆپ بە لێڵی‌و تەمتومان دەدا. لەنێوان ئەم دوو تێکۆشانە دژیەکە، هەوڵی فەیلەسوفان هەیە کە هەندێجار لە ئایدیالی ئاخێوی زانستی نزیك دەبنەوەو بڕێك جاریش لە ئەفراندنی تەمتومانی هونەری. لە یەکەمیاندا خاڵێك کە بە خێرایی وەبەرچاو دەکەوێ، شەیدایی فەیلەسوفان واتە "هۆگرانی زانین" لە هەمبەر زانستە. ژمارەیەك لە سەرناسترین فەیلەسوفان پەسنکەری هەوڵی زانایان بۆ گەیشتن بە زۆلاڵیی دەربڕین بوونە. ئەفلاتون لە کۆتایی کتێبی **کۆمار** دا پێناسەی فەیلەسوفی بە چەمکی هەقیقەت گرێ داوە:"ئەو گرۆیەی کە تەنیا هۆگری ئەو شتەن کە بوونیان ڕاستەقینەیە دەبێ بە فەیلەسوف، واتە هۆگری زانین ناودێر بکرێن، نەك هاوڕێی خەیاڵپلاو...".(٤٥) ئەو لە ڕوونکردنەوەی ئەم زۆلاڵییە هەوڵی دا تا شوێنگەی زمانی ماتماتیکی تێبگاو لە زاری ئێدئمانتۆس لە کۆتایی

44- E.H.USSERL, La crise des sciences suropeenes et la phenomenology tr anscendentale , trans. G.Granel pari s, 1989, p.41.

٤٥- افلاطون، پیشین، صص ١٠٨٤ـ ١٠٨٥.

کتێبی شەشەمی **کۆماردا** ئامانجی خۆی بەم چەشنە وەسف کرد:"(تۆ)* ویستت لە نێوان فەلسەفەو ماتماتیك سنورێك ئاشکرا بکەیتو نیشان بدەیت کە لە جیهانی ناسینەوەکاندا، پاژێك کە تەنیا بە یارمەتیی دیالکتیك دەشێ لێی تێبگەیت چەند قات بێخەوشتر و رۆشنتر لە پاژێکە کە لە ڕێگەی زانیارییە باو و ناسراوەکان دەتوانی بیناسیت، چونکە تێکڕای ئەو زانینو زانیارییانە،گریمانکراوە نەسەلمێنراوەکان بە بنەواشەگەلی سەلمێنراو لە قەڵەم دەدەن. گەرچی ئەو زانیارییانەش توێژینەوە لە ڕێگەی تێفکرین ئەنجام دەدەنو نەك لە ڕێگەی هەستو ئەزموون، وەلێ چونکە کۆڵەکەی کاری خۆیان لەسەر گریمانکراوەکان دەچەقێنن، تا "بنەواشەی بەرایی" پێشڤە ناچن، لەم روەوە لەو باوەڕەدای کە ناتوانن لە بارەی بابەتەکانی خۆیان ناسینەوەی ئاوەزمەندانە وەدەست بێنن"[٤٦]. لە بەر ئەم هۆیە بوو کە ئەفلاتون چالاکیی کەسانێك کە سەروکاریان لەگەڵ بیرکاریدا هەیە، بە ناسینەوە بە یارمەتیی بەڵگەهێنانەوە ناودێر کردو نەك ناسینەوە بە یارمەتیی ئاوەز؟ زمانی بیرکاری لە پلەوپایەی "ناسینەوە لە ڕێگەی بەڵگە هێنانەوە"، ئاستێکی نێوەنجییە لە نێوان خەیاڵکرد و ناسینەوەی ئاوەزمەندانە. لە نیگای فەیلەسوفانی دیکەوە، لە قۆناخەکانی دیکەی ئاخێوی فەلسەفی، ئەم مەودای بیرکاری لەگەڵ "زمانی ئاوەز" نەکەوتە بەرچاوانو بیرکاری وەکو باشقەی زمانی فەلسەفەی مودێرن هاتە گۆڕێ. گالیلۆ "هەر شتێك کە ناوی هەبوونی راستەقینەیە"(بە) ژمارەکان، ئەندازەکانو بەڵگەگەلی ماتماتیکی زانیو ئەو شتانەی لەم ڕێسایەدا نەگونجان، بە "خەیاڵکردگەلێ کە سەر لە هەزار قوژبن دەردێنن"[٤٧] ناودێر کرد. دیکارت لە سەر بناخەی ئەم باوەڕەی گالیلۆ لە پێشکەشکردنی **نامەی رامانەکان لە فەلسەفەی بەرایی** بە ئەنجومەنی مامۆستایانی سۆربۆن، نووسی کە بەڵگەگەلێ کە لەم بەرهەمەیدا بە کاری هێناون لە رووی مکوڕی و لێبڕاوێتی و ئاشکرابوون تەنیا لەگەڵ بەڵگەگەلی ماتماتیکی شیانی بەراوردە، هەر چەند لەوە دەترسێ کە بەپێچەوانەی بەڵگەگەلی ماتماتیکی، هەموان سەریان لێی دەرنەچێ.[٤٨] ئەو لە کورتەیەك لە بابەتەکانی کتێبەکەشیدا نووسی لەبەر ئەوەی کە نایەوێ شتێك بنووسێ کە هۆیەکی لێبڕاوانەی بۆ (ئەو نووسینە) نەبێ، ڕێگەیەکی گرتۆتەبەر چەشنی ڕێگەیەك کە هەندەسەزانان دەیگرنەبەر، واتە بەر لە بەرەنجامگیری لە هەر دۆزێك (قضیە)

* تێبینی لە نووسەرە.

47- Galilee, Lessayeur, trans. C. chauvier, paris, 1980,E232.
48- R.Dascartes, oeuves et letters , ed.A.Bridoux, paris, 1970,pp.259-260



خۆیان دەروەست زانیوە کە تێکڕای بنەماکانی ئەو دۆزە روون بکەنەوە.[٤٩] لە نێو بەرهەمە فەلسەفییەکاندا پەیجوری باشقەی دەربڕین لە لۆژیکی ماتماتیکی زۆر نموونەی هەن. هێندە بەسە لەمبارەوە دوو شاکاری فەلسەفی بخەینەوە یاد کە هەر کامیان نەك تەنیا لە شێوەی بەڵگەهێنانەوە و شێوەی هێنانەگۆڕی بەڵگەکان، بەڵکو لە دەستەبژێرکردنی شێوازی نووسینیش پشت ئەستور بە لوژیکی ماتماتیکن: **رەوشتی ئێسپینۆزا**، و **تێزی لۆژیکی-فەلسەفی ی** (لودڤیك) ڤیتگنشتاین.

ئەم سەرنجدانە لە سەرچەشنی (archetype) زانستی و بە تایبەتی ماتماتیکی، هەڵبەت تاقانە بیچم یا بەریانی بالآدەست لە شێوەی دەربڕینی بابەتە فەلسەفییەکان نیە. فەیلەسوفان لە گەلآڵەی خالگەلی جێی مەبەستی خۆیان، زۆر جاران، لە جەمسەری دیکە، واتە لە سەرچەشنی ئاخێوی هونەری نزیك بوونەتەوە. مێژوی فەلسەفە لێوڕێژە لەو نمونانەی کە سەرنجی فەیلەسوفان لە شێوازی دەربڕینی ئەدەبی و پەسنی ئەوان لە نووسەران و شاعیران نیشان دەدا. فەیلەسوفان بەردەوام لە گێڕانەوەگەری، نموونەهێنانەوە، پوختەبێژی و روونکردنەوەگەلێ کە بە یارمەتیی بەکارهێنانی خوازەکانی دەربڕین رایەڵ دەبن، لە کاری ئەوان وەکو باشقەی نووسینی فەلسەفی سەرنجیان داوە. لە بەرەنجامدا، ژمارەی نووسینە فەلسەفییەکان کە خودان بایەخو برەو ومتمانەی ئەدەبی دەبن، کەم نین و پەسندو دڵکێشبوونی زۆر لە شاکارەکانی فەیلەسوفان منەتباری ئەم خاڵە بووە. **خوان** ی ئەفلاتون نموونەیەکی بڵیندە. ئەم بەرهەمە بە هەمان بارتەقا کە دەقێکی فەلسەفیی درەوشاوە و تاقانەیە، بە نووسینێکی ئەدەبی بێهاوتاش ئەژمار دەکرێ. **خوان** لە دیدی هونەری نوسەری، تکنیکی رازاندنەوەی دیمەن و وردبوونەوە لە وردەکارییەکانی گێڕانەوەیی و تەکوزمەندیی شانۆیی نموونەیە، هەروەها بۆ ئەو کەسەی کە لێڵیو تەمتومانی واتاییو هەرەپێویستێتی دەربڕینی خالگەلی فرە واتایی بە لایەوە گرنگ بێ، نموونەیەکی بڵیندە. لێرەدا ئەفلاتون لەو وردبوونەوە ماتماتیکییەی کە نزیکایەتی دەقی فەلسەفی لە نووسینگەلی زانستی لێ دەکەوێتەوە دوور کەوتۆتەوە و بە ئاشکرا لە زۆر لاوە جڵەوی ئاخاوتەی بە دەستی بالآدەستی زمان سپاردوە و بێ تێڕامان لەگەڵ لۆژیکێکی خۆهەڵقولآو پێشڤە چووە کە سەرەنجام کاری ئەوی لە کاری شاعیران نزیك کردۆتەوە. ئەم دوورییە لە دەربڕینی وردی زانستیو هەڵبژاردنی

49- ibid,p.262

به ئاگایانەی دەنگەوازی شاعیرانە، زۆرجاران لە فەلسەفەدا سەرچاوە و مایەی پیت خستنەوەو وەدەستهێنانی بەرەنجامگەلی درەوشاوە بووە. رەنگە گوتەی دیكارت تان كە لە نامەكەی بۆ پیكۆ (وەرگێڕی **بنەواشەكانی فەلسەفە**) هاتوە، بیستبێ:"سەرلەبەری فەلسەفە هاوشێوەی درەختێكە. رەگاژۆكانی لە متافیزیكدان و كۆتەر و ناوقەدی فیزیك و لق‌و پۆپەكانی كە لەو ناوقەدانەوە رواون تێكڕای زانستەكانی دیكەن".[٥٠] هایدگێر لە وتارنامەی **مێتافیزیك چیە؟** دەپرسێ:"بەڵام ئەم درەختە لە كام خاكدا گەشەی كردوە؟"[٥١] ئەمە پرسیارێكە لە بن‌و بێخی مێتافیزیك تێدە هزری‌و لە بەر ئەوەی ناتوانێ وڵامدانەوەی لە ڕووناكایی خەیاڵیی زانست پەیدا بكات لە جیهانی ئاوەزی زانستی دوور دەكەوێتەوە و پێ دەنێتە قەڵەمڕەوی ئاخێوی شاعیرانەوە. بێگومان، خاڵگەلی گرنگ لە فەلسەفەی هایدگێر، بە تایبەت "میتافۆرگەلێ" لە نووسینەكانی دووەمین دەورەی كاری خۆی، وەكو "هەڵبژاردنی بارگە"، "ماڵ پەیدا كردن"، "زەوی"، "ئاسودەیی"و... هەرامەی "شاعیرانەن"و دەتوانی سەرچاوەكەیان لە شیعرەكانی هۆلدرلین، ریلكە، گیۆركە و تراكێل بەدی بكەیت. لەو جێیەدا كە هایدگێر لە دیتە و دەربڕینی ئۆنتیك دوور دەكەوێتەوە و پێ دەنێیتە قەڵەمڕەوی "هایدنناسیی بنیاتی"، لە راستیدا لە نێوان دوو سەرچەشنی زانست‌و هونەر، دووەمیان هەڵدەبژێرێ.

هەتا ئاخێوی فەلسەفی لە سەرچەشنی ئاخێوی تاك واتایی دوورتر دەبێتەوە، دركی ڕۆڵی راڤە سادەتر و لە هەمان كاتدا گرنگتر دەبێ. كەتواری هیچ راڤەیەك ناتوانێ بە تەواوی بكەوێتە واری تاقیكردنەوە و نرخاندنی دەسبەجێ. لەم ڕووەوە هەركات "ئەزمون" بە واتای باوو ئاسایی‌و هەڵبەت هەڵەشەی خۆی، لە بەر چاو بگرین، ئاوەزی هێرمێنۆتیك ئاوەزێكی ئەزمونی نابێت. نەك تەنیا لە خاڵگەلی تێكچڕژاو كە بە بیچمەكان و باشقە سیمبۆلیكەكانەوە گرێ دەدرێن، بەڵكو لە زۆر لایەنی ساكاری ژیانی رۆژانەش، ئێمە ناتوانین لە رێگەی تاقیكردنەوە بەرهەست و ئەزمونییەكان، راست‌و چەوتیی راڤەیەكی تایبەت بسەلمێنین. راڤەكانی رابردو هەركە لە ئاسۆی ئاماژەگەلێكی تازەدا جێ بگرن، خۆ رەنگە ئەمڕۆیی‌و راست‌و دروست خۆ بنوێنن. بە پێچەوانەوە ئەگەری ئەوە هەیە كە راڤەیەك بە تێپەڕ بوونی كات كارایی خۆی لە كیس بدا، بەڵام ئەم "بە كەڵك نەهاتن"و "بێ بەروبوومی"یە لەتەك ئەو شتەی لە ئاخێوی زانستیدا پووچەڵبوونەوەی پێ دەڵێین زۆر جیاوازە. لە بەر ئەوەی

50- ibid,P. 566
51- M.Heidegger, Questions,I, trans.H.Corbin, Paris, 1976,P. 23.



تێكڕای راڤەكان بە وردی‌و بە شێوەیەكی لێبڕاوانە شیانی سەلماندن و شیانی پووچەڵبوونەوە نین، هێرمێنۆتیك لە درك پێكردنی پۆزەتیڤیستیی ئاخێوی زانستی مەودایەكی زۆر دەگرێ. ئەمە خاڵێكی ئێجگار گرنگە، چونكە هێرمێنۆتیك لە پلارگرتن و سەرەنجام نواندنی بێ بەروبوومیی ئەو تێڕوانینە چەقبوستوە پۆزەتیڤیستیە دەورێكی گرنگی هەبووە. خاڵی سەرەكی لە باسەكانی هێرمێنۆتیكی ئەمڕۆیی، بێتوانایی ئێمەیە لە پەیدا كردنی پێوەرێك بۆ داوەری. نیچە نیشانی داوە كە ئێمە پارسەنگێك بانتر لە راڤەمان لە بەردەستدا نیە تا لە سەر بنەمای ئەو (پێوەرە) راست و چەوتیی راڤەكان بنرخێنین. ئەمە هەڵبەتە، جۆرە گەڕانەوەیەك بۆ هەڵێنجانە رێژەیی نوڕ و گومانكارەكانە. لەنێوان شاراوەمانەوەی واتا تەنانەت لای رەخسێنەری دەق و نەبوونی ئەرخەیانیی خوێنەر- بیسەر پێوەندییەك هەیە. هونەرمەند و هزرڤان كە دەزانن( یا سەرەنجام بۆیان دەردەكەوێ كە) ئاگایان لە هەموو شتێك نیە، نازانن بۆچی، بەڵام بە هەرحاڵ، بەرهەمێك بیرۆكەیەك(یا تەنانەت بە لاتانەوە باشتر بێ دەتوانین بێژین: خەیاڵكردێك) دەخولقێنن. پاشان، بەرامبەر (خوێنەر ـ بیسەر) لەگەڵ ئەم خولقێنراوە زەینی یا خەیاڵییە. گفتوگۆ دەكا، وای بۆ دەچێ كە قەرارە واتاگەلێ لە گۆڕێدا بن، دەیانخاتە روو، واتە ئاسۆی ئاماژەكانی بەرهەم بەرین دەكاتەوە و "ئیستراتیژیی خوێندنەوە" دروست دەكا... وەلێ هەرگیز، لە رووی ئەرخەیانی‌و بە دڵنیاییەوە ناتوانێ بڵێ كە كرۆكی مەبەستی پێكاوە.

ئایا دەتوانین بێژین كە هەر ئەم رێژەیی نواڕی و گومانكارییەی كە زادەی ئاخێوی هێرمێنۆتیكی ئەمڕۆییە لەگەڵ رێژەیی نواڕی ناسین لە فەلسەفەی زانستی تازە لێكچویە؟ ئایا دەتوانین بێژین كە فیزیكی تازە، لە نیوەی یەكەمی ئەم سەدەیە (سەدەی بیستەم) لە تەك بنەواشەی نەبوونی مكوڕی رێچكەیەكی گرتەبەر كە هێرمێنۆتیك لە فەلسەفەدا لەو رێگەوە دەڕوا؟ زانیاریی من لەبواری فیزیكی مودێڕن ئێجگار كەمترە لەوەی كە بتوانم بۆ ئەم پرسیارە وڵامێكی قەناعەت پێكەر پەیدا بكەم. وەلێ، ئەم خاڵە سادەیە وەبیر خوێنەر دێنمەوە كە فیزیكی تازە و بە شێوەیەكی هەمەكی ئاخێوی زانستیی ئەمڕۆ، لە دەسپێكی سەدەی بیستەم بە شوێن یا سنورێك گەیشت كە بە تێپەڕین لەو نەبوونی مكوڕی‌و لێبڕاوێتی‌یە، دەستی پێ‌دەكرد. ئەم تێپەڕینە ئێجگار دژوار بوو، چونكە بەم كارە بنەمای ئاوەزباوەڕی كە بە كۆڵەكەی زانستی مودێڕن دەزانرا، دەچووە ژێر پرسیار. تیۆریی رێژەمەندیی گشتی لە رێگەیەكەوە و باسگەلێ كە بنەواشەی نەبوونی مكوڕی‌یان دەهێنایە پێشێ لە رێگەیەكی

دیکەوە، لەم سنورە تێپەڕین. هەنووکە ئێمە بەگوتەی ئێدگار مورێن لە قەڵەمڕەوی "نائەرخەیانی" هەنگاو دەنێین. سەفەر لە قەڵەمڕەوی نەبوونی ئەرخەیانی بەردەوام ئێمە لە گەڵ رازو رەمزگەلێ ئاشنا دەکا کە نووسەرانی دەقە ئەدەبییەکان بەباشی لە بوونیان (و هەڵبەت نەدۆزراو بوونیان) ئاگادارن. موسافیرێك کە یەکێك لەم نووسەرانە لە سەدەی نۆزدەهەمدا خولڨاندبووی، بەر لە زانایانو فەیلەسوفانی هێرمێنۆتیکی تازە، لەم رازانە دوابوو. ئەم موسافیرە کیژۆڵەیەك بوو بە ناوی **ئالیس** کە سەرەنجام "بە چاوانی نووقاوەوە دانیشت و خۆی لەسەرزەمینی سەیروسەمەرە بینییەوە. هەرچەند دەیزانی تەنیا بەسە کە چاوانی بکاتەوە تا جیهان هەمدیس هەمان جیهانی وەڕسکەری کەتوارەکان بێ".[٥٢]

رازگەلێ کە هونەر سازی دەکاو بەدەگمەن کلیلی دۆزینەوەیان دەدەنە دەستی ئێمەو لۆژیکی ئاخێویسیمبۆلیك و ئەلیگۆریکی هونەری کە ئێمە لە ئەرخەیانیی زانستی دوور دەکاتەوە، هەندێ جار دەبێتە بابەتی هاوبەشی نووسینەکانی یارانی  هێرمێنۆتیك و زانایان. دەخوازم سەرنجی خوێنەر بۆ پاری حەڤدەیەمی ژیاننامەی خۆنوسی وۆرنێر هایزنبێرگ بە ناوی **ورد و درشت*** رابکێشم.[٥٣] پاری جێی مەبەستی من، گەنگەشەی باسێکە لە نێوان هایزنبێرگ و دوو فیزیکزانی ئەتۆمی، نیلس و وۆلفگانگ لە هاوینی **١٩٥٢**. رستەگەلێ لەم باسە لێرەدا دێنمەوە:" تیۆریی کوانتۆمی نموونەیەکی باڵکێشە لەم راستییە کە بڕێك لە پێوەندییەکان بە تەواوی دەتوانی فام بکەیت، هەرچەند تەنیا دەتوانی بە زمانی لێکدانەوە و ئەلیگۆریك لێی بدوێی. لەمبارەوە لێکدانەوەکان و ئەلیگۆرییەکانی ئێمە بەگشتی چەمکگەلی کلاسیك- واتە شەپۆل و تۆزقاڵ-ە. ئەم چەمکانە جیهانی راستەقینە بە شێوەیەکی تەواو وەسف ناکەن و گەر لەوەش گەڕێین، تەواوکەری یەکدین و کەوابوو پێکناکۆکن. لەگەڵ هەموو ئەم قسانەدا، چونکە تەنیا رێگەیەك بۆ وەسفی سروشت کەڵك وەرگرتن لە زمانی رۆژانەیە، دەبێ هیواداربین کە بە کەڵك وەرگرتن لەم لێکدانەوانە بتوانین دەستمان بە کەتواری کاروبارەکان رابگا. رەنگە هەر ئەم خاڵە لەبارەی هەموو مەسەلە هەمەکییە فەلسەفییەکان و بە تایبەتی لەبارەی مێتافیزیك راست بێ. ئێمە بە ناچار بە زمانی ئەلیگۆرییەکان و لێکدانەوەگەلێ قسان دەکەین کە مەبەستەکەمان دەقاودەق دەرنابڕن و هەروەها جاروبار ناتوانین لە چنگی پارادۆکس خۆدەربازبکەین. لەگەڵ ئەوەشدا، لێکدانەوەکان یارمەتیمان دەدەن کە هەتاکو زیاتر لە کەتوارەکانی کاروبارەکان، کە ناتوانین نکۆڵی لە بوونیان بکەین، نزیك بینەوە. (بە گوتەی شیلێر) * هەقیقەتماڵی لە قووڵاییەکاندا ئاوەدانە".[٥٤]

هەنووکە کە خوێنەرم هەتا سنورەکانی قەڵەمڕەوی نەبوونی ئەرخەیانیی رازەکان و کارایی ئاخێوی هونەری بەڕێ کرد، ئیدی بە جێی دێڵم. تەنیا ئیزنم بدەن بۆ پرسیارێك کە لە دەسپێکی باسەکەدا گەلاڵەم کرد و هێشتا وڵامم نەداوەتەوە بگەڕێمەوە: سنورەکانی راڤە لەکوێن؟ ئایا بۆ دروستکردنی راڤەگەلی تازە ئاستێکیش هەیە؟ زۆر کەسان بە دەنگەوازێکی گومانکار دەپرسن: ئایا ئەم ئازادیی راڤە( کە بەردەوام بە ناوی ناکۆکیی راڤەکان پاساو دەدرێ)  بەو شوێنە ناگات کە کەسانێك بە تەواوی و بێ گوێدانە دەق، پشتی تێ بکەن و هەر چییان بوێ بیلێن و بڕیارگەلی بێ سەروبەرەی خۆیان لە ژێر ناوی راڤە یا لێکدانەوەی دەق بێننە پێشێ؟ نیچە جارێکیان بە تەوسەوە، لە راڤەگەلی بێئەژماری رادەبەدەری شۆڕشی فەرەنسا وەها دوا بوو:" تەماشاوانانی جوامێر و شەیدا لە سەرتاسەری ئەرووپا ئەو گاڵتەجاڕییە خەماوییە و ئەگەر دروست بنرخێنین، بێ سەروبەرەیان تا ماوەیەکی درێژخایەن هەر لە دوورەوە بە وەها خرۆشێکەوە لێك دایەوە و دەوری یاخیبوون و خرۆش و تاسەکانی خۆیان لەودا داسەکاند کە دەق لە ژێر لێکدانەوەدا بزر بوو. بەم چەشنە، جارێکی دی دواڕۆژێکی جوامێر تێکڕای رابردوی خراپ فام کرد و لەم رێگەوە وای کرد کە بەرگەی دیدارکردنی بگرین".[٥٥] بە یاریدەی نیچە رەنگە بتوانین بەرسڤی مەسەلەی سنورەکانی راڤە بدەینەوە: راڤە سنوری نیە، وێدەچێ هەر لە بەر ئەم هۆیە دەمانەوێ رابردو و دەق" لە بەرگە هاتو" بکەین، واتە ئەم دوانە لە ئاسۆیەکی تازەدا، ئاسۆی ئاماژەکانی دەق بنەجێ بکەین.

٥٢- لویس کارول، ماجراهای آلیس در سرزمین عجایب، ترجمەی ز. پیرزاد، تهران، ١٣٧٥، ص ١٣٧.

*  ئەم ناونیشانە لێرەدا واتای تێکڕای رووداوەکانی ژیانی نووسەری ژیاننامەکە دەگەیەنێ، هەر بۆیە"ورد و درشت" لە بەرانبەر (جزء و کل)  بە کارهاتوە. ئەگینا واتای فەلسەفی و زانستیی ئەم دوو وشەیە پاژ(جزء) هەمەك (کل) ە، ئەم بە کارهێنانە لەم بوارەدا دەگونجێ و شیاو و دەقاودەقە. وەرگێڕ.

٥٣- و. هایزنبرگ، **جزء وکل**، ترجمەی ح. معصومی همدانی ، تهران، ١٣٦٨ صص ٢٠٦-٢١٨

* تێبینی لە نووسەرە.

(٥٤) هەمان سەرچاوەی پێشو، لاپەڕەکانی ٢١٠-٢١١.

(٥٥) ف. نیچە، فراسوی نیك وبد، ترجمەی د. اشوری، چاپ سوم، تهران،١٣٧٥، ص٧٨.

ئاسۆ میتافۆرێکە کە لە باسی ئێمەدا گرنگییەکی کلیلی و یەکلاکەرەوەی هەیە. نیچە لە برگەی ١٢٥ی **زانینی شاد** ئەم چەمکەی هێنایە پێشێ و پاشان لە بەرهەمەکانی هۆسریل و مێرلۆپۆنتیێ وەکو بنەتایەك یا کۆماگێکی گۆڕانهەڵگر* بەکار دەهات. ئاسۆ لە ئاخێوی دیاردەناسیدا بەستێنی تێهزرینە، هەرچەند هەرگیز بەوردی بۆ هەوێنەکانی خۆی نایەتە پاژاندن و ناناسرێتەوە. ئێستا، ئاسۆ بە واتایەك کە لە زمانی فارسیدا باوە( هەروەها لە زمانی کوردیشدا.و) واتە هێڵێك لە کۆتایی روانینی ئێمە، هێڵی درێژکراوەی لێکسوونی ئاسمان و زەوی، بێننە بەرچاوتان. ئاسۆ قەڵەمڕەوێکە کە راڤە جۆراوجۆرەکان لەودا جێ دەگرن. ئێمە لە بیاباندا رێ دەکەین و ئاسۆ جێگۆڕکێ دەکا. هێڵێکی تازە پێك دێ، هێڵێك کە هەروا شوێنی تێکەڵبوونەوەی ئاسمان و زەوییە و چاوساخی ئێمەیە. ئەمە واتایەکە کە یەکێك لە گرنگترین بەرهەمە فەلسەفییەکانی رۆژگاری ئێمە لە یەکەمین لاپەڕەیدا دەیخاتە روو: " ئامانجی ئێمە لەم پەرتوکەدا سەرقاڵبوونە بە مەسەلەی واتای هایدن و ئەنجامی ئەم کارە بە شێوەیەکی دیاریکراو. ئامانجی کاتی راڤەی زمانە، چەشنی ئاسۆی لواوی هەر چەشنە درك پێکردنێکی هایدن بە گشتی".(٥٦)

---

* ئەو شتەی کە دەشێ و هەڵدەگرێ بگۆڕدرێت. واتە باری گۆڕانی هەیە، لە بەرانبەر " دگرگون شوندە" ی فارسی.( وەرگێڕ)

(٥٦) M. Heidegger, Être et temps, trans, F.vezin, paris, 1986, p.21.



## ئەزموونی راڤە

(١)

پەرتوکی **مێتافیزیك ی** ئەرەستو بەم رستەیە دەست پێدەکا:" هەموو مرۆڤان، لە سروشتی خۆیاندا خوازیاری زانین (to eidenai)، نیشانەی ئەم (خوازیارییە) *میهربانی نواندنی ئێمە بۆ درك پێکردنە هەستەکییەکانە".(١) بەمجۆرە، یەکەمین خاڵێك کە لە دەفتەری ئالفای گەورە" واتە لە پاری یەکەمی **مێتافیزیك** دا هاتوە، ویستی دانایی یە. هۆیەك کە ئەرەستۆ لە سەلماندنی بوونی ئەم ویستە هێناویەتی، واتە" میهرەبانی نواندنی ئێمە بە درك پێکردنی هەستەکی" بابەتی پێوەندیی باسی ئێمە نیە. لەمبارەوە، تەنیا هێما بۆ دوو خاڵ دەکەم. یەکێکیان ئەمەیە کە، ئەرەستۆ لە درێژەی باسی خۆی لەنێوان درك پێکردنە هەستەکییەکان جۆرە زنجیرە پلە (hierarchy)یەکی دروست کردوە، واتە بڕێك لە تواناکانی مرۆڤ لە ناسینی هەستەکی بە بەسودتر و باشتر لە بڕێکی دیکە زانیوە و دواجار هەستی بینایی" سەرتر لە هەموویان زانیوە و نوسیویەتی: "بینایی زیاتر لە هەموو هەستەکانی دیکەمان یاریدەمان دەدا تا (شتەکان) بناسین". ئەفلاتونیش دەسەری هەستی بینایی و هاویەك زانینی لەگەڵ دانایی هێنابوویە گۆڕێ و هەتا ئەمڕۆش لە ئاخێوی فەلسەفیی رۆژئاوا هەروا ماوەتەوە. خاڵی دووەم ئەمەیە کە ئەرەستۆ لە درێژەی باسەکەیدا هۆی خۆی زیاتر شرۆڤە کردوە و لە گرنگیی یادەوەری لە ناسیندا دواوە و وەهای نووسیوە:" بەلای مرۆڤەوە لە وەبیرهێنانەوە (یادەوەری) ئەزمون پێك دێت. چونکەیادکردنەوەگەلی (mnemai) زۆری شتێك، هێزو گوڕوتینی ئەزمونێکی تاقانەی لێ دەکەوێتەوە".(٢) ئەم خاڵە لە ئەپستمۆلۆژیی ئەرەستۆییدا گرنگی هەیە. لە رستەی دواتردا، ئەرەستۆ چەمکی ئەزموونی لەگەڵ چەمکی ناسین" تا رادەیەك" بە هاوواتا زانیوە و رای گەیاندوە:" وادێتە بەرچاو کە ئەزموون، تا رادەیەك شتێکە هاوشێوەی

---

* تێبینی لە نووسەرە.

(١) — ارسطو، متافیزیك، ترجمەی ش. خراسانی، تهران، ١٣٦٦، ص ٣.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشو، لاپەڕەکانی ٣-٤

ناسین ( یا زانستepisteme) *و هونەر، بەڵام ناسین و هونەر بۆمرۆڤان لە ڕێگەی ئەزمونەوە وەدەست دێن.[٣] لەمبارەوە (ئەرەستۆ) لە فەیلەسوفێکی سوفیست(بەناوی) پولوس دواوە، کە گوایە گوتبووی:" ئەزموون هونەر دەڕخسێنێ و بێ ئەزموونی، بەخت و ڕێکەوت".

ئەرەستۆ لەم باسەدا، زۆر وێدەچێ بەشی بەرایی وتووێژی **گورگیاس** ی ئەفلاتونی مەبەست بوو کە لەوێدا پولوس لە وڵامی کرفۆندا دەڵێ:

" خەڵکان لە یارمەتیی ئەزموون و ڕاهینان، هونەرگەلی زۆر و زەوەندیان وەدەست هێناوە، چونکە ژیانی مرۆڤ لە تیرێژی ئەزموندا دەبێتە پێڕەوی زانین و هونەر، لە کاتێکدا کە بێ ئەزمونی ئێمە تووشی بەخت و ڕووداو دەکات"[٤].

مەبەستی ئەفلاتون و ئەرەستۆ لە هونەر، تکنیك یا شێوازە کە بە tekhne "تێخنە" ناویان دەهێنا و لەگەڵ ئەو شتەی کە ئێمە ئەمڕۆ بە" هونەر" ناوی دەبەین جیاوازە و لەو هەمەکیترە و ڕەنگە باشتر بێ کە لێرەدا بە" لێوەشاوەیی لەگەڵ دوورنواڕی" ناودێر بکەین. تێخنە ئاگاییە لە ڕاست هەمەکێتی( کلّیت) ی کاروبارەکان و توانایی لە دەرهێنان و ئافرێنەری(یا) (پوئسیس) . کەشتیسازێکی کارامە بە هەمان بارتەقای کەشتیوانێکی کارزان لە" تێخنە" دەزانێ. بەڵام ئەزموون لە دیدی ئەرەستۆ ناگاتە ئاستی داهێنان و لە ڕاستیدا شوێندەسپێکیەتی. هەر لە بەر ئەم هۆیە ئەرەستۆ نوسیویەتی:" هونەر یا تکنیك کاتێك سەرهەڵدەدا کە لە ڕێگەی تێگەیشتنە زۆرەکانی وەبەرهاتوی ئەزموون، درك پێکردنێکی هەمەکی لەبارەی کاروباری هاوشێوە و لێکچوو بڕەخسێ". ئەو لەمبارەوە نموونەی هێناوەتەوە کە ئەگەر چەند قات بنۆڕین و ببینین کە دەرمانێك بۆ چارەکردنی کەسانی جیاجیا کە هەموویان تووشی یەك نەخۆشین بەسودە، دەتوانین ڕێسایەك لە ڕێگەی ئەزموونەوە وەدەست بێنین، وەلێ بۆ ئەوەی ئەم ڕێسایە هەمەکی ببێ، واتە لەمەڕ هەموو تاکەکانی مرۆڤ کە تووشی ئەم نەخۆشییە بوونە وەڕاست بگەڕێ، پێویستیمان بە هونەر پەیوەستە بەکاروباری هەمەکییەوە، لەحاڵێکدا کە کردەکان و سازدانەکان هەمو گرێدراوی کاروباری پاژی یا

---

* episteme بە واتای ناسین بە کار دیت، بەڵام لە بەرامبەر زانست(science) بە کار دێت، وێدەچێ ڕەچەڵەکی لاتینی ئەم وشەیە واتای(زانست) یش بگەیەنێ.(و)

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشو ل.٤

(٤) افلاطون ، **دورة اثار، ترجمەی** م.ح. لطفی، تهران، **١٣٦٧** ،ج، ص**٢٦٥**



تاکەکەسین". بە سەرنجدان لەوەی کە باسکرا، ئیدی ڕێساکەی ئەرەستۆ چەندان سەرسوڕهێنەر نایەتە بەرچاو کە:" ئێمە وا وێنا دەکەین کە زانین و تێگەیشتن زیاتر پەیوەستە بە هونەر تا بە ئەزموون و هونەرمەندان لە ئەزمووندااران بە داناتر ئەژمار دەکەین، بەو پێیە کە هەر چەشنە داناییەك (حیکمەت) زیاتر لێکەوتەی زانینە و ئەمە لەو ڕووەوەیە کە ئەوان(هونەرمەندان) هۆیەکە دەناسن و ئەمان(ئەزمووندااران) نایناسن".[٥] مرۆڤی بەئەزموون چەندوچوونی شتان دەناسێ و کارەکەی لە تاوتوێی سەرەتایی و وێدەچێ ناسینی بووندارانەی ئەو شتانە بانتر ناچێ، لە کاتێکدا مرۆڤی خودان هونەر و تکنیك،( بۆ؟) ی شتەکان دەناسێ و کارەکەی لە قەڵەمڕەوی ناسینی هۆی بووندارانەی شتان جێ دەگرێ.

ئەرەستۆ دوابەرەنجامی لە درێژەی باسی خۆی لە دەربڕین و بەیانکردنی پلە و پایەی نزمی کەسانی بە ئەزموون یا" دەستکار" لە هەمبەر پیاوی هونەرمەند و تەکنیککار ڕاگەیاند و وەهای نووسی کە تاقمی یەکەم تەنیا بە پێی خووگرتنیان کار دەکەن، لە حاڵێکدا کە دەستەی دووەم هۆی شتەکان دەناسن. بە ئەزموونەکان توانای فێرکردنیان نیە، بەڵام هونەرمەندان و تکنیککاران کەسانێکن کە بە وردی خودان وەها هێزێکن. ئەزمووندااران خاوەنی فرەزانی یا دانایی (Sophia) نین، چونکە زانین و تێگەیشتن تەرخانە بە هونەر، کە گرێدراوی هەرامەی هەمەکییە. بە ڕای ئەرەستۆ، دانایی ڕاستەقینە لە ئاستی ئەزموون تێدەپەڕێ و لە پانتایی هونەر یا تکنۆلۆژی جێ دەگرێ. ئەرەستۆ هۆ و ڕیشەی ئەم کەم و کووڕییەی لە کاری ئەزمووندااران خستە بەرباس و بەرەنجامی ئەم کەمایەسییەشی قەتیس مانەوە یان لە سنوورەکانی "درك پێکردنە هەستەکییەکان" ناونا. کەوا بوو دەکرێ وەها بەرەنجامگیری بکەین کە بەڕای ئەرەستۆ کەسێك کە لە ئەزموونەوە دەست پێدەکا. وەلێ ئەگەر لەودا خۆی قەتیس نەکاتەوە، واتە لە درك پێکردنی هەستەکی گوزەر بکات و توانای گشتگیر کردنی ئەزموونەکان پەیدا بکا و ببێتە هونەرمەند و تەکنیککار، کاری وەها کەسێك جێی پێزانین و لە ئاستی دانایی و بۆشناخی دەنرخێنرێ. هەنووکە ئێمە دەمانەوێ بزانین کە ئایا ئەزموون هەمان واتای بەرتەسکی هەیە کە ئەرەستۆ هێنایە پێشێ؟ ئایا ئەم زانیارییەی کە بەروبوومی ئەزموونە- ئەزموونێك کە دەتوانێ ئێجگار سەرەتایی، ساکار و تەنیا گرێدراوی درك پێکردنی

---

(٥) ارسطو، پیشین(میتافیزیك) ص ٤.

هەستەکی بێ- کاتێك کە دێنە دەربڕین، چەشنێکی تازە و تێکچڕژاوتر لە ئەزموون ئەژمار ناکرێت؟

لە بنەڕەت را ئایا شیاوە کە بێژین ئەزموون لەگەڵ دەربڕینی ئەزموون جیاوازە؟ ئایا دەشێ بوترێ کە دەربڕینی هەرچەشنە داناییەك، هەر چەندەیش سادە بێ، پەیوەستە بە هەرامەیەکی هەمەکییەوە؟ ئەگەر وەهابێ، ئایا بە پێی هەمان روانگە و دابەشکاریی ئەرەستۆیی دەربڕینی ئەزموون لە رێگەی زمان و خوازەکانی دەربڕین بە قەڵەمڕەوی بۆشناخی و دانایی واتە هونەر و تکنیك پەیوەست نابێ؟ و ئەگەر دەربڕین و ئەزموون هاویەك یا خۆ لێك دانەبڕاو بزانین، ئایا ئەزموون لە ئاستی داخراوی درك پێکردنی هەستەکی تێناپەڕێ و نایەتە نێو قەڵەمڕەوی داناییەوە؟

کاری خۆمان بە بەرینکردنەوەی رایەکی شیمانکراو دەست پێدەکەین کە ئەگەر رێسای سەرەکیی ئەرەستۆ دروست بێ (واتە ئەمە کە تێکڕای تاکەکانی مرۆیی بە پێی سروشتی خۆیان خوازیاری زانین) بەرەنجامگیری دەکرێت. هەر لەم یەکەم هەنگاودا، هەمدیس مەسەلەیەك دێتە ئاراوە: ئایا بەڕاستی تێکڕای تاکەکانی مرۆڤ کە بەپێی ئەم گریمانە بە شێوەیەکی خۆڕسك خوازیار و عەودالّی زانینن بەم بیچم و تا ئەم ئاستە، عەودالّی هێنانە ئارای دەربڕینێك لەو شتەی کە بە بابەتی دانایی لە قەڵەم دەدرێت هەن؟ وا دێتە بەرچاو کە لە یەك واتادا، ناکرێ لە نێوان ناسین و دەربڕینی بابەتی ناسینەوە جیاوازییەك دابنێی. ناسین کاتێك ناسینە کە بێتە دەربڕین، واتە لانیکەم بەشێوەیەکی زەینی لە هزری ناسکار دەربدرێ و فام بکرێ. تەنانەت ئەم درك پێکردنە زەینییەش رێگەیەکی نیە جگە لەوەی لە قاڵبی زاراوەکان، رێساکان و سیستمی زمانی و رێزمانی جێ بگرێ. تێگەیشتن و ناسین لە دەرەوەی زمان و راڤە نالوێ. تەنانەت سادەترین درکی هەستەکیش لە زەینی ئێمەدا راڤە دەکرێ و بەرەنجامێکی کەم تا زۆر هەمەکی بەباردێنێ. هەر بەو چەشنەی ئەرەستۆ خۆیشی پەسند دەکا کە درك پێکردنی هەستەکی و ئەزمونی وەبارهاتو لەو، دەتوانێ بنەڕەت و بنیاتی کاری یادەوەری بێ. تا لێرە هێشتا جیاکارییەك لە نێوان ناسین و دەربڕین لە گۆڕێدا نیە و ئێمە دەربڕین تا راڤەی زەینیی خۆمان بە تێگەیشتن یا ناسین ناو دەنێین. کەوابوو چۆن دەبێ لە جیاکاریی ناسین و دەربڕین بدوێین؟

کاتێك کە لە زەینی ناسکار بێینە دەرەوە سەرنج لە تێکۆشانی ئەو لە روونکردنەوە و لێکدانەوەی ئەو شتەی کە ناسیویەتی- کە لە سروشتی خۆیدا باسلێکردنێکە روو لە



ئەوانیدی- بدەین، مەبەست لە پرسیاری سەرەوە دەردەکەوێ. روون و ئاشکرایە کە هەموان- بەردەوام و لە هەموو دۆخێکدا- خوازیاری دەربڕین یا روونکردنەوەی شتێك کە ناسیویانە، نین. وەها نیە کە هەموو خەڵکان، بەردەوام ئەو ویستی داناییە بەجێبێنن و ساخی بکەنەوە. لێرەدا دەبێ درۆی ئاگایانە و هەڵە نائەنقەستەکانیش لەبەر چاو بگرین. جگە لەمە، پرسیارەکە بە شێوەیەکی دیکەش دەتوانێ دەرکەوێ: ئایا ویستی خۆڕسکانەی مرۆڤ واتە ناسین لە هەموو دۆخ و بە هەمو بیچمێك ویستی دەربڕین یا راڤەیە؟ یا خۆ ئەم دووانە دەتوانن لێك جیابن؟ تا رادەیەك بەئاسانی دەتوانی ببینی کە دەربڕین و راڤە پەیوەستن بە هەل و مەرجێکەوە. ژمارەیەك لەم هەلومەرجانە دەرەکین، واتە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بۆ هەڵکشانی ناسین و دەربڕین ناگەڕێنەوە(بۆ نموونە بۆ هەلومەرجی کۆمەڵایەتی، سیاسی، فەرهەنگی و رێژەی ئازادیی دەربڕین و ئازادیی پێوەندیگرتن دەگەڕێنەوە) . لەم قۆناخە لە باسەکەمان، ئێمە کارمان بەسەر ئەوانەوە نیە و ئەمە هەڵبەت بە واتای نکۆڵێکردن لەو هەل ومەرجانە نیە. خاڵی گرنگ بۆ ئێمە ئەمەیە کە بە هەر حاڵ، هەڵکەوتگەلێ دێنە پێشێ کە ناسین شیانی دەربڕین نابێت. ئەم هەڵکەوتانە ئاقار و لایەنی کۆمەڵایەتییان هەیە، بەڵام مەسەلەکە ئەمەیە کە تا رادەیەك بەرەنجامی سازوکاری زمانیش کە قەرارە لە جەرگەی ئەو ئەزموون و ناسینەدا بێنە دەربڕین. ئەم مەسەلەیە و مەسەلەگەلی لەم چەشنەش کە زمان دەیان خولقێنێ، هەرکامە و بە نۆرەی خۆیان دەرخەری گرنگیی لایەنی پێوەندیکارانەی درك پێکردن و ناسینی مرۆیی یە.

وا دێتە بەرچاو کە ئەرەستۆ بە هێنانە گۆڕی خاڵی فێرکردن و بارهێنان، لەم لایەنە پێوەندیکارییەی باسەکە رادەما. درك پێکردنی ئەو کەسەی کە ئەزموونێکی سادە پەیدا دەکا، واتە لە پێشهاتێکی ئێجگار سواو بەشێوەیەکی هەستەکی شتێك تێدەگات، سەرەتاییە. هەر ئەم کەسە کاتێك لە لە ئەزموونگەلی سەرەمڕە و لە هەندێخاڵی هاوشێوەدا، بەرەنجامێکی هەمەکی وەدەست دێنێ، شتگەلێ فام دەکا کە تێروتەسەلتر لە زانراوەکانی پیشوی ئەون. لێرەدا، ئەو لە ئاستی هەمان خاڵێك کە ئەفلاتونو ئەرەستۆ بە هونەر یا تکنیك ناویان لێنا، شتێکی زانیوە و کەم تا زۆر ـ بە پێی توانامەندییەکانی دیکەی خۆی ـ تواناى هیراگەریی زانراوەکانی خۆی بە کەسانی دی هەیە: "بە گشتی نیشانەی پیاوی دانا (نەك) لە بەرانبەر پیاوی نەزان ئەمەیە کە ئەویان توانای فێرکردن (بارهێنان) ی هەیە، بەم هۆیەش لەو باوەڕەداین کە هونەر بەر لەئەزموون خودان تایبەتمەندیی زانینە. چونکە هونەرمەندان دەتوانن

فێر بکەن، بەڵام ئەزموونداران (ئەم تواناییەیان نیە) ... "[٦] هیچ دیار نیە کە بۆچی دەبێ بوترێ خاون ئەزموون ـ واتە کەسی بە ئەزموون ـ توانایی فێرکردنی نیە. دایکێك کە منالەکەی فێردەکا کە دەست بۆ ئاگر نەبات (و ئەرستۆ نموونەی ئەم ئاگر و سوتێنەرییەی لە پەرتوکی ئالفای گەورەی **مێتافیزیك** دا چەند جار بەکار هێناوە) ئەزمونێکی سادە، پەیوەست بە درك پێکردنێکی هەستەکی فێری ئەو دەکات. دایك دەتوانێ بە یەك جار نزیك کردنەوەی ئاگر لە دەستی کورپەکەیو روونکردنەوەیەکی سادە، ببێتە هۆی هەمان بەرەنجام کە مندالّ وێدەچێ بە چەند جار ئەزموونی پەیتا پەیتا، واتە لە رێگەی توانستی هەمەکیکردنی کارەکە، پەی پێدەبا. هەڵبەت ئەمە زانینێکی تەواوە و تکنیککارانە نابێت، هێشتا هۆی سوتانی دەستو زۆر خاڵی دیکە روون ناکاتەوە، بەڵام بە هەر حاڵ زانینێکی شیانی گواستنەوەو فێرکردنی رووداوێکی راستەقینەیە. بەرەنجامی کردەوەیەکی ئەرێنیی ئەوەش جێی نکۆڵی نیە. کەوابوو چەوت دەنوێنی ئەگەر بێژین ئەزموونێکی سادە شیانی گواستنەوە نیە. ئەم کەتوارە کە ئێمە دەتوانین هونەرێك کە بەیانگەری هەرامەیەکی هەمەکییە و ئەرەستۆ گوتەنی"باتر لە درك پێکردنە هەستەکییەکان هەڵدەکشێ"، نابێ بەمانای نکۆڵی لە خاڵێك بێ کە ئەزموونێکی سادە شیانی فێرکردن و شیانی فێربوون دەزانێ. هەنووکە، با لەم سوچە تێپەڕ بین و خاڵێکی گرنگتر گەلاڵە بکەین: توانایی هیراگەریی هەر ئەزموونێك، هونەر یا تکنیکێك کە سەریان بەندە بەکاروباری هەندەکی یا هەمەکییەوە، بە توانایی هیراگەر لە دەربڕینی خاڵەکان بەستراوەتەوە. واتە هێزی فێرکردن پەیوەستە بە توانامەندیی "زمانپاراوی". فێرکردن بەواتای گواستنەوەی زانراوەکان و هەوڵدان بە ئاراستەی چڕوپڕکردنیان، پەیوەستە بە بەرینایی یا بەرتەسکیی زمان و هێزی دەربڕین، بە سەرنجدان لە خاڵی سەرەوە کە باس کرا، پرسیاری سەرەکیی ئێمە خۆی زیاتر ئاشکرا دەکا: هەمبەری نێوان ناسین و دەربڕین چیە؟

(٦) ـ هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٥. رێکەوەندێك کە وەرگێڕی فارسی لە قولاپدا دایناوەو نکۆڵی ئەگەری فێرکردنی کەسی بە ئەزموون دەکا، دەقاودەقە. لە پاچەڤەی فەرەنسیی تریکۆ لە **مێتافیزیك** ئەم خاڵە تەنانەت بە هێزتر و بە گوڕ و تینتر هاتوە: "چونکە تەنیا هونەرمەندانو نەك کەسانی دی توانای فێر کردنیان هەیە":

Areistol, La Métaphysigue, trans. J.Tricot, Paris, 1974, vol. I.P.8 .



لێرەدا خاڵێکی گرنگ لە بەردەممان قووت دەبێتەوە: سەلماندنی راست و دروستیی ئەو شتەی بە دەربڕین یا راڤە ناومان لێنا، پێویستیی بە پێشگریمانەکان، پێناسەکان و ئاکسیۆمەکانە. دەتوانین لە قەڵەمڕەوی لۆژیکی سیمبۆلیك لە سەر بناخەی ئاکسیومەکان راستو چەوتیی راڤە بسەلمێنن، بەڵام لە پانتاییەکدا کە لەگەڵ نێوەرۆکی راڤەکان سەروکارمان دەبێ، واتە لە قەڵەمڕەوی واتاناسی بە سانایی تێبینی دەکەین کە خاڵی گرنگیی پێشگریمانی هالّت، واتە نێوەرۆکی زانراوەکانی پێشوی راڤەکار (یا ئەو شتەی گادامێر بە "پێشداوەری" ناودێری دەکا" (بەدی دەکەین) . هەر دەربڕینێك یا راڤەیەکی تایبەت بە دەربڕین یا راڤەیەکی دیکە پشت ئەستورە، کە دروستبوونیشی سەلماندنی گەرەکە، واتە راڤەیەك کە بە چەشنێکی کاتی چاوگە لە قەڵەم دەدرێ خۆیشی بە راڤە و راڤەکانی دیکە پشت ئەستورەو تۆژینی دروستی و وەڕاست گەڕانی هەرکامیان ئێمە لە راڤەیەکەوە بە راڤەیەکی دی دەگەیەنێ و کارەکە هەرگیز ناگاتە کۆتایی. بە دەربڕینی دیکە رێسای روون و ئاشکرای ئەرەستۆ کە هەموومان بە پێی سروشتی خۆمان عەودالێن و پێویستیمان بە زانین و ناسین هەیە، هەرکە لە چەشنەکانی هەر زانراو ـ یکی تەنانەت بێبایەخ و ئێجگار سادە و سواو ـ تێهزرین، ئێمە لەگەڵ گێژاوی "ناکۆتایی" بەرەورِوو دەکا. دەبینین کە هەر لە یەکەم هەنگاودا، گەیشتینە جێیەك کە پێناسەکان، فۆرمەکانی دەربڕین و راڤەکانمان بەردەوام بە پێناسەکان، فۆرمەکانی دەربڕینو راڤەکانی رابردوو دەگەڕێنەوە و ئێمە لە رێچکەی ناکۆتایی گەڕانەوەکان گیرۆدە دەبین، ئەمە رووداوێکە کە لە قەڵەمڕەوی زماندا روودەدا، واتە لە پانتایی ئامرازێك کە بەوەوە دەمانەوێ شتەکان، جیهانو خۆمان بناسین. ئەمە زمانە کە ئێمە لە رێچکەی ناکۆتایی گەڕانەوەکان دادەنێ و واتای هەر وشەیەك بۆ وشەیەکی دیکە دەگەڕێنێتەوە. زمان ئێمە لە هەزار قوژبنێکدا سەرگەردان دەکاو تەنانەت دەتوانێ ببێتە هۆی ئەوە کە زۆرجاران بۆ خاڵی دەسپێکی رێچکەکەمان بگەڕێینەوە. بەم چەشنە، دەتوانین بڵێین هەموو مرۆڤان بە پێی چیەتیی خۆیان عەودالّی زانینن، وەلێ کاتێك لە ئەزموونی دانایی دەستنیشانکراوی خۆیان دەدوێن، ئەزمونی راڤە دێتە گۆڕێ کە لە نێوان ئەو شتەی کە زانیویانە و ئەوەی دێتە دەربڕین مەودایەکی نەپساوە دادەنێ و ئەمە بەرەنجامو ئەرکی زمانە. هیچ راڤەیەك هەرگیز و لە هیچ دۆخێکدا تەواو نیە و ناتوانێ چیەتیی بابەتی راستەقینە دەربڕێ.[٧] دەربڕین لە گەوهەری خۆیدا ناتەواو، ناپوختە و

(7) J.Grondin, “Lintellignce hermeneutigue du Langage”, in: L horizon hermenutigue, Paris, 1993, PP. 253-2741.

پرکەمایەسییە. زمان ئێمە لە ئەگەری دەربڕینی راستەو راست دوور دەکاتەوە و دەبێتە هۆی ئەوە کە بەردەوام بکەوینە هەڵەوە و وای بۆ بچین کە توانای دەربڕینی راستەوخۆی ئەزموونەکانی خۆمان هەیە. زمان مەودا دەرەخسێنێ. هیچ جیاوازییەك نیە کە ئێمە لە ئەزموونی سادەی درك پێکردنی هەستەکی بدوێین یا لە درك پێکردنی زەینیی شتێك یا لە دەربڕینی زانراوێك لە لای کەسێکی دی. بەردەوام مەودایەکی نەپساوە لە نێوان ئەو شتەی کە دەیڵێین و ئەوەی کە دەیناسین هەیە. بەردەوام لە بۆتەی بێتوانایی دەربڕین دیلین.

## (٢)

چەند سەدەیەك پاش ئەرەستۆ میشل دومۆنتنی، رێژەیی نوارِ و گومانکارێکی مەزن، لە وتارنامەی "لە بارەی ئەزموون" کە بەرگی سێهەم، واتا دوابەرگی کتێبی **وتارنامەکان** ی خۆی بەوەوە کۆتایی هێنا، گەڕایەوە بۆ باسی ئەرەستۆ. یەکێك لە خاڵگەلی نێوەندیی ئەم تێزە باڵادەستیی یاسایە. مۆنتنی لەمەڕ هەبوونی یاساگەلی تێکچڕژاو و زۆر و زەوەند کە لە سەردەمی ئەودا لە برێك لە وڵاتانی ئەوروپا ـ و بە بۆچوونی ئەو زیاتر لە هەموویان لە فەرەنسادا ـ هەبوو، هەڵوێستێکی رەخنەگرانەی نواند. ئەو لە هەنگاوی یەکەمدا، داکۆکی لە راشکاویی دەربڕین لە یاساکان و لە هەرەپێویستیی نووسینی ماددە و بەندە یاساییە روونا هییەکان کرد و خوازیاری وێکخستنی بەندگەلی (یاسایی) بوو کە هەتا دەکرێ، رێگەی لێکدانەوە جۆراوجۆرەکان دابخا. مونتنی نووسی کە هەر کات یاساکان رۆشن بن و بە راشکاوی بنووسرێن و رابگەیەنرێن، ئیدی چمان داوە لەو هەمو یاسایانەی کە لە دەستەو پێمان دەئاڵێن. چونکە ئەم یاسا بێ‌ئەژمار و لێڵانە، تەنیا لە سەر بناخەی راڤەگەلی هەمە جۆری یاساکانی دیکە نووسراون و راپەڕاندنو ئەنجامدانی هەموویان کارێکی دژوار و تەنانەت نەلواوە. هەر ئەم خاڵانە مۆنتینی رووەو باسکردن لە ئەگەرەکانی راڤەی یاساکان رکێش کرد و مەسەلەی تاوتۆیی کاری راڤەی خستە رۆژەڤەوە. ئەو لە قەڵەمڕەوی ئاخێوی هێرمێنتۆتیکدا دۆزییەوە کە راڤەکان، هەرچۆنێك بێ دەخرێنە روو و بەرینبوونەیان پێشی پێ ناگیرێو بەردەوام هەر راڤەیەك لە سەر بناخەی راڤەکانی دیکە دروست دەکرێنو دەخرێنە روو و خەیاڵکردی بەرتەسك کردنەوەیان پووچەڵە. ئەو لە درێژەی تاوتوێی خۆیدا، ئەزموونی دانایی بە راڤە زانی و لەوەش گرنگتر، بە مەترسیی باسێکی تازە لە بواری وەڕاست گەڕانی راڤەگەلی جۆراوجۆر و هەمبەریان لەگەڵ هەقیقەت ملی دا و لێرەوە بە مەسەلەی هەقیقەتو داهێنانی



کەتوارەکان لە زماندا گەیشتو قامکی لە سەر بێتوانایی زمان لە خستنە رووی دەربڕینێکی دەقاودەق دانا. باسی مۆنتنی، بە تایبەت لە بارەی زمان، نوێو ئەمڕۆیی یە. لەم رووەوە جێی خۆیەتی کە تێبکۆشین تا دوورنۆڕێنی فەلسەفیی ئەو لە وتارەکەیدا دانەدوو بکەین. مۆنتنی سەرەتا بە بڕیاری ئاشنای ئەرەستۆ کە "هەموو مرۆڤان، لە سروشتی خۆیاندا عەوداڵی زانین" دەستی پێکرد. ئەو ئەم خاڵەی بە هەرامەیەکی ئاشکرا لە قەڵەم دا و هەوڵدان بۆ سەلماندنیشی بە کارێکی زێدە زانی، کەوا بوو نووسی: "هیچ تامەزرۆییەك سروشتیتر لە تامەزرۆیی بە دانایی نیە. ئێمە لە هەر ئامرازێك کە بتوانێ بەرەو دانایی رێنوینیمان بکات کەڵك وەردەگرین. کاتێك کە ئاوەز بە کارمان نەیەت، کەڵك لە ئەزموون وەردەگرین".(٨) ئەو پاشان رێکەوەندێك لە پەرتوکی **ئەستێرەناسی** ی مانیلیۆسی بە لاتین هێنایەوە کە بەمانای نکۆڵیی جیاکاریی ئەرەستۆیی ئەزموون و هونەر ئەژمار دەکرێ" ئەزموون، لە کارە جۆراوجۆرەکان و بە نموونەگەلی رێخۆشکەر رەڤیدەی هونەرێکە". مۆنتنی لە مەڕ ویستی دانایی یا تامەزرۆیی سروشتی بە زانین، زانست و هونەری بە هەڵقولاوی داوەری لە مەڕ ئەزموون زانی. داوەری، ئێمە لە قەڵەمڕەوی زمان و دەربڕین واتە لە پانتایی راڤە بنەجێ دەکات. خاڵی دڵکێش لە تێکڕای نووسینەکانی مۆنتنی دا لە بارەی راڤە، جەختی ئەو لە سەر فرەڤاقێتیی راڤەکان و بەرەنجامێکی گرنگە کە بە دەستی هێناوە و ئەوەش بریتییە لەوەی کە هەقیقەت هەرامەیەکی تاقانە نیە. ئەم بەرەنجامە، هەڵبەت کۆڵەکە و بنیاتی روانگەی گومانکار و رێژەیی نوارِی ئەوە.

بە رای مۆنتنی هەقیقەتەکان لە لێك بەستنیان لەگەڵ راڤەکان دروست دەکرێن. بابەتەکانی دانایی فرەڤاقن و هیچکامیان هەرامەیەکی تاقانە و ئۆرگانیك نین، لەبەرئەوەی کە ئەم بابەتانەی دانایی، واتە کەتوارەکان و هەبوونەکان راپسکاو و فرەڤاقن و بە بیچمگەلی فرەچەشن و هەندێ جار تەنانەت پێکناکۆك، لە بەرچاوی راڤەکاران جۆراوجۆر دەردەکەون. هەڵبەت روانگەی مۆنتنی رۆنراوی "زەین باوەڕیی پەتی"(solipsism) نیە ئەو تەنیا جیاوازیی زەینە مرۆییەکان زەق ناکاتەوە، بەڵکو باوەڕیشی بە فرەکەرتی و گۆڕدرانی بەردەوامی بوونەوەران یا کەتوارەکان هەیە. بە بۆچونی ئەو فرەچەشنیی بێ ئەژماری فۆرمەکانی دەربڕین دەبێ ئێمە بخاتە ئەم بیرەوە کە بابەتی ناسینەوەش وێدەچێ نەتوانێ

(8) Montaigne, Essays 3, ed.p. Michel , paris, 1973, p.353.

شتێکی جێگیر، لە گۆڕاننەهاتوو، تاقانە و هەرمان بێ. ئەم کەتوارە فرەفاقانە لە تەك یەکدیدا جیاوازن، بەڵام لەبەر گۆڕانەکان و بیچمدۆزیی پەیتاپەیتایان جاروبار هاوشێوەی یەکدی دێنە بەرچاومان. ئەم لێکچوونانە رواڵەتین و شتەکان لە گەوهەری خۆیاندا لەگەڵ یەکدیدا ناهاوشێوەن. مۆنتنی لە هەمبەر ئەو شتانەی کە ناهاوشێوەیی شتەکانمان پێ وت، ئێجگار هەستیار بوو و بە "ڕێسای سەرەکیی ناسین و دەربڕین" ناودێری دەکرد. ئەو جەختی دەکرد کە "لەمەڕ شتەکان خدەیەکی جیهانگیرتر لە فرەفاقیێتی نیە" و بەردەوام دووپاتی دەکردەوە کە وێنا یاخەیاڵکردی هاوشێوەییەکان تەنیا لە ڕێگەی نکۆڵی و تێکۆشان بۆ چاونوقاندن لە رووی خاڵگەلی جۆراوجۆر و نایەکانگیر دەلوێ. لێکچون خۆی یەکێك لە چەشنەکانی راڤەیە، گەلاڵەی شتێکە کە لە دنیای راستەقینەدا بوونی نیە، دوو روانگەی هاوشێوە لەمەڕ شتێك یا راڤەیەك کە هەلیان بۆ نەڕەخساوە تا باسەکە بۆ پێشەوە بەرن و ئەگینا جیاوازییەکەیان ئاشکرا دەبێت. لە قەڵەمڕەوی کردەی راڤەگەریدایە کە لێکچوونەکان دروست دەکرێن. لە لایەکی دیکەوە لەنێوان ناسین و دەربڕینی بابەتی ناسینەوە- واتە راڤە- هەمبەرێکی نێوەکی، نەمر و بێخەوش هەیە. بوونی راڤەگەلی فرە چەشن، جیاواز و تەنانەت دژیەك لە کەتوارێکی تاقانە، بەرەنجامی ناسینگەلی جۆربەجۆر و دواجار بەروبوومی فرەفاقیێتی شتەکانو جیاوازیی شتان لەگەڵ یەکدایەو هەر لە بەر ئەمە دەبێ بە هەرامەیەکی ناچارانە و هەرمانی بزانیت. رۆشنە کە ئەگەر بتوانی لە دیاردەیەکی تاقانە راڤەگەلی جۆربە جۆر بخەیتە روو، لە فرەفاقیێتی شتەکان، راڤەگەلی چەندقات زیاتر چێ دەبن. هەر وەك گوتمان، بە بۆچوونی مۆنتنی ئەم فرەفاقتێتیەی شتەکان بنوبنچینەی سروشتە. سروشت هەرچ جووتخولقێنراوێکیش یەکسان ناخولقێنێ، کتومت بەم گوڕتینەوە دەتوانین بڵێین هەرچ جووتخولقێنراوێکیش بە یەکسان نازانرێن یا پەسند ناکرێن. بەو بارتاقایەی کە لە "ئارایی" شتەکاندا فرەچەشنی هەیە، لە راوڕایەڵ و لێکدانەوەو راڤەیاندا، واتە لە پانتایی برەوداری و ناسینەوەکانیشدا فرەفاقیێتی دەسەڵاتداری سەرەکییە. هەر بەم هۆیەوە تەنانەت لە کاتی دانانی یاساکاندا، واتە لەوێدا کە ئامانجی یاسادانەر ئەفراندنی خاڵگەلی تاك واتایی یە، هەمدیس ڕێگەی هەڵاتن لە فرەفاقیێتی راڤەکان ناتوانی بەدی بکەی. مۆنتنی نووسی کە "لەم رۆژگارە"دا کە یاساکان لە رادە بەدەر هەن، بازاری راڤەی یاساکان گەرمتر لە جارانە. ئەو لە زاری ئەپیکۆرەوە گوتی کە:"سەردەمانێك لە بەر زۆر و زەوەندبوونی تاوان لە ئەشکەنجەدا دەژیاینو ئەمڕۆ لە بەر زێدە



بوونی یاساکان ئازار دەچێژین"[٩] لە راستیدا قسەی ئەپیکۆر و مۆنتنی ئەمەیە: لە ئەگەر و زۆر و زەوەندیی راڤەکان ئازار دەکێشین.

ئەم خاڵە گرنگە لە باسەکەی مۆنتنی بەرەنجامگیری دەکرێ کە بوونی ئەم فرەفاقیێتی و"ناتەبایی راڤەکان" بە رۆشنیو گوڕوتینەوە نیشان دەدا کە هەقیقەتی تاقانە لانیکەم بەو چەشنەی لە مێژوی ئاوەز باوەڕیی فەلسەفی گەلاڵە کراوە، بالادەست و بێخەوش نیە. ئەم مێژوە جگە لە هەوڵدانی پەیتاپەیتا بۆ پەسندسەپێنیی هەقیقەتی ئەرخەیانیو لێبڕاوانە نیە. مۆنتنی نووسیویەتی:"هەر شتێ کە بە هەقیقەت ناودێر دەکرێ، رەوایی خۆی لە راڤەیەکی تایبەت وەدەست دێنێو نەك لە هەقیقەتێکی گریمانی کە لەدەرەوەی زەیندا هەبووبێ. ئێمە بەردەوام یەك وشە لەگەڵ وشەیەك کە واتاکەی کەمتر ناسراوە، دەگۆڕینەوە".[١٠] هەقیقەت بە توانایی ئێمە لەم راڤەگەریو هەقیقەتسازییەدا بەستراوەتەوە و نەك بە کیانێکی بانزەینی. لاپەڕەیەك لەوەوپێش مۆنتنی نووسیبووی: "من نازانم بە چ جۆرێ دەبێ ئەم خاڵە روون بکەینەوە، بەڵام ئەزموون نیشانی داوە کە ئەم هەموو راڤەیە هەقیقەتیان لەنێو بردووەو کاولیان کردوە".[١١] "ئەم هەموو راڤەیە" دەبنە هۆی ئەوە کە ئێمە لە خاڵێکەوە بۆ خاڵێکی دی هەڵتوتێین و دەرفەتی وردبوونەوە و ناسین لەکیس بدەین. بێگومان راڤەگەلێ هەن کە رێخۆشکەری چارەکردنی بڕێك لە مەسەلەکانن، بەڵام رێخۆشکەری کەڵەکەیەك لە خاڵگەلی تازە و مەسەلەگەلی چارەسەر نەکراویشن، ئەو خاڵ و مەسەلانەی کە مۆنتنی هەموی لەگەڵ"ئوتۆمگەلی لە ئەژماربەدەری ئەپیکۆر" بەراورد کردونو بە مکوڕییەوە نووسیویەتی: "هەرگیز داوەریی دوو کەس لە یەك شت، یەکسان نیە، نالوێ کە دوو باوەڕی تەواو یەکسان بەدی بکەیت. نەك تەنیا باوەڕەکانی دوو مرۆڤی جیاواز، بەڵکو دوو باوەڕی مرۆڤێك لە دوو هەڵکەوتی جیاواز، هاوسان نین".[١٢] چ باش چ خراپ هەر ئاوایە. راڤەکان تەنیا نیشان دەدەن کە هەقیقەتی تاقانە هێندە کە فەیلەسوفانی ئاوەزباوەڕ پێیان وابوو لێبڕاوانەیە نیە. کتومت هەر بەم هۆیە کە هەر راڤەیەك ئەگەری راڤەگەلی تازە دەڕەخسێنێو هەر وڵامێك دەتوانێ وروژێنەری هەزاران پرسیاری تازە بێ، مۆنتنی لە "بێمتمانە بوونی بڕیاری بیرمەندان" دەدوا.

---

(9) ibid, P. 354.
(10) ibid, P. 358
(11) ibid, P.356
(12) ibid, P. 356.

لە رۆژگاری ئێمەدا هایدگێر رای گەیاندوە کە خاڵی گرنگ لە کاری هەر هزرڤانێکدا نەك ئەو شتەی کە دەیڵێ، بەڵکو نەگوتراوەکانیەتی. مۆنتنی لە زاری کوئینتیلانوس گوتویەتی:" ئەمە دانایی‌یە کە زایەنەری دژوارییەکانە". بە دەربڕینی دیکە، راڤەیە کە دواجار کارەکە سەخت‌و دژوار دەکا: "کێ هەیە کە نەڵێ لێکدانەوەکان دڕدۆنگی‌و نەزانیی ئێمەیان زێدە نەکردوە؟ چونکە هیچ پەرتوکێك چ نوسینێکی مرۆیی یا پەرتوکێکی یەزدانی ناتوانی بەدی بکەیت کە گرێدراوی ئەم جیهانە بێ و دژوارییەکانی لە رێگەی راڤەکانەوە چارەسەر نەکردبێ". مۆنتنی جەخت دەکا کە سەدان راڤەکار دژوارییەکانیان وەکو میراتێك بە راڤەکارانی پاش خۆیان سپاردوە و کاری ئەوان چەند قات گرنج گرنجتر و وڕکەرتر لە لێکدەرەوانی پێشو دەرچووە. کە وابوو ئێمە چ کاتێ لەنێو خۆماندا، ئازادانە رێك دەکەوین کە ئەم بەرەنجامە، ئەم قسەو "ئەم پەرتوکە بەسە و لێرەوە ئیدی جێیەك بۆ گوتن نەماوەتەوە؟"[١٣] مۆنتنی وڵام دەداتەوە: هەرگیز. هەڵبەت ، وەکو خاڵێکی پاشکۆیی‌و سەر ئێشەکانی یاسا بێ‌ئەژمارەکان، لێرەشدا دەتوانین ئارەزو بکەین کە ئەگەر پێویستیمان بە راڤە بێ بگەینە کۆتایی رێگەکە، وەلێ ئەمە تەنیا ئارەزویەکەو بەس. هەرایەك کە لەمەڕ "راڤەی راڤەکان" ئاخێزاوە، زیاترە لەو هەرایەی کە لەمەڕ راڤەی شتەکانە. پەرتوکەکان زیاتر لەمەڕ پەرتوکەکانی دیکە دەنوسرێن و کەمتر لە بارەی شتەکانی جیهان. ئێمە لە سەر باوەڕەکان بەگژیەکدا دەچین و نەك لە سەر خودی شتەکان، ئێمە هیچ کارێك ناکەین جگە لە هێنانە ئارای لێکدانەوەو راڤە لە راڤەکانی دیکەو درێژەو دووپاتبوونەوەی مشت‌ومڕ لە بارەی راست‌و چەوتیی راڤەکان. دەبێ دان بەوە دابنێین هەموو جێیەکمان "بەم هەموو راڤەیە" لێوڕێژ کردوە، بەڵام هیچمان بە هیچ نەکردوە. لە زیادبوونی یاساکان و راڤەکان تەنگمان پێ‌هەڵچنراوە. باوەڕەکانی ئێمە لە یەکدییەوە دەست پێدەکەن و گرێ دەدرێنەوە بە یەك. راڤەی یەکەم مایە و دەسمایەی کاش(پول نقد) ە و بۆ راڤەی دووەم کە خۆی بە کاری راڤەی سێهەم و راڤەکانی دواتر دێت؟[١٤]

کەوابوو بۆچی سەرەڕای ئەم هەموو دژوارییە ئێمە هەروا هۆگری راڤەی راڤەکان دەمێنینەوە؟ چونکە ویستی راڤە هەمان ویستی دانایی‌یە و هەر چەشنە ئەزموونێکی جیهان، بەردەوام ئاراستەیەکی راڤەیی هەیە. بە گوتەی ژولیا کریستوا هەر راڤەیەك لە تامەزرۆیی

(13) ibid, P. 357.

(14) ibid, pp,357-358.



واتابەخشین بە جیهان بیچم دەگرێ.[١٥] ئێمە لە ئەزموون- تەنانەت لە سادەترین ئەزموونەکانی پێوەندیدار بە درك پێکردنی هەستەکیمان- راڤە دەکەین. ئێمە بەردەوام، سەرەتا بە شێوەی دەربڕین یا ناسینی زەینی و زۆرجاران بە شێوەی دەربڕینی زمانی، بەرەنجامی ئەزموونمان بۆ کەسانی دیکە وەکو راڤە دەخەینەڕوو. رەنگە بتوانین هۆی دیکەش بۆ تامەزرۆیی ئێمە بۆ راڤە پەیدا بکەین: ئەزموونی راڤە، هەمیشە بە واتای راڤەکردنی راڤەیەکی دیکەیە و هەر ئەم هاوپێوەندییە نێوەکییە زانیارییەکانمان لە جیهان خودان دەرکەوت و ڕووناك دەکاتەوە. هەمدیس دەتوانین هۆیەکی دیکەش بەدی بکەین: راڤە ئامرازێکی گرنگە لە رایەڵکردنی پێوەندیی نێوانزەینی و مرۆیی. ژولیا کریستوا دەنوسێ کە راڤە بە واتای" دروستکردنی پێوەندی"یە. ئەویش لەم خاڵەوە دەست پێدەکات کە پەرەوازەیی و قرەفاقێتیی راڤەکان تەنیا لەبەر ئەم هۆیە سەرهەڵ نادا کە هەر راڤەیەك دەسکەوتێکی زەینییە و زەینەکان جیاوازن. دەرونشیکاریی فرۆیدی و پاش فرۆیدی فێرمان دەکەن کە هەموو ئاگاییەك فرەکەرتی و بەدەر لە چەقە. ئەم" لێك پچڕانی ناسکار"ە دەرخستنی راڤەگەلی فرەچەشن و تەنانەت دژبەری لە لایەن کەسێکەوە لێ دەکەوێتەوە. ئەم خاڵە دەبێ بە گرێدراوی بنچینەی زمانیش بزانیت، چونکە زمان ئەم هەڵکشانی لێك پچڕانی واتایی‌یە توند دەکاتەوە. هەر کردەو دەربڕینێکی راڤەیی پشت ئەستورە بە روانگەگەلی فرەفاقانەی تاکەکەسێك. ئەم پرسیارە کە چۆن و بە چ جۆرێ واتا لە کردەی راڤەییدا دەدرێتە پاڵ شتێك و لە بنەڕەت را ئەم کارە لە هەر خاڵێکی دیاریکراودا پشتی بە کام" دیتەی راڤەیی"( واتە پێش- زانراوەکانی راڤەکەر) بەستوە، خۆی یەکێك لە مەسەلە نێوەندییەکانی هێرمێنۆتیکە. هەر کردەیەکی راڤەیی لە" تامەزرۆیی بە واتابەخشین"ەوە هەڵدەقوڵێ. بە رای کریستوا ئەم تامەزرۆییە کە لە خۆیدا بەردەوام بە واتای کەمایەسییەکیشە، سروشتێکی پێوەندیکارانە- و هەر لەبەر ئەمە سیاسی- هەیە. تامەزرۆیی بە واتابەخشین، ویست یا لێڕوانینێکی پاك و بێگەرد و بێ‌لایەن نیە. راڤە لە لایەکەوە پشت ئەستورە بە پێشداوەرییەکان و زانراوەکانی پێشوی راڤەکار و لە لایەکی دیکەوە، بەردەوام بۆ ناسکاری بێژیار و ناسێنەر ئەگەری ئەوە دەڕەخسێنێ تا وەدوی" داهێنانی شوناس"ی خۆی بکەوێ. واتە لە فرەکەرتیی خۆی تێپەڕ ببێ -یا بیشارێتەوە- و

(15) j.kristeva, “psychoanalysis and the polis” in: g.l.ormiston and a.d.schrift eds, transforming the hermeneutic context, stat university of new York press, 1990,pp.89-105.

شوناسێکی گریمانکراو و تاقانە بۆخۆی دابهێنێ، کە ئەمەش لە بنیاتی خۆیدا کارێکی سیاسییە. بەم چەشنە تاکەکەس لە رەوتی راڤەکردندا خۆی لە شوێنگەیەکی تایبەت لە هەمبەر کەسانی دی بنەجێ دەکات. تامەزرۆیی ئێمە بە راڤە لەگەڵ پێویستیمان بە هەنتەش لە جڤاکی سیاسی، واتە ژیان لەگەڵ کەسانی دی و نێوەوەی هەمبەرێتیگەلی دەسەڵات و سەرکوت هاوپێوەندە. راڤەکردن دروستکردنی هەمبەری نێوان"من"( منی داهێنراو و گریمانکراو) لە تەك دنیایە و لە ویستی هێز و لە پێویستیی خاوەنداری و باڵادەستی بەدەر نیە.

ئەزموونی راڤە هەتاکو دەربڕینی ویست و پێویستیی ئێمە دروستکردنی شوناسێکی تاقانە و گریمانکراو بێ، هەمیشە خۆی لە قاڵبی" ئەپستمۆلۆژیك" دەنوێنێ. دەمانەوێ کەتوارەکان واتە شتەکان، کەسانی دی و خۆمان بناسین. ئەوانەش لە زماندا و بە زمانی خۆمان دادەهێنین. ڤیتگنشتاین لە برگەی پەنجا و پێنجی پەرتوکی zettel نوسیویەتی:" هاوئاهەنگی لە نێوان هزر و کەتوار، وەکو هەرشتێکی میتافیزیکی دەبێ لە رێزماندا بەدی بکرێ"(١٦) ئەم هاوئاهەنگییە نە بوونی هەیە و نە دروست دەکرێ، بەڵکو بە یارمەتیی رێساکانی زمان" گریمان دەکرێ". ناتەبایی راڤەکان هەمان ناتەباییە کە زادەی زمانە، هەم جیاوازییەکی زمانی یە و هەم نەلواوبوونی تێپەڕین لە لەمپەرەکانی پێوەندیکاری نیشان دەدا. نەشیان بەراوردی* راڤەکان، خۆی زادەی جیاکارییە زمانییەکانە. چاکترە لەمبارەشەوە بگەڕێینەوە لای مۆنتێنی. لە وتارنامەکەی مۆنتێنیدا دەخوێنینەوە کە" بەگژیەکداچوونەکان و ناتەباییەکانی ئێمە ئاخاوتەیین. من دەپرسم سروشت، بازنە یا (کردار) لە جێنانی چ شتێکە؟ پرسیاری من لەبارەی پەیڤەکانە، وەڵێ بە هەمان پەیڤگەلەوە وڵام وەردەگرێ:" پاتۆرە بەردێك قەڵافەتێکە". بەڵام ئەگەر بمانەوێ وردتر باس بکەین(و بپرسین) **"١- وەڵێ قەڵافەتێك چیە؟(دەبیسین) ***"- تەنێك"، و — تەنێك چیە؟" و شتی لەم چەشنە. دەتوانین بەرامبەر

(16) l.wittgenstein. zettel, trans.g.h.m.anscombe.oxford, 1981,p.11.

* قیاس ناپـذیری: ئەو شتەی ناشێ بەراورد بکرێ و پێوەری بەراوردی نیە.(و)

** تێبینی لە نووسەرە

*** تێبینی لە نووسەرە



(بیسەر- خوێنەر) تا دواین لاپەڕە و (وشە) * ی فەرهەنگی وشەکانی پێشڤە بەرین. ئێمە بەردەوام وشەیەك لە تەك وشەیەکی دیکە دەگۆڕینەوە..."(١٧)

مۆنتێنی دەڵێ دانەپاڵی واتای وشەیەك بە وشەیەکی دیکە کە تا بێ بنەتا درێژە دەکێشێ، وەکو ئوستورەی یونانیی سەربڕینی ئەژدیهایەك بە ناوی هیدرایە. بە پێی ئوستورەی ناوبراو هەر لەگەڵ لە مل دانی هیدرا، سەرێکی دیکەی لە جێ دەڕسکا. جێی سەرنجە کە ئەفلاتونیش ئەم نموونەیەی لە کتێبی چوارەمی **کۆمار**(٤٢٦ پ.ز) لەمەڕ یاساگەلی بێ ئەژمار لە حکومەتێکی نالەبار هێناوەتەوە.(١٨) مۆنتێنی لەدرێژەی باسەکەیدا هێما بۆ گفتوگۆی سوکرات و مێنۆ دەکا کە نەك لە نووسینەکانی ئەفلاتون، بەڵکو لە وتارنامەی **لە بارەی هێژامەندی** بەرهەمی پلۆتارك هاتوە. سوکرات لە مێنۆ دەپرسێ: " هێژامەندی چیە؟" و مێنۆ وڵام دەداتەوە "من لە هێژامەندییەکان دەدوێم و نەك لە یەك هێژامەندی. واتە من تەنیا دەتوانم هێژامەندیی پیاو، ژن، پیاوی دەوڵەت، شارۆڤەندی ئاسایی، منداڵ، بەساڵاچوو و...هتد بەیان بکەم". سوکرات دەڵێ: "چ دەسپێکێکی باشە! ئێمە عەودالی یەك هێژامەندی بووین، ئێستە لەگەڵ کەڵەکەیەك لەوان (هێژامەندی) بەرەو روو بووینە". مۆنتێنی لەم سەرسوڕمانەدا لەگەڵ سوکرات هاوپشکە و دەڵێ ئێمە تەنیا یەك پرسیار دەکەین،بەڵام لە گەڵ کەڵەکەیەکی ناکۆتا لە وڵامەکان بەرەوڕوو دەبین. ئێمە لەگەڵ واتای واتایەکی دیکە، دەربڕینی دەربڕینێکی دیکە، راڤەی راڤەیەکی دیکە بەرەوڕووین و هەر ئەزموونێکیش بە یاریدەی راڤە واتە لە رێگەی گەڕانەوە بۆ راڤەگەلی زۆر و زەوەندی دیکە دەزانرێت و دێتە گۆڕێ.

## (٣)

تا ئێرە چەند جار لە " ئەزموونی راڤە" دواین. هەر چەند-لام وایە واتاکەی تا رادەیەك رۆشن بۆتەوە، وەڵێ کاتی ئەو هاتوە کە بە وردبوونەوەیەکی زیاتر پێوەی سەر قاڵ بین. لە بەشی یەکەمی ئەم وتارەدا دیتمان کە ئەرەستۆ ئەزموونی کەم بایەختر لە هونەر یا تێخنە دەزانی، ئەو لە راستیدا ئەزموونی بە کارێکی میکانیکی، سەرنجدەری وردەکارییەکان، بە

* تێبینی لە نووسەرە

(17) Montaigne . op.cit,p.359

(١٨) افلاگون، پیشین (دوره اثار) ص ١٠٠٨

دوور لە ئەفراندن و رەژیدەیی، کە تەنانەت هیرادەرانەش نیە، لە بەر چاو دەگرت. دەتوانین بڵێین کە بەڕای ئەو ئەزموون- کە لە دەربڕین یا راڤە بە جیای دەزانی- تەنیا وەکو یەکەم هەنگاوی تاوتۆی و ناسین ئەژمار دەکرا. بەڵام ئێمە دانەدوی واتایەکی دیکەی ئەزموونمان کرد و بە یاریدەری مۆنتنی زانیمان کە ئەزموون و راڤە پێك بەستراون و هۆیەکیش بۆ جیاکردنەوەیان لێکدی نیە. لە درێژەی ئەم باستەوەرەدا تێدەکۆشم تا نیشان بدەم کە هەر ئەم خاڵە ئێمە روە و واتایەکی تازە لە ئەزموون رێنوێنی دەکا. تا ئێرە رۆشن بۆتەوە کە باسەکەی ئێمە لە قەڵەمڕەوی پێناسە ئاشناکانی فەلسەفە دەمێنیتەوە و لەبەکار هێنانی خوازەیی ئەزموون چاو پۆشیم کردوە. لە راستیدا کاتێك کە دەڵێین" ئەزموونی نێواخنی"" ئەزموونی هونەری" و " ئەزموونی دینی" و... پەیڤی ئەزموون لە واتایەکی میتافۆریکدا بەکار دەبەین و هەر ئەم واتایە دەتوانێ رێخۆشکەری درك و فامێکی تازە لە ئەزموون بێت. وەلێ من لێرەدا کارەکەم لە پەڕانپەڕی نێوەکیی سنورەکانی ئاخێوی فەلسەفی قەتیس کردۆتەوە و تێکۆشاوم تا لە پانتایی هزرگەریی فەلسەفی لە واتایەکی تازەی ئەزموون، کە لە هاوپێوەندیی لەگەڵ راڤە دەگاتە بەرەنجام، تێهزرم. ئەم کارە هەرچەند تا رادەیەك دژوارترە لە رێ کردن لە رێچکەیەکدا کە سەرنجدان لە واتاگەلی خوازەیی ئەگەرەکەی دەڕەخسێنێ، وەلێ بەرەنجامێکی هەمەکیتر و قەناعەت پێکەرتر دەدا بە دەستەوە، بە تایبەتی کە بە پێوانی رێچکەی توێژینەوەی فەلسەفی دەتوانین رێنمای "هەمبەری ئەزموون لەگەڵ زمان" لە بەردەماندا بەدی بکەین.

ئەزموون یەکەمین چەمکێکە کە پەرتوکی گەورەی کانت **هەڵسەنگاندنی ئاوەزی پەتی** بە وەوە هەڵدەدرێتەوە. لەوێدا دەخوێنینەوە:" ئەزموون بێگومان بەروبوومێکە کە تێگەیشتنی ئێمە رەنێوی دەهێنێ، بە جۆرێك کە تێگەیشتن مایەی دۆزراوە هەستەکییەکان وەبەر دێنێ [19]."هێمای کانت بە نۆڕینی راستەوخۆ، یا بەرەوڕووبوونەوەی هەستەکی لەگەڵ دیاردەکانە. جۆرێك بەرکەوتی نێواخندۆزییانە، بەدەر لە بەراورد، بەرەنجامگیری، ئێستقرا و ئەرکگەلی لۆژیکیی زەین. ئەزموون وەکو دیتنی ناڕاستەوخۆی رووداوێك، دەست خشاندن بە شتێکدا، یا بیستنی دەم دەنگێکە*. کانت لە دوو پێشگوتاردا کە بۆ دوو هەڵچنیی جیاوازی

(١٩) . ا. کانت. **سنجش خرد ناب**، ترجمەی م.ش. ادیب سلطانی، تهران، ١٣٦٢،ص٦١.

* دەنگی دەم، دەنگی زمانی نەك سروشتی (اوا. ف) phone



کتێبەکەی خۆی نووسی، هێمای بۆ ئەم چەمکە دەکرد. ئەو ئامانجی خۆی بە شێوەیەکی تایبەت ـ لە رێگەیەکی نیگەتیڤ ـ گرێدراوی ئەم چەمکە دەزانی:"من هەڵسەنگاندنی وزەی ئاوەز بە شێوەیەکی گشتی لە پێوەندی لەگەڵ هەمو ئەو ناسینانە لە بەرچاو دەگرم کە ئەو وزەیە، سەربەخۆ لە هەر چەشنە ئەزمونێك، دەتوانێ لە وەچنگ هێنانیاندا تێ بکۆشێ" ، بە[٢٠] بۆچونی کانت، ئاوەز لە دەسپێکە ئەزموونییەکانەوە دەست پێدەکا، وەلێ بۆی دەردەکەوێ کە گەر بەم چەشنە بڕوا، مەسەلەکانی سەر رێگای چارە ناکرێن، کە وابوو:"خۆی دەروەست دەبینێ کە پەنا وەبەر ئەو دەسپێکانە ببا کە لە هەمو بە کار هێنانە لواوەکانی ئەزموونی بڵێند گوزەر دەکەن...و هەر کە لە سنوری ئەزموون، وێکڕا بچنە دەرێ، ئیدی پارسەنگی ئەزموون ناناسنەوە"[٢١] کانت کاری خۆی دۆزینەوەی سنورەکان، کەوشەن و ئەرکی ئەم ئاوەزە پەتییە، لە پانتاییەك بەدەر لە هەر چەشنە ئەزموونێك زانیو نووسی، چونکە"ئەمە تەنیا رێگەیەك کە ماوەتەوە"[٢٢] و هەمدیس لە پێشگوتاری پێداچوونەوە و هەڵچنیی دووەمدا نووسی کە ئەمە تاکە رێگایەکە، چونکە ئەگەری ئەوە دەڕەخسێنێ تا توانامان بەسەر ناسینگەلی پێش ئەزمونی (پێشینی*) بشکێ. کانت لە "شیپانەی زانستەکان" واتە لۆژیكو پاشان ماتماتیكو فیزیك دوا و ئەم دوانەی بە "ناسینگەلی تیۆریکی ئاوەز کە بەرناسەکانیان لەلایەن ناسینی پێشینیەوە دیاری دەکرێ" ناودێر کرد. نمونەی ئەو لە ماتماتیك جێی سەرنج و شایانی خوێندنەوەیە:"یەکەمین کەسێك کە تایبەتمەندیی سێگۆشەی یەکسان چەق (**مثلث متساوی الساقین**) ی نیشان دا... پشکۆیەك لە خەیاڵدانیدا هەڵگڕا. چونکە ئەو بۆی دەرکەوت کە نابێ ئەو شتەی کە لە بیچمدا دەیبینێ، یا تەنانەت لە چەمکی پەتیی بیچمی سێگۆشەدا هەیە، پەیجۆر بکا، تاکو ـوەك بڵێی ـ تایبەتمەندییەکانی سێگۆشەی لێوە فێربێت، بەڵکو دەبێ شتێك رەنێوبهێنێ کە خۆی، بە پێی چەمکەکان، ناسینی پێشینی، (لە رێگەی پێکهاتەوە) لە بیچمی سێگۆشە لێی تێهزریوە و لەودانواندویەتی"[٢٣] لەمەڕ

(٢٠) پیشین (**سنجش خرد ناب**) ص ١٣.

(٢١) پیشین ،صص ٩-١٠

(٢٢) پیشین، ص١٣

* ناسینی بەرایی/ فۆرمولی و هاوکێشەیی وەکو٢X٢=٤ (و)

(٢٣) پیشین،صص ٢٦-٢٧.

زانیارییە سروشتییەکانیش کانت بۆ دەرخستنی خاڵگەلی پێش ئەزموونی درك پێکردنێکی یەکسەر تازە لە ئەزمون دێنێتە پێشێ:"کاتێك کە گالیلۆ (گۆ) یەکانی کە پێشتر لە قەپان* دابوون و (کێش) ە کەیانی دیاری کردبوو لە سەرکۆیەکی سەر لێژەوە گلۆری کردنەوە، یا کاتێك کە توریچلی ویستی بە پاڵەپستۆی هەوا کێشێك کە پێشتر خۆی بە پێی ستونێکی دیاری کراو لە ئاو دیاری کردبوو بگوازێتەوە، کاتێك کە شتال کانزاکانی دەگۆڕی بۆ ئۆکسیدەکانو ئۆکسیدەکانی دووبارە دەکردەوە بە کانزا، بەم چەشنە کە شتێکی دیاریکراوی لێ کەم دەکردنەوە و دووبارە شتێکی پێوە زیاد دەکردن، بۆ توێژەرە سروشتییەکان دیناوێکی پرشنگدار هاتەبەر، ئەوان تێگەیشتن کە ئاوەز دەبێ لەگەڵ بنەواشەگەلی داوەرییەکانی خۆیان بە پێی رێسانەگۆڕەکان بچێتە پیشەوە و سروشت ناچار بکا وڵامی پرسیارەکانی ئەو بداتەوە، نەك لێگەڕێ لە سەر دەستی سروشت بەملاوبەولادا پەلکێش بکرێت...".[24] کانت بە سەر ئەم هەڵێنجانە لە ئەزموون (تاقیکاری بۆ سەلماندنی خاڵێکی تیۆریك) ئەمەشی زێدە کرد کە ئاوەز لە سروشتەوە فێر دەبێ:"وەلێ نەك بەو دانسقەییەی کە قوتابییەکی قۆناخی سەرەتایی لێ دەگەڕێ مامۆستاکانی هەرچی کە دەیەوێ فێری بکەن، بەڵکو بە پیچەوانەوە، لە ئاستی چۆنایەتیی دادوەرێکی فەرمی کە شایەتحاڵەکان دەروەست دەکا بەرسڤی پرسیارگەلێ بدەنەوە کە ئەو لییان دەپرسێ. هەر بەم چەشنە، تەنانەت فیزیك شۆڕشی پڕخێرو بەرەکەت لە شێوەی هزری خۆیدا، پاوانکراوانە وەبەر هاتوی ئەم هزرەیە کە "فیزیك دەبێ بە پێی ئەو شتەی ئاوەز خۆی لە سروشتدا دایناوە، ئەو شتە لە سروشتدا پەیجۆر بکا (نەك چەشنی ئەفسانە هۆنینەوە بیداتە پاڵی( سروشت)  کە دەبێ هەمان شت لە سروشتەوە فێرببێ-شتێك کەلەبارەیەوە ئاوەز ناتوانێ(لە بارەی خۆی) هیچ شتێك فێرببێ[25] دەبینین کە هەر ئەو گەلاڵە سەرەتایی یە ـ و هەڵبەت ئێجگار هەڵسەنگێنراو ـ خاڵگەلی پێش ئەزموونی، کرداری ئەزموون کردن بە واتای نۆڕینی شتەکانو بەرەوڕووبوونەوەی راستەوخۆ لە گەڵیان دەگۆڕێت و دەیکاتە شتێکی تازە. ئەزموون لە سەر بنەمای دانایی پێشوتر، بە پێی نموونەکەی کانت، وەکو کردەی دادوەرێکە لە دادگا، کە دەبێ گەواهیدەران ناچار بە گوتنی راستی بکا، کە وابوو بە خاترجەمییەوە

* کێشانی شتێك کە تەرازو نەتوانێ بیکێشێت، قەپان گەورەترە لە تەرازو.(و)

(٢٤) پیشین،ص ٢٧.

(٢٥) پیشین (سنجش خردناب) ص٢٨.



گەواهییەکەیان پەسند نەکا و لەگەڵیان گومانکارانەو لە سەر بناخەی زیاترین ئاستی دڕدۆنگی بەرەوڕوو دەبێ. لێرەدا هاوواتای فەرەنسیی ئەزموون واتە Expêrience لە رەچەڵەی یونانیی خۆی نزیك دەبێتەوە. Peria کە ریشەی وشەکەیە، بە واتای تێکۆشان بوو. ئەزموون لە راستیدا تێکۆشانێکە بۆ تاقیکردنەوەی دانایی پێشوو. ئەگەر ئەم واتایە پەسند بکەین، دەتوانین ئەزموونی راڤە بە شێوەیەکی رێخۆشکەر بێنینە ئاراوە. راڤە پشت ئەستورە بە دانایی پێشوتر، بەڵام راڤەکەر دەزانێ کە ئەمە دانایی تەواو نیە، ئەگینا پێویستیەکی ئەوتۆ بە کردەی راڤە لە گۆڕێدا نەدەبوو، کە وابوو تێدەکۆشێ تا بە راڤەی خۆی رێگە بۆ گەواهیی گەواهیدەران ئاوەڵا بکا، لە حاڵێکدا کە متمانەی تەواویشی بەوان نیەو دیلی ئەم خەیاڵکردە نیە کە دەستی بە هەقیقەت رادەگات. بەم چەشنە لە زاراوەی "ئەزموونی راڤە" لە چەمکی ئاشناو برەوداری "ئەزموون" لە فەلسەفەدا دەتوانین بانتر هەڵکشێین.[26] ئەزموون دەتوانێ ئیدی تەنیا "زانینی پشت ئەستور بە نۆڕینی راستەوخۆی دیاردەکان"یا واتای بەرتەسکتری "بونیادی هەستەکیی ئەم زانینە" نەبێ. ئەزموونی راڤە بەرهەڤکردنی بوار یا هەڵکەوتێکی "دەستکرد"، (artificielle) ە تا راست و دروستیی بڕیار، گریمانە یا بەرەنجامێك تاقی بکرێتەوە. ئەگەر لە راپۆرتی پەرتوکێك یا فیلمێك زانیاریگەلێ لەبارەی "نەشتەرگەریی دڵی ئاوساو" وەدەست بێنم، ئەزموونی من نەك لەو نەشتەرگەرییە، بەڵکو لەو پەرتوکە یا فیلمە دەبێت. ئەگەر ئەو شتەی کە زانیومە لەسەر بنەمای بەراورد، یا باشتر بڵێم لە سەر کۆڵەکەی تاقیکردنەوەی بە پێی سەرچاوەکانی دیکەی زانیاری  راست یا چەوت لە قەڵەم بدەم، (کەوابوو)  راڤەم کردوە. هەر بەو جۆرەی کە لێکدەرەوە و راڤەکاری دەقێکی دینی ئەزمونێکی راستەخۆی لە رووبەڕووبوون لەگەڵ خوا نیە و تەنیا گریمانێك، یا زانراوێکی پێشوتر لەگەڵ گریمان یا زانراوێکی تازە هەڵدەسەنگێنێ. ئەزموونی ئەو لەم هەڵسەنگاندنەدا

(٢٦) هەڵبەت، باڵادەستی چەمکی باوی ئەزموون لە فەلسەفەدا، بەرتەکدەری چەمکگەلی دیکەی نیە. فردیناند ئالکیە ڕاستی پێکاوە، لە پەرتوکی کەم قەبارە، بەڵام کورتو پوختو بە سودی **ئەزموون** نوسیویەتی کە فەلسەفە کەمتر چەمکێکی تێکچڕژاو و لێڵی وەکو چەمکی ئەزموونی ئافراندوە. رازی تێکچڕژاویی ئەزموون لەوەدایە کە ناتوانرێ توخمێك لە سیستمی هزر ئاسای  شیرازەمەند کە خودان یەکانگیریی نێوەکی بێت، بزانرێت.

F.ALquie, Lexperience, Paris, 1970,P. 11 .

وەشێراوە و بڕیاری ڕاڤەکەیشی ڕێگە خۆش دەکا تا باسێکی تازە دەست پێبکا، شتانێکی تازە بێنە گۆڕێو ڕێگە بۆ دیناوەکان و هزرگەلی تازە خۆش بکرێت. ئەم ئەزموونە لەسەر زانراوەکانی پێشو، لەگەڵ کۆمەڵە گریمانێك (یا پێشداوەرییەکان) ڕۆنراوە، لە بەر ئەم هۆیە سەروکاری لەگەڵ ڕاڤەگەلێ کە پێشتر خراونەتە روو هەیەو ناتوانێ لە کۆڵیان بکاتەوە. کەوابێ دەتوانین بێژین کە هیچ ڕاڤەیەك بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاری یەك کەسو هەرامەیەکی تاکەکەسی نیە. بە دەربڕینی دیکە، هیچ ڕاڤەیەك بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و تاکەکەسی، دەربڕینێك لە کەتوارێك (لە ڕێگەی ئەزموونو تاقیکارییەکی ڕاستەوخۆ) نیە، بەڵکو داوەریو هەڵسەنگاندنە، دەتوانی چەندو چوونی، لە هەمووش گرنگتر بۆچیو لە بەرچی(؟) دیاردەیەك، هەبوونێك، ڕوداوێك، کردەیەك، ڕایەك، یا دەقێك "بێنێتە پێشێ". ڕاڤە ڕێگەچارەی تێکڕای مەسەلەکان نیەو لە ئەزموونی ڕاڤەدا پرسیارەکان دەپرسین، نەك ئەوەی وڵامێك بەرهەڤ بکەین. لە ڕاستیدا ئەم ڕەگ داکوتانی ئەزموونی ڕاڤە لەسەر دانایی پێشوتر، واتە پشت بەستن بە ڕاڤە یا ڕاڤەکانی پێشوو، پشت بەستنی ڕاڤەکار بە "ئەویدی"یە. ئەزموونی ڕاڤە نیشان دەدا کە ناکرێ سەربەخۆ و بە تەنێ بڕیار بدەیت، بەڵکو بەردەوام پێویستیمان بە ئەویدی هەیەو بە یاریدەی ئەو کارەکان دەبەینە پێشێ. بە هێنانە پێشی ئەزموونی ڕاڤە و سەرنجدان لە واتای تازەی ئەزموون، دەردەکەوێ کە لە چەمکەکان و هەڵێنجانە فەلسەفییە کۆنەکانی ئەزموون،"دەربڕینی ئەزموون" چەندە پشتگوێ خراوە. سەرنج لەو هەڵێنجانە کۆنە لە ئەزموون بدەین. تازەلاوێك لە یەکەمینساڵانی خوێندن لە بەشی کیمیا، بە ئامرازەکانی تاقیگە ئاشنا دەبێ و شێوەی کار (بەو ئامرازانە) ئەزموون دەکا. ئەو لە کردەیەکدا کە "تاقیکاری" پێ دەڵێن، مادەی هەمە جۆرە پێکەوە تێکەڵ دەکا و"بەرەنجامگەلێ" وەدەست دێنێ. لە ساڵانی دواتری خوێندندا ئەمەش فێردەبێ بەرەنجامی ئەم تاقیکردنەوانەش تۆمار بکات. ئەم کارە بە واتای دانانی بەرەنجامەکان لە جەرگەی نیشانە تایبەتیەکانە. تۆزێك پشودرێژی و تەرخانی کات، دەبێتە هۆی ئەوە کە ئەو نیشانەکانو لۆژیکی نوسینی فۆرمۆلەکان فێر بێت. بەمجۆرە تازەلاوی ئێمە، بەرەنجامێك کە پێشتر وەدەستی هێناوە لەجەرگەی هێماگەلی ڕێککەوتەیی تۆمار دەکا. لە دیدی ئەوەوە کردەوەی تۆمار و بنەجێی ئەزموون نەچەندان دژوارە و نە زۆریش گرنگە. قوتابیی لاو هەر لە هەمان سەرەتاوە فێر دەبێت کە لە زانستدا خاڵی گرنگ، خودی ئەزموون، واتە کردەی پراکتیکیو نۆڕینی ڕاستەوخۆ و لە هەنگاوی دواتردا گشتگیرکردنی تیۆریکیەتی. ئەو لەنێوان ئەزموونی کردەکی و ئەزموونی تیۆریکی گشتگیرکردن لە لایەکەوە و ئەزموونی نڤیسیاری یا



دەربڕین لە لایەکی دیکەوە جیاوازیی بایەخدارانە دادەنێ. بڕوا بەم خاڵە دێنێ کە نووسین کردەیەکی لێکەوتەی دیاردەیی[*] (epiphenomenal) یە، کە بڕیار نیە بەرەنجامێکی تازە لەو وەچنگمان بکەوێ. هەروا پەسند دەکا کە توماری ئەزموون یا دەربڕینیشی دوا بە دوای ئەزموونی کردەکی دێت و بەوەوە واتا پەیدا دەکا. لە دەربڕینی ئەزموونی کردەکی تازەگەریی هزرئاسا بوونی نیە و دەربڕین بە پێچەوانەی" ئەزمونی زانستی" بە مانای دیناوێك نیە. بە گوتەیەکی دی، تازەلاوی ئێمە دەگاتە ئەو بەرەنجامەی کە لێرەدا زمان" کێشەیەك نیە" و بڕیاریش نیە کە لە تۆماری ئەزموونندا ڕووداوێکی تازەش ڕووبدا، یا شتێکی تازە بدۆزرێتەوە، بەڵکو شتە تازەکان یەکسەر بە قەڵەمڕەوی ئەزموونی کردەکی و زانستی پەیوەستن. ئەم تێگەیشتنە لە ئەزموون و دەربڕین، هەڵبەت بە هەرامەی هەمەکیی شێوەکانی هیراگەریی زانست گرێ دراوە و لەگەڵ پێڕستبەندیی ئاوەز باوەڕانەی دانایییەکان یەکانگیرە. وەلێ دەبێ جەخت لەسەر خاڵێکی گرنگتر بکەینەوە: هەڵێنجانی کۆنی ئەزموون، لە ڕاستیدا درك پێکردنێکە لە زمان، پشت ئەستورە بە تیۆرییەکی تاك ئاقارنواڕ و قەتیس کراو لە زماندا. لە بەرانبەردا تیۆرییەکی وردتر و کت ومت هەیە کە بە پێی ئەو تیۆرییە هەم درك پێکردن یا تۆماری زەینیی "ئەزموونگەلی" بەرهەست، هەستپێکراو و هەستەکی و هەم تۆماری ئەوانەش لە جەرگەی نیشانە زمانییەکان، ناتوانن لەگەڵ یاساکانی دەربڕین، واتە خوازەکانی دەربڕین، ڕێساگەلی ڕێزمانی، سینتاکسی و وشەیی پێوەندییان نەبێ. هەموو ئەمانە کت و مت لە ڕێگەی ئەم پراکتیکە زمانییە( یا بە دەربڕینی وردتر پراکتیکی ئاخێوئاسا) لەگەڵ درك پێکردنی زاڵی زانستیی سەردەم (تامس کۆهێن ئەمەی بەرەژیدەی زانستی نۆرماڵ"normal" (یا ئاسایی) و سەرباشقە زانستیەکان ناودێر کرد و میشیل فۆکۆ ناوی پێڕستبەندیی دانایی لێنا) بەستراونەتەوە. هەربۆیە ئەزمونی کردەکی لە دەربڕین و پراکتیکی ئاخێوئاسا جیا نیە و ناتوانێ جیا بێت. ئەم پراکتیکە ئیزن نادا کە ئەزمون تەنیا لە نۆڕینی ڕاستەوخۆ و بێلایەن کورت

* پاچەڤەی ئەم زاراوەیە وشە بە وشەیە، لە رووی واتاییەوە بریتیەیە لەو بیرکردنەوانەی کە لەگەڵ دیاردەکاندا هەن، واتە هاوپێچ لەگەڵ بیرکردنەوە لە دیاردە هەندێ توخمی زەینی لە راڤەی دیاردەکاندا و لە رەوتی بیرکردنەوە وناسیندا بە چەشنێکی دەرهەست هەن و بە چەشنێکی بەرهەست نین/ پی- پدیدارانە، داریوش اشوری، فرهنگ علوم انسانی(و)

بکرێتەوە،بەڵکو بەردەوام ئەزموون لەواتای تاقیکاری، هەڵسەنگاندن، نرخاندن، دیاریکردنی راست و درۆ و ...هتد( واتە هەمان شت کە بە ئەزموونی راڤە ناومان لێنا) نزیك دەکاتەوە.

لێرەدا نەك تەنیا" پێشداوەرییەکان" (واتە زانراوەکانی پێشو) لە گۆڕێدان، بەڵکو سازوکاری تاقیکاریی زانستیش پەیتا پەیتا-هەروەك کانت گوتویەتی ئێمە بەرەو بارودۆخگەلی "دەستکرد" بۆ پێشەوە رادەنێن.

بۆچوونی هەموان لە ئەزموون، لەگەڵ هەڵێنجانی ئەو تازەلاوەی کە باسمان کرد جیاوازییەکی ئەوتۆی نیە. خەڵك لە باشترین دۆخدا، ئەزموون لەقەڵەمڕەوی کردەدا جێدەکەنەوە و زمان بە کردە ئەژمار ناکەن. ئەوان" دەربڕین" بە هەرامەیەکی لاوەکی و بەرەنجامی هەڵکشانێکی کردەکی لە قەڵەم دەدەن.

هیچکەس لە کارایی زمانی زەینیی خۆی لە راڤەی دەستبەجێی چرکەساتەکانی تاقیکاری تێناهزرێ.هەرچەند لەقەڵەمڕەوی تایبەت و ئێجگار تێکچڕژاوی زمانی زەینیدایە کە درك پێکردنەکان روودەدەن و تاقیکارییەکان پەیتاپەیتا رەخنە دەکرێن، (بەڵام) هیچکەس بیر لە تواناییەکان و بێتواناییەکانی ئەو زمانە ناکاتەوە. هەر بەو جۆرەی کە تازەلاوی ناوبراوی ئێمە کاتێك لە بەرانبەر بۆڕیی تاقیکاری و بۆرتدا رادەوەستێ و مامۆستاکەی گڕی چرای گازی بۆ درێژەدان بە" ئەزموون"تەراز دەکا ناتوانێ لە کارایی زمان تێهزرێت. وەلێ" فەلسەفەی زانست"ی ئەم رۆژگارەی ئێمە رێگەیەکی دیکەمان پێ نیشان دەدا. پۆل فیرابێند لە دەسپێکی پاری حەڤدەهەمی **لەدژی مێتۆد** نووسیویەتی کە بە سەرسەختی لایەنگری بنەواشەیەکە کە بنیامین لی ورۆف بە شێوەیەکی رۆشن و دڵکێش هێنابوویە پێشێ و بەرلەویش بیکۆن بە جۆرێك لە جۆرەکان هێنابوویە گۆڕێ و پێشبینی کرد بوو: زمان و ئەو پەرچەکردارانەی زمان دەیانوروژێنێ، تەنیاوتەنیا ئامرازێك نین کە لە راژەی وەسفی روداوەکان و هەڵکەوتی شتەکاندا بن، بەڵکو بیچم بە رووداوەکان دەدەن . رێزمان لە بەرگرەوەی گەردونناسی و روانگە و هەڵێنجانێکی وێکڕایی لە جیهان، کۆمەڵگا و هەل مەرجە مرۆییەکانە و هەموو ئەمانە لەسەر هزر، کردەوە و درك پێکردنی مرۆڤ و لەو نێوەدا لە سەر هەرچەشنە ئەزموونێکی مرۆیی شوێندانەرن.[٢٧]

تێهزرین بە یاریدەی زمان دەتوانێ تێهزرین لە زمانیش بێ. ئێمە بەردەوام لەگەڵ بەرتەسکییەکانی زمان بەرەوڕوو دەبین، کەوابوو چ باشتر لەم بەرتەسکییانە تێهزرین.

(27) p. feyerabend, contre la method, trans.b.jurdan et a.sclumberger, paris, 1998, pp.246-247



ژمارەیەك لەم چوارچێوە و بەرتەسکییانە لە خوازەکانی دەربڕیندا رەگاژۆیان کردوە و لە چیەتیی خۆیاندا مەسەلەیەکی گرێدراوی" تیۆریی دەربڕین"(rhetorique) ن. بڕێکی دیکە بۆ چیەتیی نیشانە ناسانەی زمان، واتە مەودای نێوان ئاخاوتە و وشەکان لەگەڵ هەرامەی دەرەکی دەگەڕێنەوە. تەنیا لە دەربڕینی ئەزموونێکی کردەکی، راستەقینە و پێشیندا نیە کە بەرتەسکییەکانی دەربڕین دەدۆزرێنەوە و دەزانرێن، بەڵکو ئەم بەرتەسکییانە لە گەوهەری بەیانگەری، یا نواندنی زەینیش ئاخێز دەکەن. هیچکات هیچ روداوێکی دەربڕینانە- تەنانەت ساکارترین و سەرڕاسترین دەربڕینەکان- ناتوانێ دووپاتبوونەوەی پەتیی رووداوێکی دیکە بێ. ئاخاوتە هەرگیز ناتوانێ تۆماری سادەی رووداوەکان و کردەکان بێ، بەڵکو لە رەوتی بیچمگیریی خۆیدا دەبێت بە گێڕانەوە، واتە شتگەلی زێدە لەگەڵ خۆ دێنێ و شتانی کەم، بەرتەسکیی خوازەیی پەیدا دەکا و لەگەڵ نەستی ئاخێوەر( یا نووسەر) هاوپێوەندی پەیدا دەکا.

خراپ نیە لەبارەی جیاکارییەك کە ئاوەزباوەڕی- و بە چەشنێکی چەندقات هەڵەشەتری زۆربەی خەڵکی-لەنێوان ئەزموون لەگەڵ دەربڕینی ئەزموون دای دەنێن و هەروەها لە رۆڵی سەنترالی ئەزموون و دەوری لێکەوتەی دیاردەیی دەربڕینی، کە دوابەدوای ئەو جیاکارییە دیتەگۆڕێ، زیاتر تێهزرین. پۆل فیرابێند لە کۆتایی پاری چواردەهەمی **لە دژی مێتۆد**، لە جیاکاریی نێوان زاراوەگەلی نۆڕینی(observation) (تاڕادەیەك هاوشێوەی ئەو شتەی لەم وتارەدا بە ناونیشانی ئەزموون هاتوە) و زاراوەگەلی تیۆریك (هەمدیس تاڕادەیەك هاوشێوەی ئەو شتەی کە لەم وتارەدا بە دەربڕین یا راڤە ناودێرمان کرد) دواوە و نوسیویەتی کە ئەمڕۆکە دەتوانین گرنگیی قسەکەی نویرات تێبگەین کە دەیگوت هەم دەکرێ تیۆرییەکان لەبەر نۆڕینە نایەکانگیر و دژبەرەکان وەلا بنێین و هەم بە پێچەوانەوە نۆڕینەکان لەبەر تیۆرییەکان دەکرێ بێبایەخ بزانرێن یا تەنانەت وەلا بنرێن:" سەرەنجام ئێمە دۆزیومانەتەوە کە فێربوون بە واتای بزوتن لە نۆڕینەوە بەرەو تیۆری نیە، بەڵکو بەردەوام و لە هەمودۆخێکدا، ئەم دوو توخمە دەگرێتە خۆی. ئەزموون لەگەڵ گریمانگەلی تیۆریك رەنێودەهێنرێ و نەك پێش ئەوان و ئەزموون بە بێ تیۆری تا هەمان بارتەقا لە فامکردن نایەت کە(وەك دەوترێ) تیۆری بە بێ ئەزموون."[٢٨] فیرابێند لە درێژەدا دەڵێ کە ئەگەر گریمان بکەین بتوانین بەرەبەرە بەشێك لە زانینی تیۆریکی ناسکارێکی هەستیار وەلابنێین، ئەو تەنانەت توانای ئەنجامدانی سادەترین کردەکانیشی

(28) ibid, pp.183-184.

نابێت. تەنانەت دەتوانین ببینین بە لە دەستچوونی دانایی تیۆریك، توانا هەستەكییەكانی ئەویش ئیدی بە كاری نایەن و ئەو" لە دۆخێكی سەرەتاییتر لە منداڵ رۆدەچێ". فیرابێند خاڵێكی گرنگتر لەمە دێنێتە پێشەوە و وەها دەنوسێ كە منداڵ" بەرلەوەی یەكەمین شتی هەستپێكراو ئەزموون بكا، خودان ئامرازی راڤەكردنە" ئامراز یا هێزی راڤەكردن توانایی زەینە و لە پێش ئەزموونندا هەیە و واتا بە ئەزموون دەدا. ئامرازی راڤەكردن لەكەسانی باڵق و"بە ئەزموون"دا، كەڵەكەی راڤەكانە، قەبارەیەكی هەرەمەزن لە راڤەكانی پێشوویە كە ئەگەری سەرهەڵدان بە راڤەیەكی تازە دەدەن و تاقیكارییەكان" لێكدانەوە، شیتەڵكردن و واتا"دەكەن. لەبەر ئەمەیە كە نۆرینی یەك بابەت بەلای دوو زاناوە كە لە دوو پێڕستبەندیی دانایی جیاواز بارهاتون و لە دوو پراكتیكی جیاوازی ئاخێوئاسا سوودیان وەرگرتوە، جیاوازە. بە گوتەی بە ناوبانگی تامس كۆهێن وشە و چەمكی هەسارە بۆ ئەستێرەناسانێك كە بەر لە كۆپرنیك و گالیلۆ و پاش ئەوان دەژیان، واتایەكی یەكگرتویان دەخستەڕوو، ئەوەندە كەڵكەڵە دەمانگرێ كە بێژین ئەوان لە دوو جیهانی جیاوازدا دەژیان.(٢٩)

## (٤)

هەنوكە، لە دەربڕینی هەر پێویستیی بانهەڵكشان لە واتای كۆنی ئەزموون،لە نوسینێكی فەیلەسوفێكی دیكە ـ كە رێز و پایەی كارەكەی هیچ كەمتر لە كاری كانت نیە ـ سەرنج بدەین. هێگل لە بەرایی **دیاردە ناسیی رۆح** وەهای نوسی كە ئێمە پێویستیمان بە واتایەكی تازە بۆ erfahrung یا ئەزموون هەیە. هێگل سەرەتا دەیهەویست پەرتوكەكەی خۆی بە "زانستی ئەزموونی ئاگایی" ناو بنێ، بە جەخت كردن لە سەر پەیڤی "ئەزموون" كە لەنێو هەردووك وشەكەی دی رۆنیشتبوو. لە رەوتی یەكەمین چاپی پەرتوكەكەی، كە لە ١٨٠٧ لە ژێر چاوەدێریی هێگل بڵاو كرایەوە، ناونیشانی (كتێبەكە) لە بەر هۆیەكی نائاشكرا گۆڕا بۆ: "زانستی دیاردە ناسیی رۆح". لە پاش مەرگی فەیلەسوف، ئەم پەرتوكە وەكو دووەمین بەرگی گشتكۆی بەرهەمەكانی ئەو بەم ناونیشانە كە ئەمڕۆ دەیناسین چاپ كرا، واتە وشەی زانستیش

(٢٩) بڕواننە "ڕاڤە و ڕێژەیی نواڕی لە فەلسەفەی زانستی ئەمڕۆ" لە: ب. احمدی ، كتاب تردید ، تهران، ١٣٧٤، بە تایبەتی لاپەڕەكانی ٢٢٤-٢٢٥ بۆ تێگەیشتنێكی نەریتگەرا لە مەسەلەكە بڕواننە:
L.Laudan" progess of rationality? , in: d.papineau ed, the philosophy of science , oxford university press, pp. 194-215



وەلانرا. واتای زانست یا "فەلسەفە بەو چەشنەی كە ئەمڕۆ دەتوانێ هەبێ" لە پێناسەكەی خودی هێگلدا رۆشن دەبێتەوە:"زانینی وەگەڕخراو لەو شتەی بە راستی هەیە". ئەو شتەی بە راستی هەیە، هەرامەی راستەقینەیە و كەتوارەكەی "رۆح"ە. كەتواری كاروباری راستەقینە، رۆحی رەهایە. هایدگێر لە وتارنامەی "چەمكی هێگل لە ئەزموون" دەنوسێ كە فەلسەفەی مودێرن بە لای هێگلەوە ـ بە پێی یاداشتێك لە وانەكانی مێژووی فەلسەفەی خۆی ـ بە واتای گەیشتنی زەین بە زەوی‌و تەناهی لە پاش مەترسیی زۆر و زەوەندی سەرگەردانی لە دەریا نەناسراوەكاندا بوو. هزری فەلسەفیی تازە خۆی لە خاكی خودئاگایی سەقامگیر دەكا و ئەم خودئاگاییە هەمان قەڵەمڕەوی پێش ئەزموونیی بنەواشەكانی ئەم فەلسەفەیە.(٣٠)

ئەم خودئاگاییە بە واتای كۆن‌و ئاشنای ئەزموون، ئەزموونی نیە. بەڵام لە رەوتی بەكامڵبوونی رۆح بەرەو رۆحی رەها بە واتایەكی تازە ئەزموون دەكرێ. بەم چەشنە پەیوەستە بە بڵێندیی رۆح‌و گوزەر لە پلەی خودئاگایی‌و زاڵبوون بەسەر ئاگایی ناشادو... لە یەك گوتەدا پەیوەستە بەو شتەی كە لە **دیاردە ناسیی رۆح** دا بە "ئۆدیسەی رۆح" ناوی لێنراوە. لە لایەكی دیكەوە، هۆیەكی تازەش لە سەر گرنگیی "ئەزموون بە واتایەكی تازە" هەیە. لە بڕگەی هەشتاو شەشی **دیاردە ناسیی رۆح** كە لەم بەراییەی كتێبەدا هاتوە، دەخوێنینەوە كە ئاگایی سەرەتا لەگەڵ بەرناس وەكو شتێكی تەریك لە قەڵەمڕەوی دەست بەسەرا گرتنی خۆی بەرەوروو دەبێ، واتە ئەوە لە "هەڵكەوتی ئۆبژەكتیڤ"، شتێك یەكسەر لە دەرەوەی خۆی پەیدا دەكا. وەلێ ئەمە تاقانە خاڵێك لە هەمبەری نێوان ئاگایی‌و بەرناس نیە. ئەم"هەقیقەتی رەهای ئۆبژەكتیڤ"ە لە راستیدا هەقیقەتێكە بۆ ئاگایی. ئاگایی لە رێگەی ئەزموونی بەرناس تێدەگا كە بەرناس "بۆ ئاگایی هەبووە و بەرناسێكی رەها دەهاتە بەرچاو". هێگل ئەم بزاوتەی بە "دیالكتیكی" ناو دەبرد. واتە بەرناس دۆخ "بۆ خۆی" لە كیس دەدا و دۆخ "بۆ ئاگایی" وەچنگ دێنێ. ئەویدی لە خۆوە بوونی نیە، بەڵكو لە بەر و بۆ ئاگایی هەیە. قسە تەنیا لەسەر دۆخی تازەی بەرناس نیە، بەڵكو خاڵێكی گرنگتر لە گۆڕێدایە: بەرەو رووبوونەوەی تازەی ئاگایی لەگەڵ بەرناس. ئەم ئەزموونكردنەی بەرناس بەواتای ئاشنای وشەی erfahrung یا ئەزموون نیە، بەڵكو واتایەكی تازەی هەیە، چونكە دەتوانێ بوونی بەرناس بۆ ئاگایی بسەلمێنێ. ئەمە واتایەكی دیاردە ناسانەیە، كە بەردەوام پێبەپێ، یەكانگیر و

(30) M.Heidegger, Hegels concept of Experience, New York, 1970,P 28.

هاوگونجاوە لەگەڵ "بان هەڵکشان لە خۆی". هەم بەرناس لە خۆی بانتر هەڵدەکشێ‌و دەبێتە شتێك بۆ ئاگاییو هەم ئاگایی دەگۆڕدرێت. ئیدی چ پێویست ناکا کە زەینێکی پاك وێنا بکەین کە لە بەرناسەوە باندۆر وەردەگرێ، بەڵکو ئاگایی لەگەڵ زانراوەکانو لەگەڵ خودئاگایی، بەرناس دەکاتە هیی خۆی. هەر بۆیە بڕگەی هەشتاو حەوتەمی **دیاردە ناسیی رۆح** وەها دەست پێدەکا:"ئەم شانۆگەرییەی ڕێچکەی ئەزموون لەبەرگرەوەی چرکە ساتێکە، کە بە بژیوانیی ئەو، ئیدی وانایەتە بەرچاو کە لەگەڵ ئەو شتەی هەروەك باوە لە (وشەی) ئەزموون دەزانرێت، یەکانگیر بێت".[٣١] لەم رووەوە لە **دیاردە ناسیی رۆح** دا ئەزموون، نەك بە بیچمێکی تایبەت لە ئاگایی، بەڵکو بە رەهای ئاگایی لە ڕێچکەیەدا بەرەو"زانست" گرێ دەدرێ. لێرەدا دوورنۆڕییەك بۆ سەفەرێکی دۆزینەوەیی پێویستە. ئاگایی لایەنی ناپوختی شوێنگەی خۆی فام دەکا، لەم شوێنگەیە تێپەڕ دەبێ‌و بانترهەڵدەکشێ، پێ‌دەنێتە ڕێگەیەکەوە کە بە جێیەکی تازە دەگات. بۆ ئەوەی بڵێندی لەگەڵ چەمکی ئەزموون هاوپێناو بکەین، دەتوانین لە ریشە و رەچەڵەکی وشەی ئاڵمانیی erfahrung بە واتای ئەزموون یارمەتی وەربگرین. ئەو وشەیە لە fahrenەوە دێت کە لە بنەڕەتدا، لە دوو گرۆی واتایی جیاوازدا بە کار دەهات: یەکەمیان رادان و، دووەمیان سەفەر کردن. ئەزموون لە هەناویدا جیابوونەوە، سەفەرکردن، چوونە جێیەکی دیکەیە. مەترسیی ئەزموون ترسی رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ شتانێکی تازەیە کە هەر موسافیرێك خۆی بۆ ئامادە دەکا. بەجۆرە زاراوەی نێوەندیی باسەکەمان، واتە "ئەزموونی راڤە" تێپەڕین لە هەڵکەوتو دانایی راڤەکارە و بارگەپێچانەوەیە بۆ شوێنێکی دی، کەوابوو ئامادەیی بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ شتانی تازەیە. لێرەدا دەگەینە گوتەی هایدگێر کە کەرەستەکان گرنگن، نەك چالاکمەندی.

مـن، لێرەدا سەرقاڵی لێکدانەوەی هایدنناسانەی هایدگێر لەم واتا تازەی ئەزموون کە هێگل هێناوەیەتە پێشێ، نام. هەر چەند ئەم لێکدانەوەیە دەتوانێ لە ڕێگەیەکی دیکەوە ئێمە بە کرۆکی گرێکوێرەیەکی هێرمێنۆتیکی کە لە بەردەماندایە، بگەیەنێ، بەڵام خۆی پێویستی بە وتارنامەیەکی تێروتەسەلی سەربەخۆیە. ئامانجی من خۆ خەریك کردن لە وردەکارییەکانی باسی هێگلی لە واتای تازەی ئەزموونیش نیە. تەنیا،دەخوازم جەخت بکەم

(31) G.W.F.Hegel, phenomenology of spirit, trons.A.V.Miller, Oxford University Press, 1977,P.55.



کە هەر چەند هێگل ئەم باسەی خۆی بە مەسەلەی زمانی مرۆیی گرێ نەداوە، بەڵام دەکرێ هەمبەرێکی شاراوە و نەگوتراو لەنێوان درك پێکردنێکی تازە لە ئەزموون و کەمایەسیی زمان لە گەیاندنی واتا بەدی بکەین. هەمان کەمایەسی کە لە زاری مۆنتنییەوە هێمایەکمان بۆ کرد. ئاگایی جێی مەبەستی هێگل کە لە رەوتی بڵێندهەڵکشانی پەیتاپەیتای خۆیدا بەرناسەکان" بۆ ئاگایی" پەیدا دەکا، لە فەزایەکی داخراو و بەرتەسکی بەرناسەکاندا ناژی. ئەم ئاگاییە، یەکانگیر لەگەڵ هەمان چەمکی تازەی ئەزموون، ناچارە بڵێندهەڵکشانی خۆی لە کۆمەڵگای مرۆییدا بباتە پێشەوە. لەم کۆمەڵگایەدا گرنگترین ئامرازی پێوەندیکاری، زمانە. بە بۆچوونی هێگل زمان هەیە، بەڵام ناتوانێ خاڵگەلی تایبەت و تاککەوتوو دەربڕێ و لەم رووەوەیە کە بەردەوام ئەزموونی بڵێندهەڵکشانی تاکەکەسی نەگوتراو دەمێنێتەوە. هەر ئەم بێدەنگی لێ کردنە دەکرێ لە ڕێگەیەکی دیکەوە، لە باسگەلێکی بە ناوبانگ کە لە بارەی" لەخۆنامۆ بوونی رۆح" لە بڕگەی بەشی شەشەمی **دیاردە ناسیی رۆح** دا هاتون، بەدی بکەین. هەر چەند لەوێدا هێڵی جەخت لە ژێر" فەرهەنگ"دا کێشراوە، بەڵام دەبینین کە زمانیش پێگەی نێوەندیی خۆی لە بنیاتی باسەکەدا پەیدا دەکاتەوە. بە لای ئێمەوە خاڵی سەنتراڵ لە بەرەوڕوو بوونەوە لەگەڵ پێکۆڵەکانی گرێکوێرە هێرمێنۆتیکییەکان زمانە. لە بڕگەی سەدە و دەیەمی **دیاردەناسیی رۆح** هێگل وەهای نووسیوە کە زمان لە وەچنگ خستنی خاڵگەلی تاك و تەرا، تایبەت، دیاریکراو و هەبوو هەرگیز کامەران نابێ، چونکە تەنیا دەتوانێ چشتی هەمەکی و جیهانگیر دەربڕێ. هێگل نموونە دێنێتەوە کە کاتێك دەڵێین:" ئەم لاپەڕەی پەڕاوگ" وشەکان ناتوانن لە سەر ئارایی ماتریالی و هەسپێکراوی لاپەڕەی پەڕاوگێکی تایبەت (بۆ نموونە پەڕاوگێك کە فەیلەسوف لێی دەنوسی) ئاماژە بکەن. زمان توانایی گواستنەوەی بابەتی درك پێکردن و ئاگایی نیە، تەنیا خاڵگەلی هەمەکی دەردەبڕێ. خاڵگەلێ کە روون دەکرێنەوە، بە شێوەی لێکدانەوەیی دێنە دەربڕین، بەڵام هەرگیز خۆیان ئامادە نابن. کاتێك دەڵێین ئێرە، وێنایەکی هەمەکی لە" هەموو ئێرەکان" لە ئارادایە، نەك جێیەك، فەزایەك، شوێنێکی تایبەت کە پێگەیەکی تاك و تەرا، تێکڕای سیفەتەکان و تایبەتمەندییەکانی لە وشەی ئێرەدا جێ ناگرێ، و ئەگەر بە یاریدەی کۆمەڵە ڕێکەوەندێکی دوورودرێژ هەر خدەیەکی" روون بکرێتەوە" هەمدیس وێنایەك لە ئێرە، واتە وێنەیەکی راڤەیی

دەخولقێنرێ و شوێن خۆی هەرگیز ئامادە نابێ.(٣٢) لەم روەوە لە باسی" لەخۆ نامۆ بوونی رۆح" هێگل زمان بە توخمێك لەم لە خۆ نامۆبوونە دەناسێنێ، کە لەودا بەردەوام تاکایەتیی تاکەکەس لەنێو دەچێ و لە پێش هەمەکێتییەکی دەسنیشانکراو خۆ دەشارێتەوە( برگەی ٥٠٨) .(٣٣)

کاتێك دەڵێم" من" وشەیەك دەردەبڕم کە شتێك لە من، واتە کەسێك کە منم دەرنابڕێ. هەر کە باس لە خووخدەکانی ئەم منە دەکەم- گریمان توانای ئەنجامدانی ئەم کارەم بە تەواوی هەبێ — هەر وشەیەك هەواڵێك لە وەسفکردنی سیفەت یا خدەیەکە کە هەرگیز بە تەواوی نایەتە دەربڕین، واتە تێکڕای لایەنەکانی لە هەمبەرێك کە لەگەڵ من چەشنی ناسکارێکی دیار هەیەتی، رۆشن نابێتەوە. هەر کە بەوێ هەر خدەیەك بخەمە بەر باس، ئەو کات ئەو وشە روونکارانەی کە بەکاریان دێنم، هەر ئەم دژوارییە دەخولقێنن. هەرگیز وشەی" من" نابێتە دەربڕ و نیشاندەری من وەکو ناسکارێکی تاك و تەرا و تاقانە. زمان( هێزی هاتنەگۆ) لە بوونەوەر تێدەپەڕێ و لەتەك هەبووندا بە هاویەك لە قەڵەم دەدرێ. لە راستیدا هەبوون دادەهێنێ، چونکە دەتوانێ خاڵی دیارخراو بنوێنێ.

کانت پێشتر ئەم بێتواناییەی زمانی لە **هەڵسەنگاندنی ئاوەزی پەتی** بەشێوەیەکی دیکە و سادەتر هێنابوویە پێشێ. ئەم بۆ نیشاندانی ئەمە کە پێناسەکان ناتوانن چەمکی وێکڕای شتێك نیشان بدەن، لەم بێتواناییەی زمان دەستی پێکردبوو:" پێناسە کردن وەك لە زاراوەکەوە دیارە، دەبایە بە راستی تەنیا بەم واتایە بێ کە چەمکی وێکڕای شمەکێك لە چوارچێوەی سنورەکانی چەشنی بەراییەك هەمدیس بنوێنین. بە پێی وەها داخوازێك، چەمکێکی ئامپیریك بە هیچ شێوەیەك پێناسە ناکرێت، بەڵکو تەنیا دەتوانێ روون بکرێتەوە. چوونکە لەبەرئەوەی ئێمە لە چەمکێکی ئامپیریك تەنیا برێك لە نیشانەکان لە جۆرێکی دیاریکراوی هاو واتاکانی هەستەکانمان لە بەردەستدایە، لەم روەوە هەرگیز ناتوانین دڵنیابین کە لە بەر وشەیەك کە هاو واتایەکی یەکگرتوو و تاقانە وەدیاردەخات، جارێك لە نیشانەگەلێ- زیاتر لە جارێك- تێنەهزرین. بەم چەشنە کەسێك دەتوانێ لە چەمکی زێڕ، سەرەڕای کێش، رەنگ، چەکوچ کوت*، هەمدیس لەم تایبەتمەندییە تێ بهزرێ کە ژەنگ ناهێنێ، ئەمە لە کاتێکدایە

(32) hegl, phenomenology of spirit, pp.65-66
(33) ibid , p. 308

* مەبەست تایبەتمەندیی کانزا وەکو ئاسن و زێڕ و ...هتد، کە دەکرێ بکوترێنەوە(و).



کە ئەویدی رەنگە لەمبارەوە هیچ شتێك نەزانێ. ئێمە برێك لە نیشانەکان تا ئەو جێیە بەکار دێنین کە بۆ لێك هاوێرکردن پاراو بن. وەلێ نۆڕینە تازەکانی هەندێ لە تایبەتمەندییەکان وەلادەنێن و برێك تایبەتمەندییان پێوە زیاد دەکەن. کەوایە چەمکی ئامپیریك هەرگیز لە نێو سنورە متمانەدارەکاندا گەمارۆدراو نیە"(٣٤)

دەتوانین گوتەی کانت لە سنوری باسی دیاری ئەو لە بارەی پێناسە زمانییەکانی ئەو بانتر بەرین: ئێمە لە زماندا ناتوانین خودی کەتوار ئامادە بکەین، دەتوانین روونی بکەینەوە، نیشانی بدەین، لێی نزیك بینەوە و دواجار بە یەك واتای تایبەت راڤەی بکەین. راڤە گەیشتن بە خودی کەتوار نیە، ئەزمونێکە کە کەتوار یەك جار، بەڵام نەك بۆ هەمیشە دەردەبڕێ. دەربڕینێکی کاتی، لە چوارچێوەی ئاسۆی دانایی سەردەمێکە. سەرنج لە درێژەی گوتەی کانت بدەین:"... وێکڕایی (جامعیّت) و هەمەلایەنیی قووڵ هەڵکۆڵینی من گومانلێکراوە و تەنیا دەتوانێ لەرێگەی زۆر نموونەی شایان، بە هەڵێنان و شیمان بێتە دەربڕین، وەلێ هەرگیز ناتوانێ بە ئەرخەیانییەوە ببێتە لێبڕاوانە. من لێرەدا بە لامەوە باشترە کە لە جێی زاراوەی پێناسە (Definition)، زاراوەی نواندن (خستنەڕوو=ایضاح) بەکاربەرین کە هەروا بە پەرێزەوە دەمێنێتەوە و لەودا تۆزینگەر* دەتوانێ پێناسەیەکی دیاریکراو، برەودار بناسێت و لەگەڵ ئەوەشدا، لەبواری وێکڕایی و هەمەلایەنی، هەمدیس دڕدۆنگی و رامانی خۆی بپارێزێ".(٣٥) هەر چەند کانت باسەکەی خۆی بە بۆنە و سەبارەت بە زمان گشتگیر نەکردوە، بەڵام دەتوانین لۆژیکی ئەو لە پێناسەوە بەرەو لای هەمو ئەرکێکی زمانی بەرین بکەینەوە. لە راستیدا، ئاخێوی هێرمێنۆتیکی مودێرن، کاتێك دەگاتە زمان، وەها کارێك دەکا و هەر راڤەیەك" بە پلەیەکی دیاریکراو، برەودار دەناسێ"، و لە بواری وێکڕایی (جامعیّت) و هەمەلایەنی" دڕدۆنگ دەبێ و رادەمێنێ".

(٣٤) کانت، **سنجش خرد ناب** ، ص ٧٧٣.

* سنجشگر، (و)

(٣٥) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٧٧٤

# راستی و راڤە

قینێکی بێبگار لە ئۆقرەگرتن، یەك جارو بۆ هەمیشە لە هەر کام
لە تیڕوانینە تەواوەتخوازەکان لە جیهان.دڵکێشبوونی روانگەی دووسەرە:
سەرپێچی لەوەی کە بێ بەش بین لە سەمەدی شتانی مەتەڵ ئاسا.
نیچە، ویستی هێز. بڕگەی ٤٧٠[١]

## (١)

ئامۆژیار، کەسێتی سەرەکیی رۆمانی **ئامۆژیار** و **مارگرێتا** لە نووسینی میخاییل بۆلگاکۆف، رۆمانێك دەنوسێ کە لە یەکەمین لاپەڕەکانیدا لەگەڵ پۆنیۆس پیلاتێس فەرمانڕەوای رۆمانیی ئورشەلیم ئاشنا دەبین. پیلاتێس لە یەکەمین کاژێرەکانی چواردەهەمین رۆژی مانگی بەهاریی نیسان،  لە کاتێکدا کە تووشی ژانەسەرێکی قورس و گران بووە، لە زیندانییەکی خەڵکی جەلیلە بە ناوی یەسوعای ناسری دەپێچێتەوە. یەسوعا تۆمەتبارە بەوەی کە خەڵکی بۆ راپەڕین بانگ کردوە و بۆ رماندنی پەیکەری ئورشەلیم هەڵی خڕاندون:" کەوابوو تۆ دواجار بۆ خەڵکێك کە لە مەیدانی پەیکەرەکەدا کۆببوونەوە، لە بارەی پەیکەرەوە دوای یان نا؟ دەنگێك کە وڵامی دایەوە، وەك بڵێی زرینگەی لە مێشکی پیلاتێس دەهێنا و ئێجگار ئەشکەنجەی دەدا و وەهای دەگوت:" گەورەم! من گوتم چلۆن پەرستگای باوەڕە کۆن و سواوەکان دەڕمێ و پەرستگای تازەی راستی بنیات دەنرێ. لەم وشانە کەڵکم وەرگرت بۆ ئەوەی لە قسەکانم تێبگەن"."- بۆچی دەرگیڵێکی وەکو تۆ دەبێ بە قسەکردن لەبارەی راستی، واتە بابەتێك کە لە بارەیەوە هیچ نازانێ، سەرشاخی خەڵکی بازار بگرێت؟ لەوەگەڕێ! دەتۆ پێم بڵێ بزانم هەقیقەت چیە؟" بە گوتنی ئەم وشانە فەرمانڕەوا بیری کردەوە:" بەڵێ یەزدانان! ئەمە دادگایەکی یاسایی یە و پرسیارێکی نابەجێم لێ پرسیوە... وەلێ زەینم ئیدی لە دەستم دەرچوە..."[٢]

(1) f.nietzsche, the will to power, trans.w.kaufmann, newyork, 1968,p.262.

(٢) . م. بولگاکف ، **مرشد و مارگریتا**، ترجمە ع. میلانی، تهران، ١٣٦٢، صص ٢٤-٢٥(جەخت لە منە- ب. ئەحمەدی) .



ئەم نووسینەی رۆماننوسی روس، کە لە سەردەمی زاڵبوونی" هەقیقەتێك"دا دەژیا کە بولشویکەکان پڕوپاگەندە و بە ناویەوە حکومەتیان دەکرد، وەبیرهێنەری دەقێکی دیکەیە کە هەرچەند لە نووسینی مرۆڤێکە، وەلێ لە دیدی زۆرکەسانەوە، لە نەوە یەك لە دوایەکاندا، بە دەقێکی سپیتا ناسراوە. لە بابی هەژدەهەمی **ئینجیلی یوحەننا** دەخوێنینەوە کە عیسامەسیحیان دەسگیر و زیندانی کرد و بە پڕکێشیی کاهینانی یەهودی بردیانە لای پیلاتێس فەرمانڕەوای رۆمی، تا فەرمانی مەرگی ئەو دەربکات. پیلاتێس لە مەسیحی پرسی کە ئایا خۆی بە شای یەهود دەزانێ؟ مەسیح لە جێی وڵام، پرسیارێکی لێ پرسی:

" ئایا تۆ ئەمە لە خۆتەوە دەڵێی یا کەسانی دی لە بارەی منەوە بە تۆیان گوت؟"

ئەو لە درێژەی باسەکەدا پەسندناکا کە پاشایەکی زەمینی بێ و بە زمانی درکە و ئەلیگۆری خۆی بە"شای هەقیقەت"دەناسێنێ:" عیسا وڵامی دایەوە کە پاشایەتی من لەم جیهانەدا نیە، ئەگەر پاشایەتی من لەم جیهانەدا بایە، خزمەتکارانی من دەجەنگان تا خۆم رادەستی یەهود نەکەم، بەڵام هەنوکە پاشایەتی من لەم جیهانەدا نیە. پیلاتێس پێی وت: مەگەر تۆ پاشای؟ عیسا وڵامی دایەوە: تۆ دەڵێی کە من پاشام. هەر بۆیە من لە دایك بووم و لە بەر ئەمە هاتم تا گەواهیدەری راستی بم و هەرکەس لە راستی‌یە، قسەی من دەبیسێ. پیلاتێس پێی وت: راستی چیە؟ و هەر کە ئەمەی وت هەمدیس چوەوە لای یەهودیان پێی گوتن: من لەم پیاوەدا هیچ سوچێکم نەدی. یاسای ئێوە ئەمەیە کە لە جێژنی فەسەح* لە بەر خاتری ئێوە کەسێك ئازاد بکەم، کەوابوو ئایا دەتانەوێ سەبارەت بە ئێوە پاشای یەهود ئازاد بکەم؟ هەمدیس هەموو هاواریان کرد: ئەو نا، بەڵکو باراباس، باراباس دز** بوو.[٣]

پیلاتێس لە رۆمانەکەی بۆلگاکۆفدا دەپرسێ:" دەتۆ پێم بڵێ بزانم هەقیقەت چیە؟" و پیلاتێس لە **ئینجیلی یوحەننا** دا دەپرسێ:" راستی چیە؟ وشەی" راستی" کە لە پاچەڤەی باوی **کتێبی پیرۆز** هاتۆتە نێو زمانی فارسییەوە، لە بەرانبەر وشەی عیبریی emét و پەیڤی لاتینی  veritas و پەیڤگەلی verité و wahrheit و truth لە زمانەکانی فەرەنسی،

* لە ئینجیلی( چاخی نوێ) ، یوحەننا، ئایەتی ٣٩، چاپی ٢٠٠٣، نووسراوە." جێژنی پێسەح" ل ٣٦٤. (و)

** لە هەمان سەرچاوەدا هاتوە" چەتە"بوو، ئایەتی ٤٠، ل ٣٦٤.(وەرگێڕ)

(٣) انجیل یوحنا، باب ١٨ ایەهای ٣٦تا ٤٠: در کتاب مقدس، لندن، ١٩٠٤ م ، ص ١٨٠،(جەخت لە منە — ب. احمدی)

ئاڵمانی و ئینگلیزی بەکار هاتوە و کت ومت هەمانە کە لە فارسیی ئەمڕۆییدا" حقیقت"ی پێ دەوترێ. لە ڕۆمانەکەی بۆلگاکۆف وادێتە بەرچاو کە پیلاتێس بەوەرسییەوە دەپرسێ:" هەقیقەت چیە؟" و مەبەستی لەم پرسیارە وێدەچێ ئەمەیە:" ئەی زیندانی! باسەکە بە لاڕێدا مەبە و وەڵامێکی راستە و راستی پرسیارەکەم بدەوە و بڵێ کە خەڵکت بە وێرانیی پەرستگای پەیکەر(ی ئورشەلیم) هەڵدەخراند یان نا؟ بە هێنانە پێشی چەمکی ئەبستراکتی" راستی"، لە راستیدا لە بەرسڤی راستەوخۆ بە پرسیاری راشکاوی من خۆ دەبوێری، راستی کامەیە؟ تۆ وەڵامی بدەوە!"قبووڵ بکەن کە داوەر یا پرسکارێك کە نەزانێ راستی چیە، رەوا بوونی دادگا و راستبوونی راو بۆچوونی خۆی دەباتە ژێرپرسیار. پرسیاری پیلاتێسی ئینجیل بە هەمان بارتەقای پرسیاری پیلاتێسی بۆلگاکۆف نارۆشنە. فرانسیس بیکۆن لەو باوەڕەدا بوو کە پیلاتێس لە بنەڕەت را چاوەڕێی وەڵام نەبووە و لە راستیدا ویستویەتی تا بە شێوەیەکی درکەیی بە زیندانیی خۆی نیشان بدا کە کێشەی هەقیقەت پێوەندیی بەوەوە نیە.(٤) رەنگە بتوانین رێکەوەندی **ئینجیل** یش وەها لێك بدەینەوە کە فەرمانڕەوا لە مەسیح دەخوازێ تا وەڵامێکی روون و ئاشکرا بداتەوە، واز لە گوتاری لێڵ و ئەبستراکت بێنێ. وەلێ زۆر لە باسکارانی مەسیحی هەرکە دەگەنە ئەم (باب) ەی **ئینجیلی یوحەننا** و گفتوگۆی مەسیح و پیلاتێس، کت ومت پێچەوانەی ئەم خاڵە راڤە دەکەن و گوتەی مەسیح بە دەربڕینێکی دیار و ئاشکرا و پرسیاری پیلاتێس ئەبستراکت دەناسێنن. بۆ نموونە یەزدانناسی هاوچەرخی ئینگلیزی جان مارش لە پەرتوکی **لێکدانەوەی ئینجیلی یوحەننا** دا دەنوسێ کە مەسیح لە راستیدا قسەیەکی ئێجگار سادە و راست و رەوانی کردوە.(٥) ئەو دەڵێ کە من بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی سیاسی نەهاتوم، بەڵکو پەیامنامەی من گەواهیدان بەم کەتوارەیە کە هەقیقەتی تاك و تەنیا، ئەو حکومەتەیە کە دەبێ بە حکومەتی خوا ئەژمار بکرێت. ئەم حکومەتە لە قەڵەمڕەوێکی هەرماندایە کە یەکسەر لە قەڵەمڕەوی حکومەتی مرۆیی هاوێر دەکرێ، کە هەرەتمەند، ناوچەیی و بەرتەسکە. بە بۆچوونی مارش کاتێك پیلاتێس پرسیاری فەلسەفیی" هەقیقەت چیە؟" دەهێنێتە گۆڕێ، نیشان دەدا کە لە گوتەی دیار و رۆشنی مەسیح سەرەدەرەی

(4) f. bacon," of truth" in: a critical edition of the majar , warks oxfourd university press, 1996. P.341.

(5) j. marsh , saint john, the pelican new testament commentaries, London, 1983, p. 602.



نەکردوە. ئەو لە رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ مەسیح کە خودی هەقیقەتە، سەرەنجام، تەنانەت بەرپرسیارێتی تێگەیشتن لە گوتەی راشکاوی جێی مەبەستی ئەو(مەسیح) لە کۆڵ خۆی دەکاتەوە و لە جێی ئەوە کە باسەکە لەسەر خاڵگەلی دیار و ئاشکرا چڕ بکاتەوە، پرسیارێکی هەمەکی دەپرسێ کە بە مانای خۆدزینەوە لە بەرپرسیارێتی یە و ئەبستراکتە.

رەنگە مارش و هەر باوەڕدارێکی مەسیحی کە خەریکی گفتوگۆ لەگەڵ خودی هەقیقەتە، بەڵام، تەنانەت بە پێی باوەڕی خۆیان پیلاتێس تەنیا دەیتوانی بە چەشنێکی نێواخندۆزییانە و ئیمانی لە هەقیقەت ئاگادار بێت و ئەم ئاگاییە لە رێگەی ئاوەزی رۆژانە، لوژیکی بەڵگەهێنانەوەیی و بینادارییی باو و ئاسایی ئاسان وەدەست نایەت. پیلاتێس دەبایە وەکو حەوارییەکانی مەسیح بایە کە هەندێك لەوان بە بیستنی یەك رستە لە زمانی پێغەمبەر(مەسیح) راستگۆیی و راستیی بانگەشەکانی ئەویان بۆ دەرکەوتبوو. بەڵام راستیەکە ئەوە بوو کە پیلاتێس وەها کەسێك نەبوو و نەیتوانی ئەم خاڵەی سەرەوە تێبگا. ئەو کەسێك بوو وەکو ئێمە و تەنیا ئەو کاتە لە نێوان راستی و درۆ یەکێکیانی هەڵدەبژارد کە دەیتوانی بەپێی نیشانەیەك، بەڵگەیەك، یا دوولاتەراز (قرینه= symmetry) یێك هەڵبێنێ کە " راستی" چیە. بە پێی دەقی ئینجیل وادەنوێنێ کە ئەو لەمبارەوە هیچ ئایەتێکی پەیدا نەکردبوو. ئەمەش وەبیر خۆمان بێنینەوە کە لە سەر زەمینێك کە پیلاتێس بە ناوی فەرمانڕەوایەکی رۆمانی لەودا فەرمانی دەدا، هەر رۆژە کەسانێك سەریان هەڵدەدا کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان دەکرد و لە نێویاندا کەم نەبوون کەسانێك کە لەتەك کاهێنانی یەهودی بەرەوڕوو بنەوە و سەروکاریان لەگەڵ" دادپەروەریی رۆمانی" بێ. پیلاتێس، ئەم بانگەشەکارە ناسرییەی لە تاقمی بانگەشەکارانی پێغەمبەری دەزانی و هۆیەکیشی لەبەردەستدا نەبوو تا بڕوا بە راستگۆیی و راستیی ئەم کابرایە بکا و چاری ئەم لەوانیدی جیا بکاتەوە. هێشتا ناتوانین بێژین کە ئەو لە بەرپرسیارێتی هەڵبژاردن دەسڵەمییەوە. ئەو تەنیا رایەکەی ئەمە بوو کە لەم زیندانییەی کە بانگەشە دەکا پەیامنامەکەی گەواهیدان بە راستییە، "سوچێکی ئەوتۆ"ی نەدیوە و ناتوانێ فەرمانی گوناهبارییی ئەو بدا.

ئەگەر بە لای ئیماندارێکی وەکو جان مارش، عیسامەسیح تێکڕای هەقیقەتە و ئەمە راستییەکە دیار و ئاشکرا، بەلای فەرمانڕەوای رۆمانییەوە کە باوەڕی بە یەزدانی جۆراوجۆر هەبوو و یەکێك لە ئەرکە گرنگەکانی ئەویش پاراستنی پەرستگای پەیکەر، داکۆکی لە کاهێنانی یەهودی و سەقامگیرکردنی تەناهی و ئارامی لە ناوچەدا بوو، مەسیح زیاتر لە

تۆمەتبار و زیندانییەك كە یەهودییەكان پێداگرییان لەسەر كوشتنی دەكرد، نەبوو. پیلاتێس هەوڵی دا نیشان بدا تا ئەو جێیەی كە پێوەندیی بە هەقیقەتەوە هەیە، ئەو نە لەگەڵ مەسیحدا هاوتەبایە و نە لەگەڵ یەهودیانێك كە داوای كوشتنیان دەكرد. ئێمە بۆچی دەبێ واتای بنەتایی و كردە و گوتەكانی پیلاتێس لەسەر بنەمای باوەڕی دینیی مەسیحیەكان راڤە بكەین؟ مارش دەنوسێ كە فەرمانڕەوای رۆمانی ناچار بوو كە یا لەگەڵ مەسیح بێ و یا دژی ئەو و لەم نێوەدا بێلایەنی نەدەلوا. هەر كە ئەو دەستەكانی خۆی شوشت و مەسیحی رادەستی ئەو كەسانە كرد كە سەرەنجام ئەویان لە خاچ دا و ئەم كارەشیان بە دەستی سەربازانی رۆمی، جێبەجێ كرد، بە باشی نیشان دەدا كە بێ لایەنیی پیلاتێس، بە كردەوە نەدەلوا.[٦] وەلێ، پیلاتێس لە "یەهودییەكان"( واتە لە گشت خەڵك و نەك تەنیا لە كاهێنانی یەهودی) پرسیبووی كە ئازادیی باراباسی دز دەخوازن یا ئازادیی مەسیح، ئیدی ئەم خەڵكانە بوون كە لە سەر بناخەی هەڵبژاردنی خۆیان مەسیحیان لە خاچ دا.

لە (باب) ی بیست و حەوتەمی **ئینجیلی مەتتا** (ئایەتەكانی ١٧تا ٢١) بە راشكاوی هاتوە كە " كەوابوو هەر كە خەڵك كۆبوونەوە پیلاتێس پێی وتن كێتان دەوێ بۆتان ئازاد بكەم، باراباس یا عیسا ناسراو بە مەسیح؟... بەڵام سەرۆكانی كۆن و ریش سپیەكان، تیرە و هۆزیان دنەدا كە داوای باراباس بكەن و عیسا بكوژن". [٧] لە هێنانە گۆڕی هەڵوێستی پیلاتێس، لانیكەم، جێی ئەم راڤەیە ئاوەڵا دەمێنێتەوە كە ئەو كت ومت وەكو گومانكارێك لە بەرامبەر بانگەشەی" داڕنراو"ی مەسیح كە خۆی گەواهیدەری راستی ناو دەنا، پرسی:" هەقیقەت چیە؟" گوتەی نیچە لە بڕگەی ٤٦ی **جەجاڵ** كە پرسیاری پیلاتێس تاقانە ئاخاوتەی بایەخداری **چاخی نوێ (ئینجیل)** یە، و رەخنەكاریی ئەو پەرتوكە و تەنانەت نكۆڵیی تەواوی (ئەو پەرتوكە) ئەژمار دەكرێ، چاوەدێری ئەم لایەنە گومانكارانەیەی پرسیاری پیلاتێسە.[٨] ئەو بەم پرسیارە رای گەیاندوە كە نازانێ هەقیقەت چیە و ئەمە دانپیانانێكی گەورەیە.

مەسیح لە ئایەتەكانی(باب) ی هەژدەهەمی **ئینجیلی یوحەننا** خۆی وەكو هەقیقەت نەناساندوە و بە پێچەوانەی گوتەی مارش ئاخاوتەكەی چەندان راشكاو نەبوە. ئەو تەنیا

(6) ibid, pp.602-603

(٧) **كتاب مقدس، عهد جدید**، ص ٤٩.

(8) F.Nietzsche, the anti- Christ, trans. R.j.hollingdale, London, 1971, p.162.



دەڵێ:" من بۆیە لە دایكبووم و بۆیە هاتمە ئەم دنیایەوە تا گەواهی بە هەقیقەت بدەم و هەركەس لایەنگری هەقیقەتە قسەی من دەبیسێ". كەسێك كە گەواهی بە هەقیقەت دەدا مەرج نیە خودی هەقیقەت بێ.

پیلاتێس بۆچ دەبایە وەها واتایەكی دوور لە زەین و شیمان نەكراو فام بكات؟ چەندە دژوار بوو كە ئەو بتوانێ لە رێگەی ئاوەزی باو و ناسراو و ئاوەزیانی رۆژانەوە لە هەقیقەت تێبگا. لە دیدی هەر مەسیحیەكی ئیماندار بۆ وەها سەركەوتنێك، دەبایە تیرێژی باوەڕ، پێشتر بە دڵی پیلاتێس پڕژابایە. پیلاتێس فەرمانڕەوای رۆمانیی بێئیمان كە بڕوای بە یەزدانانی فرەچەشن بوو، چۆن دەیتوانی بەرپرسیاری كاری یەهودیان بێ، كاتێك كە پێشتر تیرێژی باوەڕ لەو درێخ كرابوو؟ چۆن دەتوانی لەو بخوازی تا شتێك كە هەركەس بۆ فامكردنی، پێویستیی بە باوەڕدار بوون بە ئاینزایەكی تایبەتە، بە لۆژیكی رۆژانە و ئاوەزی دنیایی تێبگا؟ مەسیح تەنانەت بەوی نەگوتبوو كە خۆی خودی هەقیقەتە.

لە (باب) ێكی دیكەی **ئینجیلی یوحەننا** لە زاری مەسیحەوە گوتراوە كە خۆی بە هەقیقەت ناودەبا. لە كاتی ماڵاوایی لەگەڵ هەڤاڵانی نزیكی خۆی، كاتێك كە پیلاتێس لەوێ ئامادە نەبوو،(چۆن) دەیتوانی لە بانگەشەی ئەو ئاگادار بێت. جێی سەرنجە كە مەسیح لە هەنتەشی پیلاتێس نەیگوت من هەقیقەتم، تەنیا بانگەشەی كرد كە لێی ئاگادارە. ئەو رای گەیاند كە هەركەس لە راستی بێ، واتە پەیڕەوی هەقیقەت بێ قسەی ئەو دەبیسێ. بەڵام ئەم گوتەیە بۆ هەموو كەسێك بەس نیە تا بتوانێ تێبگا كە ئیدی بیانویەك نەماوە و بێلایەنی لەمە بە دواوە نالوێ. لە ئایەتێك كە مەسیح لەودا خۆی بە راستی یا هەقیقەت ناو بردوە، وردبینەوە، ئایەتی شەشەم لە بابی چواردەهەمی **ئینجیلی یوحەننا:**" توما پێی گوت: ئەزبەنی! نازانین بۆ كوێ دەچی، كەوا بوو چۆن رێگەكە شارەزا بین؟ عیسا پێی گوت: من رێگە و راستی و ژیانم. هیچكەس ناگاتە لای باوكم ئەگەر خۆی بە منەوە هەڵنەواسێ"[٩] لێرەدا مەسیح لەگەڵ یەكێك لە نزیكترین یاران و حەوارییەكانی خۆی گفتوگۆ دەكا، واتە كەسێك كە پێشتر زۆرجاران ئامۆژگارییەكانی ئەوی بیستوە و لە هیراكانی ئەو سودی وەرگرتوە. ئەمە(تۆما) یە كە دەڵێ:" ئەزبەنی! نازانین چۆن رێگەكە شارەزابین؟" قەرارە لەگەڵ رێبازەكە ئاشنا بێ و دەبێ لەوە بە دواوە خۆی وانەبێژی بێ. شوێنگەی ئەو لەگەڵ شوێنگەی پیلاتێس

(٩) **انجیل یوحنا**، ایەهای ٥و ٦، در **كتاب مقدس:** ص ١٧٣.

جیاوازه. تەنانەت ئەگەر چەشنی مارش بە راستیی رەها و بێ ئەملاوئەولای ئەو هیرایانە باوەڕمان هەبێ، هەمدیس هۆیەك لە بەردەستدا نیە کە شوێنگەی تێکڕای مرۆڤان لە بەرانبەر هەرامەی سپیتا و رێساکان و هیراگەلێ کە لە ژێرناوی هەقیقەتی سپیتا دێنەگۆڕێ، هاوسان بزانین. ئەگەرئاخاوتەی مەسیح وەها بڕشت و کاراییەکی دەسبەجێی هەبایە کە دڵی هەموان یەکسان بلەرزێنێ و لە سەر رۆحی بیسەران یەکسان باندۆر دابنێ، ئەو کات هەموان دەچوونەڕیزی حەوارییەکانی ئەو، نەك لە ریزی یەهودیان و رۆمیان و خوانەژناسانێك کە ئەویان لە خاچ دا. مەسیح خۆی رێگەی هەقیقەت و ژیان ناو نا و ئەم گوتەیە رۆحی تۆمای هەژاند.

تۆما پێشتر بڕوای بە سێ بنەواشە هێنابوو: بنەواشەی یەکەم ئەمە بوو کە مەسیح" رێگا"یە، رێگەیەك کە مرۆڤ دەبێ بیگرێتەبەر تا بگاتە خوا:" هیچکەس ناگاتە لای باوکم ئەگەر خۆی بە منەوە هەڵنەواسێ." بنەواشەی دووەم ئەمە بوو کە مەسیح هەقیقەتە. هەقیقەت، بەرزتر لە فەرمانی ئاوەزی رۆژانە و سەرتر لە سیستمگەلی هزرڤانانەیە. هەقیقەت، رۆح و گەوهەری خوایی هەیە. هەقیقەت گوزارە یا تیۆرییەك لە بارەی مەسیح نیە، بەڵکو مەسیح خۆیەتی، خودی مەسیحە. مەسیح لە تەك سروشتی ئاوێتەیی(خوایی و مرۆیی)  خۆی دەتوانێ بە مرۆڤ شکۆ و هێزی خوای نەبینراو بنوێنێ. سەرەنجام بنەواشەی سێهەم ئەمە بوو کە مەسیح  ژیانە. ژیانی مەسیح شتێك لە دەرەوەی ئەو نیە کە دەوروبەری ئەو بتەنێ. ئەو خودی ماکی ژیانە. لەمەڕ ئەم خاڵەی دوایی جان مارش دەڵێ کە یەزدانناسیی مەسیحی هێشتاش گرنگیی رێسای" مەسیح ژیانە"ی دروست و بە تەواوی فام نەکردوە و نەیتوانیوە بە رۆشنی روونی بکاتەوە کە بە چ واتایەك مەسیح خۆی کەتوارێکی شکۆمەند و بڵیند هەڵکشاوە کە تێکڕای بیچمگەلی راستەقینە و هەبووی ژیان لەودا هاوبەشن. ئێستە پەسند دەکەن کە ئەمڕۆش درکی تەواوی هەقیقەت بۆ یەزدانناسێکی وەکو مارش وەها دژوار و نەلواو بێ و لە لایەکی دیکەوە، تەنانەت تۆما، حەواریی نزیکی مەسیح نەیزانیبێ کە ئەو بۆ کوێ دەڕوا و بپرسێ" کەوابوو چۆن رێگەکە شارەزابین؟" پیلاتێس لە شکرداری رۆمانی کە بە پێی رێبازی پێشینان و باپیرانی باوەڕی بە یەزدانانی فرەچەشن هەبوو، چۆن و بە چ جۆری دەیتوانی بەرپرسی" گومڕایی" خۆی بێت؟

هەمبەری نێوان رێگا( کە لە شەریعەت دەدوێ)  لەگەڵ ژیان و هەقیقەت کە لە باسی ئایەتەکانی پێنجەم و شەشەمی بابی چواردەهەمی **ئینجیلی یوحەننا** دا هاتوە" واتایەکی



تایبەت لە هەقیقەت" نیشان دەدا: هەقیقەت رێسا و تیۆری و گوزارەیەکی هزرینگەرانە نیە و نایەتە بیری مرۆڤەوە، بەڵکو بانمرۆیی و ئاسمانی‌یە. دەبێ لە دیتەی زەمینیی هەقیقەت دابڕی و ئیمان و باوەڕی رەها بە هەقیقەتی سپیتا بێنی تا رێگەی بێلایەنی دابخرێت.قسەی من ئەمەیە: جگە بە یاریدەی وەها هەڵێنجانێك لە هەقیقەت، ناتوانی پیلاتێس و هەرکەس کە" گوێڕایەڵ نابێت" مەحکوم بکەیت. ئەم تێگەیشتنە لە هەقیقەت بەشێوەکی ناچارانە رێگە لە بەردەم کەسانی بێلایەن دادەخا و لەگەڵ جان مارش هاوبێژ دەبێ: هەنوکە یا دەبێ لەگەڵ مندا بی یا لە دژی من. ئەم هەڵێنجانە لە هەقیقەت، فرمانی پیلاتێس بە کوشتن یا زیندوومانەوەی مەسیح، وەکو هەڵبژاردن لە نێوان ئیمان و کوفر لە قەڵەم دەدات( کە بە ئاشکرا وەها شتێك بە مێشکی پیلاتێسیشدا نەدەهات)  و تەنانەت بێلایەنیی ئەو —کە خوازیاری کوشتنی پیاوێك نەبوو کە بە سوچباری نەدەزانی- لە دژی ئەو بەکار دێنێ و بەردەوام لەو دەپرسێ بۆچی" تێکڕای هەقیقەت یا خودی هەقیقەت"ت هەڵنەبژارد؟

ئەگەر بڕیار بێ کە باوەڕ و ئیمان بە هەقیقەتی سپیتایی لە خۆیدا بەردەوام دوو جەمسەری ئیماندار وکافر بخولقێنێ و رێگەی سێهەم و رێگەکانی دیکە دابخا، چۆن لەنێوان کەسانێك کە لە قوولایی هزر و سروشتی باوەڕدارانەی خۆیان بە بوونی راستیی خوایی باوەڕیان هەیە و تەنیا دەرکەوتەکانی جیاواز دەبینین، واتە لە نێوان پەیڕەوانی دینە یەزدانییە جۆربەجۆرەکان وتووێژی بنیاتنەر لەمەڕ باوەڕەکانیان(" یا رێگە هەمەجۆرەکان کە گرتوویاننە پێش) دەڕخسێ؟ هەروەها، چۆن دەلوێ کە هەرکام لەم ئیماندارانە، لەگەڵ کەسێك کە بێ ئیمانە و بڕوای بە خوا نیە، گفتوگۆ بکەن؟ ئەگەر پێشمەرجی هەر گفتوگۆیەك، هەبوونی ئیمانی بێگەرد، پەتی و مەعنەوی بە هێزی سپیتایی هەقیقەت بێ، رێگەی وتووێژ لەگەڵ کافر و بێ‌ئیمان دادەخا. رەنگە بتوانی کافر ناچار بکەی بە رواڵەت رێسا و یاسای ئاخێزراو لە ئیمان و شەریعەت پەسند بکا، وەلێ ناتوانی لە رێگەی باسێکی قەناعەت پێکەر، واتە لە وتووێژێکی هاوشان و یەکسان کە هەردوولا مافی یەکسانیان هەبێ( و هەر لە سەرەتاوە مەرجی بەردەوامیی گفتوگۆ پەسندکردنی بەرەنجامی یەکێك لە لایەنەکان نەبێ)  ئەو بەرێی ئیماندا رێنوێنی بکەیت، بە دەربڕینی دی، ئازادیی بیر و دەربڕین لە گفتوگۆ لەگەڵ کافردا، بەو واتایەیە کە بابەتی سەرەکیی گفتوگۆ، واتە باشاری کوفر و ئیمان بتوانێ ئازادانە بێتە گۆڕێ. کەوابوو، مەرجی پەسندکردنی ئیمان و هەقیقەتی سپیتایی ناتوانێ هەر لە سەرەتاوە بێتە ئاراوە. لە راستیدا رێگەیەك بۆ بردنە پێشی وتووێژ نیە مەگەر ئەوەی کە ئیماندار و بێ ئیمان یەکسان و

پێکەوە- خاوەنی ماف و ئاسایشی هاوسان- باسەکە ببەنە پێشێ.ئەگینا تەنیا لە یەك دۆخدا دەتوانی کافر بێدەنگ بکەیت، لە ڕێگەی زۆرە ملێ و سەرکوت. ئەگەر وامان کرد ڕێگەی رزگاری و بەختەوەریی کافر کە بەڕای ئیماندار هەمان ئیمانیەتی لە کافر گیراوە: ئایا ئیماندار لەم دۆخەدا بە پێی بنەواشەگەلی ئیمانیی خۆی، تووشی هەڵە نەبووە و گەیشتن بە بەرەنجامێك کە وێدەچوو دەیتوانی ڕێخۆشکەری رزگاری، تەوبە و بەختیاریی کافر بێ، لەوی درێخ نەکردوە؟

تا کاتێك کە کەسێك نیچەئاسا هەقیقەت زادەی زمانپاراویی مرۆیی بزانێ، ئەگەری میانرۆیی و پێرەوا دیتن هەیە، وەلێ لەو کاتەوە کە کەسێك ئەو هەقیقەتەی کە جێی پەسندی خۆیەتی بە ئەرخەیانییەکی لێبڕاوانە و سپیتا بزانێ کە ئەوەش بە بابەتی باوەڕێکی بێخەوش بناسێ و ئەرخەیان بێ کە تێکڕای هەقیقەت لە لای ئەوە، تەنیا لە یەك دۆخدا دەتوانی گفتوگۆ لەگەڵ کەسێکی دیکەدا بکات، یا لەگەڵ کەسیك کە ئەویش باوەڕی بە هەقیقەتێکی سپیتایی هەیە، وەلێ راڤەیەکی جیاواز لەو دەخاتەڕوو( بۆ نموونە بەیانگەرەکەی بە ڕێباز یا پێغەمبەرێکی دیکە دەناسێ یا خۆ لەگەڵ کەسێك کە لە بنەڕەت را نکۆڵی لە هەبوونی هەقیقەتی سپیتا دەکا. ئەو تاقانە دۆخە ئەمەیە کە مرۆڤ هەقیقەتی باوەڕدارانەی خۆی نەکاتە پارسەنگ، پێوانە، بنەڕەت و بونیادی باسەکە و ئامادە بێ( هەرچەندیش کە بەلایەوە دژوار بێ) لە باسکردن لەگەڵ کەسانێك کە لە دەرەوەی ئاینزا و باوەڕەکانی ئەودان یەکسانی رەچاو بکات. لە راستیدا هەر خاڵێك لە وەها باسێك تاقیکارییەکە لە سەر ئیمانی ئەو مرۆڤە. ئەو هەر جارە و خۆی لە مەترسییەك دەدا و لە بەرانبەردا هەر جارە دەتوانێ بە ئیمانێکی بەهێزتر لە تاقیکردنەوەکەی سەرکەوێت. بۆ ساتێکیش بێ لە یەکەمین ساڵانی سەرهەڵدانی دینە گەورەکان کە ئەمڕۆ لە جیهاندا زیندون و پەیڕەوی زۆریان هەیە، تێهزرن. جگە لە چوونە ژێرباری وتووێژێکی هاوسان، چ ڕێگەیەك لە بەردەمی پێغەمبەران و شوێنکەوتوانی بەرایی ڕێبازەکانی دینی نوێ هەبوو؟ ئەوان لە بەر ئەوەی ئیمانیان هەبوو، لەم یەکسانیی ماف لە گفتوگۆیەکی زیندو و راستەوخۆ و کارا نەدەترسان. ئەوان ڕێگەیان لە بەردەم رادەربڕینی نەیاران و کافران نەدەگرت. بە پێچەوانەوە تێدەکۆشان تا لە ڕێگەی بەکار هێنانی زمان، لۆژیك، ئەلیگۆری، هەقایەت و (حەدیس) و ڕێنوێنی، راست و دروستیی باوەڕی خۆیان نیشان بدەن. هیچ ئاین و ئاینزا و ڕێبازیکی گەورە سەرنەکەوت و ژمارەی پەیڕەوان و ئیماندارانی خۆی زۆرو زەوەند نەکرد مەگەر لە ڕێگەی پەسندی پێویستیی مافی یەکسان بۆ



هەموان، پێرەوادیتن و بەرگە گرتنی روانگەی نەیار و هەوڵدان بۆ بەڵیاندن(اقناع) و سەلماندنی راست و دروستیی ڕێساکان، هیراکان و باوەڕەکان و لەیەك ئاخاوتەدا هەقیقەتی شاراوە و بنەتایی خۆیان. لەگەڵ کەسانێك کە وەها وتووێژیك بێسود و بێمانا بزانن و لەگەڵ پێشمەرجەکانی نەسازن، ناتوانی گەنگەشە بکەیت. ئەمانە ئەگەر بگەنە دەسەڵات، ڕێگەی نەیاران دادەخەن و تەنیا خوازیاری ملکەچی دەبن و بەس. بەڵام، خۆشبەختانە کەسانی دیکەش هەن کە ئامادەن تەنانەت لەمەڕ بەردی بناخەی ئیمانی خۆیشیان لەگەڵ ئەویدی ئامادەی باس و خواسن. ئەمان راستیی ئیمانیی خۆیان لە دڵدا دەهێڵنەوە، وەلێ ئەو(ئیمان) ە ناکەنە مەرج یا پێوەری پێشکەوتنی باسەکە" لەگەڵ ئەویدی". ڕێگە کراوە دەهێڵنەوە تا گفتوگۆ بچێتە پێشێ.

## (٢)

لێگەڕین لەمەڕ بێلایەنیی پیلاتێس زیاتر تێهزرین. ئەو بە پرسینی "ڕاستی چیە؟" لە راستیدا دەڵێ: من نازانم راستی کامەیە، لەنێو ئەو هەموو بانگەشەکارانی پێغەمبەرایەتی کە خۆیان بە خودان هەقیقەت دەزانن و لە نێوان ئەم زیندانی‌یە ناسری و کاهێنانی یەهودی کە ئەویان کۆت کردوە و رادەستی دادگای منیان کردوە و پێداگرانە خوازیاری مەرگی ئەون(و هەر کام لەم دوو لایەنەش بانگەشەی دەستبەسەراگرتنی هەقیقەت دەکەن) من ناتوانم داوەری بکەم، چوونکە خۆم لە هەقیقەت بێئاگام. سەرەنجام ئەو بە نیشانەی بێلایەنی و پاك بوون لە خوێنی تۆمەتباری ناسری دەستەکانی لە مەرکانەیەکدا دەشوا. گادامێر، لە وتاری**"هەقیقەت چیە؟"** جەخت دەکا کە پیلاتێس خۆی بە نوێنەری" دەسەڵاتی سیاسی"ی دەوڵەتی ناوەندیی رۆم لە خاکی سپیتا دەزانی. بێ لایەنیی ئەو لە راستیدا، بێلایەنیی دەسەڵاتی سیاسی لە کاروباری راستیگەلی ئیماندارانە بوو. هەر بۆیە، لێڕوانینی ئەو بە واتای ئەمڕۆیی وشە، ئازادهزریوانە و رەوابەخشانە بوو. ئەو رای گەیاندبوو کە بەناوی دەسەڵاتی گشتی دەست لە کاروباری ئیمانی و باوەڕدارانە وەرنادات و خۆی لەو کارە دەبوێرێ، چونکە نازانێ کێ راست دەڵێ و راستی لە کوێیە. قسەی ئەو ئەمەیە: ئەم زیندانی‌یە خۆی بە نوێنەر یا جاڕدەری هەقیقەت ناودێر دەکا، منیش لە کاری هەقیقەتدا داوەری ناکەم و ئەم کارە بە خاوەن باوەڕانی

دیکەی هەقیقەت دەسپێرم.[١٠] بەڵام دژواریی داوەریی گادامێر کت ومت لەم خاڵی دواییدا وەشێراوە. پیلاتێس مەسیحی ئازاد نەکرد، بەڵکو ئەوی بە باوەڕدارانی هەقیقەتێکی دیکە، واتە بە یەهودیان سپارد تا بەناوی هەقیقەت لە خاچی بدەن، ئەوەش بە دەستی سەربازانی پیلاتێس. ئەگەر پیلاتێس رایگەیاندبا:" لە بەر ئەوەی من نازانم هەقیقەت چیە، کەوابوو هەر بانگەشەکارێکی هەقیقەت لە سایەی دەسەڵاتی سیاسی و لەشکریی خۆمدا دەپارێزم" ئەوکات داوەریی گادامێر لە بارەیەوە راست دەبوو. چونکە فەرمانڕەوای رۆمانی ئاوەهای نەکرد و یەکێك لە دوو لایەنەکەی دایە دەست لایەنی دیکە تا بکوژرێت (ئەمە کە مەسیح نەکوژرا و بۆ ئاسمان هەڵکشا، لێرەدا هیچ جیاوازییەك لە باسەکەی ئێمەدا چێ ناکا،چونکە پیلاتێس پێشتر ئاگای لەمە نەبوو)  نیشان دەدا کە ئەو هەرچەند بێ لایەنیی خۆی راگەیاندبوو، بەڵام بە واتای ئەمرۆیی، نە رەوابەخشانە بوو، نە ئازادهزریو و نە دادپەروەر. دەوڵەتی مودێرن بانگەشە دەکا کە لە کاروباری باوەڕدارانە بێ لایەنە. لانیکەم ئەمە وەکو بنەواشەیەك رادەگەیەنێ، هەتا بە کردەوە ئاشکرا بێت کە چەندە لە هەمبەر ئەم بنەواشەیە وەفادارە. لە راستیدا، بانگەشە دەکا کە لە کاروباری پێوەندیدار بە هەقیقەت و راگەیاندنی هەقیقەت بێلایەنە. پۆل فێرابێند مافی خۆیەتی کە دەڵێ هەر بۆیە دەوڵەتی مودێرن دەبێ لە هەمبەر بیچمەکان و رێچکەکانی پێشکەوتنی زانستیش بێلایەن بێت. چونکە زانستیش لەو پانتاییانەیە کە بانگەشەکانی خاوەنداریێتی یا نوێنەرایەتیی هەقیقەت لەواندا دێنەگۆڕێ. کەوابوو، لە هەمان کاتدا کە دەوڵەتی مودێرن دەتوانێ خوازیاری پێشکەوتنی زانست بێ. ناتوانێ دەستوەردان لە دیاریکردنی چارەنووس و رێچکەی بە فراژووبوونی بکات.[١١] دەوڵەتی مودێرن دەبێ قبووڵ بکات کە ئەگەر لە شوێنێکدا پێشکەوتنی زانست وەکو لەمپەرێك لە رێگەی هاتنەدی ئامانجگەلی سیاسی، ئابووری و لەشکریی خۆی ببینێ، ریگەی فراژووبوونی بوونی داناخات. هەل ومەرجی ئەم پەسندکردنە، ئەمرۆکە بابەتی باس و خواسی کۆمەڵناسانی زانستە.ئەم باسە بەردەوام بە بانگەشەی جیهانگرەوەیی ئاوەزباوەڕی و هەروەها کێشەی هەقیقەت گرێ دەدرێ. هەروەك نیچە لە سەدەی پێشو(سەدەی نۆزدە) نیشانی دابوو و

(10) H.G.Gadamer, “Quest- ceque la verite?, “ in: lart de comprender, ecrits 2, trans. i.julien- deygout, paris, 1991, pp.39-57

(١١)   . پ. فیرابند،" افسانەهای پریان: علیه روش و نتایج"، در: دیدگاەها و برهان ها، مقالەهایی در علم و فلسفه ریاضی، ترجمه و تالیف ش. اعتماد، تهران، ١٣٧٥، صص١١٨-١٣١.



ژمارەیەك لە فەیلەسوفانی رۆژگاری ئێمەش لە رێگەگەلی دیکەوە نیشانیان داوە کە لەنێوان سپیتایی هەقیقەت و باوەڕ بە بنەواشەی تاکانەی ئەرکی ئاوەزی مرۆیی رایەڵێکی پتەو هەیە.[١٢]

چ بانگەشەی بێلایەنیی بنەتایی پیلاتێس پەسند بکەین یان نا، ئەوە بە ئەمرۆیی بزانین یان نا، وادێتە بەرچاو کە پرسیاری ئەو واتە "هەقیقەت چیە؟" نیشان دەدا کە ئەو خۆی بانگەشەیەك لەمەڕ ناسینی هەقیقەت ناکا. ئەگەر ئەم پرسیارە شێلگیر بزانرێت، لانیکەم کێشەی نارۆشنیی هەقیقەت دێتە ئاراوە. بەڵام زانستی مودێرن لەگەڵ ئەم پرسیارە سەروکاری نابێ و هەربۆیەش پێڕەوابین نیە، واتە بەگوتەی نیچە، بەرگەی ئەوە ناگرێ کە باوەڕی بنچینەیی خۆی بە هەقیقەت بچێتە ژێر پرسیارەوە، یا تۆزقالێك خەوشدار بێت. راستە کە زانستی مودێرن ئێمەی لە گێچەڵی زۆرێك لە باوەڕگەلی پێش ئەزموونی و چەقبەستو رزگار کردوە، بەڵام خۆی بە پەسندکردنی دۆگماتیڤی هەقیقەت، هەرامەیەکی دیکەی بە شێوەیەکی پێش ئەزموونی و بەدەر لە هەرجۆرە ئاوەزیان، گەنگەشە و بەڵگەهێنانەوەیەکی رەخنەکارانە، پەسند کردوە. زانست رێگەی پەڕگیریی گەنگەشە لەمەڕ راڤەهەڵگربوونی هەقیقەت بە ناوی" هەرە پێویستیی بەرهەستگەرایی و هەرە پێویستیی دەربازبوون لە هەر باس و باوەڕێکی بایەخدارانە"ی داخستوە. هەقیقەت وەکو ئامانج و ئاکامی لێبڕاوانەو بێئەملا و ئەولا، رێچکەی ئەمرۆی زانستی رۆشن کردۆتەوە. لەم روەوە، راڤەگەلی لێکجیا و تەنانەت دژبەر تەنیا دەرخەری ناتەبایی بیروڕا لەمەڕ هەڵێنجانە لواوەکان لە هەقیقەت دەناسرێت و باوەڕی گشتی ئەمەیە کە سەرەنجام رۆشن دەبێتەوە کە کام لەوانە دەتوانێ  لەتەك ئەو راستییە بنەتایی و لێبڕاوە یەکانگیر بێ. بەڵام هەقیقەت ئاکامی خەیاڵی و بنەواشەیەکی نەسەلمێنراوە کە زانست بزاڤی خۆی بەرەولای (لە کاتێکدا کە هەبوونیشی تەنیا گریمان کردوە)  ئورگانیزە دەکات. هەقیقەت کە بەم چەشنە تەنیا راڤەیەك لە هەقیقەتە و بەس، بە پێوەرێك دەزانرێت کە ناتوانێ و نابێ بکەوێتە بەر گومان و رەخنەکارییەوە. زانست کە شتێك لە دەرەوەی خۆی بە فەرمی ناناسێ و ناوی پڕوپووچی لێدەنێ، بە سانایی، بوونی هەقیقەت لە دەرەوەی خۆی باوەڕدەکا و گشت بزاڤی خۆی رێگەیەك بەرەو لای ناودەنێ. زانای پۆزەتیڤیست، زانستگەرای دۆگماتیست، بە تیتاڵییەوە لەهەر شتێك لە دەرەوەی بازنەی دانایی خۆیەتی دەڕوانێ. ئەو بە ناوی هەقیقەتێکی سپیتا کە تەنیا زانستی

(12) M.foucault, l archeology du savoir, paris, 1969 p. feyerabend, farwell to reason , London , 1987

ئەو کلیلی چوونە نێو دەروازەکەی پێیە، هەر دیاردەیەکی فەرهەنگی لە دەرەوەی زانست بێ بەرتەك دەداتەوە، یا لانیکەم بە بەرزترین ئاستی گومانکارییەوە لێی دەڕوانێ، گومانێك کە تۆزقاڵێك لێی لەمەڕ باوەڕی چەقبەستوی خۆی بە هەقیقەت بەکاری ناهێنێ. ئەمە لە کاتێکدایە کە دەتوانین نیشان بدەین کە فەلسەفەی هونەر و جیهانبینی (weltanschauung) ی ئێمە لە توخمگەلێ پێکهاتوون کە لەدەرەوەی بازنەی لەبەرگرەوەیی و باڵادەستیی زانستیدا بوونیان هەیە. زانست تەنیا لەبەرئەوەی تەواوەتخوازە، ئەم توخمانە بە فەرمی ناناسێ و بە رەوایان نازانێ، بەڵام خۆی لە توخمێکی گریمانکراو، وەکو ئامانج وئاکامی کارەکە دەڕوانێ و بڕوای پێدەکا و هەرگیز پرسیاری پیلاتێس دووپات ناکاتەوە:

" هەقیقەت چیە؟"

لە بەرانبەر چەمکی هەقیقەت وەکو ئاکام و داوەری بنەتایی رێساکان و راڤەکان، یونانییەکان پێش سەرهەڵدانی مێتافیزیك، واتە بەر لە سەرهەڵدانی بیرۆکەی ئەفلاتونی، بە شێوەیەکی دیکە دەیانڕوانییە هەقیقەت. هەروەك هایدگێر نیشانی داوە وشەی یونانیی aletheiaبە واتای "ئاشکرایی" یا باشتر بێژین" دانەپۆشراوی" بوو. لە دیدی یونانیانێك کە بەر لە پەیدابوون و باڵادەستیی ئاخێوی مێتافیزیك تێدەهزرین، هەقیقەت شتێك نەبوو جگە لە ئاشکرایی. لە بڕگەی ۱۲۳ لە **شیعری فەلسەفیی هێراکلیت** دەخوێنینەوە کە " بنچینەی راستەقینە(یا شتێك، یا جیهان) حەز دەکا خۆی بشارێتەوە"[۱۳] وشەی physisکە لە وەرگێڕانی تۆماس رۆبینسۆندا" بنچینەی راستەقینە" یا real constitution هاتوە، لە سێ پاچەڤەی برەوداری فەرەنسی بە la nature یا " سروشت" ناودێر کراوە[۱٤] هەروەك هایدگێر لە **دەروازەیەك بۆ مێتافیزیك** نیشانی داوە ئەم وشەیە لە لای یونانیان بە واتای هەبوون بوو، نەك سروشت.[۱٥] هەقیقەت، هەمان ئاشکرایی هەبوونە و شتێك نیە کە لە بنەتای کاری زانستی، لە ئاکامی رێگا یا لە کۆتایی مێژوودا وەدەست بێت. هەقیقەت بنەتایەکی

(13) Heraclitus, fragments, trans. T.m. robinson, university of toron to press, 1991, p.71

(14) les penseurs grece avant socate, trans. J .volquine, paris, 1964.p.81.

Heraclite, fragments, trans. F.roussille , paris, p.53.

j-p. Dumont ed, les ecoles prsocratiques, paris, 1991, p.93

(15) M.Heidegger, Introduction ala metaphisigue, trans, G.kahn, paris, 1985, PP. 63-84



خەیاڵکردشێوە نیە کە وەکو بیرۆکەیەکی ئەفلاتونی لە جیهانێکی دیکەدا جێی خۆش کردبێ‌و دەرکەوتگەلێ لەو بە سەر شتانو بوونەوەران پرژا بێ.

هەقیقەت بەردەوام لەهەمبەر کەسێك کە سەرنجی دەداتێ، رووداوێکی تازەیە، جیاواز و تاقانەیە کە لە بوارێکی مێژوویی‌و بەرجەوەنگەلی راڤەکاردا جێدەگرێ. لە هێرمێنۆتیکی تازەدا، هەقیقەت بیچمی بەرسڤێکی کاتی‌و مەرجدار بە خۆوە دەگرێ‌و بە هیچ شێوەیەك ناتوانێ بەرسڤێکی لێبڕاوانە و بنەتایی بێت. هەر ولامێك، بە شیمانێکی زۆرەوە رۆشنگەری خاڵگەلێکی تازە دەبێت، بەڵام بێگومان رێخۆشکەری پرسیارانێکی تازەو زۆر و زەوندیش دەبێت. هەقیقەتێکی سەربەخۆو لەخۆوە بوونی نیە. هەقیقەت بەستراوەتەوە بە پرسیار و لەم رێگەوە زایەنەری پرسیارانێکی تازەیە. هەقیقەت ئاکام‌و ئەنجام یا ئەو شتانەی یونانییەکان telosیان پێ دەگوت، نیە. هەمبەری بنچینەیی هەقیقەت لە تەك بەرتەسکیی رووداو و بەرتەسکیی مەرجێك کە شتێك دەکاتە راستەقینە، واتە هەمان شت کە هایدگێر بە "هەرامەی راستەقینە بوون" (Faktizität) ناودێری دەکرد، لە یەکەمین نووسینەکانیدا بەر لە **هەبوون‌وهەرەت** هاتبوویە گۆڕێ‌و لە تێزی ئەو "لە بارەی گەوهەری هەقیقەت" کە دەسپێکەری وەرچەرخانی (kehr) ی بە ناوبانگ لە هزری ئەودایە، هەمدیس هاتە ئاراوە و سەرەنجام لە پەرتوکی **نیچەدا** زراڤبینی کرا.[۱٦] هەمبەری نێوان "هەرامەی راستەقینە بوون"و هەقیقەت لە وشەی یونانیی a-létheia ئاشکرایە. هایدگێر لە باسی رەچەڵەکناسیی ئەو وشەیە a یا پێشگیری نەرێکردن بە گرنگ دەزانێ. پەیڤی Lethe بە واتای داپۆشراوی‌و شاراوەبوونە و aletheia یا هەقیقەت دانەپۆشراوی‌و ئاشکراییە. بنەمای هێرمێنۆتیکی "هەرامەی راستەقینە بوون" راستیی رووداوانەی بوونێکی چوارچێوەدار و هەرەتمەندە. بە ئاشکرا ئەم هەڵێنجانە لە"هەقیقەتی رووداوانە" بۆ هەقیقەتێکی مێتافیزیکی‌و لە دەرەوەی

(١٦) هایدگێر لە بڕگەی دوازدەیەمی **هەبون‌و هەرەت** (ل ٥٦ی دەقی ستاندەری ئاڵمانی) لە "هەرامەی راستەقینە بوون" کە بە ئینگلیزی بە (facticity) دەیخوێننەوە، دواوە:"هەرکە دازاین هەبێ، کەتوار(fact) یکەو راستەقینە بوونی وەها کەتوارێك ئێمە بە"هەرامەی راستەقینە بوون" ناوی لێ دەنێین. ئەمە رێگەیەکی حاشا هەڵنەگری هایدن‌و خودان پێکهاتەیەکی تێکچڕژاوە کە تەنانەت ناتوانێ وەکو کێشەیەك وەری بگرێت، مەگەر ئەوەی کە هەڵکەوتی بووندارانەی بنچینەیی دازاین بزانرێت:

M.Heidegger, Being and Time, trans. J.Macgurrie and E.Robinson oxford, 1973,P.82 .

کات‌و شوێن‌و لە دەرەوەی هایدن یا دازاین ناگەڕێتەوە. ئەم هەڵێنجانە لە هەقیقەت چەشنی ئاشکرایی هایدن یا ڕوودراوانەیی "هەرامەی راستەقینە بوون" لەگەڵ چەمکی عیبرانیی emèt بەراورد بکەین. ئەم پەیڤە کە لە **کتێبی پیرۆز** بە واتای"هەقیقەت" هاتوە و لە بڕگەی جێی مەبەستی ئێمە لە **ئینجیلی یوحەننا** شدا دووپات کراوەتەوە، لەدیدی ڕەچەڵەکناسیی وشەکانەوە بە واتای ئەمەگناس، پشتیوان‌و لایەنگرە. لە **مزامیر دا** چەندقات هاوپێوەندیی هەقیقەتی ئیمانی‌و پشتیوانی هاتۆتە گۆڕێ. پشتیوانیی خوا لە کەسێك کە ئیمانی بە هەقیقەتی ئەو هێنابوو، بنچینەی تێگەیشتنی دینی لە هەقیقەتە. لە باسی هایدگێر لەبارەی ئاشکرایی، هێمایەك بۆ "پشتیوانی"ی هەقیقەت لە باوەڕهێنەر بەدی ناکرێت. هایدگێر لە **تەرخانی پشکێك بۆ فەلسەفە** لەمبارەوە زۆری نووسیوە. چەند بەشێك لەم کتێبە لەبارەی ئەمەیە کە ئایا ئێمە دەتوانین لە خوا بە شێوەیەکی تازە تێهزرین؟ بەردەوام خوای دینەکان لە "من" دەدوێ، بەڵام هایدن لە هەر وێنایەك لە "من" جیایە. بەم پێیە "خوایەك" یا Göttenی نیە.[١٧] شتێك کە ئاشکرا نەبێ لەگەڵ ئاخاوتەیەك کە هێمای بۆ دەکا یەکناگرێتەوە. ئەگەر بەرێکەوت، یەکانگیرییەکیش پێك بێت، ناتوانێ بۆ ئاخێوەر ئاشکرا ئەرخەیانکەر بێت. لە پەیڤی یونانیی oyoó^ یا "لۆگۆس" ئەم هاویەکبوونی بنچینە و ئاخاوتە، یا لۆژیك و زمان، بوونی هەیە. لۆگۆس زۆلاڵێتی زمانی و واتایی دا-نە-پۆشراوی بوو. لەجەرگەی "لۆگۆس"دا، پێکبەسترانی ئاوەز- ئاخاوتە لە خۆیدا فێرکارییەك بوو، واتە شتێکی لە خۆیدا ئاشکرا و شیانی تێگەیشتن دەکرد. لە گوتنەوەی زمانیدا، شتەکان کە ئاوەز دەشیا بیانناسێ، بەهەمان شێوە هەمدیس دەناسرانەوە. لەم" دەربڕین" یا "گوتنەوە"یەدا شتێکی تازە ڕووی نەدەدا. لە قەڵەمڕەوی هەقیقەتدا، شتێك کە خۆ- ئاشکرایە، واتە" لۆژیکی بنەتایی شتەکان"یا apophansis، لە لۆژیکی ئاخاوتەییدا بنج دەبەستێ و شتێك ناناسێنرێ،" بەیان"(ناکرێ و) "نانوێنرێت"، تەنیا دەردەکەوێ. ناکرێ بێژین کە لەم قەڵەمڕەوەدا شتێك pre-sentدەبێت. پێشگری preبە واتای شتێك کە پێشتر هەبووە و هەنوکە بەیان دەکرێ یا خۆی دەناسێنرێ، لێرەدا کارایی نیە. لە دەسپێکی سەرهەڵدانی مێتافیزیکی ڕۆژئاوایی بوو کە ئەم" دەربڕین یا ناسێنران"ە، واتە دەربڕینی شتێکی لە پێشان هەبوو بە یاریدەی ئاخاوتە سەری هەڵدا. بە پێی میتافیزیکی ڕۆژئاوایی شتێك

(17) M.Heidegger, Beiträge zur philosophie, Gesamtausgabe, Band 65,Frankfurt am Main, 1989,p.239.



ڕاست و دروست دەزانرێت کە بتوانێ کۆی شتانێك کە پێشتر هەن، ئامادە بکات. وەلێ، لە فەلسەفەی یونانییەکانی پێش سوکرات، واتە لەوێدا کە هێشتا سەردەم یا مێژوی مێتافیزیك دەستی پێنەکردبوو، ئەم پێش و پاش کەوتنە هەرەتییە بێمانابوو. ئەمڕۆ، لە زانستی مودێرندا بونیادی مێتافیزیکیی فامکردنی هەقیقەت، واتە ئاشکرا بوون یا ناسێنران لە گۆڕێدایە. پێوەری لێك هاوێرکردنی مێتۆدی دروست، سەرکەوتنە لە پەیداکردنی کەتوارێك کە پێشتر هەبوو. بەپێی بونیادی مێتافیزیکی، ئێمە بەردەوام لە کاری دۆزینەوەی شتانێکی پێشترهەبووین: یاساگەلێ، ڕێساگەلێ، تەنانەت مێتۆد و بەرەنجامگەلێ. لە چەمکی لاتینی veritas هەقیقەت بەم هەرەتمەندییەوە هاتە ئاراوە و ئیدی هیچ شوێنەوارێك لە aletheia نەمایەوە.

بەڵام فەلسەفە دەبێ لە دەرەوەی ئەم قەڵەمڕەوی بەیانگەری، نواندنگەری و پاشکەوتنە زەمانییە کار بکات. فەیلەسوف لەو شتەی زانست دەستەبەندیی دەکا و تێکنۆلۆژی" لە قالبی" دەدا" جیادەبێتەوە. ئەو لە قەڵەمڕەوێك لە دەرەوەی پانتایی ئوتۆریتە و دەست بەسەراگرتنی زانست کار دەکا. ئەو دەبینێ کە سەروکاری ئێمە لە شیعر، هونەر و دیندا لەگەڵ شتانێکە کە "بە بیچمی بەرهەست" دەستەبەندی، تاوتوێ و فام ناکرێن. لێرەدا پرسیارێکی کلیلی سەرهەڵدەدا: ئایا لە پانتایی زانستیشدا سنورێك بۆ" بیچمی بەرهەست" هەیە یان نا؟ ئێمە لەرەوتی دەربڕینی ئەزموونگەلی زانستی زۆرجاران لەگەڵ شتگەلێ سەروکار پەیدا دەکەین کە ئاوەزمەندانە و ژیرانە و عەقڵگیر کار ناکەن؟ زمان قەڵەمڕەوی ئاشنای وەدەرکەوتنی ئەم سەمەرانەیە. هەموو شتانی ئامادە لە زماندا هەنتەشیان نابێت، ئەمە خاڵێکە کە لە سەردەمی **دیاردەناسیی ڕۆحی** هێگل بۆ ئێمە ڕۆشن بۆتەوە. گادامێر لەمبارەوە نوسیویەتی" تۆێژینەوەی فەلسەفی کە بە شێوەیەکی بنچینەیی بۆ نەوەی ئێمە، باندۆرگری کارەکانی هۆسرێل و هایدگێرە، بە واتای مافی پرسینی ئەم پرسیارەیە کە هەل ومەرجی ڕاستەقینەی گوزارەیەك لەسەروی ئاراستە لۆژیکییەی چیە؟ بەڕای من، ئێمە دەتوانین بە شێوەیەکی بنچینەیی بڵێین کە هیچ ڕێساو گوزارەیەك نیە کە بەشێوەیەکی پەتی‌و سادە ڕاستەقینە بێ".[١٨] بە دەربڕینی دیکە، هیچ گوزارەیەك ناتوانی بەدی بکەیت کە لەگەڵ هەقیقەت هاوجووت بێ، بەڵکو بەردەوام دەری دەبڕێ یا ڕاڤەی دەکات، "ئاراستەدار"ە، سەرقاڵی گوزارەکانی دیکەیە، بە "پێش ـ داوەرییەکان"و "نەریت"ەوە گرێ دراوە. هەر

(18) Gadomer, op. cit., p.49.

گوزارەیەك، بە ناچار، لە گوزارەكانی دیكەوە دەست پێدەكاو لەگەڵ راڤەكانی دیكە یەكانگیر یا نەیارە. لەوەش گرنگتر ئەمەیە كە هەرگوزارەیەك بەرسڤێكە بۆ پرسیارێك. گوزارەیەك نیە كە بتوانی بەدەر لەم لایەنی وەڵامدانەوەیە لە قەڵەمی بدەیتو گریمان بكەیت كە وڵامێك بۆ پرسیارێك نیە. بۆ درك پێكردنی كاتیی هەرگوزارەیەك دەبێ تێبكۆشین تا رێسایەكی تاقانە كە لە پشت لۆژیكی پرسیار وەشێراوە، تێبگەین، پرسیارێك كە ئەم گوزارەیە بەمانای وڵامێكە بۆی. هەر پرسیارێكیش خۆی "ئاراستەدار"ە و لەگەڵ پرسیارانو نەریتەكانی دیكە دەستەویەخە دەبێت. ناتوانی واتای تەواوی لە خۆی یا لە هیچ وڵامێكی شیمانكراو كە پێی دەدرێتەوە، بزانیت. پرسین، دارشتنی پرسیار، دوابەدوای "پێش ـ داوەرییەكان" و ئەو شتەی هایدگێر "پێش ـ فامەكان"ی پێوتوە، سەر هەڵدەدا. ئەوانیش بۆ كۆماگی هزروئاگایی ئێمەو ئەو شتەی كە بە ئەزموونی ئێمە لە ژیان ناودەنرێ، یا بە گوتەی نیچەی لاو"ئاسۆی ژیان"، دەگەرێنەوە. هەر پرسیارێك "ئاسۆ"ی واتاكانی خۆی بەرین دەكاتەوە. شوێنگەیەك بۆ وڵامە شیمانكراوەكان بەرهەڤ دەكات. ئەم شوێنگەیە نەك لە بارودۆخی وەستاو و تاكوتەرا بەڵكو لە ژیانی بە كۆمەڵو بەكردەوە ئاخێز دەكا. لە هەبوون ـ لە ـ جیهاندا واتە لەو شتەی هایدگێر بە دازاین ناودێری كردوە كە لە خۆیدا دەرخەری بە ملداهاتنی ژین لەگەڵ كەسانی دیكەیەو جیهانێتیومێژوودارییە،پێكدێت.هەرپرسیارێك هەرچەندەیش ئەبستراكت و داخراو بێ، لە خۆیدا ئەم لایەنی كۆمەڵایەتیو پێوەندیكاریو پراگماتیكو نێوانزەینیو نێوان ـ مرۆییە دێنێتە پێشێ.

## (٣)

لە گوزەری مێژوویی پێشكەوتنی ئاخێوی هیرمێنۆتیك لە رۆژگاری مودێرندا و لە ئەوروپا، روداوێكی گرنگی مێژوویی باندۆرێكی یەكلاكەرەوەی هەبوو. ئەم روداوە، سەرهەڵدانی بزوتنەوەی چاكسازیی دینیو وێكخستنی شەریعەتی مەسیح لەسەر ستونی بنەواشەگەلی تازە و لەراستیدا راڤەگەلی تازە، لە باشار لەگەڵ بنەواشە باوەرِدارانەو راڤەكانی كەلیسای رۆما بوو. گرنگترین هزرمەندانی پرۆتستان وەكو مارتین لۆتەر و ژان كالۆن، یا عاریفانێك وەكو یاكوب بوهمە، یا بیرمەندانێك كە بازنەی كارەكەیان بە بەرینایی (كاری) لوتەر كالۆن نەبوو، بەڵام بە نۆرەی خۆیان باندۆری زۆریان لەسەر پێشكەوتنی رێبازی نوێ دانا، كەسانێك وەكو ساموئێل راتفۆرد و جان ئامۆس كۆمنسكی لە مشتو مرِە فیكریو باوەرِمەندانەكانی



كاتۆلیكەكان، بەدەوام لەسەر هەرە پێویستیی هێنانە گۆرِ و پەسند كردنی راڤەگەلی تازە لە دەقگەلی سپیتا و لە سەروی هەموویانەوە **كتێبی پیرۆز** بە تایبەتی **چاخی نوێ (ئینجیل)** جەختیان كرد. ئەوان لە بەرانبەر باڵادەستیی زەمینی، مەتریالی، سیاسیو لەشكریی كەلیسای رۆما، رێگەیەكیان جگە لە گەڵاڵەكردنی ئاسان تێگەیشتن لە دەقگەلی سپیتا بۆ هەموانو بە گوێرەی ئاسۆی دانایی سەردەم، نەبوو.ئەوان ئێجگار هەوڵیان دا تا پاوانكردنی لێكدانەوە و راڤەی دەقگەلی سپیتا لە چنگی قەشەكان دەربێنین، بۆیە دەستیان دایە پاچەڤەی ئەم دەقانە بە زمانی خەڵكەكەیان و لە راڤەكانو لە لێكدانەوەكانیاندا تازەگەرییان كردو هەڵبەت لە لایەن كەلیسای رۆماوە بەچەواشەكار و خوانەژناس ناونران. باندۆر پەسندیی دەستەیەك لەو بنەما فیقهیانەی شەریعەت لە فەلسەفە، زانستەكانو بیچمەكانی دانایی رۆژگار، نەك تەنیا هەرەپێویستیی چوونە نێوی باسگەلی دینیو ئاخاوتەیی (كلامی) ، بەڵكو هەرە پێویستیی ئاگادار بوون لە باسە زانستیەكان و ئەو شتەی كە لۆتەر خۆی "گەنجینەی نەریتەكان و دەسكەوتەكانی هزری مرۆیی" ناوی نابوو، دەهێنایە پێشێ.[١٩]

جەخت لەسەر خوێندنەوەی دەقگەلی سپیتا بە پێی فەلسەفە، زانستەكانو فۆرمەكانی دانایی سەردەم، باسكردن لە مێتۆدی راڤەی دەقەكانی لە رۆژەڤی زۆر لە توێژەران و یەزداناناسان دانا. یەكێك لەم یەزداناناسانە فرێدریش دانیەل ئێرنێست شلایرماخێر بوو، كە لەمەرِ هێرمێنۆتیكو چەشنەكانی لێكدانەوەو راڤەی دەقەكان زۆری نووسیو ئێجگار وانەی وتەوە. كارەكانی ئەو هاوپێناو لەگەڵ تیۆرییەكانی دیكە كە لەمبارەوە لە لایەن كەسانێك وەكو یوهان مارتین كلادنیوسو فرێدریش ئاسێت خرانە روو، هەروەها راڤەگەلی زۆروزەوەند و تازە كە لە دەقگەلی سپیتا بە رێژەیەكی تارادەیەك بەرین بڵاو بوونەوە و خوێنرانەوە، بیچمیان بە قەڵافەتی سەرەكیی"تكنیكی هێرمێنۆتیك"بەخشی. كاتێك كە سەدەی نۆزدەهەم هات، ئیدی مێتۆدمەندیی زانیاری لە بواری راڤەی دەقەكان بە بەرەنجامگەلی درەوشاوە گەیشتبوو، نەك تەنیا لە قەڵەمرەوی ئاخێوی دینی بانتر هەڵكشابوو، بەڵكو راڤەی دەقیشی وەپشت سەرنابوو و تێكرای زانینی مرۆیی و تەنانەت قەڵەمرەوی باس لە بونیادی ئەم زانینە واتە ئاخێوی فەلسەفیی ئەپستمۆلۆژیای تەنی بوو ـ لە نێوەراستی ئەو سەدەیەدا زاراوەی "راڤەی جیهان" لەنێوان فەیلەسوفانێك بە روانگەگەلی ئێجگار جیاوازەوە، برەوی پەیدا كربوو. لەم

(19) G.Gusdorf, Les origins dehermeneutigue, paris, 1988, pp.100-103.

ڕووەوە، بۆ فەیلەسوفو کۆمەڵناسێکی وەکو ویلهۆلم دیلتای لە کۆتایی ئەو سەدەیەدا، ئەم ئەگەرە ڕەخسابوو کە باسەکە لە زمانناسیی مێژوییو تەنانەت لە ئاخێوی فەلسەفی فراوانو پەڕگیرتر بکاتەوە. لە پاش دیلتای، ئیدی هیچ سەمەرە نەبوو کە توێژەران لە ڕاڤەی کولتورەکان، ئاخێوگەلی زانستی، هونەریو ڕەوشتیو تەنانەت ڕاڤەی ڕوداوەکانو کردەکان، کە بە واتای ڕاڤەی مێژوش دەزانرا، بدوێن. لە سەروبەندی سەدەی بیستەم باسکردن لەوە کە زۆربەی بوارەکانی ژیان، ڕەفتاروکولتوری مرۆیی دەشێ ڕاڤەبکرێو تەنانەت سەر وەدەرنانی ئەم ڕایە کە تێکڕای تێگەیشتنی مرۆڤ ڕاڤەییە، چەندان سەمەرە خولقێن نیە.

سەرەڕای برەو و پەسندی باڵادەستیی ڕاڤە لە زۆربەی بوارەکاندا و دەورێك کە هێرمێنۆتیکی فەلسەفی لە سەلماندنی ئەم خاڵە گرتیە ئەستۆ، نێوەندێتیی دەق هەروا مەسەلەی سەرەکیی هێرمێنۆتیك مایەوە. وادێتە بەرچاو کە تەنانەت ئەمڕۆش ڕاڤەی دەق ڕێنوێن و بیچمی سەرەکیی ڕاڤە لە بوارگەلی هەمەجۆری ژیانی مرۆیی دەزانرێت. بیرمەندانێك وەکو ژاك دێریدا و پۆل دێمان، پەیڕەوانی هێرمێنۆتیك سەرکۆنە دەکەن کە هەرچی هەوڵ دەدەن، ناتوانن ئامانجی پەیدا کردنی" واتای ڕەسەن" وەلانێن و هەر بۆیە دەگەڕێنەوە لای باشقەی دەق. هەر بۆ نموونە دێریدا لە وتاری" پێکهاتە، نیشانە و کایە" کە لە یەکێك لە یەکەمین پەرتوکەکانی خۆی بەناوی **نڤیسیار وجیاوازی** لە تاوتوێی ڕەخنەکارانەی مێتۆدی کلۆد لیۆشتراوس بڵاوی کردەوە، دوو چەشن ڕاڤەی لێك جیاکردەوە. ڕاڤەی یەکەم هەمان مێتۆدی پێکهاتەیی دۆزینەوەی ڕەمز یا واتاکانی دەقە، کە لە گریمانی بوونی ڕاستییەك یا سەرچاوگەیەك کە لە کایەی نیشانەکان و لە سیستمی فرەواتایی نیشانەکان هەڵدێ و سەرەنجام شیانی تێگەیشتن و ڕوونکردنەوەیە، دەست پێدەکا و لە ڕاستیدا یارانی هێرمێنۆتیك خۆیان کاری خۆیان بۆ ئەم چەشنە ڕاڤەیە تەرخان کردوە، تەنانەت ئەگەر خۆیان ئەم خاڵە پەسند نەکەن. ڕاڤەی دووەم چالاکییەکی هەڵوەشێنەرانەیە کە لە بەرهەمەکانی نیچە بەدواوە، بە شێوەی هەمە جۆر هاتۆتە گۆڕێ و نیشان دەدا کە کت ومت لە بەر هەمان کایەی نیشانەکان، ڕاڤەکان ناتوانن دۆزینەوەی واتای ڕەسەن بن.[٢٠] ئەم ڕایە لەمەڕ هێرمێنۆتیکی مودێرن ڕاست نیە. ژمارەیەکی هەرەمەزن و ڕوولەزێدەبوونی نوسەرانی هێرمێنۆتیکی ئەمڕۆیی، بە تایبەت لە قەڵەمڕەوی ئاخێوی هێرمێنۆتیکی ئەدەبی، بە جەختەوە گوتویانە و ئەم ڕێسایەیان کردۆتە

(20) j.derrida, lecriture et la difference , paris, 1967, p.427.



سەرباشقەی کاری خۆیان کە واتا نە بنەواشەیەکە و نە سەرچاوەیەك، وەها شتێك نیە کە بەر لە ڕاڤە و پێش لە هەڵکشانی ئاماژەگەری، لە دەقێك یا کردەیەك یا لە ڕوداوێکدا جێی بۆ خۆش کرابێ. خاڵی گرنگتر ئەمەیەکە هزرڤانانی هێرمێنۆتیك ئەمڕۆکە لەتەك ئەم ڕایەی نیچە کە هەقیقەت زادەی زمانپاراویی ئێمەیە بە تەواوی تەبان و تەنانەت لە بەگژدا چونی "تالوکەی ڕێژەیی نواڕی" کە بەردەوام جێی ترس و پەرێزی و فەیلەسوفان بوو، خۆیان نەبواردوە.

هێرمێنۆتیکی تازە واتاکان بە زادەی کردەی لێوڕێژ لە خەیاڵگەری و تازەگەری دەزانێ و لقێك لەو(هێرمێنۆتیك) کە لە بەرهەمەکانی نوسەرانی ڕێبازی ئەدەبیی کۆنستانس، واتە پەیڕەوانی تیۆریی وەرگرتنی دەق دەچێتە پێشێ، واتا جگە لە بەرەنجامی کردەی وەرگرتن و ڕاڤەی دەق لە لایەن بەرامبەر (خوێنەر- بیسەر) ەوە نازانێ. سەنجدان لەم نموونەی دوایی بەباشی نیشان دەدا کە تەنانەت چڕبوونەوەی باسی هێرمێنۆتیکی لەسەر دەقیش مەرج نیە مەترسی لێبکەوێتەوە و توێژەر دەتوانێ بەدەر لە کەڵکەڵەی پەیداکردنی واتاگەلی پێشینیی دەق، بەکاری خۆی درێژە بدات.

ئەگەر بەرجەوەنی بەرینی ڕاڤە لە دەقدا قەتیس نەکەینەوە، دەگەینە کوێ؟ هەروەك بە هێمایەکەوە گوتم، لە نێوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم مەسەلەی ڕاڤە لە هەمو شتانی ئەم جیهانە و نەك تەنیا دەق گەڵاڵە کرابوو. لە نێو فەیلەسوفانی نیوەی یەکەمی ئەو سەدەیە، زاراوەی" ڕاڤەی جیهان" ئاشنا بوو. گوتەی مارکس کە لە تێزی یازدەهەمی بە ناوبانگی ئەو لەدژی ماتریالیزمی میکانیکیی فویرباخ هاتوە، وەبیرمان بێنینەوە: "فەیلەسوفان تا هەنوکە لە ڕێگەی هەمە جۆرەوە جیهانیان ڕاڤە کردوە، ئەمە لەکاتێکدایە کێشە لەسەر گۆڕینیەتی".[٢١] وا دێتەبەرچاو کە کردەی ڕاڤە لە دیدی مارکسەوە چەندان کارێکی پڕبایەخ نەبوو، چوونکە بە جۆرە سوکایەتی پێکردنێکی ئاشکرا لێی دواوە. ئەم خاڵە کە هەرچەشنە ڕاڤەیەك گۆڕانێك لە ئاسۆی زانستیی سەردەمە و شتێکی زێدە دەکا و زنجیرە پرسیارانێکی لێدەکەوێتەوە،نەکەوتە

(٢١) ئەم ڕستەیە، لەو یاداشتانەدا هاتوە کە لە بەهاری ١٨٤٥ نوسراون و فرێدریش ئێنگڵس ناونیشانی" تێزگەلێ لە بارەی فویرباخ"ی بۆ دانان و لە ساڵی ١٨٨٨ بە هەندێ دەسکارییەوە چاپی کردن. دەقی سەرەکیی مارکس لە ساڵی ١٩٢٤ بڵاو کرایەوە. وەرگیرا و لە:
Karl Marex, early writing, trans.r.livingstone and g.benton , London, 1975 , p.423

بەردیدی مارکس و نەیتوانی لەم خاڵەش تێبگات کە هەرچەشنە چالاکییەك بە مەبەستی گۆڕانی جیهان پێویستیی بە ناسینێکی ڕاڤەیی لەوە. هەڵبەت ئەم ناسینە ناتوانێ کامڵ بێ‌و زۆر وێدەچێ لە کردەی کۆمەڵایەتیدا بگۆڕێت، بە هەرحاڵ هەبوونی بۆ دەسپێکی هەرکردەیەك‌و بۆ نموونە "کردەی شۆرشگێڕانەی گۆڕینی جیهان" هەرە پێویستە. ئەم خاڵە تا ڕادەیەك بۆ هەڵێنجانی سوکایەتی ئاسای مارکس لە کاری فەیلەسوفان دەگەڕێتەوە. ئەو کە بەردەوام کاری خۆی بە "زانستی" ناودێر دەکرد، تێفکرینی فەلسەفی لە بەرانبەر "زانستی ئەزموونی"و "کەتواری هەنوکەیی"دادەنا و هەڵبەت وەها بایەخێکیشی نەبوو. لە **ئایدیۆلۆژیی ئاڵمانی** دا مارکس‌و ئینگڵس هێندە چوونەپێشێ کە مەسەلەکانی فەلسەفەیان جگە لە "گوتە ڕازاندنەوەی بێ‌مانا" نەزانی‌و چەمکگەلی وەکو "گەوهەری مرۆیی"و "تاکی مرۆیی"یان تەنیا بە هۆکاری کۆمەڵێك بەدحاڵیبوون لە "ناسینی بەریانی ڕاستەقینەی هزر" ناساند. ئەوان لەبەر نەیاریی خۆیان لەگەڵ فەیلەسوفانی (پاش هێگلی) بە ڕاشکاوی لە جیایی خۆیان لە قەڵەمڕەوی گومانوێژییە بێ‌سودە فەلسەفییەکان‌و هەنگاونان لە قەڵەمڕەوی پتەو و قایمی زانستە ئەزموونییەکان دوان، زانستگەلێ کە گریمانەکانیان نەك ئەبستراکتە، بەڵکو "کەسانی ڕاستەقینە، چالاکییەکانیان‌و هەل‌و مەرجی مادیی ژیانیانە"و ئەم هەل‌و مەرجانە "تەنیا دەتوانن بە مێتۆدێکی بەشێوەیەکی تەواو ئەزموونی هەڵسەنگێنرێن".[٢٢] مارکس بە گەڵاڵەکردنی یەکبوونی تیۆری‌وکردەوە، پراکسیسی لە بەرانبەر ڕاڤەکاندا دادەنا و ڕای دەگەیاند کە لە ڕەوتی کردەوە دایە کە دەکرێ درك بە هەقیقەت بکەیت‌و تیۆری هەرکاتێ لەگەڵ کردەوەدا هاوپێناو بێ، هەواڵێك لە هەقیقەت دەدا بە دەستەوە. بەڵام هێشتا دەبێ بپرسین کە ئایا تیۆریی شۆڕشگێڕانە جگە لە ڕاڤەگەلێ لە جیهان، شتێکی دیکەیە؟ ئایا کردەی شۆڕشگێڕانە جگە لە تێکۆشان بۆ هاتنە دی‌و تاقیکاریی گەڵاڵەکانە، ئەوگەڵاڵانەی کە بە هەرحاڵ وەکو کۆمەڵە ڕاڤەیەك لە گۆڕێ دان؟ ئایا دەتوانی کردەوەیەك وێنا بکەیت کە بە جۆرێك لە جۆرکان ڕۆنراوی پێش ـ فام نەبێ؟

مارکس لە باوەڕ بە هەقیقەت، هەرە پێویستیی بەرهەستێتی (objectiveness)ی زانستی‌و ڕەت کردنەوەی ڕاڤەگەلی فەلسەفی تەنیا لەگەڵ پۆزەتیڤیستەکان تەبا نەبوو، بەڵکو

(22) K.Marx and E.Engels, collected Works, Moscow, 1975 vol .5, p.31

ب.ئەحمەدی) جەخت لە منە ـ نووسەر



لەگەڵ زۆربەی هەرەزۆری هزرڤانانی سەردەمەکەی، واتە ڕۆژگاری زانست باوەڕی‌و باوەڕ بە مێتۆدە زانستی‌و بەرهەستگەراکان هاوڕا بوو. ئەگەر لە پێشکەوتنی باسەکانی هێرمینۆتیکی مودێڕن، لەم دیدەوە ناتوانی دەسەرێکی بۆ لەبەرچاو بگریت، بەڵام لە ڕوویەکی دیکەوە کارەکەی شایانی سەرنجە. ئەو چالاکییەکی فیکریی نواند کە بووبە ڕێخۆشکەری تێگەیشتنێکی تازە لە ڕاڤەو لە یەك واتادا هێشتاش برەوداره. ئێمە ئەمڕۆ دەپرسین کە بۆچی مارکس کردەیەك یا ئەزموونێکی بە شتێکی گۆڕێنەر نەدەزانی‌و بۆچی وەکو باس‌و لێکدانەوەیەکی سادە لە بەرانبەر گۆڕانی جیهان ڕیزبەندی دەکرد و هێندە چووەپێشێ کە تێکڕای مێژوی فەلسەفەی خستەژێر پرسیارەوە؟ ئەگەر ئێمە لە بەرهەمەکانی مارکسدا خاڵگەلێکی ناتەبا لەگەڵ هەموو ئەمانەمان بەدی نەکردبا کە ڕێگەی تێگەیشتنێکی تازە لە ڕاڤە خۆش دەکەن، پرسیاری سەرەوەمان نەدەهێنایە گۆڕێ. بە سانایی دەتوانین ببینین کە ئەو لە بەرهەمە سەرەکییەکانی خۆیدا لەگەڵ تێگەیشتنی ئەمڕۆیی لە ڕاڤە یەکانگیرە و ئەوەش وەکو کردەی گۆڕان‌و ئەزموون لە داهێناندا دەخاتە ڕوو.

میشیل فۆکۆ لە یەکێك لە دواندەرییەکانیدا لە ژێر ناوی "نیچە، فرۆید، مارکس" کە لە مێزگردی حەوتەمین کۆڕی نێونەتەوەیی فەلسەفیی ڕوایومون لە ژوئیەی **١٩٦٤** پێشکەش کرابوو، مارکسی لەگەڵ نیچەو فرۆید بە یەکێك لە بنیاتنەرانی هەڵێنجانێکی تازە لە ڕاڤە ناساند. لە پاش کۆتایی دواندەریی فۆکۆ، لێیان پرسی کە چۆن دەتوانێ نوسەری "تێزگەلێ لە بارەی فویرباخ" لە ڕیزی دواکۆکیکاران یا بنیاتنەرانی هەڵێنجانێکی تازە لە کردەو ئەزموونی ڕاڤە ناودێر بکات. فۆکۆ لە وڵامدا گوتی:"ڕاستیتان دەوێ من چاوەڕێی ئەوەم دەکرد کە ئەم گوتەیەی مارکس لە دژی گوتەکانم بێتە بەرباس. وێڕای هەموو ئەمانە، ئەگەر ئێوە سەرنج لە ئابووریی سیاسی بدەن، دەبینین کە مارکس بەردەوام (ڕەخنە*) لە ئابووریی سیاسی وەکو شێوەیەك لە ڕاڤە دەخستە ڕوو. دەقێك کە لە بارەی کردەی ڕاڤە بێ، پێوەندیی بە فەلسەفەو ئامانجی فەلسەفەوە هەیە. ئایا ئابووریی سیاسی ـ بەو جۆرەی کە مارکس دەیهێنایە گۆڕێ ـ ناتوانێ جۆرە ڕاڤەیەك کە مەحکوم نەکرێت، بخولقێنێ، چونکە لە خۆیدا هەوێنی گۆڕینی جیهانی هەڵگرتوە و بە شێوەیەکی تایبەت نێوەکیکردن دەخاتە ڕوو؟"[٢٣] فۆکۆ ئەوەشی بە

* تێبینی لە نووسەرە. (و)

(23) M.Foucault, Dits et ecrits, paris, 1994, p.574.

گوتەکانی سەرەوە زێدە کرد کە هەر کاتێك لە پەنای نیشانەکاندا بین، نەك واتاکان، تێگەیشتنێکی تازە لە راڤە و لە بەرەنجامدا لە راڤەی مارکس وەچنگ دەخەین:" کاتێك کە لە دابڕانی سەدەی نۆزدەهەم (لە هزرینگەریی پێشو)** تێ دەهزرین، هەڵبەت لەگەڵ ناوی هێگلدا هاوپێناوی دەبینین. وەلێ لە مێژوی نیشانەکاندا دۆخەکە وەها نیە. بە تایبەت، لە هەرەمەزنترین بەرینبوونەوەی نیشانەکاندا، دۆزینەوەی زمانە هیندوئەوروپاییەکان،ڕەوینەوەی رێزمانیگشتی، جێگرتنەوەی چەمکی ئەندامئاسایی( organicity= لە کۆمەڵناسیدا) لەگەڵ ئالترناتیڤێکی دیکە. بڕوا بکەن کە هەموو ئەمانە"کەم بایەختر" لە فەلسەفەی هێگل نین". جیانی ڤاتیمۆ کە لەگرنگترین هزرڤانانی ئەمڕۆیی هێرمێنۆتیکەو لەو کۆڕەشدا بەشدار بوو، قەناعەتی بە روونکردنەوەکەی فۆکۆ نەهات و سووچی لەوگرت کە گوتەکەی لەمەڕ نیچە راستە، چوونکە ئەو بە راستی بە ناکۆتایی راڤەکان بڕوای هەبوو، وەلێ لەبارەی مارکس (گوتەکەی) وەڕاست ناگەڕێ.: "مەگەر مارکس لەم خاڵە نەدەدوا کە بەردەوام هەرەپێویستە بۆ شوێندەسپێکی سەرەکی بگەڕێینەوە؟ سەرخان چی پێیە کە بیڵێت، ئەگەر ژێرخان دیاریی نەکات؟ فۆکۆ لە وڵامدا گوتی: "... تەنیا بۆ نموونە **هەژدەی برۆمێر** لە بەرچاو بگرن. دەبینن کە مارکس هەرگیز راڤەی خۆی وەکو راڤەی بنەتایی نایەنەتە گۆڕێ. چاك دەزانێو ئەمەش دەڵێ کە ئێمە وەکو پێشان دەتوانینو دەبێ کە مەسەلەکە لە رێگەیەکی بێ بگارتر، یا لە رێگەیەکی زیاتر هەمەکی، راڤە بکەینو هیچ روونکردنەوەیەك ناتوانی بەدی بکەیت کە کارەکە تەواو بکات".[٢٤]

باس لە هەقیقەتو راڤە نرخی ئەوەی هەیە کە بە وردبوونەوەی زیاتر لە دەقی دواندەریی فۆکۆ بدوێین.[٢٥] فۆکۆ لەم گریمانەوە دەستی پێکرد کە تێگەیشتن لە تکنیکەکانی راڤە لە نووسینەکانی مارکس، نیچەو فرۆید دەتوانێ یارمەتیمان بدات تا لە هێڵە سەرەکییەکانی پەیکەرەیەکی هەمەکی یا زاینارینامەیەك لە تێکڕای تکنیکەکانی راڤە لە سەردەمی رێزمان نووسانی یونانی تا رۆژگاری خۆمان تێبگەین. هەر کام لەم فەرهەنگانە خودان سیستمی راڤەیی خۆیەتیو تکنیکەکان، مێتۆدەکانو رەوتی تایبەتی خۆی هەیە تا پێی وابێ کە زمان

---

** تێبینی لە نووسەرە. (و)

(24) ibid, PP.575- 576.

(25) ibid, PP.564-574.



واتایەك جگە لەو شتەی دەڵێ لەگەڵ خۆیدا دێنێو ئەم واتایە لە جێیەکی دیکە جگە لە زماندا هەیە. بۆ درکی ئەم خاڵە کە سەدەی نۆزدەهەم کام چەشن لە سیستمی راڤەیی پەیدا کردبوو و لە بەرەنجامدا، ئێمە ئەمڕۆ پەیوەست بە کام سیستمی راڤەیین، دەبێ سەرێك لە بەرهەمەکانی ئەو سێ بیرمەندە بدەین. یەکەمین بەرگی **سەرمایە** و پەرتوکەکانی وەکو **لەدایکبوونی تراژێدی، لە بارەی رەچەڵەکناسیی رەوشت، لێکدانەوەی خەونەکان** ئەم تکنیکە راڤەییانە روون دەکەنەوە. ئەم کۆمەڵە تکنیکە ئێمە لە بارودۆخێکی دژواردا تووش دەکەن، چوونکە شێوازگەلێکن کە پێوەندییان بە خۆمانەوە هەیە. کاتێك کە ئێمەی راڤەکار بەم تکنیکانەوە دەست بە راڤەگەری دەکەین، زیاتر خەریکی راڤەی خۆمانین. لە لایەکی دیکەوە، بە یاریدەی ئەم تکنیکانەی راڤەیە کە دەست بە راڤەی هزرەکانی هەمان راڤەگەرانی سەرەکی واتە فرۆید، نیچەو مارکس دەکەین. فوکۆگوتەنی، بەم چەشنە وەك بڵێی ئاوێنەگەلێك روو لە روو و پەیتاپەیتا کەتوار دەنوێننەوە.

گرنگیی کاری مارکس، نیچەو فرۆید لە کولتوری رۆژئاوا دا، لەوەدا نیە کە نیشانەکانیان فرەفاقی کردوە. لەوەشدا نیە کە ئەوان واتاگەلی تازەیان بەشتانێك کە پێشتر واتایان نەبوو، بەخشیوە. کاری گەورەیان ئەمەیە کە توانییان چیەتیی نیشانە بگۆڕن و رێچکەیەك بگۆڕن کە لەودا نیشانەکان دەتوانن راڤە بکرێن. بۆ نموونە، مارکس نیشانی دا کە لەو چەمکانەی کە بۆرژوازی لە پارە، سەرمایە، بایەخ و... دروستیان دەکا، تێکڕای ئەو شتانەی کە بەناوی رێساکان یا پێناسەگەلی بنەتایی ناودێر دەکرێن تەنیا قسەی پووچن و لەم کاروبارانەدا رێچکەی راڤەکان بێ کۆتاییە. ئەویش وەکو نیچە و فرۆید کە راشکاوتر لەو لۆژیکی باسی هێرمێنۆتیکیان بردۆتە پێشێ، راڤەیان بە پەیامنامەیەکی لە بن نەهاتو زانی. هەڵبەت بەر لەوانیش راڤە ناکۆتا دەهاتە بەرچاو، بەڵام باوەڕی سەرەکی ئەمە بوو کە نیشانەکان ئاڵ وگۆڕ ناکرێن. نیچە، مارکس و فرۆید راڤەیان لە گێچەڵی ئاڵۆ گۆڕی نیشانەکان رزگار کرد. لە پاش ئەوان نیشانەکان بە کۆمایەکی ناکۆتا و بێسنور گرێ دران، چونکە ئیدی کۆمەڵە درزێکی قەرەبوونەکراو و شوێندەسپێکی زۆروزەوەند هاتبوونە گۆڕێ. ناکاملّیی راڤە و ئەم کەتوارە کە هەر راڤەیەك بەردەوام پاتۆر پاتۆرە، لەبەرهەمەکانی هەر سێ هزرڤانەکەدا زۆر جاران بە یەك شێوە دەردەکەوێ: نکۆڵی لە شوێندەسپێك. ئەم ئەزموونە بۆ هێرمێنۆتیکی مودێرن ئێجگار گرنگە، هەتاکو کەسێك زیاتر لە راڤەگەریدا نغرۆ ببێ و پێشڤەبچێ، زیاتر لە جێیەك(فۆکۆ

دەڵێ لە ناوچەیەکی بە شێوەیەکی رەها ترسناك)  نزیك دەبێتەوە کە لەودا راڤە نەك تەنیا ڕێگەیەك بۆ گەڕانەوە پەیدا ناکات، بەڵکو خۆی لە ژێر ناوی راڤە دەرەوێتەوە.

لە دەرونشیکاریی فرۆید دا، راڤە هەرگیز ناتوانێ رابوەستێ و ناگاتە کۆتاییش. لە بەرهەمەکانی نیچەشدا بە ئاشکرا راڤە بەردەوام ناتەواوە.فەلسەفە بە لای ئەوەوە جگە جۆرێك لە زمانپاراوی کە بەردەوام لە دۆخی هەڵپەسێراندا دەمێنێتەوە، چەشنێك زمانناسیی مێژویی کە بەردەوام دڕدۆنگە، زمانناسییەکی بێزاراوە نیە کە بەردەوام بچێتە پێشێ و هەرگیز ناتوانێ بە شێوەیەکی رەها بنەجێ و سەقامگیر بێت. ئەم لایەنە ناپوخت و ناکاملەی راڤە لەگەڵ بنەواشە بنیاتییەکانی دیکە پەیوەستە و ئەمانە رەژیدەی قەلاَفەتی سەرەکیی هێرمێنۆتیکی مودێرنن: ئەگەر راڤە هەرگیز ناتوانێ بگاتە کۆتایی، زۆرسادە لەبەر ئەمەیە کە شتێك بۆ راڤە لە ئارادا نیە.

هیچ شتێك بوونی نیە کە بە شێوەیەکی رەها بۆ راڤە دروستکرا بێ، چونکە لەبنەتادا هەموو شتەکان راڤەن. هیچ نیشانەیەك لە خۆیدا ئەو شتە نیە کە خۆی بهاوێتە بەر هرروژمی راڤەوە، بەڵکو بە مانای راڤەی نیشانەکانی دیکەیە. هیچ بەروبوومێکی راڤەیی بوونی نیە کە خۆی راڤە نەکرێت و خاڵێکی راڤەیی نەبێ. ئەمە دەتوانین لە کارەکانی مارکسدا بەدی بکەین، کە هەمبەرێتییەکانی رەنێوهانینی راڤە نەدەکرد، بەڵکو راڤەکانی راڤەدەکرد. بە راستی فرۆید چ شتێکی لە نیشانەکاندا دۆزییەوە؟ ئەو سازوکاری" دەرون پشێوی"نەدۆزییەوە، بەڵکو خەیاڵپەوەرییەکانی(fantasmes) رۆشن کردەوە، خەیاڵەکان کە راڤەکانن، لەگەڵ دڵەڕاوکێکانی هاوڕێ یان. فرۆید ناچارنەبوو تا ئەوشتەی کە نەخۆشەکانی بەویان دەنواند، وەکو کۆمەڵە زناکێك لە زمانێکی بەدەر لە زمانی نەخۆشەکان راڤە بکات. راڤەی ئەو راڤەی راڤە بوو، لە قاڵبی دەربڕینێك کە ئەو راڤەیە دەریخستەڕوو. کت ومت بەم شێوەیە، نیچە بە مامۆستای راڤەگەلێ دەبینین کە خۆیان رۆنراوی راڤەگەلی دیکەن. وشەکان شتێك نین جگە لە راڤە. وشەکان بە درێژایی مێژو بەرلەوەی نیشانە بن راڤەگەلی بنچینەیی لە قەڵەم دراون. فۆکۆ لە دواندەریی خۆیدا ئەم خاڵەش دێنێتە پێشێ کە راڤە دەبێ بە چەشنێکی ناکۆتا بەردەوام خۆی راست بکاتەوە، واتە ببێتە راڤەیەکی تازە. کەوابوو مەسەلەی گرنگی وەها دەبێ: کێ راڤە دەکا و بە پێی کامە سەمەد؟[26]

(26) ibid. p. 573.



هەر راڤەیەك لە تامەزرۆیی واتا بەخشین بە جیهان بیچم دەگرێ. ئەم تامەزرۆییە نیشان دەدا کە شتێك لەم جیهانەدا کەمەو پێویستیی بەو واتایە بوونی هەیە. جیهان هێشتا ناکامڵ و بێمانایە و بەم راڤەیە کامڵتر دەبێ، چونکە واتایەکی تازە سەروەدەردێنێ. واتای دڵخواز نائامادەیە و من دەبێ بیچمی پێ بدەم و ئامادەی بکەم. جێی سەرنجە کە تامەزرۆیی من بە واتابەخشین، بە واتای دروستکردنی وێنەیەك لە جیهانە کە بە من تەناهی و هێمنی زیاتر دەبەخشێ و گۆڕانی پێوەندیی من لەگەڵ دنیا و کەسانی دی ئاسانتر دەکا. لە بەر ئەوەی ئەم تامەزرۆییە بە راڤە بەجۆرە هەمبەری من لەگەڵ جیهان دەکاتە ئامانج، هەر راڤەیەك کردەیەکی سیاسییە. راڤە وەهایە، چونکە بەرەنجامی ژیانی مرۆڤان لە تیرێژی هەمبەرێتییەکانی دەسەلاَتە و بەکاری دەربڕینی پێوەندییە مرۆییەکان لەم سووچەوە دێت. تامەزرۆیی بە راڤە سادەترکردنەوەی هەمبەری مرۆڤان لە ڕێگەی راڤەیە.

ئەم باسەی کریستوا بە شێوەیەکی پوختتر لە **هەبوون و هەرەت** ی هایدگێردا هاتوە. دەیڤید کۆزنزهوی لەمەڕ ئەم لایەنەی کاری هایدگێر دەنوسێ: "مەبەستی ئەو (هایدگێر) * لە تێگەیشتن بەسانایی بیچمێکی ناسین لەنێوان بیچمەکانی دیکە نیە، بەڵکو بنەڕەتیترین توانایی ئێمەیە بۆ ژیان لە جیهاندا و هەروەها ئەمەیە کە بە شێوەیەکی کارامە بە جیهانی خۆمان بوێرین. هەڵبەت ئەم توانایە دەبێ حسێب بکا کە تێکڕای شێوەگەلێ کە لەواندا خدەکانی جیهان ئاشکرا دەبن، پەیتاپەیتا لە دۆخی گۆڕاندان و هەرئەم گۆڕانە هەمیشەییەی جیهان لە ئێمە دەخوازێ تا بیچم بە راڤەگەلی تایبەت بدەین. هەر بەوچەشنەی کە گەلاَلەکانی ئێمە و پێویستییەکانمان جیاوازییان تێدەکەوێ، ئێمە راڤەکانی خۆمان دەگۆڕین. بۆ نموونە، هەندێجار دەبێ خۆمان وەکو قوتابیان راڤە بکەین، هەندێ جار وەکو ئەندامانی ماڵبات، هەندێ جار وەکو بەرخۆران (مصرف کنندگان) و رەنگە جارێکیش وەکو فەیلەسوفان لەگەڵ هەموو ئەوانەدا، هایدگێر دەخاتەوە بیرمان کە تێکڕای ئەم راڤانە درك پێکردنێکی بەرایی لە جیهانیان وەکو پێشگریمان لەگەڵدایە".[27]

* تێبینی لە نووسەرە

(27) D.cuzen hoy," Heidegger and hermeneutic turn" in c. guignon ed, the cambride componion to Heidegger, combride university, press, 1995, p.173.

## (٤)

کانت لە پێشگوتاری **هەڵسەنگاندنی وزەی داوەری** لەنێوان دوو چەشنە داوەری جیاوازیی دانا. داوەریی یەکەم لەمەڕ چشتی تایبەت، پشت ئەستۆر بەیاساکان و ڕێساگەلی پێشتر دیاریکراوە، کە کانت بە داوەریی لێبڕاوانەdeterminat judgement ناودێری کرد. داوەریی دووەم هەرچەند بەستراوەتەوە بە هەرامەیەکی تایبەتەوە، بەڵام دەبێ عەودالّی هەرامەی هەمەکی بێت و هەر بۆیە کانت ئەوەی بە داوەریی ڕاهێنەرانە (Reflective Judgment) ناودێر کرد. ئەو ئەم جیاکارییەی وەها دەربڕی: "وزەی داوەری بە شێوەیەکی گشتی وزەی تێهزرینە لە هەرامەی هەندەکی کاتێك کە لەنێو هەرامەی هەمەکیدایە. ئەگەر هەرامەی هەمەکی (ڕێسا، بنەواشە، یا یاسا) داتا بێ و بڕیاربێ کە هەمەکیی پەیدا بکرێت، وزەی داوەری تەنیا و تەنیا رامێنەرانەیە".[٢٨] ئەم پرسیارانە کە ئێمە چۆن و بە چ جۆرێ لە ئەزموونی هەرامەیەکی هەندەکی دەتوانین لە دووی هەرامەی هەمەکی بگەڕێین، هەمبەری ئەم کردەیە لەگەڵ زانستدا چیە، ئەمە کە ئایا دەتوانرێ بەرهەڤبوونی کەڵەکەیەك لە کاروباری هەمەکی کە لەگەڵ یەکدی شیانی بەراوەرد بن یان نا و لە هەمووش گرنگتر، تایبەتمەندیی تێڕوانینێکی ئاکامناسانە کە ئەگەری گەیشتن لە هەرامەی هەندکییەوە بۆ هەرامەی هەمەکی دەرەخسێنێ، تێکڕا لە سێهەمین هەڵسەنگاندنی کانتدا هاتوونەتە گۆڕێ.[٢٩]

هەروەك دیتمان مەسەلەی نێوەندیی گوتەیەك کە لە **هەڵسەنگاندنی وزەی داوەری** دا هێنامەوە، هەمبەری نێوان هەرامەی هەمەکی و هەرامەی هەندەکی‌یە. دەتوانین بێژین کە کانت دوو چەشنە داوەریی لێك جیاکردۆتەوە، یەکێکیان لە هەرامەی هەندەکییەوە بە ناسینی هەرامەی هەمەکی دەگات و ئەویدی لە هەرامەی هەندەکییەوە دەست پێدەکا تا هەرامەی هەمەکی وەکو یاسا، یا ڕێسا، یا بنەواشە هەڵسەنگێنێ. ئەو شتەی لە دەسپێکی سەدەی نۆزدەهەم بە ناوی "بازنەی ناسین" و " بازنەی هێرمێنۆتیك" هاتەگۆڕێ، لانیکەم لە ڕوانگەی فەلسەفی درێژەی ئەم باسەی کانت بوو. فرێدریش ئاسێت لە ساڵی١٨٠٣دا نووسی:" دژواریی ناسین ئەمەیە کە درك پێکردنی هەر پاژێك بە ناسینی (گشت) ەوە پەیوەستە، بەڵام گشت نازانرێت، مەگەر لە ڕێگەی تێگەیشتن لە پاژەکان". ئەو ئەم خاڵەی وەکوو پێکناکۆکێك هێنابوویە گۆڕێ، وەلێ لەو باوەڕەدابوو کە ئەم پێکناکۆکە هەرچەند ڕەژیدەی کۆمەڵە دژوارییەکە، هەمدیس وەکو بەربەست و لەمپەرێك لەڕێگەی توانایی تێگەیشتنی مرۆیی دەرناکەوێ، بەڵکو نیشاندەری پێوەندیی نێوەکی( یا بە زمانی هێگلی، پێوەندیی دیالکتیکی) لە نێوان گشتو پاژە. لە پانتایی هێرمێنۆتیکدا دەتوانین بێژین کە راڤەی پاژەکان، جگە بە وێنایەکی بەرایی لە (گشت) نالوێ، وێنایەك کە وێدەچێ لە ڕەوتی ناسینی پاژەکاندا بگۆڕێت و بە نۆرەی خۆی هەرەپێویستیی چاوخشاندنەوە بە ڕەوتی تێگەیشتن لە پاژەکانی لێ بکەوێتەوە. ئەمە باسێك نیە کە تەنیا لە ئاخێوی هێرمێنۆتیکدا قەتیس بکرێتەوە. لێرەدا خراپ نیە کە لە دوایەمین لاپەڕەکانی ژیاننامەی خۆنووسی وۆرنێر هایزنبێرگ، بە ناوی **وردودرشت** (بدوێمو) نیشان بدەم کە فیزیکزانانی وەکو کارێل فرێدریشو هایزنبێرگیش لەم مەسەلەیە ئاگادار بوون:"کارێل فرێدریش کە جارێکیان هاتبوە لامان، هزری بنەڕەتی تێکۆشانی خۆی وەها دەربڕی: بزاوتی تێفکرینی ئێمە لەبارەی سروشت بەردەوام لە شێوەی بازنەیی یا قەپووشکەیی* یە، چوونکە تەنیا لە دۆخێکدا دەتوانین درك بە سروشت بکەین کە لەبارەیەوە تێهزرینو، ئەگەر دەتوانین تێهزرین لە بەرئەوەیە کە زەینی ئێمە بە پێی یاساکانی سروشت دروست کراوە. کەوابوو، بە پێی بنەما لە هەرکوێوە بمانەوێ دەتوانین دەست پێبکەین. بەڵام بینای زەینی ئێمە بە جۆرێکە کە باشترە لەگەڵ سادەترین شتەکان دەست پێبکەین، واتە لەگەڵ کۆمەڵە شەقڵێکی نەیار: بەڵێ بوون یا نەخێربوون، هەبوون، یا نەبوون، چاکە یا خراپە".[٣٠]

شلایرماخێریش دەیزانی کە ڕێگەی دەرباز بوون لە بازنە نیە، بەڵام دەتوانین لە "کۆمەڵە شەقڵێك کە سادەترین شتانن" دەست پێ بکەین. بۆ "تێگەیشتن لە دەق" دەبێ لە "مێتۆدی دەربڕین یا شێواز" دەست پێ‌بکەین. "شێواز" بەکارهێنانی کەسیی ئاخێوە کە هەل بۆ دەق دەڕەخسێنێ تا شتێکی تازە و جیاواز بڵێت. دۆزینەوەی چەمکی سەرەکیی دەق و بەگشتی تێکچنراوی نیشانەکانو ڕێزمان، جگە بە سەرنجدان لە زمان نالوێ. شیکاریی هێرمێنۆتیکیی

(28) i.kant, the critique of judement, trans.j.cmeredith, oxford university, press, 1992, p.18.

(٢٩) لەمبارەوە بڕواننە پاری هەشتەمی ئەم پەڕتوکە:

١- گورنر، **فلسفەی کانت**، ترجمە ع. فولادوند، تهران،١٣٦٧، صص ٣٢٩-٣٣٩

* حلزونی. (وەرگێڕ).

(٣٠) و. هایزنبرگ، **جزءوکل**، **ترجمە** ح، معصومی همدانی، تهران، ١٣٦٨، ص ٢٤٥.

دەق لەگەڵ شیکاریی شێوازناسانە بە مێتۆدی لیۆئێسپیتزێر لەم دیدەوە جیاوازە کە هێرمێنۆتیك سەرەمرە زیاتر لەم خاڵە نزیك بۆتەوە کە واتای شاراوەی دەقەکان نازانرێت و لە دۆزین نەهاتویە. ئێمە تەنیا دەتوانین جۆرە نزیکییەك لەگەڵ دەقدا رایەڵ بکەین، بەڵام ئەمە بەواتای دۆزینەوەی واتاگەلی وردوکتومتی نیشانەکانی دەق نیە. شلایرماخێر دەیپرسی چۆن منالآن دەتوانن زمان فێربن، کاتێك لە پێشان لە هیچ رێسایەکی زماننناسانە ئاگادار نین. لە راستیدا ئەو دەیهەویست بەم نموونەوە نیشان بدات کە زەینی مرۆڤ دەتوانێ لە کۆمەڵێك کاروباری هەندەکی رێساگەلێ لەمەڕ کاروباری هەمەکی رێك بخات کە لەگەڵ کۆمەڵە یاسایەکی راستەقینە کە لەگەڵ ئەو کاروبارە هەندەکییانە پێکبەستراون و لە یەك واتادا رەژیدەی ئەوانن، جیاوازییان نەبێ، بە زمانی گادامێر، دەتوانین بێژین کە جۆرێك هاودڵی (EinfÜhlung) لە نێوان رێساگەلێ کە منداڵ پەیدایان دەکاو یاساگەلی بنیاتیی زمان هەیە. هەرچەند شلایرماخێر زاراوەی هاودڵی بەکارنەبردبوو، بەڵام ئەو خۆی لە باسەکانیدا لەم چەمکە نزیك ببوویەوە. وەکو نموونەیەکی رۆشنگەر، کە گادامێر لە یەکەمین بەشی **هەقیقەت و مێتۆد** زۆرجاران کەڵکی لێ وەرگرتوە، دەتوانین جۆرێك هاودڵی لەنێوان رێساگەلی پێکهاتەیی و شێوازناسانە کە راڤەگەری بەرهەمی هونەری لەودا دەیدۆزێتەوە، لەگەڵ یاساگەلێ کە بەرهەمی هونەری سەردەمانێك بە راستی لەسەر بنەمای ئەوانەوە دروست کرابوون، وێنا بکەین.

جیاکارییەك کە دیلتای لەنێوان روونکردنەوە و راڤە داینا و بەو پێیە یەکەمیانی بۆ مێتۆدی دەربڕینی یاساکانی زانستە سروشتییەکان و دووەمیانی بۆ مێتۆدی دەربڕینی رێساکانی زانستە مرۆییەکان تەرخان کرد، رەگاژۆیان لە هەمان جیاکاریی کانتی دایە. روونکارییە زانستییەکان بە ناچار دەبێ لە بزاوت لە هەرامەی هەندەکی بۆ هەرامەی هەمەکی، یاساگەلی پێشان هەبوو لە سروشتدا بدۆزنەوە وا "روونکاری"یان لەبارەوە بکەن و بەم پێیە ئەمانە داوەرییگەلی راشکاوانەن. راڤەگەلی هەمەچەشن لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان و جوانیناسیدا بزاوتێکن بەرەو بەیانکاریی واتاکان، ئاماژەکان و رێساکان و بەم پێیە ئەمانە داوەرییە رامێنەرانەکانن. دیلتای نیشانیدا کە دۆزینەوەی ئەو رێساکۆمەڵایەتیانەی کە تاکەکانی مرۆڤ خۆیان سازیان دەکەن، بە ناچار رەوتی ناسین و دیناو سەرقاڵی هەمان دروستکردن دەکەن و دژوارە بتوانی نکۆڵی لە دەستوەردانی ناسێنەر لە گۆڕانە بانهەڵکشاوەکاندا کە ئامانجی ناسینیەتی،بکەیت. لە راستیدا دیلتای لە قەڵەمڕەوی زانستە



مرۆییەکانو راڤەگەریدا سەرقاڵی دۆزینەوەی بازنەی هێرمێنۆتیك بوو. هەڵبەت ئێمە ئەمڕۆ، لەمەڕ زانستە سروشتییەکانو فیزیکییەکانیش لەگەڵ هەمان ئەو خاڵانەی کە دیلتای لەمەڕ زانستە مرۆیەکان هێنابوویە پێشێ، بەرەو رووین. بەڵام لەهەمان ئاستی زانستە مرۆییەکانیشدا ئەو دەبایە پەسندی کردبا کە راڤەکان لەبەرئەوەی کە لەتەك کۆمەڵە یاسایەکی پێشان هەبوو بەرەورِوو نین‌و بڕیار نیە کە یاساکان بدۆزنەوە، بەڵکو لە رەوتی دروستکردنی رێساکاندا دەوری خۆیان پەیدا دەکەن، بە ناچار دەبنە روانگەیەکی راستەقینە و دەبنە خاوەنی خەدیەکی متمانەیی و رێژەیی.

دیلتای لە شیپانەی ئەم رێژەیی نواڕییەدا راوەستا، بەڵام ئاخێوی هێرمێنۆتیکی رانەوێستا. خەدی رێژەیی راڤەکان لە هیچ جێیەك بەقەد باسی نیچە لە "بەرجەوەنگەرایی" وەها تەواو و ورد و کت ومت نەنوێنرا. لە هەڵێنجانی نیچە لە راڤە و داهێنانی هەقیقەت لە رەوتی بەکاربردنی زمان، ئێمە جارێکی دی لەگەڵ مەسەلەی بازنەی هێرمێنۆتیك بەرەورِوو دەبین. هەڵبەت، بەر لە نیچە، رۆمانتیکخوازە ئاڵمانییەکانیش تا رادەیەك بەم شێوەیە خۆیان بە مەسەلەی بازنەی هێرمێنۆتیك خەریك کردبوو. رەخنەکاریی شلایرماخێر، نۆڤالیس و فریدریش شێلگێل لە فەلسەفەی رۆژگاری خۆیان خاڵێکی هاوبەشی هەبوو و ئەویش مەسەلەی "رەها" بوو. ئەمان جەختیان دەکرد کە ئێمە ناتوانین تاکاتێك کە قەتیسی هەڵێنجانە ناتەواوەکان و پچرپچڕەکانی خۆمان لە هەقیقەت و جیهانین و داناییمان بە هیچ شێوەك رێگەیەك بەرەو فامکردنی تەواوەتێك خۆش ناکات، بانگەشە بکەین کە کۆڵەکەیەکی پتەومان بۆ ناسینی رەها پەیدا کردوە. ئێمە تەنیا وێنایەك لە گشت یا رەها لە مێشکماندا پەروەردە دەکەین و لەسەر ئەو بناخەیە سەرقاڵی راڤەکانی خۆمان لە جیهان، واتە دەربڕینی خۆمان لە تێگەیشتنێك کە لە پاژەکانی جیهان وەدەستمان هێناوە،دەبین. هەر لەبەر ئەمە دەبێ پەسند بکەین کە خەیاڵکردەکانمان و پێشگریمانەکانمان لە گشت، بەردەوام وەبەر گۆڕان و گۆڕاندن دەکەوێ. راڤەیەك کە هەرکام لە ئێمە دەیخەینە روو، تەنیا و تەنیا لە جیهانی بنەتایی و داخراو و سنورداری" من" دەدوێ و تەنانەت لە رێگەی لە پاڵ یەك دانانی کەڵەکەیەك لە راڤەکان و دروستکردنی بەراورد لە نێوانیاندا (گریمان کە کارێکی لواو بێ و ئێمە پێوەرێك بۆ بەراوردمان لەبەردەستدابێ) هەمدیس ناتوانین کە جیهانی بێبنەتا و بێسنوور بناسین. رێگەی دروست ئەمەیە کە هەرراڤەیەك زیاتر بە" راڤەی بارودۆخی من و بەرجەوەنی من" بزانین و بانگەشەیەکی زیاتر لەمەمان نەبێ.

فرێدریش ئاسێت لە پەرتوکی **توخمەکانی ڕێزمانی هێرمێنۆتیك و رەخنەکاری** کە لە ساڵی ١٨٠٣ بڵاوی کردەوەو شلایرماخێر لە زنجیرە وانەگوتارەکان و دواندەرییەکانی لەمەڕ هێرمێنۆتیك، جەختیان لە سەر ئەم خاڵە کرد کە "ئامانجی راڤەگەر تێگەیشتن لە دەقە، وەکودانەرەکەی و تەنانەت باشتر لە دانەرەکەی. لەبەرئەوەی کە ئێمە ناتوانین بە هیچ زانیارییەکی راستەوخۆ لە نیازەکانی دانەر و لەوەی کە سەردەمانێك بە زەینیدا تێپەڕیوە، دەستمان رابگات، دەبێ تێبکۆشین تا لە زۆر شتان ئاگادار بین کە وێدەچێ خۆیشی لێیان ئاگادار نەبووبێ.ئەم شتانە لەبەرگرەوەی توخمەکانی پێوەندیدار بە بواری مێژوویی، کۆمەڵایەتی، زمانی و ناسینەیی رۆژگاری دانەر و زنجیرەیەك لە زانراوەکان لەمەڕ هەمبەرێتیگەلی شێوازناسانە و پێکهاتەیی نێواندەقی و پێوەندیی نێوان ژانرەکان و نێوان ئاخێوەکان و شتی لەم چەشنە دەبن. تەنیا لەهەندێ خاڵی دەگمەندا کە دانەر خۆی سەرقاڵی راڤەی دەقێك کە خۆی بەرهەڤی کردوە ببێ، ئێمە دەتوانین تا رادەیەکی وردتر پەی بە نیازەکانی ئەو بەرین، بەڵام ئەمەش هەرامەیەکی لێبڕاوانە و رەها نیە. شلایرماخێر نیشانی دا کە دەق دەتوانێ لە دوو رێگاوە راڤە بکرێت، یەکێکیانی بە رێگەی ڕێزمانی ناودێر کرد و ئەویدی بە رێگای دەروونناسانە ناولێنا. ئەگەر لەڕەوتی تاوتوێی دەقێکدا، لە زمانەکەی ورد بینەوە، واتاناسی بێنینەگۆڕێ و تێبکۆشین تا هەمبەری نێوان دەق یامێتۆدی دەربڕین لەگەڵ زمان و بەتایبەتی دیاریمەندییە ڕێزمانی گەردانگەرانە(صرفی inflectional ) ، سینتاکسی و سیستمی وشەکان تێبگەین، بە رێگەی راڤەی ڕێزمانیدا رۆیشتوین و ئەگەر لە رێگەی بەڵگەگەلی ئەرخەیانکەر لە ورە و فراژووبوونی زەینیی دانەر بکۆڵینەوە، لە رێگەی راڤەی دەروونناسانەوە هەنگاومان هەڵگرتوە. وەلێ خاڵێك کە لێرەدا پێش دێت، ئارەزوی شلایرماخێر لە تێگەیشتنی پوخت وتەواوی دەق دەکاتە بلقی سەرئاو. ئێمە لە هیچکام لەم دوو رێگەیە کە ناوبراو هێناویەتە گۆڕێ، بە وردی بە ناسینەوەیدەق ناگەین. چونکە ناتوانین زانیارییەکی تەواو لە فراژووبوونی مێژوویی زمان وەدەست بێنین، نەك ئەوەی لە ژیانی ئاخنەیی و زەینیی کەسێك زانیاریی هەمەلایەن و تێکڕایی و وردو پوخت وەدەست بێنین. لەم روەوە بەردەوام لە نیوەڕێگای ئەم دوو چەشنە راڤەیەدا رێ دەکەین و هیچ رێسایەکیش بەدی ناکرێت کە ئێمە لێبڕاوانە رازی بکا کە رێچکەی راستمان گرتۆتەبەر. ئێمە تەنیا کاتێك دەتوانین بانگەشەبکەین کە بە ناسینەوەی زمان، کەسێك، یا دەقێك وێراوین کە پاژەکانی ئەوانەمان ناسیبێ، وەلێ ناتوانین بە شێوەیەکی ورد پاژەکان بناسین، مەگەر ئەمە کە ناسینێکی ئەرخەیانمەند لە( گشت) مان وەدەست هێنابێ. هەر لەبەرئەمە بەگوتەی نۆڤالیس ئێمە" بەردەوام لە رێچکەی ناسینداین"، هەمیشە موسافیرین، بێ ئەوەی قەت بتوانین



بگەینە جێ. لەڕەوتی خوێندنەوەی دەقێکدا ناتوانین بانگەشە بکەین کە واتای رەسەنی ئەو دەقەمان ناسیوە. لە بەرانبەردا ئەم دڵخۆشییەمان هەیە کە هەرجارە خوێندنەوەیەکی دەق دەتوانێ لە رێچکەی ناسینی دەقدا ئێمە لە هەڵکەوتێکی باشتر لە پێشو دابنێ و زانیاریمان زێدەتر بکات.

ئەم خاڵە کە پاژەکان بە سەرنجدان لە گشت و گشت بە سەرنجدان لە پاژەکان دێنە ناسین، بە نموونەیەکی سادە کە شلایرماخێر هێناویەتە گۆڕێ، باشتر دەزانرێت: واتای وشەیەك لە رێگەی تێگەیشتن لە رستەیەکدا کە ئەم وشەیە پاژێك لەوە، دەزانرێت، بەڵام یەك رستە کاتێك دەزانرێت کە واتاکانی وشەگەلێ کە رەژیدەی ئەون، بناسرێن. هەر بەم شێوەیە بۆفامکردنی ئاخێوی دەقێك ئێمە دەبێ واتای هەر رستەیەکی دەق تێبگەین، بەڵام ئەم رستانە مەتەڵ ئاسا و نەناسراو دەمێننەوە، ئەگەر بێتو ئێمە لە پێشان وێنایەك لە هەمەك و سیستمی کۆبەندی لە تیۆریی دەربڕین و بەکارهێنانە خوازەییەکان لە تێکڕای دەق لە مێشکماندا نەبێ. ئەم پێکناکۆکە دەتوانێ گرێکوێرەیەکی فەلسەفی لە قەڵەم بدرێت، بەڵام بەکردەوە چارە دەکرێت، بەم هۆ سادەیە کە منالان نزیکەی هەژدە مانگ پاش لە دایکبوونیان بێ ئەوەی لە رێساکانی گەردانکردن و سینتاکس و رێزمان ئاگادار بن و واتای سەرجەم وشەکان بزانن، فێری زمان دەبن و لە مەودایەکی نەچەندان دوورودرێژدا کارامەیی زمان پەیدا دەکەن و بە باشی هێز و توانای رایەڵکردنی پێوەندیی زمانی لەگەڵ کەسانی دی پەیدا دەکەن. رۆشنیش نیە کە چۆن و بە چ جۆری ئەم بەچکە شەیتانانە پێکناکۆکی هێرمێنۆتیکی فەیلەسوفان چارە دەکەن!

ئەوەی کە شلایرماخێر لە ژێرناوی بازنەی هێرمێنۆتیك لەمەڕ دەقیکەوە هێنابوویە پێشێ، دیلتای لەبارەی تێکڕای رەفتارەکان و بەروبوومی رەنێوهێنەرانەی مرۆیی خستیەڕوو. ناسین ناتوانێ وێکڕا و لە پڕڕا کامڵ بێت، بەڵکو لە بانهەڵکشانێکی دوور و درێژدا کامڵ دەبێت. بەرەبەرە فێرخوازان لەگەڵ رێساگەلێ ئاشنا دەبن کە هەمبەری پاژ و هەمەك رۆشن دەکەنەوە. مەسەلە ئەمە نیە کە کامیان لە پێشەوەی ئەویدیە، بەڵکو کێشە لەسەر هەمبەری هەمیشەیی و هەڵبەتە وەرچەرخاویانە. لەم نێوەدا چەمکی"هاودڵی" هەروەك گادامێر هێنایەئاراوە، دەبێتە رۆشنگەری خاڵگەلی گرنگ.[(31)] ناسینی ئێمە لە دانەر، هونەرمەند، یا هۆکارێکی مێژوویی ناتوانێ بێخەوش بێ، بەڵکو بەردەوام بەجۆرێك لەجۆرەکان لەگەڵ ئەزموونەکانی خۆمان بەراورد دەکرێت. ئێمە لە

(31) H.Georg Gadamer, Truth and Method, trans. J. weinsheimer and d. Marshall , New York , 1994, pp.41, 231-232,250.

رێگەی جۆرێك" هاودڵی" دەتوانین لە بەڵگەنامەکانی رابردو ورد بینەوە و ژیانیان بناسین. دیلتای نۆڕیبووی کە تێکڕای زانستە مرۆییەکان تا ئەندازەیەکی زۆر لەگەڵ مەسەلەی هێرمێنۆتیکی راڤەی دەربڕینەکان(expresions) و فرمانگەلی مرۆیی سەروکاریان هەیە. ناسینی تاکەکانی مرۆڤ بە واتای ناسینی ئەودەربڕینە فەرهەنگیانەیە کە ئەوان پێشکەشی دەکەن.ئەم دەربڕینانە تەنیا دەقەکان نین،بەڵکو بیچمی هەمەچەشنیان هەیە. توێژەری زانستەکۆمەڵایەتییەکان لە رێگەی روو لە رووداناانی دانایی خۆی لەگەڵ دانایی کەسانێك کە شێوەی رەنێوهانینی فەرهەنگیی ئەوان لە تاوتۆیی ئەو دایە، کاردەکات. ئەو ناچاردەبێت کە لەنێوان ئەو دیاردانەی کە تاوتۆییان دەکات کە زادەی باوەڕەکان و زانراوەکانی خەڵکانە لەگەڵ سیستمی بیرو باوەڕەکان و زانراوەکانی خۆی جۆرێك بەراورد یا هاودڵی دروست بکات. بۆ ناسینی مرۆڤ، دەبێ مرۆڤ بیت و بۆ درك پێکردنی فەرهەنگی مرۆیی دەبێ رێگەی هاودڵیی فەرهەنگی ئاوەڵا بکەیت. لە تاوتوێی مەسەلەکانی زانستە مرۆڤایەتییەکان ئێمە دەبێ بتوانین خۆمان لە قاڵب یا ئاسۆیەکی فیکری و فەرهەنگیی دیکە جگە لە ئاسۆی ئاشنای خۆمان، تێ‌خزێنین. بەجۆرە، لەنێوان وەرگرتنمان لە بەروبوومی فەرهەنگیی ئەوانیدی و دروستکردنیان بە دەست و هزری کەسانی دیکە هەمبەرێك و نزیکایەتییەك رایەڵ دەبێت. ئەم هەمبەرە نیشان دەدات کە ئێمە لە جێی ئەوە کە تێ‌بکۆشین تا کارێز لە زەینی کەسێکی دیکەدا لێ‌بدەین، ویستومانە تا لەرێگەی ئەو شتەی بەیانکراوە، ئەزموونێك پێوەندیدار بە رابردوو، یا پێوەندیدار بە فەرهەنگێکی دیکە بۆ خۆمان زیندوو دەکەینەوە.

چەمکی هاودڵی، لە بەرگرەوەی ئەگەری وتوویژی من لەگەڵ ئەویدی یە. ئەم چەمکە بەستێنی گفتوگۆیەك لەنێوان دوو ئاسۆی ژیانی جیاواز، دوو ئاسۆی واتایی و دوو پێڕستبەندیی دانایی لێکجیا دروست دەکا. بەم چەشنە کاری راڤەگەر ئیدی نابێتە هاوشێوەی کاروچالاکیی دەروونناسێك کە تێدەکۆشێ تا لە قووڵایی زەینی نەخۆش رۆ بچێ. هەڵێنجانی دیلتای دوایین دەرکەوتی تامەزرۆیی رۆمانتیك بە دۆزینەوەی زەین و نیازی‌دانەر، یا خۆی گوتەنی" گیانی خوڵقێنەری بەرهەم" بوو. جەختی زێدەڕۆیانەی ئەو لەسەر زەینییەت و نیازی دانەر و لەسەر رۆحی ئەو وەکوو دوائامانجی ناسین، بەکردەوە رێگەیەکی نەما مەگەر ئەوەی کە بە تاوتۆیی ژیانی دانەر کۆتایی پێ‌بێت و رێگەی پێشکەوتنی خوێندنەوەی دەقەکان و ئاخێوەکان دابخات. مێتۆدی پێشنیارکراوی دیلتای رۆشنی نەکردەوە کە ئێمە بە چ جۆرێ دەتوانین دەقێك کە دانەرەکەی ناناسین، یا تا رادەیەك هیچ شتێك لە بارەیەوە نازانین تاوتۆی بکەین و پەی بە واتاکانی ببەین.



**(٥)**

زۆر لە توێژەرانی فەلسەفەی نوێ هاوڕان کە بەبێ ئەو چەمکەی کە نیچە لە هەقیقەتێك کە لەڕێگەی زمانپاراوی دروست دەکرێت هێنایە گۆڕێ،هزرڤانانی سەرەتای سەدەی‌بیستەم نەیاندەتوانی بەسەر دژوارییە تیۆرییەکان کە "بازنەی هێرمێنۆتیك" خولڤاندویەتی زاڵ بن. مارتین هایدگێر لە هەبوونو هەرەتدا بە پشت بەستن بە باسەکانی نیچە هێرمێنۆتیکی لە ئاستی باسێکی هایدنناسانە هێنایە ئاراوە. قەرزداریی هایدگێر لە نیچە، لەو پەرتوکەدا بە راشکاوی بەیان نەکراو بە لێڵی مایەوە، بەڵام لەو وانانەی کە لە بارەی نیچە پێشکەشی کردن، رۆڵی نیچە لە ئاوەزی هێرمێنۆتیکی ئەمرۆیی ئاشکرا بوو. هایدگێر لە **هەبوونو هەرەت** دا لەم خاڵە دوا کە "دازاین" یا هەبوون ـ لە ـ جیهان"یا "هەبوون ـ لەوێ" یا مرۆڤ، لەڕاستیدا لە هەبوونی خۆی لەنێو ئەوانیدی و لە جیهاندا ئاگادارە و هەربۆیە: "بوونەوەرێك لە نێوان بوونەوەرانی دی نیە.دازاین لەدیدی بووندارانەوە (ئۆنتیك) بەم کەتوارە لە بوونەوەرانی دیکە جیا دەبێتەوە کە لە بونیادی هایدنی خۆی، هایدن وەکو مەسەلەیەك بۆ خۆی بەدی دەکا. تێگەیشتن لە هایدن خۆی تایبەتمەندییەکی هەبوونی دازاینە".[٣٢] جیاکاریی دازاین لەگەڵ هەرشتێك و هەر گیانەوەرێك لەم جیهانەدا، بە سانایی لەمەدا نیە کە ئەو ئاگای لە خۆیە، بەڵکومەسەلەی سەرەکیی لێرەدایە کە ئەودەتوانێ لە پرسیارانێکی بنچینەییش ئاگادار ببێ، واتە دەتوانێ بپرسێ بوونی بوونەوەران چیە؟ بەس نیە کە بە سانایی بێژین مرۆڤ خودئاگایە، بەڵکو دەبێ بزانین ئەو لە (خۆ)یەك ئاگادارە کە لە بنچینەی خۆیو بنچینەی هایدن، بە واتایەکی هەمەکی پرسیاری زۆری هەیە. دازاین لە بەر ئەوەی کە هەبوون ـ لە ـ جیهاندایە، دەتوانێ لە هایدن بە واتای هەمەکی پرسیار بکات. دازاین دەزانێ هاتۆتە ئەم جیهانەوە، دەبێ لەگەڵ ئەوانیدی بژیێ، دەبێ لەگەڵ ئەوانیدی کاربکات و سەرەنجام دەبێ لە پاڵ ئەوانیدی بمرێ. دازاین باش دەزانێ کە لە هەندێ شتدا لەگەڵ ئەوانیدی هاوبەشەو زۆر لە زانراوەکانی، بۆ نموونە ئەو توانابییەی(پرسینی) پرسیارگەلی بنچینەیی تایبەت بەو نیە، بەڵکو تاکە مرۆییەکانیش لەم توانامەندییە هاوبەشن. دازاین دەزانێ کە رەسەنایەتیی خۆی لە شتێکدا کە یەکسەر هیی ئەوە و تەنیا لە بۆ ئەوە، واتە لەگەڵ مەرگی خۆی پەیدای دەکات. دازاین لەم

---

(32) M.Heidegger, Bing and Time, P.32 .

(جەخت لە منەـ ن. (ب. احمدی) )

خاڵەش بەباشی ئاگادارە کە خۆیشی جگە لە هەبوون ـ بەرەو ـ مەرگ شتێکی دی نیە. هەبوونی دازاین فامکردنی ئەم هەبوونی (seiendeit) شتەکانو ئەوانیدی یە و مکوڕی و لێبڕاوێتی بوونی خۆی نێوان شتانوکەسانو لێبڕاوێتیی مەرگ.

ئێمە بە شێوەیەکی هەڕەتمەندو مێژویی لە جیهانێکدا دەژین کە ئەگەری ناسینەوەی تەواوی هەبوونی هەبوونەکان نارەخسێنێ. تێگەیشتنی ئێمە بەردەوام پەنانەکیو پەنابێژانەیە. هەرچەند هزری ئێمە ناتوانێ پێوەندیی خۆی لەگەڵ بنچینەی خۆی بە شێوەیەکی کاملو هەمە لایەن و تێکڕایی تێبگا و دەوری بداتەوە، بەڵام سەرەڕای ئەم سنوردارییە ئێمە ڕێگەیەکمان جگە لە هەوڵدان بۆ تێگەیشتنی هەڵکەوتی خۆمان لەجیهاندا نیە. بە لای(دازاین) ەوە تێگەیشتن یا راڤەی جیهان، هەرامەیەکی هایدنناسانەیە و هاوهەنگاو دەبێت لەگەڵ تێگەیشتن لە هەڵکەوتی خۆی لەجیهانداوهەروەها فامکردنی هەمبەرو نزیکایەتییەك کە لەتەك کەسانی دیکەدا هەیەتی. ئەم هاوهەنگاوییە هەرامەیەکی ناچارانە و حاشاهەڵنەگرە و بە دازاین نیشان دەدا کە راڤەی ئەو لەجیهان ناتوانێ ناسینێکی لێبڕاو و بنەتایی بێت. دازاین دەتوانێ لەم خاڵە تێبگا کە هەرچەشنە ناسینو راڤەیەکی ئەو لەدیمەنگەی ژیانیەوە لەم جیهانەدا دێتە ئاراوە و ئەو هەرگیز ئەو توانایییەی نابێت کە راڤەکانی خۆی لە پێگەیەکی دیکەوە، واتە لە وێستگەیەکی سەرتر لەم جیهانەوە بخاتە روو. هەر راڤەیەك ناچارانە قەتیسماوی شوێنگەی هێنانە گۆڕی راڤە، شوێنگەو هەڵکەوتی راڤەگەر و ئەو بەرتەسکییانەیە کە زمان دەیان رەخسێنێ. پێوەندیی نێوان ژیانی فیکری و فەرهەنگیی کەسێكو زاراوەکانو وشەگەلێ کە ئەو دەستیان پێ رادەگا پێوەندییەکی ئێجگار نزیکە، تا ئەو جێیەی کە ناتوانی بە وردی وەدیار بخەیت تا چ ئاستێك دانایییەکانی ئەو و بەرەنجامەکانی ناسینەکان و راڤەکانی ئەو بەستراوەتەوە بە بەرینایی و چواچێوەداریی ئەو دەزگا زمانییەی کە لەودا و بەوەوە دەژی. ڕێساکانو سیستمی وشەیی زمان شتێکە کە تاکەکەس لە کۆمەڵگا و فەرهەنگێك بە میراتی دەبات کە خۆی لە جەرگەیدا بە ڕێکەوت دەبینێتەوە. هەم هەودای هەستە تایبەتییەکان و ئەو حاڵەتانەی کە کەسێك تووشیان دەبێتو هەم بارتەقای کارایی گشتگیرییە تیۆریك و بەرەنجامگیرییەکانو بەراوردگەلێ کە سازیان دەکا، زادەی ئەم هەڵکەوتە بووندارانەیە کە بەر لەو هەبووە و ئەو هاوێژراوەتە نێوی و لە ڕێگەی زمانەوە لەگەڵیدا بەرەو روو بووە و ئاشنای بووە. هاوبەندیی ئەم هەمووە لەگەڵ زماندا شتێکە کە بەرلەدایکبوونی هەرکام لە ئێمە بیچمی گرتوە و ئێمە لە جەرگەی ئەم هاوبەندییەو باڵادەستیی زماندا درێژە بە ژیانمان



دەدەین، شتانو هەمبەرەکان دەناسینو راڤەیان دەکەین. بەم پێیە لە بەیانکاریی بنەماکانی ئەم کردە راڤەییەیە دەبێ پەسندبکەین کە هەر راڤەیەك کەمتر بەروبوومی بارودۆخی دەرونیو یا دەسەڵاتی ویستی ئێمە و زیاتر زادەی نەریتەکانو زمانی ئێمەیە. تەنانەت ئەم خاڵە سەرەتاییەیە کە شتان لە هەڵکەوتێکی تایبەتدا بۆ ئێمە چ گرنگییەك پەیدا دەکەن، هەرامەیەکە کە زمان، کۆمەڵگاو فەرهەنگ دیاریی دەکەن. ئەمە بەواتای ورد و کتومت وشە وێرانی و نکۆڵی لە چەمکی دیکارتیی ناسکارە، چونکە ناسکار بە واتا دیکارتییەکەی واتە ناسینگەرێکی سەرپشك، دانا و باڵادەست وەلادەنرێ، تا ئاشکرا بکرێ کە دازاین لە ژیانی رۆژانەی خۆیدا بە پێی خووخدە دەژی، دەناسێ یا راڤە دەکا و دیلی زیندانی نەریتەکان، پێش-فامەکان خووەکان و زمانە. کاتێك هایدگێر دەیگوت کە زمان دەدوێو نەك مرۆڤ و ئێمە تا ئەو جێیەی کە بە زمان بەرسڤ دەدەینەوە ئاخێوەرین،(٣٣) یا کاتێك دێریدا بە ئاشکرا دوابەدوای هایدگێر دەیگوت کە زەینییەت بەرو بوومی پێکهاتەی دەقو زمانە،(٣٤) لەڕاستیدا، جەختی دەکرد کە دیناوی سەرەکی کاری زمانە و نەك کاری ئاخێوەر.

لە دیدی هایدگێرەوە هێرمێنۆتیك بەرلەوەی کە ڕێساگەلێ بۆ راڤە، یا تیۆرییەك لە مەڕ ئەو بێت، بە مانای راڤەی هەمبەری نارۆشن و شاراوەگەری راڤەکار لەگەڵ هایدنە. دازاین دەتوانێ لەگەڵ هەبوونی خۆیدا پێوەندی رایەڵ بکات، بەڵام ئەم پێوەندیگرتنە بەردەوام پشت ئەستورە بە پێش ـ فام و ئەو ئاسۆی دانایییەی کە ئەو لەودا (ژین) دەباتە سەرێ. هایدن ناتوانێ چەشنی هەرامەیەکی هەبوو بناسرێت، بەڵکو تەنیا بۆمان دەلوێ کە لە دەربڕینو راڤەدا هێمای بۆ بکەین. هەر بەوچەشنەی کە جیاوازی هەیە، لە نێوان ئاشکرایی هایدن و چەمکێك کە ئێمە لە هەقیقەت دەیخەینە روو لێكهاوێری هەیە. ئاشکرایی هایدن یا هەقیقەت، بە پێی گوتەی بە ناوبانگی هایدگێر زایەڵەیەکی هەیە کە هەندێجار لە بەرهەمی هونەریو بە تایبەت لە شیعردا بەرگوێ دەکەوێ. راڤەی هایدگێر لە شیعرەکانی هۆلدرلین ڕێگەیەك بۆ گوێڕادێران بەم زایەڵەیە نیشان دەدا. ئەم زمانە رازئاوێتەو درکەییە جیاوازە لە تەك ئەو شتەی ئێمە لە هەقیقەت لە زمانی زانستی، بەڵگەهێنەرانە و چەمکیی خۆماندا

(33) M.Heidegger, Acheminement vers La Parole, trans. J.Beaufret, Parrida, Positions,Paris, PP.11-39 .

(34) J.Derrida, Positions, Paris, 1972,P.122.

دەری دەبڕینو هەر چەندەیش کە خۆمان بە کتومت لە قەڵەمی بدەین، ناتوانێ دەقاودەقترین دەربڕینەکان بێت. هایدگێر دەڵێ کە متمانە بە وردیی زمانی زانستی رێگە لە بەردەم ئاشکرایی راستیو بیستنی زایەڵەی هایدن دادەخا.[٣٥] ئێمە لەسەر بنەمای ناسینەوەکانی گەمارۆدراو لە ئاسۆی فیکریی سەردەمی خۆمان، شتەکان دەناسینو یەکێك لە ئەرکەکانی سەرشانی هێرمێنۆتیك ئەمەیە کە ئەم پێش ـ فامە بە وردی بەیانو روون بکاتەوە. هەر راڤەیەك، بە هەر بیچمێك بێت، بۆ نموونە"روونکارییە زانستییەکان" لە بیرکاری و زانستە سروشتییەکان، بەستراوە و پشت ئەستور بەم کەتوارەیە کە هەرچیەك راڤەدەکرێت، بە چەشنێکی هەرە پێویست رەگاژۆی لە کاروباری پێشتر ناسراو کردوە، واتە پشت بەستو بە راڤە یا راڤەکانی دیکەیە کە هایدگێر ناوی "پێش ـ فام"ی لێنان و لە پاش ئەو گادامێر بە "پێش داوەری" ناودێری کردن. بیرکاریزانێك تەنیا کاتێك دەتوانێ بە کاری خۆی سەرقاڵ بێت کە برێك چەمکگەلی بەرایی لەو شتەی کە کەوتۆتە بەرباس، لەبەردەستیدا هەبن، تا بتوانێ لە پێشان مەزندە بکات کە دەبێ لە کامە رێگاوە و چۆن بڕواتو بتوانێ لە خۆیەوە هەڵبێنێ کە چ شتانێك پێوەری تاوتوێو هەڵسەنگاندنی بەرەنجامەکانن، یا دەکرێ کامە ژێدەرەکان پەسند بکەیتو بە کاریان بێنی. لە زانستە مرۆییەکاندا ئەم خاڵە کە ئێمە دەبێ لە رەوتی ناسیندا، پێش ـ گریمانگەلێکمان لەلابێت، بەقەد بیرکاریو زانستە سروشتییەکان ئاشکراو بێپەردەیە.

لە بانهەڵکشانی تێگەیشتنو راڤە، چەمکی پێش ـ فام لەگەڵ چەمکێکی گرنگی دیکە گرێ دەدرێو ئەوەش هەمان "گەڵاڵە دارشتن"ە. دازاین لەسەر بناخەی پێش ـ فامەکانی خۆی گەڵاڵە دادەرێژێ و بانهەڵکشانی ناسین یا راڤەکانی ئەو، جیا لە ئەزموونی تاقیکاریی گەڵاڵەکان نیە. تێگەیشتنی من لە خۆم، رێخۆشکەری رێچکەیەکە کە من لەویوە دەرۆم، ئەم تێگەیشتنە بەر لەهەموو شتێك بە شێوەی گەڵاڵەرێژی دەردەکەوێ. من خۆم گەڵاڵەرێژی دەکەم، تا بتوانم ئەو ئەرکانەی سەرشانم راپەڕێنمو بگەمە ئەو ئامانجەی کە لەبەردەم خۆمدا دام ناون، چ ئامانجی گەورە بن و چ ئامانجگەلی بچوك کە ئاسان وەدەست دێن. بۆ ئەوەی کە بتوانم وەکو نووسەرێك بژیم، سەرەتا دەبێ پێش ـ فامێك لە نووسەربوون لە بیرکردنەوەمدا هەبێ و پاشان خۆم بە رێگەی تایبەت گەڵاڵەرێژی بکەمو پەیتاپەیتا ئەم گەڵاڵەیە تاقی بکەمەوە و وردبینی بکەم. کەسێك ئەمرۆ نووسەرە، چونکە پێشتر خۆی یەکانگیر لەگەڵ

(35) Heidegger, Beitrage zur Philosophe, PP.145-159.



ئەگەرێك، ئەگەری بوون بە نووسەر، گەڵاڵەرێژی کردوە. هەنوکەش ئەگەر ئەم گەڵاڵەرێژییە پەیتاپەیتا درێژە نەدرێ، واتە ئەگەری نووسەربوون بەشێوەیەکی هەمیشەیی گەڵاڵەرێژی نەکرێ، نووسەر بزر دەبێ. ئامرازی راستەقینەی بووندارانەی دازاین نەك "چالاکمەندی" بەڵکو "ئەگەر"ە. هایدگێر دەنوسێ:" هەر دازاینێك، وەکو دازاین خۆی لە پێشان گەڵاڵەرێژی کردوە و تا ئەو جێیەی کە هەیە، گەڵاڵە رێژییە. دازاین تا ئەو جێیەی کە هەیە، بەردەوام خۆی لە جەرگەی ئەگەرەکاندا فام دەکاو پەیتاپەیتا خۆی لەجەرگەی ئەگەرەکاندا لە داهاتوشدا فام دەکا ... تێگەیشتن چەشنی گەڵاڵەرێژیی جۆرە هەبونێکی دازاینە کە لەودا ئەگەرەکانی دازاین وەکو ئەگەر هەن".[٣٦] هەڵبەت توانایی مرۆڤ بۆ گەڵاڵەرێژی ئازادو بەدەر لە زۆرەملێی هەمەچەشن نیە. دازاین ناتوانێ خۆی لە هەر ئەگەرێکی تایبەتی بووندارانە و هەرکات کە بیەوێ، گەڵاڵە بکات. بەر لە هەموشتێك، بەستێنی ژیان، شوێنگە کۆمەڵایەتی، مێژوییو فەرهەنگییەکان، بیچمگەلێ لە ژین بەسەربردن بەو شێوەیەی کە دازاین بیەوێ، مەرجدار و بەرتەسك دەکەنەوە. تێگەیشتن لەبەر سنوورداریی گەڵاڵەرێژی بەردەوام لەگەڵ بەرتەسکیو سنووردارێدا بەرەوڕوویە و سەربەخۆییشی رێژەییە. ئازادی، هاتنەدی ئەگەرێکی بووندارانەی راستەقینەیە، لەم روەوە ناتوانێ رەها بێت. هەرشتێك بەناوی ئەگەرێکی راستەقینە دەزانرێت، لەگەڵ هەڵکەوتێکی دەستنیشانکراو و پاشبەستێنێکی فەرهەنگی و حاڵەتە زاڵەکانی گونجاو لەگەڵیان، هەیەو شیانی ناسینە.هەر بڕیارێك، هەرچەشنە گەڵاڵەرێژییەك و هەر چەشنە پێش- فامێك، لە ئاخنەی ئەو هەڵکەوت و پاشبەستێنەدا و لەو حاڵەتانەدایە کە دەلوێ و ئەم توخمانە بە شێوەیەکی گشتی لەسەروی سەرپشکی و چاوەدێریی تاکەکەس بیچم دەگرن. راڤە و تێگەیشتن لە جیهان کە لە دەرەوەی ئەم بەرتەسکی و سنوورداریبیانە دا نالوێ، بەر لە هەر شتێك دەرخەری ئازادیی سنورداری ئێمەن.

هایدگێر توانی ئامیانی راڤە وەها کە شایانی" رەسەنترین" راڤەکان بێ، لە ئاستێکی هایدنناسانەدا دەربڕێ وبەرووی رەهەندێکی یەکسەرجیاواز لە ئەزموونی راڤە ئاوەڵای بکات. ئەو بازنەی هێرمێنۆتیکی وەکو تایبەتمەندینوێنی سادەی هێرمێنۆتیك بە قەڵەمڕەوی باسی" هایدنناسانە" تێپەڕاند. نووسەرانی هێرمێنۆتیك بە تایبەتی گادامێر لە هیراکانی هایدگێر دەستیان پێکرد و تێکۆشان تا بۆ" ئاریشەی هەقیقەت" رێگەیەك پەیدا بکەن. بە رای

(36) Heidegger, Bing and Time, P.185.

گادامێر مرۆڤ بەردەوام گەمارۆدراوی کەوشەنەکانی زمان و نەریتە. زمان خدەیەکی تاکەکەسی نیە، بەڵکو ئامرازی پێوەندیی کۆمەڵایەتی و ڕێخۆشکەری درك پێکردنی هەمبەرە مرۆیی‌یەکانە. هەر راڤەیەك تێگەیشتنێك لەم هەمبەرانەیە و خدەیەکی زمانی هەیە. دەتوانین بێژین کە راڤەکان خدەیەکی وتووێژانەیان هەیە. هەر راڤەیەك بەمانای چوونە نێو هەمبەرێتییەکانی مرۆڤ و جیهانی ئەو و هەمبەرێتیگەلی نێوانزەینی و بەم پێیە وەك ئەوەیە بەشداری گفتوگۆیەك بێت. لێرەدا گفتوگۆ مەرج نیە وتووێژ لەگەڵ مرۆڤێکی دیکە بێت، بەڵکو دەتوانێ وتووێژ لەگەڵ دەقێك، بەرهەمێکی هونەری، یا دەسکەوتێکی فەرهەنگیش بێت، وتووێژێك کە خودان توانایی گۆڕینی زەینی راڤەگەرە. گادامێر نووسیویەتی:" قسەکردن لە وتووێژی هێرمێنۆتیکی بە تەواوی ئاوەزپەسندە. بەڵام لەم خاڵەدا وەها بەرەنجامێکیش وەدەست دێت کە گفتوگۆی هێرمێنۆتیکی وەکو گفتوگۆیەکی زیندو و راستەقینە، زمانێکی هاوبەش پەیدا دەکات و پەیدا کردنی زمانی هاوبەش- هەمدیس چەشنی وتووێژیکی زیندو کەمتر بە واتای بەرهەڤکردنی ئامرازێك بۆ گەیشتن بە ئامانجی درك پێکردنەو زیاتر لەگەڵ کردەی درك پێکردن و لێك تێگەیشتن هاوجووت دەبێت.

تەنانەت لە نێوان هەر دوولایەنی ئەم گفتوگۆ هێرمینۆتیکیەی دەق و راڤەگەر پێوەندییەك وەکو پێوەندیی نێوان دوومرۆڤ بیچم دەگرێ، کە ئەمە شتێکە زیاتر لە یەکانگیریی رووت و لێرەشدا، بابەتەکە بۆ ئاستی زمان رکێش دەکات. بەڵام ئەمە کە وەها کارێك دەلوێ، خۆی لە کۆتاییدا بەری رەنجی راڤەگەرە. هەر دووك {واتە} دەق و راڤەکار، لەم رێرەوەدا پشکیان هەیە". (٣٧)

گادامێریش وەکو هایدگێر نیشان دەدا کە هەرکام لە ئەزموونەکانی رابردوی ئێمە تەنیا لەوێدا کە لە بیچمی دەربڕانە و زمانیی خۆیان ئامادە بن، واتە لە جەرگەی راڤەگەلێ پەسند بکرێن، وەکو پێش- فام دەور دەگێڕن. بە بێ بوونی زمان ئێمە هەرگیز ناتوانین ئەزموونەکانی خۆمان راڤە بکەین و لەگەڵ یەکدیدا پێوەندیان بدەین و سەرەنجام بیانپارێزین. زمان، جیهانیك کە دەناسین، ساز دەکا. هەبوون-لە- جیهان زمانی‌یە. ئێمە بە پێچەوانەی گیانەوەرانی دی کە بە پێی خووخدە لەم هەسارەدا دەژین، خاوەنی یەك جیهانین، چونکە لەگەڵ زماندا سەروکارمان هەیە.گفتوگۆ بە رێساکانی زمان دەلوێ. تێکۆشانی ئێمە بۆ تێگەیشتن

(37) Gadamer, Truth and Method, p.388.



لەمەبەستی بەرامبەر(خوێنەر-بیسەر)ەکەمان، لە رەوتی گفتوگۆیەکدا، ئێمە لە لوژیکێکی راڤەییدا جێدەکاتەوە. کاتێك کە تێدەکۆشین تا گوتەکانی بەرامبەر تێبگەین، رێگەیەکمان جگە راڤەی چەمکگەلێ کە ئەو دەیان هێنیتە پێشێ، نیە. ئێمە ناچار دەبین تا ئەو چەمکانە بە زمانی خۆمان و بە لۆژیکێکی ئاشنا بۆ خۆمان بگەڕێنینەوە و لە چوارچێوەی رێساگەلێکی تازەدا جێیان بۆ بکەینەوە. لێرەدا، تێگەیشتن پشت ئەستورە بە کۆمەڵێك پێش-داوەری و برێك لە ئەزموونە راڤەییەکانی رابردو لە رەوتی بیچمگیریی راڤەی تازەدا بەشداری دەکەن. هەربەوجۆرەی کە ژەنیاری سازێکی مۆسیقا لەسەر بنەمای دانایی‌یەکانی پێشوی خۆی، کۆپلەیەك مۆسیقای تازە دەخوێنێتەوە و دەیژەنێت. راڤەکانی ئێمە بەرلەوەی سەلماندنی شتێك بن، دەرخەری تاقیکارییەکی هزرینگەرانەن. ئێمە پێش —داوەرییەکانی لە دروستکردن و هێنانەئارای راڤە لەکار وەردەدەین و لەڕاستیدا بە راڤە تاقییان دەکەینەوە. هەر راڤەیەك رێگەیەك بۆ ئاسۆی ئاماژەکانی سەردەمی خۆی پەیدا دەکا، چونکە بەشێك لە هایدنی زمانیی مرۆڤە. لێرەدا مەسەلەی راست وچەوتیی راڤەکان لەسەر بناخەی پێوەرێك کە لەدەرەوەی ئەوانەوە وەدەست هاتبێ، ناتوانێ بێتە گۆڕێ. لە بەرئەم هۆ سادەیە کە وەها پێوەرێك هەرگیز وەدەست نایەت. راڤەگەلی جۆراوجۆر پێکەوە دێنە نێو گفتوگۆیەکەوە کە رەژیدەی ئاسۆی داناییەکان و ئاماژەکانە. گفتوگۆ بەردەوام، لەسەر بناخەی باشقە و لە بیچمگەلی پرسیار و وڵام سەرهەڵدەدا و بەردەوام دەبێت. کاتێك لە رەوتی خوێندنەوەی دەقێکدا لە خاڵێك تێدەگەین و بەڵێگۆی دەبین یا نکۆڵی لێ دەکەین، لەڕاستیدا دەستمان بە راڤەیەك راگەیشتوە و ئەم راڤەیە دواجار وڵامێکە بۆ پرسیارێك کە ئێمە بە ئاگاداری یا نائاگایانە لەگەڵی بەرەو روو بووینە. ئێمە لە بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ هەر دیاردەیەك کە وێدەچێ بێئەوەی بزانین یا بمانەوێ لە رەوتی وتووێژێکدا هەنتەش پەیدا دەکەین و دەچینە ژێرباری لۆژیکی وتووێژەوە. بەگوتەی بەناوبانگی هۆلدرلین کە هایدگێر زۆر جاران دووپاتی کردۆتەوە:" ئێمە وتووێژین". ئێمە بە هاتنەنێو رەوتی گفتوگۆ دەگۆڕێین. رەنگە بتوانین بێژین کە کامڵتر دەبین. بە هەرحاڵ هەڵکەوتی خۆمان وەکو پرسیارگەر، کەسێك کە دەیەوێ لە شتەکان و پێگەی خۆی لە جیهان ئاگادار بێتەوە، وردبین دەکەین. پێش ـ داوەرییەکانی ئێمە کە شوێندەسپێکی راڤەکانی ئێمەن، کاروباری نەمرانەو گۆڕانهەڵنەگر نین، بەڵکو هۆکارگەلی شیانی تاوتۆیی سەرلەنوێ و دووپاتە و شیانی راستکردنەوەن. ئێمە هەتا زیندوین. پەیتا پەیتا خەریکی چاوخشاندنەوە و

راستکردنەوەیانین. لەم روەوە، هەم خۆمان دەگۆڕێین و هەم راڤەکانمان گۆڕانیان بەسەردا دێن. ئێمە وەکو ناسینمان لە جیهان، پەیتا پەیتا تازە دەبینەوە.

ئێمە هەرگیز واتای راستەقینەی دەقێك لە ئاسۆی دانایی‌یەکان و ئاماژەکانی رابردو ناناسینەوە. چونکە لەو ئاسۆیەدا رۆژگار نابەینەسەرێ و لە دیمەنگەی ئاسۆی سەردەمی خۆمان لێی دەڕوانین. لێرەشدا چەمکی وتووێژ بەکار دێت. ئێمە بەڕاستی بە گواستنەوەی دەقێك لە ئاسۆی رابردو بۆ ئاسۆی سەردەمی خۆمان وتووێژی نێوان دوو ئاسۆ لواو دەکەین. لەوەی باسکرا رۆشن دەبێتەوە کە بەڕای گادامێر واتای راستەقینەی گوزارە، دەق، ئاخێو، روداو و کردە هەرگیز ناناسرێتەوە. ئێمە تەنیا راڤەگەلێ لەو" واتای راستەقینە"یە دەخەینە روو. ئەگەر وردبینەوە، تێبینی ئەوە دەکەین کە ئەو" واتا راستەقینەیە"ش شتێك جگە لە راڤەیەك نەبوو و بەم پێیە دانەپاڵی" راستەقینە"بەو کارێکی شیاو نیە. بەرەنجامێك کە وەدەست دێت وەهایە: لە نێوان چەشنەکانی تێڕوانینەکان و راڤەکان هیچکام سەرتر لەویدی نین، چوونکە هیچ بەرجەوەنێکی سەرتر و هەڵکەوتو بوونی نیە، کە راڤەی بنەتایی بەیان بکا. لەم روەوە پێوەری لێبڕاوانە و بێ ئەملاو ئەولاش لە کاردا نین تا داوەریی نێوان راڤەکان یەکلا بکاتەوە. ئێمە لەسەر بناخەی پێوەرگەلی کاتی، هەر بۆ نموونە سەرنجدان لە بوار، ژانرەکانی دەربڕین و بەرهەم و هتد، دەتوانین هیرارکییەك لە نێوان راڤەکان دروست بکەین، بەڵام دەبێ دان بە سروشت و خووخدەی رێژەیی و کاتیی ئەم هیرارکییە بێنین. لە بانهەڵکشانی داوەریی دەقێك یا بەڵگەنامەیەك لە مێژوی رابردوش، لەگەڵ ئەم بەرتەسکی و چوارچێوەداریی رێژەیی نواڕیە بەرەوڕووین. رۆشنە کە بۆ ئێمە، ئەمڕۆ هیچ سەردەمێکی مێژوویی رابردو، بە شێوەی لەخۆوە بوونی نیە. ئێمە بەردەوام لە بەرجەوەن و ئاسۆی دانایی ئەمڕۆیی خۆمان هەر رووداوێك، ئاخێو، دەق، ئەزموونێك راڤە دەکەین. ئەم راڤەیە جیاوازە لەگەڵ راڤەی کەسێکی دی کە لەسەر ئەستونی پێش ـ داوەریگەلێکی دیکە کاری خۆی دەست پێکردوە. راستیی رووداوەکان لە راڤەکاندا رەنگ دەدەنەوە، بەڵام هەرگیز بە تەواوی بەیان ناکرێن و نایەنە تێگەیشتن. کەوابوو واتایەکی راستەقینە، لێبڕاوانە و بنەتاییش ناکرێ بۆ شتانی جیهان دابنێیت.



# ڕاڤە و ژیان

## (١)

داستانی قارەمانێتی ئۆدیسەی هۆمیرۆس بە وشەی" ئاندرا" بە واتای" مرۆڤ" دەست پێدەکا. لەم داستانەشدا وەکو ئیلیاد ئێمە هەموو مرۆڤێك هەم لە چاوی خواوەندانەوە و هەم لە نیگای مرۆڤەکانی دیکەوە دەبینین. لە حاڵێکدا کە مەسەلەی نێوەندی و دەسپێکی ئیلیاد تووڕەیی مرۆڤێك واتە ئاخیلۆسە و روداوەکان لە دەوروبەری سەرپێچیی ئەو لەبەشداری لەجەنگدا دەخولێنەوە، لە ئۆدیسە دا نەك تووڕەیی مرۆڤ بەڵکو تووڕەیی خواوەندان و لێرەدا سەرگەردانیی مرۆڤ، لە نێوەندی تێکڕای رووداوەکاندایە. یەکەمین سرودی ئەم داستانە شیعرییە، بە باس وخواسی گردبوونەوەی خواوەندان دەست پێدەکا. ئەوان دەیانەوێ چارەیەك بۆ ئۆلیسی بەخت خەواڵوو، یەکێك لە فەرماندەکانی یونانی و لە قارەمانانی جەنگی ترۆی، کە لە سەفەرێکی بێئاکام بۆ گەڕانەوە بۆ ماڵ و زێدەکەی ئاوارە بووە، پەیدا بکەن. خوای دەریاکان، پۆزئیدون، لەم جڤاتە دا بەشدار نیە. ئەو لە ئۆلیس تووڕە بووە، چوونکە ئەو بە سوچباری نابینایی کوڕەکەی واتە پولیفم دەزانێ و دەخوازێ کە کەشتیی ئۆلیس، لە رێگەی گەڕانەوە بۆ نیشتمانی خۆی ئیتاکا، نوقم ببێ و ئۆلیس سەرگەردان و ئاوارە بەسەر ببا. هاوسەری ئۆلیس پنەلۆپە و کوڕەکەی تلماك، لە ئیتاکا، چەمەڕای ئەون. خەڵك پێیان وایە کە ئۆلیس لە گەرداوەکاندا خنکاوە و لەم روەوە پیاوانی زۆر دەچنە خوازبێنیی پنەلۆپە و بە سەرسەختییەوە داوای هاوسەرێتیی لێ دەکەن. لە گردبوونەوەی خواوەنداندا، ئاتنە پێشنیار دەکا کە لە قەڵافەتی پیاوێکی پۆشتە و پەرداخی لاوچاك، بە ناوی یەکێك لە دۆستانی ئۆلیس بچێتە دیداری تلماك و دلێری بکات کە پەیجۆری باوکی بکات. هەرکە ئەم پێشنیارە پەسنددەکرێ، ئاتنە وەها دەکا و لە میوانیی ماڵی تلماك خۆدەردەخا و لەگەڵ ئەودا دەدوێ.

ئۆدیسە یەکێك لە دوو داستانە شیعری و وقارەمانێتیەکەی هۆمیرۆس و لە یەکەمین بەڵگەنامەکانە کە لە مێژوی هونەر، فەلسەفە و فەرهەنگی رۆژئاوا نووسراوە و خۆشبەختانە بەدەستی ئێمە گەیشتوە. باندۆری ئەم قارەمانێتی‌یە لەسەر فراژووبوونی رۆژئاوا بەرین و یەکلاکەرەوە بووە، تا ئەوجێیەی کە بە بێ هیچ زێدەگۆییەك دەتوانین ئەم شوێندانەرییە لەگەڵ مۆرێك کە کتێبی پیرۆز لە سەرئاگایی و هزرینگەریی رۆژئاوایی لێی داوە بەراورد بکەین. هەنوکە ئێمە دەمانەوێ ببینین یەکەمین جار کە مرۆڤ لەم داستانە شیعرییەدا دێتەگۆ، چ

دەڵێ. ئاتنە خۆی وەها کە هەیە بە تلماك ناناسێنێ و درۆی پێ دەڵێ:" ئاتنە، یەزدانێك کە چاوانی هەڵگڕاوی هەیە، وڵامی ئەوی دایەوە: هەنوکە من بەتۆ تێکڕای ڕاستییەکە دەڵێم، ناوی من مێنتسە، کوڕی ئانخیالۆسی دوورنوارِ و...[(١)] پاشان ئاتنە لە تلماك دەپرسێ کە خۆی بناسێنێو بڵێت کە لە کام خانەدانە:"تلماکی دوورنوارِ وەڵامی دایەوە: ئەی میوانی من، من ئەمێستا ڕاستیی تەواوت پێ دەڵێم، دایکم گەواهی دەدا کە کوڕی ئەوم، بەڵام چلۆن ئەمە بزانم؟ هیچکەس تا هەنوکە، خۆی نەیتوانیوە بزانێ کە زادەی کێیە. بە ئەرخەیانییەوە خوازیاری ئەوە بووم کە فەرزەندەی پیاوێکی بەختەوەر بوومایە، پیاوێك کە لە نیشتیمانی خۆیدا [ژیابا و] بە ساڵانی بەساڵاچوویی خۆی گەیشتبا. بەڵام ئاوەها شتێك ڕووی نەداوە. چارەنووسی پیاوێك کە دەڵێم من کوڕی ئەوم، لە نێو تێکڕای خەڵکان شوومترین بوو. ئەمە بزانە، ئەی ئەو کەسەی کە پرسیارم لێ دەکەی.[(٢)]

لەم یەکەمین دەربڕینەی ئاوەزیانو هونەری یونانیو ڕۆژئاواییدا، دەبینین کە خواوەندان ڕاست ناڵێن، هەرچەند بانگەشەی دەربڕینی "تێکڕای هەقیقەت" دەکەن. ئەوان قەڵافەتێکی پۆشتە بەخۆیانەوە دەگرن، شوناسی خۆیان دەشارنەوە، ئامۆژگاری دەکەن، ڕێخۆشکەری دەکەن، بەڵام "تێکڕای هەقیقەت" ناڵێن. هەقیقەتێك کە خواوەندان لێی ئاگادارن، بۆ مرۆڤانو مەرگچێژان بە شاراوەیی دەمێنێتەوە، تەنیاهەندێجار چەنددەرکەوتێك لەو دەبێتە ڕێنوێنی کاری ئەمانوئەوەش لە چوارچێوەی چارەنوسێکی ئەزەلی. بەڵام هەمبەری مرۆڤ لەگەڵ هەقیقەت کە لێرەدا لە قەڵافەتی تلماکی نیگەران و دڵشکاودا وێنەی دەکێشرێت، لە جۆرێکی دیکەیە. ئەو دەزانێ کە تەنانەت شتێکی ئەوتۆ لەبارەی خۆیەوە نازانێو هەر ئەم بێ ئاگایی‌یە وەکو هەقیقەتێك کە لێی ئاگادارە، دەردەبڕێ. مرۆڤ لە هەموو شتێك خانەگومانە، چونکە "هەقیقەتێکی تەواو" کە ئەو لێی دەدوێ ئەمەیە کە هەقیقەت بەلایەوە نەدۆزراوەیە. ئەو لە ڕازەکانی بوونی خۆیشی ئاگادار نیە. یادەوەریی ناکامڵە. ساڵانێك لە تەمەنی لە یاد نیە و لە ڕازی ئەفراندن و لە دایکبوونی خۆی ئاگادار نیە. دایکێك کە بانگەشە دەکا دایکی ئەوە، دەتوانێ ڕاست نەڵێو هەرگیز بە ڕۆشنی ناسەلمێنرێ کە ئایا بە ڕاستی ئەو سەفەرکەرە، باوکی ئەوە یان نا. تلماك لە ڕازی شوناسی خۆی ئاگادار نیەو ئاگاداریش نابێت. بەڵام

(1) Homer, Lodyssee, trans.M.Dofour, Paris , 1989,PP.21.
(2) ibid, P.22.



تامەزرۆییو ئارەزوی ئاگاداربوونی هەیە. لەوە گرنگتر ئەمەیە کە بەباشی ئاگادارە کە چارەنووسێکی بانتر لە تواناکانو دەسەڵاتەکانی چارەنوسی ئەویان  نیشان کردوە. تلماك، لەسەر خاکی ئیتاکا وەستاوە، چاوەڕێی گەیشتنی پیاوێکە کە دەڵێن باوکیەتیو ئۆلیس لە گەرداوەکاندا بزر بووە و سەری لێشێواوە، مەگەر بەزەیی خواوەندانو چارەنوس بیگرێتە خۆیو بە ئارەزوی خۆی کە گەیشتنەماڵە، بگات. ئەم بێئاگاییەی تلماك دوو دڕدۆنگیی ئەو لە لایەکەوە و گومەساریی* نائۆمێدانەی ئۆلیس لە لایەکی دیکەوە، چارەنوسی ئەزەلیو ڕاستەقینەی مرۆڤە.

هەنوکە لە یەکەمین ڕۆژانی سەرهەڵدانی ژیار و ئاوەزیانی ڕۆژئاوایی بۆ دوایین قۆناخەکانی واتە ڕۆژگاری کۆتایی میتافیزیك دێینو دەبینین کە هەمان دڕدۆنگیو گومانکاریی تلماك هێشتاش بە هەمان گوڕتینەوە لە ئارادایە. سەرەتا، سەرنج لە یەکێك لە پەرتوکە بەناوبانگەکانی مێتۆدولۆژیی ئەمڕۆ واتە **مێتۆد** لەنووسینی ئەدگارمورێن،دەدەین. مورێن لە دەسپێکی پێشگوتاری سێهەمین بەرگی **مێتۆد** دا نووسیویەتی کە مرۆڤ هەرگیز نەیتوانیوە بە وێنایەکی دروست لە جیهانو هەڵکەوتی خۆی لەودا دەستی ڕابگات. ئەو لە **ئایدیۆلۆژیی ئاڵمانی** ی مارکسو ئینگڵس دەگێڕێتەوە کە مرۆڤ هەمیشە لە خۆیو لەوەی کە ئەنجامی دەدا و لەوەی کە دەبێ ئەنجامی بداتو لە جیهانێك کە لەودا دەژی، وێنایەکی هەڵەی هەبووەو دەشڵێ کە هەڵبەت مارکسو ئینگڵس لەم ڕێسایە بەدەر نەبوونە و وێناگەلی هەڵە بە خەیاڵیاندا هاتووە.[(٣)] مۆرێن وەیاد دێنێتەوە کە ئەمڕۆ زیاتر لە هەمیشە ئێمە ئەم خەیاڵکردە چەوتانە دەخولقێنین و تەنانەت لە کۆڕوکۆمەڵی زانکۆییشماندا ئوستورە خۆی لە جێی عەقڵ دەناسێنێو ئایدیۆلۆژی جلوبەرگی پۆشتەی زانست لەبەر دەکات. هەر بۆیە دەبێ ئێمە لە هەمبەر ئەو شتانەی بە ڕاستییە زانستییەکان ناودێریان دەکەین لەگەڵ زۆرترین دڕدۆنگی بەرەوڕوو بین. تەنیا لەم ڕێگایەوە کە دەتوانین تێبگەین کە تێفکرینی کۆمەڵایەتیی ئێمە لەگەڵ کام لە مەترسییەکانی ڕەنێوهانین و هەمدیس ڕەنێوهانینی ساویرەکان بەرەوڕوویە.

به ئاشکرا، مۆرێن لەگەڵ ئەوەی کە خەریکی نووسینی پەرتوکێك لەمەڕ مێتۆدناسیی زانستە ئەمڕۆییەکانە، باسی خۆی لە دەرەوەی بازنەی ئەپستمۆلۆژی،یا لانیکەم لە دەرەوەی

* گم گشتگی/ گومەساری/ لە دیالکتی هەورامی وەرگیراوە. (وەرگێڕ)

(٣) ا. مورن، **روش شناختِ شناخت**، ترجمەی ع. اسدی، تهران، ١٣٧٤،، ص ١٥.

ئەو شتەی بە شێوەیەکی نەریتی و باو"ئەپستمۆلۆژی"ی پێ دەوترێ، ڕێك خستوە. لە ڕاستیدا، فەلسەفەی زانستی ئەمڕۆش ئەگەر ناچار بوایە کە (لە بەر هەر هۆیەك بێت) تەنیا سەرنج لە هەڵێنجانە چەوتەکانی مرۆڤان بدات، ڕەنگە لە کۆتی ئاخێوی ئەپستمۆلۆژیکدا مابایەوە، بەڵام کێشەکەی لەم خاڵە بانتر ڕۆیشتوە و ناچار بووە کە لە پێوەندیی تێکچڕژاوی بوونی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ لەگەڵ وێناگەلێ کە مرۆڤ لە هەر شوێنگەیەکدا دەیخولقێنێ، ورد بێتەوە. هەربۆیە ئەو قەڵەمڕەوەی کە تاوتوێی دەکات دێتەنێو پانتایی ئاخێوی هایدنناسانەوە. بەرینبوونەوەی ئاخێوی کۆمەڵناسانە لە تاوتوێی زانستدا و گرنگی پەیداکردنی ئەو شتەی "مێژوی زانست"ی پێ دەوترێو گەڕانەوە بۆ باسگەلی هزرڤانانی وەکو کانگیم، فۆکۆ و باشلار، بێتوانایی ئەپستمۆلۆژیی پۆزەتیڤیستی نیشان دەدا. تێڕوانینی هایدنناسانە نیشان دەدا کە نالوێ خەسارناسیو خەسارناسیی هەقیقەت بە بەرەنجامێکی بنەتاییو لێبڕاوانە بگەن، چوونکە پێوەری ناسینیان بە ناچار لە خۆیانەوە وەدەست دێنین و ناتوانین سەربەخۆ لەوان و زاڵ بە سەریاندا تێ بهزرین، یا داوەری بکەین. ژیان ئامرازێکی دیکەمان پێنابەخشێ جگە لەم ئاوەزە ڕێژەیی و بەرتەسکە. مۆرێن دەنوسێ: زانیاریی ئێمە پێشکەوتنی هەرەمەزنی لە ناسیندا لێ کەوتۆتەوە، وەلێ تەنانەت پیشکەوتنەکانی زانستی ئێجگار پێشکەوتوی وەکو فیزیك، ئێمە بە ناسینێك دەگەیەنێ کە تێگەیشتن و لۆژیك و هۆشی ئێمە لەودا دۆش دەمێنێو ئێمە لەگەڵ مەسەلەیەکی لە ناسین نەهاتوە بەرەوڕوو دەکا. عەقڵ کە لە ڕواڵەتدا متمانەدارترین کەرەستەی ناسینە، پەی بەوە دەبا کە لەخۆیدا گرێکوێرەیەکی هەیە. بە ڕاستی عەقڵ چیە؟ ئایا جیهانگیر و گشتییە؟ ئاوەزگەرانەیە؟ ئایا ناتوانێ لەدژی خۆی ڕابوەستێو تێنەگا؟ ئایا بە گشتی زانینی عەقڵ وامان لێ ناکات کە تێبهزرین ئەمەش جۆرێك پاساوی ڕۆژئاوا تەوەری لەخۆیدا حەشارداوە؟ ئایا بەرەبەرە تێبینی ناکەین کە بەناوی خەبات دژی نەزانی، نکۆڵیمان لە گەنجینەکانی ناسین کردوە و سوکایەتیمان پێکردوە و لەنێومان بردوە؟ ئایا نابێ تێبگەین کە چاخی ڕۆشنگەریی ئێمە بۆتە شەو و تاریکی دایگرتوە؟ ئایا نابێ لەوەی کە بەلامانەوە ئاشکرایە دڕدۆنگ بینو لە تێکڕای ئەو شتانەی کە بنەمای ڕاستییەکانمانن پێداچوونەوە بکەین؟"(٤)

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ١٦.



لە باسی داستانی شیعریی هۆمیرۆسدا دیتمان کە ئاتنە کۆمەڵی هێمای ناڕوون بە بەشێك لە هەقیقەت دەکات، بەڵام بانگەشەی دەربڕینی تێکڕای هەقیقەت دەکاو تلماك لە هەمان کاتدا کە دەیەوێ لە هەقیقەتی تەواو بدوێ،گومانکارە. لەڕاستیدا، دەربڕینی هەردووکیان بە مانای کۆمەڵە ڕاڤەیەکە. ئەوان لەگەڵ یەکدی دەدوێن و دەستیان بە هەقیقەتێکی هاوبەش ڕاناگات، چونکە ئاخاوتە بەردەوام لەگەڵ کەتواردا مەودای هەیە. لە جەرگەی ڕاڤەکاندا، تەنیا سەرەداوێك لە هەقیقەت دەتوانی بەدی بکەیت، نەك زیاتر. دڕدۆنگی بونیادی دانایییە، کاتێك کە دەزانین هەقیقەت شاراوەیە و بە شاراوەیی دەمێنێتەوە. یەکێك لە هزرڤانانی هەڵکەوتوی ئامریکایی سەردەمی ئێمە واتە ئیستنلی کاڤێل ئەم خاڵەی هێناوەتە گۆڕێ. کاڤێل کە جیا لەنزیکایەتیی ئاشکرای تیۆرییەکانی لەگەڵ هزرەکانی نووسەرانی هێرمێنۆتیك، بەردەوام مەودای خۆی لەگەڵ ئەوان پاراستوە، سەرچاوەی سەرەکیی باسەکانی خۆی لە **توێژینەوە فەلسەفییەکان ی** ڤیتگنشتاین بەدی کردوە و لە پەرتوکی **بانگەشەکانی ئاوەز** (١٩٧٩) لە گومانگەریی ڕادیکاڵ داکۆکی کردوە.(٥) ئەو لەم پەرتوکەدا بە تاوتوێی بەرتەسکی و سنوردارییەکانی توێژینەوە لەزانستە ئەزموونییەکان و هەروەها بەرتەسکییەکانی تێڕوانینی فەلسەفی لەم زانستانە بەم بەرەنجامە گەیی کە لەمە بەدواوە، پێشکەوتنی زانست و فەلسەفە لە گرەوی ئەوەدایە کە" ڕێچکەی پەیجۆر لە فەلسەفەدا" بگۆڕێت. فەلسەفە لەجێی کۆڵێنگەری لە بنەماکانی زانینی ئەرخەیانی و بونیادە متمانەدارە مەتریالی و ئەزموونییەکان دەبێ خەریکی تاوتوێی شیمانەکان و ڕوداوگەلی بێجێنشین بێ. ئێمە دەبێ لە قووڵبوونەوەی فەلسەفیدا، سەرنج لە لایەنی بێبنەتایی و نەناسیاوی ڕووداوەکان و شتەکان و هەروەها لە خدەی تاقانە و تایبەتی بووندارانەی خۆمان بدەین.

بە ڕای کاڤێل، تێکڕای ئەو هەوڵانەی کە لە دوو هەزارساڵ تاکو ئێستا، بۆ دەربازبوون یا چاوپۆشی لە هەرە پێویستیی ملکەچ بوون بە گومان ئەنجام دراون، کێشەکەیان چارە نەکردوە، بەڵکو بەردەوام خولقێنەری بیچمگەلی تازە لەو بووە. فەلسەفە ڕێچکەیەکی نیە جگە لەوەی کە لە نەریتی گومانکاریی فەلسەفی کەڵك وەربگرێ، نەریتێك کە تەنیا لە هزرەکانی گوماندااران و سۆفیستەکانی جیهانی کەونارا یا دڕدۆنگییەکانی دیکارت، هیوم و کانت کورت نابێتەوە، بەڵکو پانتاییگەلی کەمتر ناسراویش دەگرێتەوە کە تاکو ئێستا کەم سەرنجیان

(5) S.Cavell, The Claims of Reason York, 1979.

لێدراوە. نووسینەکانی بیرمەندێکی وەکو رالف والدۆ و ئێمرسۆن نموونەیەکە لەو باسانەی کە قەڵەمڕەوی هزری فەلسەفی بەرین دەکەنەوە. بەڕای کاڤێل، میتۆدی ئێمرسۆن دەتوانێ لەبەردەم کەسانێك دابنرێت کە بەشێوەی جۆراوجۆر لەگەڵ ئەم کەتوارە بەرەوڕوو بوونە کە ئێمە گەیشتوینەتە جێیەك کە چیدی ناتوانین بانگەشەکانی ئاوەز شێلگیرانە لە قەڵەم بدەین. کاڤێل لە وتارێك لەژێرناوی" چاکسازیی بنچینەیی ئێمرسۆن" جەختی لە سەر ئەم خاڵە کرد کە ئەم بیرمەندە لە ڕێگەیەکەوە چووبوو کە لە پاش ئەو نیچەش (بێ ئاگا لە کارەکانی ئەو) تاقیی کردەوە.[٦]

کاڤێل چەند قات دووپات دەکاتەوە کە مەسەلەی گرنگ ئەمەیە کە لە خۆمان بپرسین: چ بەسەرمان، ژیانمان و شێوەی ژینمان دەهات، هەرکات لە جێی جەنگ و نەیاریی توند لەگەڵ گومانگەری چووباینە ژێر رکێفیەوە.[٧] ئێمە لە نەریتی میتافیزیکدا بەرەنجامگەلێ پەسند دەکەین کە بە دروست و ئەرخەیانی لە قەڵەمیان دەدەین و بە کردەوە جار ناجارێ، ناچار دەبین بێ متمانە و لەبرەوکەوتو لە قەڵەمی بدەین. دژوارە بتوانی لەم رۆژگارەدا کەسێك پەیدا بکەیت کە بیەوێ یا بتوانێ بەهەمان گوڕوتینی پۆزەتیڤیستەکانی دەیەکانی پێشو لەگەڵ ئەم گوتەیە ناکۆکی بنوێنێ کە ئێمە سەرەڕای تێکڕای هەوڵەکانمان هێشتا کۆڵەکەیەکی ئەرخەیانکەرەوەی پتەومان بۆ تیۆرییەکانمان پەیدا نەکردوە. ئەم پەیدانەکردنی دوا وڵامەکان ئێمەی هیوابڕاو نەکردوە و هیشتاش ئارمانجمان" چارەسەری مەسەلەکان"ە. ئێمە بە دەگمەن دەرفەت بەم بیرە دەدەین خۆبنوێنێ کە مەسەلەی چارەکراو و کۆتایی پێهاتو لەڕاستیدا بێبایەخە و تەنیا ئەومەسەلانەی کە هەرگیز ناگەنە کۆتایی، بەڕاستی کاڵا بەقەد باڵای ناونیشانی فەلسەفین. کەسێك کە بە خەیاڵی خۆی مەسەلەیەکی چارەکردوە، هەمبەرێکی دروست و شیاو لەگەڵ ژیان و جیهان رایەڵ ناکات.

ئەمە هەڵکەوتی سروشتیی نەزانیی ئێمەیە کە بە ڕێگەکانی ئاگاداربوونی بەرتەسك و ڕێژەیی ئێمە هەلی وەدەرکەوتن دەڕەخسێنێ و پەیتا پەیتا ئێمە بۆ ئەزموونی ڕێگەیەکی تازە لە ژین بردنە سەر رکێش دەکات، ئەو ڕێگانەی کە بەبێ ناوێزە ئەو هەواڵە سنوردارانە لە برەو دەخەن و لەبەرانبەردا ڕێچکەیەکی تازە بۆ دانایییەکی تازە دەکەنەوە: گومان، هەمبەرێك لەنێوان ئێمە و جیهان دروست دەکا و ئەم هەمبەرە بە نۆرەی خۆی رەژیدەی پێش ـ فامگەلێکە کە بەپێچەوانەی خەیاڵکردە زانستییەکانی ئێمە ناتوانێ پەیجۆرگەری سالاریی بەسەر جیهانی بەرناسەکاندا بێت.

---

(6) s.cavell, “emerson contitutitional amending”, in: philosophical passages, cambride, Massachusetts, 1995, pp.14-42
(7) s.cavell , the claims of reason , p.15



بانگەشەی گەورەی ئاوەز" مافی گومان کردن"ە . بە پەسندکردنی، "فەیلەسوفی ناخیی ئێمە" خودئاگا دەبێتەوە. باشترە کە ئێمە لەجێی رووبەڕووبوونەوە و سەرکوتی(خۆ) ی رۆژانەمان، لە بانگەشەکانی لووتبەرزانەی زانستی دەست هەڵگرین و پەسندبکەین کە لەگەڵ دردۆنگیی سەرەمڕە و بنیاتنەر، لە جەرگەی سنوردارییە مرۆییەکانی خۆمان ژیان بەرینە سەرێ. کاڤێل لە پلەی قوتابیی ڤیتگنشتاین و ئاستین، لە هەمبەر" گەورەترین سنورداریی ئێمە کە لە گەورەترین ئامرازی ئێمەوە ئاخێزاوە"، واتە زمان کەمتەرخەم نیە. ئەو رادەگەیەنێ کە وزەی ناسینی ئێمە لە کۆتی قەڵەمڕەوی وشەکان و زماندایە. گریمانی زەینێکی بەرین کە بتوانێ هەموو شتێك لە دەرەوەی سنورداریی زمان تێبگا، گریمانێکی چەوتە و لە دیدی فەلسەفییەوە پاساو نادرێ. کاڤێل بە یاریدەی ئێمرسۆن و بە تایبەتی پەرتوکی **والدێن** بەرهەمی هێنری دەیڤیدتۆرۆ نیشان دەدا کە ئێمە لە کۆتی ئەو دانایییانەین کە هەمانن و لە راستیدا زیندانیی زمانمانین و سەرەنجام دەبێ پەسند بکەین کە هەر ئەم وشانەی کە بە یاریدەی ئەوان پێوەندی بەوانی دیکەوە دەکەین، یا جیهان و خۆمان بە خۆمان دەناسێنین، خیانەتمان پێ دەکەن. وشەکان هەرگیز لە کۆتاییدا ئەو شتە دەرناچن کە لە بەراییدا دەمانویست و عەوداڵی بووین. ئێمە بە سەر زمان و هزری خۆمان و لەسەر لۆژیك و پێکهاتەی زانست چاوەدێری و زاڵبوونمان نیە. ئێمە لەبەرئەوەی بیچمگەلی مرۆیی دەربڕین، واتە سنوردارییەکانی تێبینی ناکەین و پشتگوێی دەخەین، خۆمان و لە بەرەنجامدا کەسانی دی و جیهان لە کیس دەدەین. ئاوەزباوەڕی تا هەنوکە گومانی بەگوڕ نەکردوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە بە ئاراستەی سەرکوتکردنی یا وەك فەیلەسوفان دەڵێن" بۆڕدانی" چۆتە پێشێ. فەلسەفە بەو چەشنەی کە کاڤێل دەیناسێنێ، بانتر لەم راگەیاندنە هەڵدەکشێ کە چ شتێك راست و دروستە و چ شتێك درۆ و چەوت.

فەلسەفە دەتوانێ لە گێچەڵی ئەو شتەی کە نیچە" درێژدادڕییە عەقڵانییەکان" ناوی لێنا بوو، رزگار ببێ. کێشەی نیچە تەنیا بیچمی دەربڕین و سەلماندنی هەرە پێویستیی بڕگەنووسی نەبوو. ئەو دەیهەویست پەیامنامە و کاری راستەقینەی فەلسەفە رۆشن بکاتەوە. فەیلەسوف دەبێ لە جێی پرسیار لە راست و چەوتیی شتان، بەردەوام بپرسێ کە بۆچی ئەم شتە بە راست و دروست دەناسێنرێ و ئەو شتە چەوت؟ ئەم پرسیارە ئێمە بۆ جەرگەی بەرجەوەنگەرایی نیچە دەگەڕێنێتەوە. لێرەدا لە پرسیاری کلیلیی نیچە کە" راست و درۆ" بە کاری کێ دێن؟ تەنیا هەنگاوێك مەودا دەمێنێتەوە و بەس.

## (٢)

نیچە ئەو بوێرییەی هەبوو تا لە"دواین مرۆڤ" بدوێ. ئەو دەرگایەك كە تلماك بە رووی ئاتنەدا ئاوەڵای كردبوو دایخست و دەرگایەكی دیكەی ئاوەڵاكرد و خۆی بە مزگێنیدەری هەورەبروسكەی" كەڵەمرۆڤ" ناونا و لە بەرانبەر سەرترین ئاكارە باشەكان، مرۆڤی ئەمڕۆیی داینا، بوونەوەرێكی سوك و چروك كە چیدی ئامرازی پێویستی بۆ هەڵسەنگاندن و پێوانی هەرچی و پەرچیی خۆی لە بەردەستیدا نیە، كەسێك كە لە پاتۆری پێنجەمی پێشگوتاری **وەهای گوت زەردەشت دا**" دوایین مرۆڤ" ناوی لێ نراوە:" سەردەمی هەرزەئەژمارترین مرۆڤ سەرهەڵدەدا. مرۆڤێك كە چیدی ناتوانێ خۆی بە هەرزە بزانێ. هێی! دواین مرۆڤتان پێ‌نیشان دەدەم... زەوی بچوك بۆتەوە و لە سەریەوە دواین مرۆڤ هەڵبەزودابەز دەكا،مرۆڤێك كە هەموو شتێك بچووك دەكاتەوە. نەوەی ئەو وەكو پێشكە خاشەبڕ نابێ. دواین مرۆڤ درێژترین تەمەنی هەیە." ئێمە بەختەوەریمان داهێناوە": دواین مرۆڤان وەها دەڵێن و چاوەتروكێ دەكەن".[8] دواین مرۆڤ وێرانگەرە و هیچ شتێك ناخوڵقێنێ. نیهیلیستە. لە هەرشتێ سەردەمانێك كە لە نەریتە رەوشتتییەكاندا بە هێژامەندی دەناسرا رووی وەرگێڕاوە و خۆی یەكسەر بەبێ بەهاكان دەژی. كێشەكەی سودمەندبوون لە ئاسودەیی و لەشساخی، یا نیچەگوتەنی گەرمایە. هەر جێیەك ژین بردنەسەر لەودا دژوارە بەجێ دێڵێ، نەخۆش كەوتن و بەگومانبوون بە گوناه دەزانێ، بە پەرێز و ترسنۆكە و ئێجگار بەترسەوە هەنگاو دەنێ. هێشتا كار دەكا، چونكە كار بەمایەی سەرگەرمی دەزانێ، بەڵام دەترسێ كە ئەم سەرگەرمی‌یە لەئاستی خۆی دەرنەچێ. لەجێی هاوپێوەندی و یەكگرتن لە یەكسانی دەدوێ:" مێگەلێك، بە بێ هیچ شوانێك". نیچە دەڵێ:" هەموو یەكسان دەبینن و هەموو یەكسان دەخوازن. هەركەس جگە لەمە ببینێ، بە پێی خۆی دەچێتە شێتخانە". بڕیاری دواین مرۆڤ پشت ئەستورە بە ئاوەزی رۆژانەوە و بەرگەی هیچ بزاوتێك لە دەرەوەی فەرمانە یەكسانسازەكانی ئەم ئاوەز ناگرێ و هەر شتێك جگە لەم عەقڵە بە شێتایەتی ناو دەنێ. دواین مرۆڤ مێژو بە هەقایەتی شێتان دەزانێ، پێی وایە لە هەرشتێك كە تا هەنوكە رووی داوە ئاگادارە و بە هەموو شتێك پێ‌دەكەنێ. دنیا بە داخراو و بەرتەسك دەخوازێ، پێویستیی بە ئاسۆكراوەكان نیە. بە ماڵی بچوك و پیشەی ساكاری، بە خۆشییە بچووكەكانی ژیانی رۆژانە و شەوانە لە پەڕانپەڕی بچوكی خۆی و لە نێو خێزانی

(٨) ف. نیچە، **چنین گفت زرتشت**، ترجمەی د. اشوری، ویراست چهارم، تهران ، ١٣٧٥، صص ٢٧-٢٨



خنجیلانەی خۆی دڵخۆش دەكا و دەیەوێ بە لەشساخییەوە درێژە بە ژیان بدا. دواین مرۆڤان هێشتا بە دژی یەكدا دەچن، بەڵام پێكەوە دەسازن، نە وەك گەدەیان تێك بچێ. دواین مرۆڤ دەڵێ: من دەمەوێ دواین مرۆڤ بم، كەڵەمرۆڤ پێشكەشی زەردەشت بێ.(!)

ئایا ئەم رەخنەكارییە تاڵ و تاسێنەرەی" مرۆڤی ئاسایی"، "مرۆڤی كۆڵان و بازار" یا بە گوتەی ویلهۆلم رایش" مرۆڤی بچوك" كە بەسانایی هەركام لە ئێمەین، لە بەرانبەر پێشنیارێكی سەلمێنەیی، گەلاڵەیەكی میتافیزیكی بۆ سەرهەڵدانی كەڵەمرۆڤ، گەلاڵەیەكی پشت ئەستور بە ویستی هێز جێ‌دەگرێ؟ ئایا نیچە كە ئەو بە بانگەوازدەری رێژەییبوونی بایەخەكان و راستییەكان دەناسین، خۆی پەیامهێنی بایەخگەلی تازە و سەرترە و لە بەرەنجامدا لە جێیەكدا رێژەییبوون بەرتەك دەداتەوە؟ ویستی هێز كە ئەو دەیهێنێتە پێشێ لە كوێدا بنەجێ دەبێ؟ لەودا نیگای تازەی میتافیزیكی، لە مزگێنیی كەڵەمرۆڤدا، یا لە هەمان گەلاڵەی رێژەییمەندیی داناییەكان و هەقیقەتەكان؟ وڵامەكە رەنگە بتوانین لە تاوتوێی رێژەی نواڕیی نیچە بەدی بكەین.دەزانین كە "ژیان" چەمكێكە كە لە هزری نیچەدا پێگەیەكی نێوەندیی هەیە. ئەمەش دەزانین كە ئەو دەیوت ئێمە ناتوانین ژیان بناسین، چونكە عەقڵ ملكەچ و خزمەتكاری ژیانە و لەسەر بناخەی عەقڵ ناكرێ ژیان بناسین و یا پێناسەیەك لەو بدەین بەدەستەوە. خاڵێك كە لێی ئاگادارین ئەمەیە كە بە بێ ژیان نە بایەخێك لە گۆڕێدا دەبوو و نە زانیارییەك، نە ئاوەز و نە ویستی هێزێك. تێكڕای ئەم كاروبارە لە پێوەندییەك كە لەگەڵ ژیان پەیدا دەكەین، بە شێوەیەكی رێژەیی و رێككەوتەیی واتا پەیدا دەكەن. ئێمە ناتوانین لەمە زیاتر بچینە پێشەوە و لە بەرانبەر ژیاندا دەچەقین. ئەو چەمكانە كە لە بارەیەوە دروستیان دەكەین، تەنیا بە كاری ناسینی رێككەوتەیی لە چەمكەكانی دیكە و شتانی دیكە دێن. یەكێك لەم چەمكە بەسودانە" ئاسۆی ژیان" یا lebenshorizonten ە كە نیچە لە یەكەمین بەرهەمەكانیدا بە كاری هێنا. ئەم چەمكە رێخۆشكەری پێشبینیی چەمكی هایدگێریی" پێش ـ فام" بوو. ئاسۆی ژیان رەگاژۆی لەم كەتوارە دایە كە هەرچەشنە پێش ـ فامێكی ئێمە كە بەوەوە دێینە نێو بانهەڵكشانی ناسین و راڤە و داوەری، بە شێوەیەكی ناچارانە بە بیچمگەلی كەم و زۆر ناسراو لە ژیانی راستەقینە دەگەڕێتەوە و لەگەڵ بەستێنی مێژویی، كۆمەڵایەتی و فەرهەنگی (ئەو شتەی هۆسرێل" ژینجیهان"ی ناو لێناوە) پێوەندیی هەیە.

وردبوونەوە لە یەکەمین وانەگوتارەکانی نیچە و گەلاڵەگەلێ کە لەو لەمبارەوە بە جێماوە، بە باشی نیشان دەدا کە ئەو بە یاریدەی" ئاسۆی ژیان" تێدەکۆشا تا لە قەڵەمڕەوی قەتیسماوی زماننasی و شێوازناسی بانتر بچێ و لە فەلسەفە، مێژو، دین، جوانیناسی و ڕەوەشتیش سەرنج بدات. نیچە لە سەرەتای کاری فیکریی خۆیدا هێرمێنۆتیکی بە لقێك دەناسی کە هەرچەند تا ڕادەیەك پێوەندیی لەگەڵ ڕەخنەکاریی فەلسەفی هەیە، بەڵام بە هەرحاڵ، بەشێکی سەربەخۆ لە زمانناسیی مێژوویە و بە تایبەتی لە توێژینەوەکانی هزر و ئەدەبی کلاسیك بەکار دێت.ئەم ڕایەی ئەو بەرەبەرە گۆڕا و زیاتر سەرنجی لە لایەنەکانی فەلسەفیی ڕاڤە دا و لە بەرەنجامدا قەڵەمڕەوی هێرمێنۆتیکی بەرینتر کردووە[٩] پێشڤەچوونی بەرهەمەکانی نیچەی لاو نیشان دەدەن کە ئەو بەرەبەرە خدەی فەلسەفیی لقێك لە باسی زمانناسی و ڕێزمانیی کە بەشێوەیەکی نەریتی بۆ کاروباری ڕاڤەی دەقەکان تەرخان کرابوو، بەگرنگ لەقەڵەم دا. ئەم دوورنۆڕییە، کە دەرخەری یەکەمین کرۆکەکانی تێفکرین لە ڕەچەڵەکناسیشە، بوو بە ڕێخۆشکەری درك پێکردنێکی تازە لە هێرمێنۆتیك و لە هەمان کاتدا نیشانی دا کە" ریشەگەلی کەمایەسییەکانی زمانناسیی مێژوویی چین. لە یەکێك لە یاداشتەکانی نیچە کە وادیارە مێژوی نووسینەکەی بۆ کۆتایی ساڵانی دەیەی ١٨٦٠ دەگەڕێتەوە، دەخوێنینەوە کە لەدیدی ئەوەوە کردەی ناسینەوەی دەق، ناسینی ریشە و بنەچەیەتی:" ئێمە دەمانەوێ شتێك زیاتر لە دەقێکی کۆتاییهاتو بەدی بکەین. دەمانەوێ لە بەرانبەر چاوانمانەوە سەرچاوەی بەرهەمێك، مێژوی ڕەنێوهانین و لە دایکبوونی ببینین... ئاواتەخوازین کە بانهەڵکشانی بیچمگیری و کرانی(شدن) بەرهەم بە ئارامی لە بەر چاوانمان ئاشکرا ببێ".[١٠] ئەم گوتەیە هەم ڕێچکەی باسی ڕەچەڵەکناسی نیشان دەدا و هەم لەدیدی ناسینی هێرمێنۆتیکی پڕبایەخە. نیچە لە وانەگوتارەکانی لە زانکۆی بازێل کە دەورەیەك لەوان بۆ تاوتوێی **ئیلیادی** هۆمیرۆس تەرخان کرابوو، ڕایگەیاندبوو کە مەسەلەکەی نەك تەنیا

(٩) لەمبارەوە ئەم وتارەی خوارەوە ئێجگار ڕێخۆشکەرە. نووسەری ئەم وتارە بەڵێنی داوە کە لە داهاتویەکی نزیکدا پەرتوکێك لەمەڕ هەمبەری نیچە لەگەڵ هزری هێرمێنۆتیکی بڵاوبکاتەوە، کە لە ڕاستیدا ئەم وتارە بەشی بەرایی ئەو پەرتوکە ئەژمار دەکرێ:

n.davey," hermeneutice and lvietzsche s early thought" in: k, ansell- pearson ed, nitsche and modern german thought, London, 1991, pp.88-119.

(10) ibid, p.92.



هۆمیرۆس، بەڵکو" گشت خەیاڵسازیی یونانی"یە و بە جەختەوە گوتبووی کە بۆ ناسینی ئەم بەرهەمە دەبێ سەرنج لە ئاسۆی ژیانی یونانییەکان بدەین و سودێکی نیە کە باسەکە لە تاوتوێی نیازەکانی دانەری بەرهەم قەتیس بکەینەوە.[١١]

چەند ساڵ دواتر نیچە لە **لەدایکبوونی تراژێدی** دا لە "یونانیان" دوا و ڕای گەیاند کە بۆ ناسینی واتاگەلێ کە لە هەر تراژێدیایەکدا بەدی دەکرێن،دەبێ لە گشت بایەخگەلی یونانی کە بەرەنجامی ژیانی یونانییەکانە، وردبینەوە. ئەو نووسی کە یونانییەکان لە تەك ترسەکان و تۆقینەکانی بوونی مرۆیی ئاشنابوون و لەبەر ئەمەش خواوەندانی ئولۆمپیان خوڵقاندو هەمدیس لەبەرئەمە تراژێدیاکانیان ئافراند.[١٢] یونانییەکان خوڵقێنراوانی ئاسۆی ژیانێك بوون کە دەبێ بەر تاوتوێ بکەون و هەتا ئەم ئاسۆیە نەناسرێت، بۆ ئێمە نالوێ کە ڕێگەیەك ڕووەو واتاگەلی دەقە یونانییەکان ئاوەڵا بکەین.

ناسینی ئاسۆی ژیانی یونانی ئیدی بەسانایی چەشنی ـ گریمان بەمەبەستی سەلماندنی دروستی و متمانەی ئەو ڕاڤانەی کە دەیانخەینەڕوو نیە،بەڵکو دەبێتە ئامانجی توێژینەوە. دەبینین کە بازنەی هێرمێنۆتیك جارێکی دی نیگاری دەکێشرێت: بە بێ **ئیلیاد** ناتوانین ئاسۆی ژیانی یونانیان بناسین، وەلێ لە لایەکی دیکەوە بەبێ ناسینی ئەو ئاسۆیەش ناتوانین پەی بە ڕازەکانی **ئیلیاد** بەرین. لەم ڕووەوە، نیچەش وەکو هزرڤانانی دیکەی هێرمێنۆتیك و بە تایبەت شلایرماخێر، لە هەمبەری نێوان ئەم دوانە دوا و لە گریمانگەلی کاتی کە دەتوانن لە بەرەنجامی پێشکەوتنی توێژینەوە و تاوتوێی ئاسۆکانی دیکەی ژیان هاوتەراز و بیراز بکرێن، باسی کرد. نیچەی لاو چەندجارێك" پەیامنامەی هێرمێنۆتیك"ی بونیادنانی یەك" مێتۆدی ناسین و داوەریی بەرهەمەکان" زانیبوو، بەڵام بەردەوام جەختی لەسەر ئەم خاڵە دەکرد کە ئەم ناسینە بەبێ سەرنجدان لە کۆی توخمگەلی فەرهەنگی و ژیانێکی ڕاستەقینە کە ئەم بەرهەمانە پشتیان پێبەستوە نالوێ و هەرکەس کە تەنیا بەرهەم بێنێتە ئاراوە، گێجی و نارۆشنیی باسەکە زێدەدەکا.

مەسەلەیەك کە نیچە هێنابوویە پێشێ، واتە هەرە پێویستیی تێپەڕین لە بەرهەم خۆی و وردبوونەوە لە ئاسۆی دانایی سەردەمێك کە بەرهەم لەودا ڕەخساوە ڕەگاژۆی لە ڕوانگەی

(11) ibid, p.93.

(12) F.Nietzsche, the birth of tragecly, trans.w.kaufman, newyork, 1967, p.41

ڕۆمانتیکخوازان و بە تایبەت فریدریش شیلگیل دایە. تەنانەت دەتوانین سەرچاوەکەی دوورتر بەرین و سەرنجیش لە کارەکانی وینکلمان بدەین. ئەوەی نیچە هێنابوویە پێشێ و تا ڕادەیەك تازەیە، مکوڕی و لێبڕاوێتی ئەم هەڵێنجانە یا بەرەنجامگیرییەی ئەوە کە بۆ تێگەیشتن لە دەق، نەك تەنیا دەبێ لە بەرهەم، بەڵکو دەبێ لە ڕوانگەکان و بەرجەوەنەکانی دانەریش بانتر بچی و لە ئاسۆی ژیان و فەرهەنگێك ورد ببیەوە کە بەرهەم لەوەوە بەرهەڤ کراوە و بە نۆرەی خۆی یا قایم و پتەوی کردوە، یا کۆمەڵە گۆڕانێکی لەودا چێ کردوە. ئەم دوورییەی دەق لە نیازی دانەرکە ئەمڕۆکە بەلای ئێمەوە و بەشێوەیەکی هەمەکی لە ئاخێوی ڕەخنەگرانەی ئەدەبی و هونەریی نوێدا، وەکو پێشگریمانێکی لێبڕاوانە خۆدەردەخا، بە ئاسانی بیچمی نەگرت و دەستەویەخەبوونی نیچە لەگەڵێدا نموونەیەك لە هەوڵدان بۆ زاڵبوون بەسەر پڕوپووچییەکان و خاڵگەلی پڕتەمتومانە کە دەورتادەوری بەسترانەوەی دەق بەدانەریان بە کەڵەکچنێکی* قایم و ئەستور گەمارۆ دابوو. ئەگەر ئێمە ئەمڕۆ بتوانین بەبێ خۆ لەقەرەدانی تەندورەی دژوارییەکان و گرێکوێرە تیۆریکی‌یەکان نیشان بدەین کە تێکڕای دەقەکان نەك بەروبوومی نیازەکان و هزرەکانی" خولقێنەر یا ڕەخسێنەری" خۆمان،بەڵکودەرخەری ئاسۆیژیان وجیهانبینیەکن کە لە ئاستی تاکایەتی بانتر دەچن، لە بەر ئەمەیە کە لە زەوییەکی قورس و پتەو هەڵتروشکاوین کە نیچە پێشتر تەختی کردوە. هایدگێر لەمەڕ نیچە و بەرهەمەکانی ئەم خاڵەی هێناوەتە پێشێ کە دەبێ هایدن، جیهان یا ئاسۆی ژیانێك کە بنچینەی بەرهەمەکانی نیچەن، لە جێی ئەو تاوتوێ بکرێن:" ئەگەر ئێمە لە جێی ئەمە کە لەبارەی هایدن و جیهانێك کە یەکەمجار بنچینەی بەرهەم بوون، لێکۆڵینەوە بکەین، دانەدوی تاوتوێی ژیانی مرۆڤێك کە بەرهەمی ئافراندوە دەکەین، بەردەوام لە پلە و پایەی بەرهەمدا، خۆی(دەرگای خۆی) بە ڕوومان دادەخا"[١٣] بەم چەشنە دەتوانین بڵێین کە مەسەلەی سەرەکیی هێرمێنۆتیك زاڵبوون بەسەر مەوداکان و نامۆیی‌یە و دەبێ دەربخات کە چۆن و بە چ جۆرێ بەرهەمێك لە فەرهەنگی ڕەسەن و هەڵکەوتی مێژوویی پەیدابوونی خۆی جیادەبێتەوە و دەچێتەنێو ئاسۆی ژیانی بەرامبەرانێك (بیسەر ـ خوێنەر) کە لەسەردەمێکی دیکەدا دەژین.

* لە زاری هەورامی وەرم گرتوە، بە واتای" حصار" ی فارسی.( وەرگێڕ)

(13) M.Heidegger. nietzche, trans.D.farrell krell, new York, 1991, val.3.p.4.



ڕای نیچە هەرچەند هێشتا لە کۆتی ئاسۆی ژیانی سەردەمی دانەر بوو و تاوتوێی ئەو ئاسۆیەی بە هەرە پێویست دەزانی ، وەلێ لە بەرگرەوەی هەندێ کرۆك لە دیتەیەکی تازەتریش بوو. ئەو لە هەمان کاتدا کە بەڕاشکاوی لە گواستنەوەی ئاسۆی ڕابردو بۆ ئاسۆی ڕۆژگارێکی دی، واتە سەردەمی ڕاڤەگەر باسی نەدەکرد، بەڵام ڕێگەی بە یاریدەی هێماگەلێکی بیرورژێن ئاوەڵاکرد، تا ئێمە بتوانین ئەمڕۆ، لە باس لە هێرمێنۆتیك ڕابگەیەنین کە کێشە لەسەر ئەمە نیە کە بەرهەمێك بۆ بەرامبەران (بیسەر ـ خوێنەر) ی سەرەکیی خۆی چ واتایەکی دەبەخشی، بەڵکو خاڵی نێوەندی ئەمەیە کە بەرهەم هەنووکە بۆ ئێمە چ واتایەك دەبەخشێ.

بەرتەسکیی ڕوانگەی نیچەی لاو کە هەرەپێویستیی تاوتوێی ئاسۆی ژیانو فەرهەنگی سەردەمێکی مێژوویی وەکو پێش ـ مەرجی ناسینی بەڵگەنامەکانو دەقگەلی مێژوویی ئەو سەردەمەی دەهێنایە پێشێ، بۆ پێشینەیەکی تیۆریك کە لە کاری شلینگدا هەبوو و بۆ شوێندانەریی لەسەر کاری ڕۆمانتیکخوازە ئاڵمانییەکانیش دەگەڕایەوە. بەڵام نیچە کرۆکێك لە ڕوانگەیەکی ئەمڕۆیی بەم پرسیارەوە هێنانە پێشێ: چۆن و تا چ ئاستێك دەتوانی لە مەودای فەرهەنگیو کۆمەڵایەتیی نێوان دوو سەردەمی جیاوازی مێژوویی کەم بکەیتەوە؟ ئەو نووسی:" لەبەرئەوەی کە ئێمە لە کۆماگی تۆخمەکاندا پەروەردە نەکراوین، ناتوانین بە تەواویو بە وردی بەرەنجامگەلی فەرهەنگییان بناسین، ئەو جەختی کرد کە وەها ناسینێك " کارێکە هەتا بڵێی دژوار ... و ئێمە ناچاردەبین کە تۆیژینەوەی خۆمان بە یاریدەی بەراوردەکان بەرینە پێشێو لەم ڕووەوە، تێگەیشتنی ئێمە لە پێشینان دەتوانێ سازدەری جۆرێك هاوتەریبیی ئاگایانە و وێدەچێ لە هەندێ ڕووەوە ناخودئاگا بێ".[١٤] چەمکی"هاوتەریبی"کە لە نووسینەکانی نیچەدا هاتۆتە گۆڕێ، بە وردبوونەوەی زیاتر دەخەینە ڕوو. هەرچەند ئەم زاراوەیە بەڕاشکاوی لەنووسینەکانی یارانی هێرمێنۆتیكو زمانناسانی مێژوویی سەدەی نۆزدەهەمدا نەهاتوە، بەڵام لە هێما بە چەمکێکی دیکە کە نیچەش بەکاری هێناوە، واتە "بەراورد" لە گۆڕێدا بووە. فریدریش ئاسێت لە باسکردن لە بەراورد لە نێوان دوو هەڵکەوتی فەرهەنگیی جیاوازدا هێمای بە کاری ڕاڤەگەرێك دەکرد کە تێدەکۆشێ تا جۆرێك لە "هاوپێناوی" لەگەڵ هەردووهەڵکەوتی جیاواز دروست بکا. ئەم لایەنە لێرەوە چووە نێو باسەکانی هێرمێنۆتێکی ڕۆمانتیك و هەروەها لە یەکێك لە شێلگیرترین خاڵگەلێ کە لە تیۆرییەکانی زمانناسی

(14) Davey, op, cit,P.94.

هاتەگۆڕێ، واتە لە بەرهەمەکانی فۆن هۆمبۆلێتدا خدەیەکی هێرمێنۆتیکیشی پەیدا کرد. ئەو نووسی: "سەردەمانێك کە درزێکی زەبەلاح دوو بوونەوەری لێك جیاکردبێتەوە، هیچ پردێك ناتوانێ لە نێوانیاندا دروست بکرێ...لەم روەوە هەرجۆرە ناسینێکی بابەتێکی تاقانە، پەیوەست بەئەوبەری درزەکەوە، لە ڕێگەی پێشگریمانی شیمانی بوونی بەراوردێك لەگەڵ هەڵکەوتی ناسێنەر دەتوانێ بیچم بگرێ".(١٥) ئەم بەراوردە ئەگەری ئەوە دەڕەخسێنێ کە ئێمە بابەتی ناسینەوە لە هەڵکەوتێکی تازە، یەکانگیر یا تەریب لەگەڵ ئاسۆی تێگەیشتنی ناسێنەر دابنێین. ئەم خاڵە یەکێك لە یەکەمین خاڵگەلی سەرهەڵدانی ئاگایانەی باسی هێرمێنۆتیکی ئاوێتەبوونی ئاسۆجیاوازەکانە کە هەڵبەت چەند لایەنێك لەو لە نزیك سەد ساڵ پێشتر لە نێوان هزرڤانانی ئاڵمانی لە ئارادابووە، بەڵام بەو گوڕوتینو وردبینییەوە بە سەرهەڵدانی دیتەی هێرمێنۆتیکی گرێ نەدرابوو.

ئەوەی نیچە، دوابەدوای هۆمبۆلێت لە بارەی بەراورد هێناویەتی، رەنگە یەکەمین باسی هێرمێنۆتیکی لەمەڕ چارەسەربوونی دژوارییی رووبەڕووبوونەوەی ئاسۆکان بە قازانجی ئەم سەردەمە بێت. ئەمە هەمان باسە کە ئەمڕۆ بە سپاسو لە سایەی کارەکانی گادامێر، گواستنەوەی بەرهەمێك یا دەقێك بۆ رۆژگاری خۆیو ئاسۆی هزرەکانو ئاماژەکانی خۆمان ناودێری دەکەین. سەرنجدان لە زاراوەی نیچەیی "ئاسۆی ژیان" رۆشنگەری خاڵگەلی گرنگو سەرنج راکێشە. هەم جۆرێك پێشبینیی گرنگیی چەمکی ژیان لە نووسینەکانی دواتر و بەناوبانگتری نیچەیەو رۆشن دەکاتەوە کە ئەم چەمکە چ مێژینەو پێشینەیەکی دوورودرێژی لە کاری فەیلەسوف هەبووە و هەم نیشان دەدا کە نیچە تێبینی کردبوو کە هەر بە تەنێ ئاگایی و ئاگاداری لە هەل ومەرجەکانی ئاسۆی رابردو بەس نیە و ئەمە هێشتا بە واتای کلیلی کردنەوەی ئاڵۆزییەکان و دژوارییەکانی دەق نیە، بەڵکو دەبێ بتوانین ئەو هەل و مەرجانە لە تەك هەل ومەرجی ئەمڕۆ و ئەو ئاسۆی ژیانە لە تەك ئەم ئاسۆ هەنوکەییە بەراورد بکەین. رەخنەگرتنی نیچە لە philolgyیا ئەو شتەی لە نەریتی ئێمەدا زمانناسیی مێژوویی پێ وتراوە، بە سەرنجدان لەچەمکی ئاسۆی ژیان دەناسرێتەوە. ئەمە ئەو لقە زانستییەیە کە نیچە لە سەردەمی زانکۆدا خوێندبووی و لە ڕێگەیەوە هۆگری فەلسەفە ببوو، بەڵام بەرەبەرە لەگەڵ خاڵەلاوازەکانی ئاشنا ببوو. ئەم زمانناسییە لەدیدی ئەوەوە ناتوانێ" بەراورد" رایەڵ

(15) ibid, P.94.



بکا و تەنیا بەناسینەوەی ئاسۆی رابردوو رازی دەبێ و لەڕاستیدا ناسینێکی خەیاڵی لەو وەدەست دێنێ. زمانناسی مێژوویی گەمارۆدراو لە خەیاڵکردەکانی خۆی لەمەڕ سەردەمی مێژوویی رابردو دەمێنێتەوە و ناتوانێ ئەوانە بگوازێتەوە بۆ ئەمڕۆ. گرنگیی رۆمانتیکخوازان بە لای نیچەوە لەمەدایە کە ئێجگار تێکۆشاون تا کەرەستەکانی نێوان ئاسۆی ژیانی هاوچەرخ و ئاسۆی ژیانی یونانی ئامادە بکەن.

لە لایەکی دیکەوە نیچە لە راست مێتۆدی پۆزەتیڤیستیی زمانناسیی مێژوویی دەنگی هەڵدەبڕی و دەینوسی کە کاری زۆربەی زمانناسانی مێژوویی هاوشێوەی کاری ئەو کەسەیە کە هێندە لە بڕگەیەکی بچوك لە تابلۆیەکی نیگارکێشی واقی وڕدەمێنێ کە سەرەنجام گشت تابلۆکە لە بیر دەکا و لە بەرەنجامدا توانای وەدیارخستنی ئەمە کە ئایا پاژی جێی مەبەست بەو گشتەوە پەیوەستە یان نا، لە کیس دەدا. نیچە ئەم مێتۆدەی بە" ترسهێنەر" ناودێر کرد.(١٦) ئەو بەردەوام دەیگوت کە زمانناسان تەنانەت ناتوانن هۆی قەناعەت پێکەر لەمەڕ ئەمە کە بۆچی ئێمە دەبێ فەرهەنگی کەونارا و ئەدەبیاتی کلاسیك بخوێنینەوە، بدەن بەدەستەوە. هەڵبەت، لە سەردەمی بڵاوبوونەوەی **لە دایکبوونی تراژێدی** مامۆستایانی زمانناسیی مێژوویی و کۆنخوازانیش بە نۆرەی خۆیان نیچەیان بە" سۆبژکتیڤیزم"، واتە دانانی بەرەنجامگەلی زەینی لە جێی کەتوارەکان، تۆمەتبار کرد. ئەوان بەم کارەیان بە باشترین شێوە قسەی نیچەیان دەسەلماند و نیشانیان دەدا کە توانای تێگەیشتن واتە گواستنەوەی ئاسۆی ژیانی رابردو بۆ ئاسۆی هەبوو و هەنووکەیی و هاوچەرخیان نیە.

جەختی نیچە لەسەر ژیان لە" ئاسۆی ژیان"، ڕێگەی خراپ تێگەیشتن دادەخا و وادێتە بەرچاو کە ڕێچکەی ئاخێوی هێرمێنۆتیك تەخت دەکا تا سەرەنجام بە باسی گادامێر لە بارەی تێك کردنەوەی ئاسۆکان بگات. نیچە بەردەوام جەختی دەکرد کە ئەوەی دژوارە و بەڕاستی بایەخی ناسینەوەی هەیە، هەمبەری نێوان ژیان و ناسین، یا بەدەربڕینێکی دی نێوان ویستی هێز و ویستی هەقیقەتە. لەبەر ئەم پشت بەستنە بە بەستراوەیی ژیان و زانست، ئەو لەگەڵ شۆپێنهاوێر هاوڕا ببوو کە روانگەیەکی زانستیی پەتی ناتوانێ سەمەد یا سەرچاوەی ئامانجەکانی بوون بێت. رادەری بنچینەیی، وارسکەکان و ئەو ویستاتەنەیە کە ئێمە هەمومان پێکڕا لە ژێر ناوی ژیان کۆی دەکەینەوە. خاڵی گرنگ دۆزینەوەی هاوپێناوی یا هاوسەنگیی

(16) ibid, P.96.

زانین و ژیانە و ئەگینا کارێکی دژوارنابێ کە بە بێسەرنجدان لەم هەمبەرە خۆمان بە زانینێکی پەتی سەرگەرم بکەین و لە هەرجێ بە پێویستمان زانی دەست بدەینە داهێنانی چەمکەکان و رەخساندنی کاروبارێکی خەیاڵی کە خۆمان ناونیشانی هەمدیس دەرکەوتەکانی کەتوار بەوان دەدەین. نیچەی لاو لەو باوەڕەدابوو کە هاوسەنگیی نێوان دانایی و ژیان شتێکە کە لە سەردەمی ئێمەدا لە کیس چووە. ئەمرۆکەش زۆر لە خەڵك و هەروەها پسپۆڕان لەگەڵ ئەرەستۆدا هاوڕان کە سەمەد و پاڵنەری سەرەکیی دۆزینەوەی راستیی زانستی خودی هەقیقەتە و ئێمە تەنیا لەبەر چێژی وەدەست هێنانی زانین خۆمان بە زانینەوە سەرقاڵ دەکەین. ئەوان پێوەندیی تێکچڕژاو، چەند لایەنە و شاراوەی نێوان دۆزراوە زانستیەکان و ژیان وەلادەنێن و لێرەوە دەکەونە هەڵەوە. نیچە ئەم سەمەدی وەدەستهێنانی زانین سەبارەت بەخۆی بە"وێرانگەر" ناودێر کرد و بەشێوەی هەمیشەیی خۆی لە رێکەوەندێکی هەڵخرێنەرانە دا نووسی: ئامانجی زانست وێرانیی جیهانە"[١٧] ئەمە یەکەمین رەخنەکاریی بێ بەزەییانەی نیچە لە ئاخێوی زانستی و پێشکەوتنی هەنوکەیی زانستە.

ئەم ژیانە کە پەیتاپەیتا خۆی بەسەر باسی فەلسەفی دەسەپێنێ، چیە؟ ئایا دەتوانێ واتایەکی جگە لەهەمان گۆڕانی پەیتاپەیتای هەبێ کە فەیلەسوفانی پێش سوکراتیی یونان و بە تایبەت هێراکلیت دەیانهێنایە گۆڕێ؟ ژیان کە گۆڕان و کرانی سەرەمرە و پەیتا پەیتایە، بێمانا و پەیتاپەیتا دەنوێنێ. دەتوانی وەکو هێگل لەبۆی رێچکەیەکی روو لە فراژووبوون بکێشێتەوە، وەلێ بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە دەبێ بتوانی خۆت لە دەرەوەی ژیانەوە بنەجێ بکەیت، یا خۆ دەبێ دڵنیابیت کە لە دوایین خاڵی ئەم "فراژووبوون"ە داین. هەڵبەت لەمەی دواییشدا، هەروا جێی ئەم گومانە دەمێنێتەوە کە ئاگاداریی ئێمە لە ژیان دەتوانێ نەك سەرلەبەری، بەڵکو لە بەرجەوەنی هەمان قۆناخی بنەتایی بێت و بەس. بەهەرحاڵ، ئێمە نە لە دەرەوەی ژیاندا جێ دەگرین و نە لە پلەی کۆتاییی ئەو ژیانە داین کە بتوانین دوایین واتای فام بکەین. هەر هەواڵێك لەو (ژیانە) دەدەین بە دەستەوە، تەنیا بۆچوون، چاوەڕوانی، لێڕادیتن و شتێکە لە خۆوە و پڕکەمایەسی و ناپوخت.بونیادی تراژێدیی یونانی هەر ئەم درك پێکردنی لایەنی ناپوخت، بێسود و پووچی ژیانە، کە نیچەی لاو لەو بەناونیشانی" دیناوی پووچبوونی ترسهێنەری ژیان" دواوە. ئاوەزباوەڕان لە رۆژگاری سوکرات، تاکو ئەمرۆ، لە جێی تێگەیشتن لەم لایەنەی ژیان بەردەوام

---

(17) ibid, p.98.



شتانێکیان داوەتە پاڵی و تێکۆشاون تا ژیان ماقووڵ و شیاو نیشان بدەن. بەڵام لە ئاخێوی دینی و فەلسەفیدا باسەکە بەردەوام بۆ ناماقووڵبوونی ئەم جیهانە گەڕاوەتەوە. مەسیح بە بەڵێندان بە جیهانێکی دیکە، لە راستیدا لایەنی پووچی ژیان لەم جیهانەی پەسند کرد. بەرلەویش لە **چاخی کۆن(کتێبی پیرۆز)** ژیان "پووچەڵی پووچەڵەکان" ناو لێنرا بوو،[١٨] ئاخێوی دینی ئەم دنیایە زووتێپەڕ دەزانێ، چونکە لە بەراورد لەگەڵ دنیایەکی دیکەدا ریزبەند دەبێ.ئاوەز باوەڕیی سوکراتی کە ئەم جیهانە پەسند دەکا و پاساوی دەدا و دینی مەسیح کە دنیا رەت دەکاتەوە، هەر دووك بە واتای مەرگی تراژێدی و لە راستیدا بەروبوومی ئەم مەرگەن. عەقڵی مرۆڤ و ئاوەزی تیۆریك یا تیۆریا، دەتوانن تەکووزمەندییەك لەم ئاژاوە و پووچییەدا پەیدا بکەن، هەر بەو جۆرەی کە جیهانی دیکە دەتوانێ وڵامێك بۆ (و لە بەرەنجامدا راڤەیەك) لەم پووچییە ناکۆتایە بەرهەڤ دەکا. بە کۆتاییهاتنی دیتەی تراژیك رێگە بۆ دیتە میتافیزیکییەکان، هەم ئاوەزباوەڕی و هەم تێڕوانینی دینی ئاوەڵا بوو. پەرتووکەکەی نیچە بە چاکی دەکرا لە جێی **"لە دایکبوونی تراژێدی"**، مەرگی تراژێدی ناو نرابا، چونکە نیشان دەدا کە پەیدابوونی ئاوەزباوەڕیی سوکراتی، دوابەدوای مەرگی تێڕوانینی تراژیکی ژیان سەری هەڵداو لە جێی کەتواری تاڵ و پڕ پەژارەی ژیان، ژیانێکی خەیاڵی و ئەفسانەیی، بەڵێنێك بۆ خۆش بژێوی و بەختەوەری رەخسا.بە مەرگی تراژێدی ئەم باوەڕە کە تێکڕای مەتەڵەکانی جیهان سەرەنجام چارەسەردەکرێن و ئەدیپۆس دەتوانێ بەرسڤی هەمو شتانێك بداتەوە، گوڕوتینی سەند.[١٩] بەڵام ئەو باوەڕەی کە هەموو شتێك چارەسەرهاتوو لەقەڵەم دەدا، رێخۆشکەری نیهیلیزمە، رەنگە بەجۆرە بتوانرێ رازی گەڕانەوەی نیچە بۆ فەرهەنگی یونانییەکان تێبگەین. ئایا ناتوانین بێژین کە ئەم باوەڕەی نیچە کە ئێمە لەگەڵ زانستگەرایی و ئاوەز باوەڕیمان لە شیپانەی نیهیلیزمدا راوەستاین، تەنیا بەرەنجامی دوایین هزرەکانی فەلسەفیی ئەو کە لە دوایین یاداشتەکانیدا تۆمار کرابن نیە، بەڵام ئەو لە هەمان سەرەتای کاری فیکریی خۆی دەستی پێڕاگەیشتوو؟ ئەگەر لەم روانگەوە **لەدایکبوونی تراژێدی** بخوێنینەوە دەبینین کە مەرگی تراژێدی دەسپێکی نیهیلیزمە.بەم چەشنە،سەرنجی نیچە بۆ یونانی کەونارا واتایەکی تازە پەیدادەکا؟ تێهزرین لە تراژێدی یونانی و جوانیناسیی یونانی لە شیپانەی مەرگی تراژێدیدا، یاریدەمان دەدا تا تێبگەین کە لەگەڵ

---

(١٨) **کتاب مقدس، عهد عتیق**، لندن، ١٩٠٤ م، کتاب جامعه، باب اول، صص ٩٨٦-٩٨٧

(19) Nietzsche, the birth of tragedy , p.18.

نهیلیزمی ناخمان هەنوکە چۆن بەرەوڕووبین. چۆن بگەڕێیینەوە بۆ ژیان، بە رۆژێکی تازە کە زەردەشت لێی دەدوا. بە ویستی هێز، بە کەڵە مرۆڤ، بە مرۆڤێکی بەشکۆتر کە بە قسەکردن لە بارەیەوە دەبێ لە بازاڕ بچیتە دەرێ و لە پرتەو بۆڵەی خەڵکان گەڕێی و لە یەکسانخوازیی ئەوان و لە ئاوەزباوەڕییان روو وەربگێڕیت.[٢٠] ئەو کێشانەی کە نیچە دەیانخاتەڕوو کێشەکانی سەردەمی ئێمەن. ئەگەر ئێمە بگەڕێینەوە لای تراژێدی لەبەر ئەمەیە کە بیستن و فامکردنی وڵامەکانی تراژێدیی یونانی لە رۆژگاری ئێمەدا چەندقات ئاسانتر لە وڵامگەلی دەقەکانی دیکەیە، چونکە جۆرێك هاوکاتی لەنێوان سەردەمی مەرگی تراژێدی و سەردەمی نهیلیزم وەبەرچاو دەکەوێ. کاتێك کە نیچە دەپرسێ: " تراژێدیی یونانی چیە؟" لە راستیدا پرسیاری ئەو بەم واتایەیە: تراژێدیی یونانی بە چ کەڵکێکی ئێمە، لە رۆژگاری نیهیلیزمدا دێت؟ بەم چەشنە، ئێمە هەمبەرێکی نێوەکی لە نێوان ئاسۆی ژیان، نیهیلیزم و چەمکێکی سەلمێنەیی کە لە ژیانەوە ئاخێز دەکات دەبینین.

## (٣)

خاڵگەلی گرنگ کە نیچە لە دەسپێکی کاری فیکریی خۆیدا لەمەڕ" ئاسۆی ژیان" هێنابوویە پێشێ، وەکو هێڵێکی سوور لە هەر چییەك کەلەودا نووسی بەدی دەکرێ. لە بەستێنی ئاسۆی ژیاندایە کە ئێمە دەناسین و راڤە دەکەین. ئاسۆی ژیانی رۆژانەی ئێمە و فەرهەنگ و هەڵکەوتگەلی تایبەتی کۆمەڵایەتیی ئەم ژیانە بواری راڤەکانی ئێمەن، بەڵام هیچکام، بە بونیادی راڤەکانی ئێمە ئەژمار ناکرێن. بونیادی راڤەکان، پاڵنەری سەرەکی و سەمەدی ژیانیان شتێکی دیکەیە. پاڵنەری ژیانی راڤەکان ویستی هێزە، هەرچەند بە زۆری ئەم خاڵە بە وردی و بە زراڤی بە شاراوەیی دەمێنێتەوە. لەسەر بنەمای ئاسۆکانی ژیانێکی تایبەتە کە راڤەکانی ئێمە لە جێی ئەوە کە وەکو شتێك کە بەڕاستی هەن(واتە وەبەرهاتوەکانی ویستی هێز) ناودێردەکرێن، شتانی دیکە، بۆ نموونە بە بەرەنجامەکانی ویستی دانایی ناو دەردەکەن. ئاسۆی ژیانی ئەمڕۆیی ئێمە، کە نیچە بە ئاسۆی نیهیلیستی ناودێری دەکرد، وارسکە یا ویستی سەرتربوون و پاڵنەری پڕگۆڕ و سەرمەستیی ژیانی بە "ویستی دانایی" ناودێر دەکرد.ویستی سەرتربوون لە بەستێنی ژیانی رۆژانەدا لەنێوناچێ، بەڵام لە

(٢٠) نیچە، **چنین گفت زرتشت**، ص٣٠



شاراوەگەریی بەردەوامدا، بێبار و نیچە گوتەنی "بێخوست" دەبێ. دواین مرۆڤ تەنیا بە دروستکردنی رێساکان تێر دەبێ، نەك بە دەستڕاگەیشتن بە دانایی راستەقینە.رێسا هیچ نیە مەگەر کەمکردنەوەی هەمەلایەنیی خاڵی نامۆ و نەناسراو بۆ بەرتەسکی و چوارچێوەداریی چەمکیی شتێکی ئاشنا.ئەرکی هەر راڤەیەك، لە خۆیدا گەڵاڵەی ناکۆتایی رێساکانە. لەم روەوە ناتەبایی راڤەکان وەکو هەرامەیەکی هەرەپێویست و لێ دەرباز نەبوو و لە جەرگەی ئەم راڤەیەدا وەشێراوە. هەرشتێك کە شیانی راڤە بێت، بە رووی بێبنەتایی راڤەدا ئاوەڵا و کراوەیە و دەبێ بەرگەی ئەو هەموە بگرێ. دەتوانین مەسەلەکە وەها بێنینە ئاراوە: هەر راڤەیەك لە شتێك رێخۆشکەری ئاسۆی بەرینی واتاکانە و بێسود دەبێ کە یەکێك لەم واتایانە وەکو واتای خودێتیانەی ئەو شتە گریمان بکەین و وەها بیناسێنین. ئەم پشت بەستنی هەر راڤەیەك بە راڤەکانی رابردوو دەبێتە هۆی ئەوە کە بتوانین بێژین ناسین تەنیا بە واتای توانایی دەربڕینی شتێکی تازە و نەناسراو بە زمانی شتێکی کۆن و ئاشنایە.[٢١] ئاسۆی ژیانی مرۆیی بوارێکە کە تێکڕای بیچمەکانی دانایی مرۆڤ لە سەری رۆنراوە. زانین لە کەتوارەکان دروست ناکرێ، بەڵکو لە راڤەکان بیچم دەگرێ: "لە دژی پۆزەتیڤیزم کە لە بەرانبەر دیاردەدا رادەوەستێ ـ (ودەڵێ:) "تەنیا کەتوارەکان هەن" ـ من دەڵێم: نەخێر، کەتوارەکان بە وردی هەمانن کە هەن، تەنیا راڤەکان لە گۆڕێ دان. ئێمە ناتوانین هیچ کەتوارێك "لە خۆماندا" ساوکە بکەین، لە بنەڕەت را رەنگە شێتی بێ کە بمانەوێ وەها کارێك بکەین".[٢٢] نیچە لە **ویستی هێز** دا دەڵێ کە ئێمە شتێك لە جیهان بە واتای کتومتی وشە ناناسین، بەڵکو هەموو شتێك بە کردەی راڤە، راڤە دەکەین، لە راستیدا دەمانەوێ هەموو شتێك دەستەمۆ و ماڵی بکەین. تێدەکۆشین تا لە رێگەی راڤەوە لە بێگانەییو سەمەرەیی شتەکان نکۆڵی بکەینو بیانخاینە خزمەت خۆمانەوە. لەم روەوە راڤە هەمان ویست سالارییە،[٢٣] کە لە کردەدا دێتە دی: "تێکڕای دەزگای دانایی ئێمە دەزگایەکە بۆ ئەبستراکت کردنو سادە کردنەوە... لە پێناوی خستنە ژێر رکێفی شتەکان".[٢٤] کرۆکی سەرەکیی سەمەد و پاڵنەری زانین

(21) F.Nietzsche, The Gayscience, tra.w.kaufmann, New York, 1974,PP. 300-302.

(22) F.Nietzsche, The will to Power, trons.w.koufmann, New York, 1968, P.267.

(23) ibid, P.342.

(24) ibid, P.274.

وەدەستخستنی سالاریو هێزە. فراژووبوونی دانایی مرۆڤ دەبێ وەکو بەرەنجامی ویستی هێز بزانرێت، ویستێك کە لەگەڵ ژیاندا هاویەك دەبێو بەوەوە مرۆڤ باڵادەستیی خۆی بەسەر جیهاندا زیاتر دەکات:"زانین چەشنی ئامرازی هێز کاردەکا، واتای"زانین" لێرەدا وەکو خاڵگەلی "چاکە"یا "جوان" دەبێ بە بیچمێکی راشکاو و موئەنگێو، مرۆڤ تەوەرانەو بیۆلۆژیك بێ. بۆ ئەوەی کە چەشن (بوونەوەری زیندو) بمێنێتەوە و هێزی خۆی زیاتر بکات، دەبێ کارێك بکات کە هەڵێنجانی ئەو لە کەتوار لەگەڵ هۆکارگەلی راوڕایەڵپەسند فام بکرێتو دەبێ بتوانێ گەڵاڵەیەکی رەفتاری بێنێتە ئاراوە".[٢٥] ئێمە ناسینو فامکردن بەواتای ئاسایی ژیانی رۆژانە، واتە ئاشنابوون لەگەڵ شتێك، بە کاردەبەین، بۆ نموونە دەڵێین کە شتێکی ئەم دنیایە شیانی ناسینە. بەڵام ئەو شتە تەنیا شیانی راڤەیە، لە راڤەدا و بە راڤەوە ئاشنایی دەدەینە پاڵ دنیا. وەك بڵێی ئەو شتە واتایەکی نێوەکی هەبووە و هەنوکە پەیمان پێ بردوە. راڤە ناسینی ئێمەیە لە هەر شتێك و لە جیهان. تەنیا دەبێ پەسند بکەین کە راڤە یا ناسینی ئێمە خدەیەکی کاتی هەیەو شتێکی لواو، تایبەتو گوزەراوە. لەم دۆخەدا بۆ ئێمە رۆشن دەبێتەوە کە دنیا "واتایەکی لە پشت خۆی حەشار نەداوە، بەڵکو واتاگەلی بێئەژماری هەیە".[٢٦] چەمکگەلی وەکو "زانینی خۆمەش"، "ئاوەزی پەتی" و چەمکگەلی لەم تاقمە وەکو ئەفسانەی پەتین، کە ئەگەر بە واتای میتافۆریك بە کار نەیەن، نەك تەنیا بێ واتا، بەڵکو ترسناك دەبن. لە سەر بنەمای وەها چەمکانێکە کە ئێمە "دەستەبەرێك" لەمەڕ زانینی خۆمان وەدەست دێنینو لەبەرئەوەی کە ئەم دەستەبەرە بۆ پەیداکردنی هێزی خۆمان پێویستمانە، سەرەمرە هەوڵ دەدەین تا "ناکۆتایی راڤەکان" لەیادبکەین، یا بێ بایەخ نیشانی بدەین.[٢٧] لەگەڵ وەها چەمکگەلێکە کە ئێمە ئەفسانەی بزاوتی بەرەبەرەی خۆمان بەرەو ناسینی رەها و تەواوی هەمووشتێك دەخولقێنین، ئەفسانەیەك کە بنچینەی هەڵێنجانە "زانستی"یەکانی ئێمەیە.

ئەگەر ئەو شتەی لە برگەی ٦٠٠ی **ویستی هێز** دا هاتوە راست بێ کە:" هیچ ئاستێك بۆ ئەو رێگانەی کە لەواندا جیهان دەتوانێ راڤە بکرێت، نەبووە و هەر راڤەیەك هێمایەك لە

(25) ibid, P.266.

(26) ibid, P.267.

(27) Nietzsche, The Gay science, pp. 336-337.



گەشە یا تیاچوونە"،[٢٨] لەم دۆخەدا دەبێ پەسند بکەین کە تەنیا راڤەگەلی پشت بەستو بە بەرجەوەنە بەرتەسكو سنوردارەکان، تایبەتودیاریکراوەکان هەن. لەم دۆخەدا هەمەکێتیی جیهان لە جێی "ئارایی" ماتریالیی خۆی، هەر ئەم کۆماگی رێکەوتەیی راڤەکانوگێڕانەوەکان دەبێت. ئەوکات، جیهان چیدی هەرامەیەك، داتایەك، هایدنێکی راستەقینە ئەژمار ناکرێت، بەڵکو بەو چەشنەی کە بە راستی هەیە، بە مانای ئەفسانەکانو راڤەگەلێکە کە هەرکامیان هەواڵدەری گەشەیەك یا تیاچوونێك، دەبێت. واتا یا هەقیقەتی جیهان شتێك نیە کە لە جێیەك لە دەرەوەی مندا هەبووە، یا دەسەلاتێك بەرلەوەی من دەست بەم تاوتوێیە بکەم لە نێویدا چاندبێتی. واتا شتێکە کە من لەسەر بنچینەی گەڵاڵەیەك دروستی دەکەم کە خۆیشی راڤەیەکە لە جیهان و ویستی هێز ئاشکرا دەکا. هەر واتایەك دەربڕینی پێویستیی هێز و داخوازیەتی و لە خۆیدا گەڵاڵەیەك بۆ خستنەگەڕی هێزی لەگەڵدایە. واتا لەبەر هێز هەیە. کاتێك دەڵێین کە "راڤە بانهەڵکشانێکی ناکۆتایە"یا "کایەی راڤەکان ناکۆتایە"، لە راستیدا نیشان دەدەین کە راڤە بانهەڵکشانی پەیتاپەیتای دیاریکاری و سەلماندنی ژیانە. هەر بەو چەشنەی کە ویستی هەموو کەسێ بۆ هێز بێکۆتاییە.

هەقیقەت بە ژیانو بەرجەوەنی هەرکام لە ئێمە لە ژیان بەستراوە. دەقاودەق لە بەر ئەم بەسترانەوەیە کە باسەکە بەشێوەیەکی لەچارەنەهاتو خدەی فەلسەفی پەیدادەکا و بە هایدنناسییەوە پەیوەست دەبێت. ئێمە بە راڤەوە واتا بە ژیان دەبەخشین. هەر راڤەیەك هێمایەکە لەسەر سنور یا ئاسۆی ژیانی راڤەگەر. بەڵام ئەمە هەمو مەسەلەکە نیە. دڵکێشبوونی چیرۆکەکە لێرەدایە هەر راڤەیەك لە هەمان کاتدا دەتوانێ ئەو سەرسنورە یا ئاسۆی دانایی راڤەگەر بەرین بکاتەوە و رێچکەو شێوەکانی هەبوونی ئەو بگۆڕێت. بەم پێیە راڤەی رووداوێك یا ئەزموونێکی هایدنناسانەیە. دەقو راڤەگەر، هەر کام لەم کردە راڤەییانە ئاسۆی ژیانێکی دیکە بەرین دەکەنەوە. لێرەدا دەق دەبێ بە واتای هەمەکیو خوازەیی بە کار بەریت. "دەق" رۆشنگەری جیهانە و هەروەها وزەی جیهان و کردەکانو ئاخێوەکان، رووداوەکان، باوەڕەکان، زانراوەکانو لەم نێوەدا هەر چییەك بە واتای تایبەت دەقە. بە رێکەوت نەبوو کە نیچە لەمەڕ راڤەوە زیاتر وشەی ئاڵمانیی ausLegung بەکاردەبرد، کە بە واتای لێکدانەوە یا باسلێکردنی دەقەکانو بە شێوەیەکی تایبەت دەقگەلی سپیتا و بە

(28) Nietzsche, The will to Power, P.326.

تایبەت **کتێبی پیرۆز** بەکاردەهات. نیچە خدەی مەتەڵ ئاسای ژیان، وەکو هایدنێکی یەکانگیر لەگەڵ بنەواشەی ویستی هێزی هێنانە پێشێ. بە رای ئەو، هەر ئەم خدە مەتەڵ ئاسایە بۆ هەر راڤەیەکی مرۆڤ لە شتانو رووداوەکانیش بەرین دەبێتەوە. لە دیدی نیچەوە هایدن وەکو شتێکی راڤەکراو، سەر هەڵ دەدا و لە رێگەی راڤە و بە هۆیەوە، بیچم دەگرێ. راڤەگەلێ کە بە هایدن بیچم دەدەن، هەرکامیان بەردەوام راڤەی راڤەیەکن و هەمدیس ـ بەیانگەرن. راڤەی بنەتایی‌و خودێتییانە دەقاودەق لەبەر ئەم هۆیە هەرگیز وەدەستهاتوو نیە. هایدنناسیی نیچە، لە هایدنناسیی ئەفلاتونی، لەم رێگەیە دادەبڕێ کە ئیدی "یەزداناسیی نەرێنی" نیە، یەزداناسییەك کە لەودا هایدن بە تەواوی بە شتێکی دیکە دەزانرێت و هەرگیز بە دووشتی هاوسان ئەژمار ناکرێن. نیچە واتای رازئاسای هایدنی چەشنی شتێکی دیکەو نەناسراو بە واتای هایدن چەشنی راڤە و چەشنی ویستی هێز گۆڕی. ئەو لە وردبوونەوە لەهەمبەری راڤە و ویستی هێز بەم بەرەنجامە گەیشت کە هایدن کۆمایەك لە نیشانەکانە کە تەنیا لە راڤەکاندا بوونیان هەیە. نیشانە، یەکبوونو فرەفاقی لەسەر بنچینەی ئەویدیبوون و جیاوازی رۆدەنێ. واتای هەر نیشانەیەك نیشانەیەکی دیکەیە. هەر راڤەیەك رێگە بۆ راڤەیەکی دی خۆش دەکا. راڤەی ئەو شتەی کە تاقانەیە، فرەفاق دەخاتە روو و بە پێچەوانەوە ئەو شتەی کە فرەفاقە، پوختو سادە دەکاتەوە. راڤەو هایدن هاوشێوەن و ئەگەر لە زاراوەیەك کە نیچە لە **زانینی شاد** دا هێناویەتی، لەوێدا کە لە برگەی ٣٤٤ لە ئۆلیس دەدوێ، کەڵك وەربگرین، هایدن "بێ ئەژمار ئاسا" (polytropoi) یە.[٢٩] لایەنەکان، پێچو لۆچەکان، فێڵو تەڵەکەی بێ ئەژماری هەیە، وەلێ هەمدیس تاكو تەرا دەنوێنێ. بەم چەشنە نیچە رێگە لە بەردەم فرە فاقێتی ئاوەڵا دەکا و لە هەمان کاتدا پێداگری لەسەر گرنگیی زمان دەکا کە راڤەکان پێکەوە کۆدەکاتەوە و بە یەکتایی جیا لە فرەچەشنیی ناکۆتای ئاماژە لواوەکان، بیچم دەدا.

نیچە نووسیویەتی کە هەر راڤەیەك لە "تێکۆشان بۆ سالاری بەسەر دەق" بیچمی گرتوە،[٣٠] وەلێ راڤەکار کێیە؟ پاڵنەرێکی چالاك لە پەیکەربەندیی هەرەوەزیی هێزەکان کە دەتوانێ بە راڤەکار ناودێر بکرێت و سەرەڕای هەڵکشانو داکشانەکانی، یەك "خود"، یەك "من"، یەك جەستە، یەك خۆیە؟ کێ راڤە دەکا؟ نیچە وەڵام دەداتەوە: پاڵنەری چالاکی ئێمە. راڤەی دەق جیهان واتە هایدن بە جەستەوە گرێ دەدا، (واتە) بە تەواوەتی جەستە ـ دەرون، کە دەربڕی پاڵنەرە سەرەکی‌و چالاکەکانی ئێمەیە. نیچە لە "سوكوهەرزەنواڕانی جەستە" لە **وەهای گوت زەردەشت** دا نووسیویەتی:" جەستە ئاوەزێکی گەورەیە، فرەییەك لەگەڵ یەك واتا، جەنگی و ئاشتییانە، مێگەلی و شوانکارەیی. گیانی ئاوەز بچووکە، ئامرازێك بۆ ئاوەزی گەورە، واتە جەستە".[٣١] راڤەی هەمەکی، ئەبستراکت، تێکراییبوونی نیەو ئەوەی خۆی وەها وەدیاردەخا، بۆ نموونە "روونکردنەوە" (erklarung) ی زانستی، کە نیچە بانگهێشتی ململانێی کرد، تەنیا بیچمێك لە راڤەیە کە لەودا تاکێتی بە سەر فرەفاقێیتیی بەرجەوەنئاسای پاڵنەرە چالاکەکان زاڵ دەبێت. روونکردنەوە، بە پێچەوانەوە، وەستاوە، شتێکی لە باردا نیە، ئەبستراکت، "هیچ کوێی" و بەرهەستە، جۆرێك بێلایەنیی لەرزۆك رادەگەیەنێ. بەڵام هەر راڤەو هەر بەرجەوەنێك لایەنگریان هەیەو ئەمە خدەی تایبەتو رەسەنیانە. لە دیدی نیچەوە ژیان بە راڤە وەکو شتێکی تاکەکەسی، دیاریکراو، گوزەریا، وەبارهێنو فرەفاق بیچم دەدا، لە حاڵێکدا کە زانین، لەودا هەموانیبوونی ئەبستراکتی خۆی، بەردەوام بە کەتوارێك، کەتوارێك وەکو مەرگ گرێ دەدرێ. بە رێکەوت نیە کە فەلسەفەی نیچە لەمەڕ راڤەوە، لە هەمان کاتدا، لەبارەی پەسند و پەسنی بێدرێخی ژیان، جەستە، وەبارهێنان، فرەفاقێتی، مەتەڵەکان، سیمبۆلەکانو کرانەکانە. لە فەلسەفەی راڤەی نیچە دا، خاڵی تاقانە، بە یاریدەی میتافۆری راڤەیی، بە فرەفاقێیتی هەمەکیی دەربڕینە فرەفاقەکانو واتاگەلی سیمبۆلیك واتە بەردەوام (هەر شتێك) دەگۆڕێت بۆ ئەویدی. هەرشتێکی هەستپێکراو، دیار و تەرا تا ئەو جێیەی کە راڤەهەڵگر بێت، بەرەوڕووی مەرگو ئەبستراکتگەراییی تیۆریك دەوەستێ. ئەمە راڤەیە کە بۆ بوون دەرەخسێنێ، تا هەبێو واتاکان بەرهەڤ بکا. بەم چەشنە، راڤە لە بەرهەمەکانی نیچەدا، سیمبۆلی ژیان چەشنی وەبارهێنان و کرانە.

## ٤

(29) Nietzsche, The Gay sciece, PP.280-283 .

Polytropoi کە لە دەقی برگەی ٣٤٤ی **زانینی شاد** ی نیچە بە یونانی هاتوە، لە یەکەمین دێڕی **ئۆدیسەی** هۆمیرۆس بە سیفەتی ئۆلیس زانراوە. ئۆلیس لەگەڵ ئێجگار تەڵەکەی ژیان بەرەو ڕوو دەبێو ئێجگار شێوەکانی ژیان تاقی دەکاتەوە.

(30) Nietzsche.The will to pawer,p.342

(٣١) نیچە، **چنین گفت زرتشت**، ص ٤٥.

له نیگای یەکەمدا، باسی نیچە لەمەڕ "بەرجەوەنگەرایی" باسێکی ئێجگار سادە وەبەرچاو دەکەوێ. هەرکام لە ئێمە بە پێی پاڵنەری ویستی هێز و لە بنەتادا، بە پێی پێداویستییەکانی جەستەی کارناسانەمانو بەرەنجامگەلی ئاگایانەو ناخودئاگایانەی و لەسەر بنەمای بەستێنی ژیانو داناییەکانی سەردەمەکەمان، گەلاڵەیەك لە شتان دادەڕێژین، بۆ نموونە گەلاڵەگەلی ڕەوشتیو گەلاڵەگەلێ بۆ ژیانی سادەتر و "سەرکەوتووتر". لە سەر بنەمای ئەم گەلاڵانە کۆمەڵە ڕاڤەیەك لە شتەکان دەخەینە ڕوو کە بەر لە هەرشتێك دەبێ بە کاری خۆمان بێن، ژیانمان ئاسانتر بکەن، نرخاندنەکانمان پاساو بدەنو بەرسڤی ویست سالاریی ئێمە بدەنەوە. نیچە ئەم خاڵەی وەها کورت کردۆتەوە کە هەرکام لە ئێمە، لە سەربنەمای "بەرجەوەنی خۆمان لە ژیان"، ڕاڤەگەلێ لەشتان دەخەینەڕوو. لەبەرئەوەی کە بەرجەوەنەکانی ئێمە یەك جۆر نینو ناتوانن تیکڕا لەگەڵ یەکدا یەکانگیر بن، ئەو ڕاڤانەیش کە لە شتێکی یەکبوو دەیخەینە ڕوو هاوسانو هاوپێناوی یەکدی نینو تەنانەت دەتوانن لەگەڵ یەکدیدا ناتەبایی، باشار و یا پێکدژ بن. هەمدیس لەبەرئەوەی کە ئێمە پێوەرێك لە دەرەوەی بەرجەوەنی مرۆیی خۆمان لە بەر دەستمان نیە تا بتوانین ئەم ڕاڤانە لە سەر ئەو بنەمایە هەڵسەنگێنین. هەرکام لە ئێمە ڕاڤەکانمان لە ژیانی خۆمان وەدەست دێنینو بە کردەوە ملکەچی فرمانی برەوداریو ڕێژەیی نواڕینانەی فرەیی هەڵێنجانەکان دەبین.

ئەگەر دیتەی بەرجەوەنیی نیچە تەنیا بەم واتایە بناسین کە ناتەبایی لە ڕاڤەکاندا بەرەنجامی ناتەبایی لە بەرجەوەنەکانە، دەبێ دان بەوە دابنێین کە نیچە چەندان دوورتر لە جێیەك نەچووە کە کەڵکەڵە ڕێژەیی نۆڕینانەو ئەپستمۆلۆژیکەکان دیکارت، هیومو (کانت) یان بەو جێیە گەیاندوە و گەر وابێ هێشتا ئێجگار دوورە لە لوتکەکانی باسی مۆنتنی لەبارەی ئەزموونی ڕاڤە. وەلێ وەها ڕاڤەیەکی سنوردار کارایییەکی بەرتەسكو سنورداری هەیەو لە بەرگرەوەی بنەمای باسی نیچەش نیە. گرنگیی کاری نیچە لەوەدایە کە زانیویەتی "درۆ لە بەر ئەم هۆیە هەرگیز لە هەقیقەت نزیك نابێتەوە (چونکە) هەقیقەت بوونی نیە".[٣٢] هەقیقەت زادەی زمانپاراویی ئێمەیە و خۆمان دەیخولقێنین، چونکە ڕاڤەگەری دەکەین، دەمانەوێ بناسین، بایەخدۆزی دەکەینو پێویستیمان بە سالاری هەیە. هەقیقەتو ڕاڤە ئامرازی سالاریو دڵبژۆکیی دەسەڵاتی ئێمەن:"ئەمە پێویستیی ئێمەیە کە جیهان ڕاڤە

(32) Nietzsche, The will to Power, P.330.



دەکات: پاڵنەرەکانی ئێمە و ڕەزامەندییەکانو ناڕەزایەتییەکانی ئەم پاڵنەرانە. هەر پاڵنەرێك جۆرێك دڵبژۆکیی دەسەڵاتە، بەرجەوەنی خۆی هەیە، کە دەیەوێ تێکڕای پاڵنەرەکانی دیکە ناچار بکا تا وەکو نۆرم قبووڵی بکەن".[٣٣] ئێمە هەقیقەت ناناسین، بەڵکو بایەخڕۆنەری دەکەین. ئێمە لەم کارەشدا خاڵگەلی سەرەکیو شکۆمەند لە یاد دەکەین. بۆ نموونە، ورد نابینەوە کە بایەخی هەرهەقیقەتێك بە پێی دژواریی دانەدوکردنیو سەختییەکانو ڕەنجەکانی پاشباری، ڕێژەییە. هەر کات هەرامەیەك لە هەلو مەرجێکی ئێجگار نالەبار و بەدەر لە وزەی مرۆیی تاقی بکرێتەوەو بە چاك بزانرێت، چاك دەبێت.

بە ڕای نیچە، "ناسینی هەقیقەت" بە لای مرۆڤەوە بێ واتایە. هەقیقەت بە مەرجێ دەبوو کە ژیان "هەبوون" بایە. بەڵام ژیان "کران"ە، واتە لە دۆخی گۆڕانی بەردەوامدایە و ئیزن نادا کە شتێکی نەگۆڕ و وەستاو لە ژێر ناوی هەرامەیەکی هەرمان بناسێنرێ. بانگەشەی ناسینی هەقیقەت بە نکۆڵی لە ژیان دەلوێو خۆی یەکێك لەو تەڵەکە و چاوبەستە کارامانەیە کە ژیان "بۆ ئامانجگەلێ کە بە لامانەوە ناڕۆشنن" بە کاریان دەبات. خەڵکان هەقیقەت دەئافرێنن و دادەهێنن، بەڵام ناتوانن بشارنەوە کە ئەم کارە تەنیا لە ڕێگەی دەربڕینی بەرجەوەنێکی تایبەتو لە بەرەنجامدا بەستراوەبە پاڵنەرەکانو وزەگەلی ژێنەرانەی تایبەت و نەك گشتی،دەلوێ. تاکەکانی مرۆڤ لە پایەی بوونەوەرانی زیندوو کە لە بەندی هەلومەرجی بنەڕەتیی ژیاندا هەن، هەقیقەتیان لە ڕوانگەی ئەم بەندانەی ژینی خۆیانو ئەو شتەی بۆ ژیان بەسود و پێویستنو ئەو شتەی لە هێزی کۆتەکان کەم دەکاتەوە، بە پێویست دەزانن. ئەم بەرجەوەنەی ئەوان بۆ هەقیقەت، بە واتای دروستکردنی لە ڕێگەی زمانەوەیە و ڕوانین بۆ "شتێکی" پێشتر هەبوو نیە. هەقیقەتەکان بە بارتەقای هەقیقەتەکان زۆر و زەوەندنو ڕاڤەکان بە هەمان بارتەقای بەرجەوەکانمان فرەڤاقن. هەرکام لە ئێمە جیهان بە پێی داخوازو بیچمێکی سەرهەڵدانی تایبەت لە فرمانێکی پاڵنەرانە یا ئاوێتەیەکی تایبەت لە پاڵنەرەکان دەناسین یا ڕاڤەی دەکەین. نکۆڵی لەم هەمە چەشنییەو گۆڕینی هەموو شتێك بۆ ڕاڤەیەکی بنەتایی و "ڕەسەن" کارێکی سەرکوتکەرانەیە. لە پێشگوتاری **لەسەرویچاکەوخراپەوە** دەخوێنینەوە: "دەبێ دانبەوەبنێین کە خراپترین و درێژخایەنترین و ترسناکترین هەڵەیەك کە

(33) ibid, P. 267.

ئێسته(فەیلەسوفان) *کردویانە، هەمان هەڵەی چەقبەستو بووە، واتە داهێنانی رۆحی ئەبستراکت و چاکەی پەتی بە دەستی ئەفلاتون. بەڵێ! ئێمە هەنوکە کە لێی تێپەڕیوین، هەنوکە کە ئەوروپا لەم مۆتەکە (گیانێکی هاتۆتەوە بەرو)* هەناسەی ئۆخژن پیاهاتنەوە دەکێشێ و لانیکەم لە خەوێکی بێخەوش سودمەند دەبێت، ئێمە، کەسانێك کە ئەرکی سەرشانمان بێدارمانەوەیە، میراتگرانی تێکڕای ئەو وزەیەین کە بەرەنگار بوونەوە لەگەڵ ئەم دواندەرییەی لێکەوتۆتەوە. بێگومان، باس و خواس لە رۆح و لە چاکە بەشێوەی ئەفلاتون، خاپوورکردنی هەقیقەت و نکۆڵی لە بەرجەوەن (perspektiv)، واتە مەرجی بنەڕەتیی تێکڕای ژیانە".[٣٤]

تێڕوانینێك کە هەقیقەت لەدەرکەوت (نمود) (phenol) پڕبایەختر دەناسێنێ، واتە هەقیقەتێکی رەسەن و تاقانە لە بەرانبەر راڤەگەلی بێئەژماری تاکەکانی مرۆڤ دادەنێ و لەویش بەسەرتری لە قەڵەم دەدا، سەرەتا لەسەر بنەمای پێشداوەرییەکی رەوشتی رۆنراوە" کە کەمتر لەهەر گریمانێکی دیکە لە جیهاندا سەلمێنراوە" و پاشان تێدەکۆشێ تا خدەی سەرکوتکەری خۆی بشارێتەوە. لە بەرانبەر ئەم سەرکوتگەرییەدا، فەیلەسوف جەخت دەکا کە ژیان لە گۆڕێدا نەدەبوو ئەگەر"نرخاندنەکان و دەرکەوتەکانی بەرجەوەنێك" واتە راڤەگەلی بێئەژماری ئێمە لە سەر بنەمای بەرجەوەنەکانمان نیگار نەکرابا.[٣٥] کەسێك کە نکۆڵی لە هەمە چەشنیی وەدەرکەوتنی جیهان بکا و بیەوێ"جیهان دەرکەوتەیی" بە قازانجی هەقیقەتی یەکتا لە نێوبەرێت، گریمان کە لەم کارەدا سەرکەوێ، هەمان" هەقیقەت"ی بانگەشەیی خۆیشی وێران کردوە. نیچە درێژەی دەداتێ و دەڵێ کە هەقیقەت بە دژی باوەڕ بە گوڕوتین و لاوازیی راڤەکان، واتە باوەڕ بەو شتەی شێوەکاران روون- نسێ (سایە روشن) یان پێگوتووە، دروست دەبێ. ئەگەر رەخنەکارێك بڵێت کە بە گریمانی چوونیەکیی هەقیقەتەکان و راڤەکان، هەقیقەتی هەر کەسێك تەنیا" هیی خۆی دەبێت" و رێگەی پێوەندیی نێوان راڤەکان دادەخرێت، نیچە وڵامی دەداتەوە: لە کوێوە دەزانن کە ئەم" هیی خۆ"یە کە بەکاری دێنن

* تێبینی لە نووسەرە

* تێبینی لە نووسەرە

(٣٤) نیچە، **فراسوی نیك وبد**، ترجمەی د. اشوری، تهران، ١٣٧٥، ص.٢.(جەخت لە منە.ب. ئەحمەدی)

(٣٥) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٧٥



راست بێت؟ ئێوە تەنیا لە رێکەوەندە زمانییەکاندا بەکاری دەبەن. هەمان زمانێك کە هەقیقەتی راڤەکانی دروست کردوە. بۆچی لە سازکردنی هەقیقەتدا، کاری زمانتان شێلگیرانە نەزانیوە، بەڵام لێرەدا رێسای رێزمانتان وەها بە شێلگیر زانیوە؟ کەوابوو دەپرسن:"ئایا جێی خۆی نیە کەمێك بە بکەر و هەروەها وەپاڵدراو(مسند) و بەرکار رابوێرن؟ مەگەر فەیلەسوف نابێ خۆی لە ئیمان بە رێزمان سەرتر ببات؟[٣٦]

نیچە لە بڕگەی **٣٧٤ ی زانینی شاد** لە ژێرناوی"بێ بنەتای تازەی ئێمە"دەنووسێ کە ئێمە ناتوانین بەوردی بزانین کە پانتایی خدەی بەرجەوەنی و ئەگەرەکان و بیچمگەلی لە ئەژمارنەهاتوی،کامەیە و ئایا بەڕاستی هایدن جگە لەم بەرینبوونەوەیە خدەیەکی دیکەی هەیە یان نا؟(٣٧) بەڵام ئەمە دەزانین کە تێکڕای هایدن (و ئەو لێرەدا وشەی dasein بە کار دەبات) بە چەشنێکی بونیادیو چالاك سەرقاڵی راڤەیە. هۆی ئەمە کە "تەنانەت لەگەڵ بکارترین* و وردترینو ئاگاترین شیکارییەکانو شیکردنەوەی (خۆ)گەلی هۆشمەندانە"ش ناتوانین پەی بە بارتەقای راڤەکانو بەرجەوەنەکان ببەین، ئەمەیە کە ئێمە لە گەمارۆی بەرجەوەنی خۆماندایین. زیندانیی سوچی تەنگی ژینگە، بەرجەوەن، ژیان، بیچمەکانی دانایی، پێش ـ گریمانەکان، ویستەکانوپێداویستییەکانمان. ئێمە گیرۆدەی کونجکۆڵیی بێ بەروبوومین و پەیتاپەیتا دەمانەوێ بزانین کام لە بوونەوەرانی هۆشمەندی دیکەو کام بەرجەوەنی دیکە دەتوانن هەبن. نیچە نموونە دێنێتەوە کە ئێمە بەردەوام ئاواتمانە بزانین ئایا بوونەوەرانێك هەن کە لە توانایاندا بێ کاتی رابردو یا ئالتەر ناتیڤەکانی رابردو و دواڕۆژ ئەزموون بکەنو لە پێناوێکی دیکە لە ژیان و لەگەڵ چەمکێکی دیکە لە لۆژیك و هەمبەرێتیگەلی هۆ و بەرهۆیی بەسەربەرنو بناسنو راڤەکانی خۆیان لە جیهان بێننە ئاراوە. بەڵام ئێمە هەرگیز ناتوانین شێوەیەکی ژیانی هەنوکەیی جیا لەوەی ژیان بۆ ئێمەی بەرهەڤ کردوە وێنابکەین یا بۆی بچین. مەسەلەی کات کە لە هێمای نیچەدا گرنگیی پەیداکردوە، واتە ئەم خاڵە کە بوونەوەرانی بەدەر لە ئێمە بتوانن لە رابردوی خۆیاندا بژین، یا بە دواڕۆژی خۆیانەوە گرێی بدەن، خۆی بە باشی نیشان دەدا کە لە ئاسۆی فیکریی ئێمەدا، هەر وا سەرەمڕەیی کات واتای هەیەو ئێمە

(٣٦ ) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٧٦

(37) Nietzsche,The Gay science,pp.336.

* بکار: کارآزمودە / بکارترین: کار آزمودەترین. بکار / زاری **هەورامی**

ناتوانین بوونەوەرانێك لە دەرەوەی كات وێنابكەین. لۆژیكێكی دیكە لە هیچ شوێنێك بوونی نیە، مەگەر لۆژیكی ژیانی ئێمە كە لەودا قەتیسین و لەوەوە لەسەر پایەی بەرجەوەنەكانمان راڤەگەلێ دەخەینەڕوو. ئەگەر ژیان ببێتە شتێكی دیكەو پاڵنەرگەلی تازە لە ئێمە بوونەوەرانی دیكە دروست بكەن، ئەوكات رەنگە كۆمەڵە سەمەدێكی تازەو لۆژیكێكی تازە سەرهەڵبدەن. نیچە راست دەڵێ كە ئێمە تەنانەت ئەگەری وەدەست هێنانی ئەم تامسارییە*یە گەمژانەیەشمان نیە كە: "بمانەوێ لەم قوژبنە تەنگەوە فرمان بدەین كە هەمو ئەو بەرجەوەنانە تەنیا لەم قوژبنەوە دەلوێنو بەس. بە پێچەوانەوە، دنیا لە چاوی ئێمەوە بۆتە"بێبنەتا"، لە بەرەنجامدا ئیدی ناتوانین نكۆڵی بكەین كە دنیا دەتوانێ تا بێبنەتا راڤەش لە خۆ بگرێت. جارێكی دی، ئێمە لەم بیرە موچڕكە بەلەشماندا دێت. بەڵام مەگەر كەسێكیش پەیدا دەبێ كە تێبكۆشێ تا بە گوێرەی ئەو مێتۆدە كۆنە، لەم درنجەی جیهانی نەناسراو، بە خێرایی خوایەك بخولقێنێ؟ و لەمە بە دواوە، نەناسراوەكان وەكو "نەناسراوێك" بكاتە پرسیار؟".[٣٨]

نیچە لە بڕگەی ١٥ی **ویستی هێز** دا هەر راڤەیەكی ئاخێزاو لە هاوبەرجەوەن بە "باوەڕ"ێك ناودەنێ. باوەڕ زۆر بە سانایی بە واتای لەبەرچاوگرتنی شتێك بە ناوی هەقیقەتە. هەر باوەڕێك بەو واتایەیە كە ئێمە بەرجەوەنی خۆمان بە راستەقینە گریمان كردووە. نیچە دەڵێ كە تێڕوانینی نیهیلیستی هەمو باوەڕەكان وتێكڕای لەبەرچاوگرتنی شتێك بەناوی هەقیقەت بە چەشنێكی هەرەپێویست بە درۆ دەزانێو بەڵگە دێنێتەوە كە جیهانێكی راستەقینە بوونی نیە. نیچە، بە پێچەوانەوە، ئەم درۆیانە بە پێویست دەزانێ، چونكە هەركامێكیان، واتە هەر بەرجەوەنێك كاتێك بە راستەقینە لە قەڵەم بدرێت، نیشان دەدات كە راڤەگەر "پێویستیی بەم درۆیە هەبووە". بیچمی سەرهەڵدانی بەرجەوەنێك، سەرچاوەكەی لە خۆماندایە (تا ئەو جێیەی كە ئێمە پەیتاپەیتا پێویستیمان بە جیهانێكی داخراوتر، پوختتر و سادەترین) ...[٣٩] ئێمە پێویستمان بە "هەرەپێویستیی درۆكانە". لە خۆمان بپرسین كە بۆچی بەرجەوەنی خۆمان وەها هەڵكەوتوو و دانسقە دەزانین؟ تا ئەو جێیەی كە زۆرجاران راڤەی خۆمان تاقانە راڤەی راستەقینە لە قەڵەم دەدەین؟ مەگەر جگە لەوەیە كە باوەڕمان بە

* تامساری: غرور/ تامسار: مغرور (بادینانی) ـ (باكووری)

(38) ibid, PP. 336-337.

(39) Nietzsche, The will to Power, P.14.



راڤەی خۆمان، پێویستیمان بە راڤەی خۆمان هەیە؟ دەتوانین رەگو ریشەی لە سەرچاوەكەیدا، لە هۆی هێنانە ئارای راڤەكەی خۆمان پەیجۆر بكەین. نیچە لە بڕگەی **٢٥٩**ی **ویستی هێز** دا دەنوسێ كە هەر بەرجەوەنێك "بەرجەوەنی پاراستنی كەسێك، كۆمەڵگایەك، نژادێك، دەوڵەتێك، كلیسایەك، ئیمانێك، كەتوارێك"ە.[٤٠] بۆ سەرتر زانینی ئەمانە، لە بەر قورسو قایمبوونی هێزی خۆمانە كە لە بیرمان دەچێ كە نرخاندنەكانمان، تێكڕای هەڵسەنگاندنەكانمان، گشت راڤەكانو ناسینەكانمان بەردەوام لە روانگەیەكی تایبەتەوە، خراونەتە روو، و بەوبوومی یەك بەرجەوەنن. واتای ئەم قسەیە ئەوەیە كە خۆمان لەگێلی دەدەین و لە راستیدا ئێجگار هەوڵ دەدەین تا فەرامۆش بكەین كە كەسێكیدیاریكراو كەڵەكەیەك لە خاڵگەلی لێڵی(وەك) بایەخی دژیەكوله بەرەنجامدا پاڵنەرگەلی دژیەك لە ناخیدا كۆدەكاتەوە. "ئەم دەربڕینی هەلومەرجی نەخۆشی مرۆڤە، بە پێچەوانەی ئاژەڵان كە لەواندا تێكڕای وارسكەكانیان یەكسەر وڵامی ئامانجگەلی وەدیارخراو دەدەنەوە".[٤١] پۆزەتیڤیستەكان لەبەرانبەر دیاردەكانی جیهان دەوەستنو هاواردەكەن كە"تەنیا كەتوارەكان بوونیان هەیە". ئەوان كاری خۆیان ناسینو روونكردنەوەی وردو بێ كەمو كووڕیی كەتوارەكان دەزانن‌و لە بیر دەبەنەوە كە روونكردنەوە بە بێ یاوەریی ئامرازی زمان كە لێوڕێژ لە زۆروكەمی لە هەمبەر كەتوارە، لە بنەڕەت را كارێكی نەلواو دەبێت. نیچە دەڵێ: "نەخێر، كەتوار دەقاودەق هەمان شتە كە بوونی نیە، تەنیا راڤەكان هەن. ئێمە ناتوانین كەتوارێك "لە ـ خۆوە، سەقامگیر بكەین: رەنگە شێتی بێ كە بمانەوێ وەها بێ".[٤٢] نیچە دەڵێ ئەم پێشگریمانە پۆزەتیڤیستییە كە "جیهان شیانی ناسینە"، تەنیا بە یەك شێوە واتای هەیە: جیهان راڤەپەسندە، گرنگتر ئەمەیە كە دەبێ بزانیت كە جیهان واتایەكی لە نێواخندا نیە، بەڵكو واتاگەلی بێ ئەژمار لەسەر بنەمای راڤەكان، واتە لەسەر بنەمای "بەرجەوەنگەرایی" پەیدا دەكا. سەرنجدان لە باسی نیچە لەمەڕ "بەرجەوەنگەرایی"و ئەو مەسەلانەی هاوڕێ لەگەڵیدا لەمەڕ كایەی راڤەكانو گەڕاندنەوەی راڤەكان بۆ یەكدی و پەیدانەكردنی هەقیقەتو لە راستیدا لە گۆڕێدا نەبوونیو ئەمە كە هەقیقەت تەنیا زادەی زمانپاراویی ئێمەیە، پەیدا دەبن، دەبنە هۆی ئەوە كە بانگەشە بكەین

(40) ibid, P. 149

(41) ibid, PP. 149-150.

(42) ibid, P.247.

هێرشی نیچە بۆ سەر میتافیزیك هێرشە بۆ سەر هەر روانگەیەك کە بڕوای بە ئەگەری هەبوونی هەقیقەتێکی رەها هەبێ و بیەوێ یا تێبکۆشێ تا هەر شتێکی پێوەندیدار بە مرۆڤ لەم هەقیقەتە یەکتایە بەرەنجامگیری بکا، نەك لە کەتواری بووندارانەی مرۆڤ، واتە لە پاڵنەرە راستەقینەکان، پێداویستیەکان، ویستەکان، پاراستنی خۆ و ... هتد. بە نیچەوە زانیومانە کە هەقیقەتو هایدن هەردووك لە ئاستی بەرجەوەنەکان هەنو لە بەر بەرجەوەنگەلی جیاواز، جیاوازن. لەم روەوەیە کە ئەو دەڵێ جیهانێکی دی بەشێوەیەکی بەرهەست شیانی ناسین نیە، چونکە هایدنو هەقیقەتی پەتیو بنەتاییو لە خۆوە لە بنەڕەت را بوونی نیە. بەردەوام هەقیقەت "هەقیقەتێکە بۆ کەسێك یا شتێك"و جیهان "شتێکە بۆ کەسێك".

هەنوکە دەبێ وردبینەوە کە ئایا تێڕوانینی بەرجەوەنگەرایانەی نیچە، لەگەڵ شتانێك کە ئەو بە شێوەیەکی سەلمێنەرانە دەیگوتنو لە سەریان پێداگریی دەکرد، واتە لەگەڵ هیرای نێوەندیی خۆی لەمەڕ" ویستی هێز" یەکانگیرە یا نە؟ ئەگەر ویستی هێز یەکسەر بەدەر لە باسگەلێ کە نیچە لەمەڕ بەرجەوەنگەرایی و دروستکردنی هەقیقەت لە راڤەکاندا بێنینەگۆڕێ، وەها کە ژمارەیەك لە رەخنەکارانی نیچە بەو چەشنە ناساندویانە، خاڵێکی میتافیزیکی دەبێت و لەم دۆخەدا وادێتە بەرچاو کە لەگەڵ بنیاتی رێژەیی نواڕی گومانکارییەك کە بیچم بە بەرجەوەنگەرایی دەدا، دژبەر دەبێت. ویستی هێز لە تێکڕای بەرهەمەکانی نیچەدا و نەك تەنیا لە دوایین بەرهەمەکانیدا، بەردەوام بە چەشنیکی باڵادەست و "سەلمێنەیی" هاتۆتە ئاراوە. ئەم فرمان سەپێنییەی ئاخاوتەی نیچە وامان لێدەکات کە قسەی ژیل دێلۆز پەسند بکەین کە لە پەرتوکی **نیچەوفەلسەفە** دا ویستی هێزی لەگەڵ مەسەلەی گەڕانەوەی هەرمان، یەکێك لە دوو چەمکی نێوەندیی هزری نیچە ناساندوە. دیلۆز نووسیویەتی کە بە بێ سەرنجدان لە لایەنی سەنتراڵی چەمکی ویستی هێز لە فەلسەفەی نیچەدا ناتوانین کە فەلسەفەی بنیاتنراو لە سەر فیزیکی وزە کە راستیدا دژی ئەفلاتون بیچمی گرتوە و بنەمای کاری نیچەیە، بناسین. لە دیدی نیچەوە بایەخەکان، لە مێتۆدەکانی ژیان و شێوەکانی بوونی ئەو کەسانەی کە داوەری و بایەخدۆزی دەکەن بیچمی گرتوە.[43] بۆ نرخاندنی بایەخەکان دەبێ سەرچاوەکەیان واتە" شێوەکانی ژیان" کە لە یەکەمین بەرهەمەکانی نیچەدا بە ئاسۆی ژیان ناودێر کراوە، سەرنج بدەین. ناکرێ واتاکان جیا لەم

(43) G.Deleuze, nitezsche et la philosophie, paris , 1977, pp.1-2.



هەرەپێویستییە هەمدیس بناسینەوە:" تاکە دیاردەیەك نیشانەیەك یا هێمایەکە کە واتای خۆی لەو وزانەی کە هەن پەیدا دەکا، گشت فەلسەفە بەم پێیە ناسینێکی تەرخانکردنی نیشانەیە"[44] نیچە ناپرسێ" ئەمە بە چ واتایەکە؟"، بەڵکو دەپرسێ" کێ و لەبەرچی ئەم واتایەی دروست کردوە؟" لە دیدی ئەوەوە چاك و خراپ بوونی شتان، بە هیچ شێوەیەك واتایەکی خودێتیيیان نیە، بەڵکو نیشانەکانی شێوەی ژیانی ئاخێوەرن. لەگەڵ ئەو شتەی کە نیچە" بەنیاری* کردنی وشەکان" ناودێری کردوە، واتا بە بنەجێکردنی هەر وشەیەك لە زمانە جیاوازەکاندا وەکو زمانی ئاغا و نۆکەر، دەتوانی واتاکانیان" دیاری بکەیت" لەم روەوە شێوەکانی ژیانی کە لە راڤەدا ئاشکرا دەبن، هێمایەك لە ویستی هێزن. ئەفراندنی کەرەستەکانی تازەی ژیان، کە بەم جۆرە لە راڤەکان و لەبەرەنجامدا لە بەرجەوەکان جیا نیە، وزەی سەلمێنەیی هزرە. هەربۆیە، ئێمە بانگەشە دەکەین کە ناتوانی ویستی هێز بەدەر لە بەرجەوەنگەرایی بێنینە گۆڕێ.

رەنگە بتوانین ئەم خاڵە وەها بخەینەڕوو کە ویستی هێز لە دیدی نیچە بە واتای باوی وشە "ویست"ێك نیە. لە واتای باوی ئەم وشەدا، ویست بەر لە کردە لە شێوەی گەڵاڵەیەك، یا تەنانەت تامەزرۆییەك، دێتە گۆڕێ. نیچە جەخت دەکا کە ویست زنجیرەی ئەو مەیلانەیە کە یەکلاکەرەوەی ئەو وزانەن کە بە هۆی گۆڕانکارییە پەیتاپەیتاکانی هەل ومەرجی ژیان و چەرمەسەری و ئاسۆی ژیانی خەڵکاندا دیاریدەکرێن. ئەمە کە تێکڕای بیچمگەلی فرەچەشن کە لەو هەموو گۆڕانە بێئەژمارانەوە وەبەردێن و پەیوەستن بەو هەموو وزە جیاوازەوە، لە ژێر ناوی یەکەی" ویست" ناوبێنین، هەڵەیەکی شێتانەیە، کە تەنیا وەبارهاتووی بەکارهێنانی زمانییە. خەڵکان بۆ ئاسانبوونی کاروبارەکانیان، ئەم ناونیشانە هەمەکییانە سازدەکەن و لە بەیانکاریی چەشنەکانی دۆش دەمێنن. نیچە جارێکی دی هێما بۆ جیایی کاری فەیلەسوف لە کاری رێزماننوس دەکا و نیشان دەدا کە لە راستیدا ویست وەکو چەمکێکی ئەبستراکت و پێش ـ کردەیی ئەفسانەیەکە زادەیجیاکاریی زمانناسانە لەنێوان بابەت و بارکراو( محمول) .

(44) ibid, pp.3-4

* نیار: نمایش/ نیاری: نمایشی/ نیارڤان: هونەرمەندی شانۆ، شانۆکار. وێدەچێ وشەی" پێشنیار" بە واتای پێش + نیار= نواندنی شتێك لە پێش چاوی کەسێك، لێرەوە هاتبێ.

هەنبانە بۆرینە، هەژار (و)

ئەم خراپ تێگەیشتنە کە بابەت یا بکەری رستە، هۆکارێکی سەربەخۆ و جیا لە کردەیە، جێی پەسندکردن نیە.

ویستی هێز بەو واتایەی کە نیچە مەبەستیەتی، تامەزرۆیی یا ئارەزوی هێز نیە، چونکە ئەگەر وابێ تەنیا لە زمانی کۆیلەکاندا واتای پەیدا دەکرد. ویستی هێز لەو وزانەی کە لە ژیانی راستەقینەوە ئاخێزاون جیا نیە و هەر بۆیە وزەیەکی رەژیدەیە کە لەگەڵ هەر ئاسۆیەکی دانایی و هەر ئاسۆیەکی ژیان هاوپەیوەستە. ویستی هێز تەکانەدانی بزوێنەری کردەگەلی دیاریکراو و لێکجیایە، هەمەکی دیتنی تەنیا لە خدەیەکی هاوبەشیدا واتا پەیدا دەکا: بەردەوام لە مێژوی مرۆڤدا لە شێوەی سەرهەڵدان و رۆژداگەڕانی دامەزراوە و بنیاتە ماددی و مەعنەوییەکان، ئاسۆی پێویست بۆ پارێزگاری لە ژیانی مرۆڤ بەرهەڤ دەکا. لەم واتایەدایە کە نیچە ژیان و هەمووکەسێك بە ویستی هێز دەبینێ، بەڵام بیچمی سەرهەڵدانی ئەم ویستە، شتێك بە راستی رۆشنگەریەتی، خاڵگەلی بێئەژمار، دیاریمەند و جیاوازن. دیلۆز وەبیرمانی خستۆتەوە کە نیچە ویستی هێزی بەهاوشێوەی" وزەیەکی سەرکەوتوو" زانیوە و بەمجۆرە ویستی هێزی بە(کردە) و گرێ داوە.[٤٥] وزە ئەو شتەیە کە دەتوانێ کارێك بکات و ویست ئەو شتەیە کە دەیەوێ کارێك بکات. ویستن نەك بە واتای داواکردن، بەڵکو بە واتای بەشداری لەکاروبارەکانە.

ئەگەر ویستی هێز وەها کە ژیل دێلۆز هێناویەتە گۆڕێ، لەبەرچاو بگرین، ئیدی وەکو هەندێ لە نووسەران سەرمان لێ تێك ناچێ کە چۆن دەلوێ فەیلەسوفێك کە لەگرنگیی بەرجەوەنەکان دەدوێ و جەخت لەسەر رێژەمەندیی دانایی و برەودارییەکان و راڤەکان دەکا، لە جێیەکی دیکەدا روانگەیەکی میتافیزیکی لەمەڕ برەودارییی ویستی هێز بێنێتە پێشێ؟ جان ریچاردسۆن لە پەرتوکێك بە ناوی **سیستمی نیچە** کە بە تازەیی لە چاپ دراوە بە گەڵاڵەکردنی ئەم پرسیارە ئێجگار هەوڵی داوە تا نیچەی رێژەیی نواڕ بە قازانجی نیچەیەکی سیستمساز بەلاوە بنێ و لەسەر بنەمای میتافیزیکی ویستی هێز، نیچە بە فەیلەسوفێك کە هیراکانی پۆزەتیڤیستییە و لە بنەتادا داکۆکیکاری هەقیقەتێکە، بناسێنێ.[٤٦] بەر لە ریچاردسۆن نووسەرانێکی زۆر بەم بەرەنجامە گەیشتبوون کە

(45) ibid, pp.56-59

(46) J.Richardson , Nietzsche s system , oxford university press, 1996.



بەرجەوەنگەرایی تەنیا و تەنیا لە ئەفراندنی بایەخەکاندا قەتیسە و بەم چەشنە رێگەیان بۆ راڤەیەکی هاوشێوەی راڤەی ریچاردسۆن خۆش کردبوو. ئەوان ویستی هێزیان لە دەرەوەی بازنەی بەرجەوەنگەرایی و رێژەمەندیی بایەخەکان دانابوو، چونکە دڵنیاببوون کە نیچە بایەخی لێبڕاوانە و جیهانگیر بۆ ویستی هێز دادەنێ.[٤٧] جێی سەرنجە کە لە پەستاوتنی باسی بەرجەوەنگەرایی لە ئەفراندنی بایەخەکاندا دەبێ واتای" بایەخەکان" لە دیدی نیچەوە بە وردی رۆشن بکرێتەوە. بەلای نیچەوە، سەرچاوەی بایەخەکان ژیان یا ویستی هێزە و هەروەك کە دێلۆز نیشانی داوە ویستی هێز لە بنەڕەت را لە جەرگەی بەرجەوەنگەرایی دایە و ناتوانێ لە دەرەوەی، و بە شێوەی پۆزەتیڤیستی بێتە ئاراوە.

بێگومان نیچەی رێژەیی نواڕیش لەگەڵ هەمان ناتەبایی و پارادۆکسانەی روانگەی رێژەیی نواڕانە بەرەوڕوودەبێ کە ئەفلاتون لە **تەئەتتۆس** دژی پرۆتاگۆراس هێنابوویە پێشێ.[٤٨] بەڵام ئەم پێکناکۆکە بنیاتییەی فەلسەفە نابێ ببێتە هۆی ئەوە کە ئێمە نکۆڵی لە بنەڕەتی بەرجەوەنگەرایی نیچە بکەین، یاخۆ وەکو میتافۆرێك لە بەرچاوی بگرین کە هیچ ئاشکرا نیە لەبەرچی لە کاری نیچەدا سەریوەدەرهێناوە. کتێبەکەی ریچاردسۆن لە بەدحاڵیبوونێك ئاگادارمان دەکاتەوە کە تەنانەت لە ناونیشانەکەشدا بەدی دەکرێ. ئەو دەیەوێ یەك بنەواشە، یەك سیستم، یەك رێسای تۆکمەی فیکری لە هزر و فەلسەفەی نیچەدا پەیدا بکا و ئەوەی کە پەیدای دەکا لە ژێرناوی میتافیزیکی ویستی هێز دەی ناسێنێ. لە حاڵێکدا دەبێ بێژین وەها دیتەیەکی تاقانە لە کاری نیچەدا بەدی ناکرێت و ئەوەی هەیە، بەردەوام هەواڵی رێژەمەندیی بەرجەوەنەکان دەدات. کاتێك نیچە دەیگوت ئێمە ویستی هێزین، بەرجەوەنی خۆی وەدیاردەخست. راستە کە زەردەشتی ئەو

(٤٧) وەکو نموونەگەلی رۆشنگەر، بڕواننە:

R.Schaht, “nitezsche and nihilism” in: R.C.Solomon, Nietzsche: A collectiafn critical essays new York, 1973

J.T.Wilcox, truthand volue in nitezsche , university of Michigan , press, 1974.

K.R.Westphal, was” nitezsche a cognivist?” in: journol of the history philosophy, 22,3,1984, pp.343-363.

(٤٨) لەمبارەوە بڕواننە وتاری:" سوفیستەکان و گومانکاران" لە :ب. احمدی، **کتاب تردید**، تهران، ١٣٧٤ صص ١٠٨-١٤٢.

بە راشکاوی دەیگوت" دەمەوێ بە مرۆڤان واتای هەبوونیان هیرا بکەم" بەڵام ئەمەشی دەزانی کە لە مرۆڤان ئێجگاردووره و دانی پیادەنا: واتای من لە تەك واتاکانی ئەوان هاوزمان نیە".[٤٩] هەقیقەتی زەردەشت هەقیقەتێکی میتافیزیکی نیە و ئەگینا خۆی ئاشکرا دەبوو و رێگەگەلی ئێجگار زۆری پەیدا دەکرد تا مرۆڤان ناچار بکا کە لەگەڵیدا ئاشنا بن. بە پێچەوانەوە، ئەمە هەقیقەتێکی دێرفامە و ئاتاجمەندی هیراکانی زەردەشت، کە دەزانێ:" ئەوان لە من تێناگەن، من زارێك بۆ ئەم گوێیانە نیم".[٥٠] زەردەشت وەکو هەرکەسێکی دی ناچارە کە لە دیتەی خۆی، بەرجەوەنی خۆی، ژیانی خۆی، هێز و توانای خۆی داکۆکی بکا. کەوابوو ئەو پێغەمبەر نیە و هەقیقەتێکی هەرمانی پێنیە. لۆتیی قەلات بەو دەڵێ کە کاتێك تێدەکۆشا لەگەڵ خەڵکی بدوێ" لۆتی ئاسا دەدوا"[٥١] لەم رووەوە زەردەشت، بەرەبەیان، بە خۆی دەڵێ:" ئیدی لەگەڵ خەڵکی قسان ناکەم. ئەمە دواجار بوو کە لەگەڵ مردوویەکدا دوام. من دەچمە ریزی خولقێنەران، دنیابێخەمان، خۆش رابوێران و پەلکەزێرینە و پلیکانەی کەڵەمرۆڤ(و) تێکرای پێیان دەنوێنم".[٥٢] رۆشنە کە زەردەشت لەگەڵ کەسانێك دەتوانێ و لەگەڵ کەسانی دیکە ناتوانێ بدوێ. لەگەڵ داهێنەران هاوپەیڤ دەبێ چونکە لەگەڵ ئەواندا لە راڤەگەلێکدا هاوبەشە و لەتەك دواین مرۆڤ قسان ناکات، چونکە زمانێکی هاوبەشی لەگەڵ ئەودا نیە. زەردەشت لەبەر ئەوەی کە بەرجەوەنێك، راڤەیەك و راستییەکی لایە، پێش مەرجێك بۆ پێوەندی لە تەك کەسانی دی دادەنێ. پێغەمبەرێك نیە کە بۆ بەختەوەریی هەموان هەواڵێکی هێنا بێ. راستیی ئەو نە راستییەکی هەرمانە و نە شتێکی هەمیشە دروست. وێنای زەردەشت وەکو خودان هەقیقەتی رەها و پێغەمبەرێك، هەڵەیەکە کە چەند نەوە لە توێژەرانی بەرهەمەکانی نیچە لە داوی کەوتن و هێشتا واز لە توێژەران ناهێنێ. لە بەرانبەر ئەواندا دەبێ بە شێوەی دێلۆز لە زەردەشتێك داکۆکی بکەیت کە یەکێك لەو قسە زۆرانە دەڵێ، ئەویش بۆ هەندێك لە کەسان. زەردەشت دەڵێ:" بەوانەی کە"رێگە"یان لە من پرسیوە،

(٤٩) ف. نیچە، **چنین گفت زرتشت**، ص٣٠.

(٥٠) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٢٨.

(٥١) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل٣١ .

(٥٢) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٣٣.



وەها وڵامم داوەتەوە: ئەمە، هەنوکە رێگەی منە. رێگەی ئێوە کامەیە؟ چونکە رێگەی رەها لە گۆڕێدا نیە".[٥٣] ئەو کەمێك پێشتر گوتویەتی:" من لە ئێجگار رێگا و مێتۆدەوە بە راستیی خۆم گەیشتوم." ئەمە بەرسڤ بە کەسانێکە کە لە سیستمی نیچە و لە نیچەی میتافیزیسین دەدوێن و رێژەیی نوارِیی ئەو پشتگوێ دەخەن.

(٥٣) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٢٠٧.

# هونەر و ئازادی

## (١)

وۆنسان وان گۆك لە نامەیەكدا كە لە ساڵی ١٨٨٨لە ئاریل بۆ هاوڕێی نیگاركێشی خۆی ئیمیل بێرنار ناردی (ئەو بەزۆری، رێكەوتی رۆژ و مانگی لەسەر نامەكانی نەدەنووسی) وەهای نووسی: "دەتوانی وەها دیاردەیەك گریمان و وێنا بكەیت كە هەسارەكان و هەروەها كۆمەڵەكانی خۆریش خودان هێڵ و بیچم و رەنگ بن. دەتوانین تارادەیەك دڵنیا و هیوادار بین كە تاكەكەس ـ هەڵبەت بە هەل ومەرج و بیچمی دیكە، بۆ نموونە لە شێوەی پەپوولە ـ بۆ یەكێك لە ئەستێرانی بێئەژمار بگوازرێتەوە و خۆی بە نیگاركێشانەوە خەریك بكات. دیاردەكانی ژیان لەوێدا دەلوێ تێكچڕژواترو سەرسووڕهێنەرتر لە (دیاردەكانی هەسارەی ئێمە، وەكو) * شێوەگۆڕانی كرم بۆ پەپوولەیەك، یا زەردەواڵەكانی زێڕینی مانگی خاكەلێوە(نیسان= may ) نەبن. بۆ كیانی پەپوولە نیگاركێشەكانیش، رەنگە گۆڕەپانی كار و كردەوەی بەرین لە یەكێك لە ئەستێرانی بێئەژماری گەردونی بە رووماندا بكرێتەوە كە زیاتر لە خاڵەكان و هێماگەلی گریمانكراوی شاران و دێهاتەكانی نەخشەیەكی جوگرافیای زەمینیی ئێمە دەستڕاگەیشتوو بێت."(١)

نیشانە نەخشەییە جوگرافییەكان لە هەسارەی ئێمەدا هێماگەلێكن بۆ ژیانی خەڵكانو روەكەكانو گیانەوەركان، بەڵام چاوساخی ئاشنایی لەگەڵ ئەوان نایەنە ئەژمار. شیمانی ژیانی ئەوانیدی دێننە پێشێ. هونەرمەندگریمان دەكا كە هێماگەلێ لەمەڕ شیمانی ژیانی "پەپوولە نیگاركێشەكان" هەن، كە هەڵبەت رێگەی ئاشنایی ئێمە لەگەڵیان ئاوەڵا ناكەن، بەڵام وێنای ئێمە لە تەنیاییو سنوورداریيەكانمان لەنێو دەبەن. هەربەوجۆرەی كە بە سەیركردنی نەخشەی جوگرافیایی، بەهەر حاڵ، لە شیمانی ژیانێكی دیكە دڵی خۆمان دەدەینەوە كە تەنیانینو لامان وایە كە ئاسۆی ژیانمان بەرینتر بۆتەوە. وادێتە بەرچاو كە وان گۆگ لە وێنای هەسارەیەك كە لەودا نەتوانێ خەریكی نیگاركێشی بێت، ترسی لێ دەنیشت. كێشانەوە بۆ ئەو

---

* تێبینی لە نووسەرە.

(١) و. وان گوك، **نامەهای وان گوك**، ترجمەی ر. فروزی، تهران، ١٣٤١، ج٢، ص٢٩٥( بە دەسكاری كردنی كردارێك) .



پێداویستییەكی ئاخنەییو مەرجێك بۆ ژیان بوو. گۆڕەپانێكی بەرینی كردەوەوكاركردن كە لە هەسارەیەكی دیكەدا وای دەخواست تا لەودا تەنانەت لە قاڵبی پەپوولەیەكیش بتوانێ بە كاری نیگاركێشەكان درێژە بدات، سەربەخۆ لەڕادەی سەرسووڕمانو تێكچڕژاوییەكانی ئەو هەسارەیە بوو. لە دیدی ئەوەوە، ژیان بە هەر بیچمێك كە لەو پەڕانپەڕە نەناسراوەدا درێژە دەكێشێ، چ سەمەرەتر و چ سادەتر لە ژیان لە زەویی ئێمەدا، تەنیا كاتێك پڕ بایەخ دەبێ كە كەسێك، لە قەڵافەتی پەپوولەیەكدا یا لە هەر بیچمێكی دیكەدا، بتوانێ لەوێدا نیگاركێشی بكات. سەرقاڵبوون بە هونەر، لە زەویو (یا خۆ) لە هەر هەسارەیەكی دی مەرجی ژیانی بەختەوەرانەیە. كاری هونەری لەگەڵ ژیان پێكبەستراوە و تەنانەت هاویەكە و لە بەرئەوەی كە ژیان فرە چەشن، رەنگاو رەنگو پێناسەهەڵنەگرە، هونەریش بەدەر لە هەر پێناسەیەكی زانایانە و هەر تێكۆشانێك بە مەبەستی قەتیس كردنەوەی لە قاڵبێكدا درێژە پەیدا دەكا. كە وابوو، لە حاڵێكدا كە ئەفراندنو بەرەوڕوو بوونەوە لە تەك هونەر دەچێتە پێشێ، هەرگیز ناتوانین بێژین كە كام دەستە لە چالاكییەكانی ئێمە كارانێكی هونەرین، یا چ شتێك بەرهەمی هونەری لە بەروبوومەكانی كارورەنێوهانینی مرۆڤ جیا دەكاتەوە. ئەم خاڵانە خۆیان لە جەرگەی پرسیارێكی كورتو بە رواڵەت سادە دەنوێنن كە چەندین سەدەیە ـ بە ئەرخەیانییەوە لە رۆژگاری یونانی كەونارا بەملاوە، وەلێ لەبەرگەلێك هۆ دەتوانین بێژین تەنانەت لە چەندین سەدە بەر لە ژیاری یونانی ـ لە بەرچاوی مرۆڤ قووت بۆتەوە و هیچ پێویستیی بەوە نەبووە تا فەیلەسووفانی وەكو بومگارتن یا رۆشنگەرانی سەدەی هەژدەهەم زاراوەی "جوانیناسی"دابهێنن، تا بتوانی لە بارەیەوە تێهزریت. ئەم پرسیارە بنیاتییە، لە هەمان رۆژگاری یونانییەكان بە دواوە پەیتاپەیتا بە بیچمی جۆراوجۆر دووپات كراوەتەوە:" چ شتێك بە بەرهەمی هونەری ناودێر دەكەین؟"

هەرچەند چەندین سەدەی دوورودرێژە كە مرۆڤان لەم پرسیارە تێهزریونو لە نێویاندا، هەم یارانی زانستو فەلسەفەو هەم هونەرمەندانێك هەبوون كە ژیانی فیكریو داهێنەرانەی خۆیان بۆ پەیداكردنی وڵامی ئەم پرسیارە رێكخست، هەمدیس وڵامێكی بنەتایی، لێبڕاوانەو قەناعەت پێكەر وەدەست نەهاتوە. لە سەردەمی مودێڕندا، زۆرێك لە هونەرمەندان پەیتاپەیتا كاریان كرد و ئافراندیان و بە دەستكەوتە هونەرییەكانیان ئەگەری پێشكەوتنی باسگەلی فەلسەفییان رەخساند. لە نێویاندا كەسانێك هەبوون كە هەم هونەرمەند بوونو هەم فەیلەسوف و لە هەمبەر پرسیاری بنیاتیی "بەرهەمی هونەری چیە؟" لە خۆیان هەستیاریی زۆرتریان

نیشان دەدا. زۆرێك لە هونەرمەندان، بە هیچ شێوەیەك وزەی داهێنەری خۆیان لە رووی بێ پەرۆشی، یا تەنیا لەسەر بنەمای وڵامدانەوەی پێداویستیی ناخیو مەعنەویی داهێنەرانە نەدەبردە پێشێ، بەڵکو تێدەکۆشان تا بنچینەی کارەکانیان لەسەر ئاوەزیانو عەقڵمەندیی فەلسەفی و بەشێوەیەکی تایبەت، پشت ئەستور بە بەرسڤێکی شیمانکراو بۆ هەمان پرسیاری بنیاتی رۆبنێن. بەم هەموەوە، کۆمەڵە بەرسڤێکیان بەرهەڤ کرد(کە) کاتیومەرجداربوون، نەك ئەرخەیانکەر و هەرمان. هێشتا هیچ وڵامێك کە پوخت بێو جێی هیچ باسو خواسو ئەملاوئەولایەك نەهێڵێتەوە، بۆ پرسیاری "بەرهەمی هونەری چیە؟" بەرهەڤ نەکراوە. هەر وڵامێك تەنیا لە هەندێ رووەوە راستودروست دێتە بەرچاو، روویەکی گشتی پەیدا ناکاتو لە بەرانبەر سوچ لێگرتنە رەخنەکارییەکان چەندان بەرگە ناگرێت.

لە ساڵی ١٩٥٠ ئێرنێست گۆمبریج پەرتوکی **بە سەرهاتی هونەر** ی بڵاو کردەوە کە ئەمڕۆ وەکو کارێکی کلاسیك و هەڵکەوتو دەناسرێت. ئەو بە تاوتوێی نزیکەی سێسەد بەرهەمی هونەری بەم بەرەنجامە گەیشت کە "شتێك بە ناوی هونەر بوونی نیە"[(٢)] بەرهەمگەلێ کە ئەو لە بواری هونەرگەلی شێوەکاری توێژینەوەی لەسەرکردبوون، بەمەبەستی دابینکردنی پێداویستیگەلی کتوپڕ لە کاتی خۆیدا رسکابوون و لە راستیدا بە بڕێك هەڵکەوتی تایبەتو دیاریکراو بەستراوە بوون. بە رای گۆمبریج هەڵەیە کەوابیربکەینەوە کە ئەم بەرهەمانە لەدیدی رەخسێنەرانیانەوە بە خەیاڵی ئەوە کە بەرهەمانێکی هەرمان بن، دروستکرابوون، هەرچەند ئێمە ئەمڕۆ ئەوانە بە "بەرهەمگەلی هونەری" ناودێر دەکەین و تەنانەت سەرچەشن (archetype)ەکانی هونەر ئەژماریان دەکەین. پەسنی رەشۆکانەی ئەمڕۆیی کە "ئەم بەرهەمە چەندە زیندوویە!" چاوەڕوانیی تێکڕای ئاسۆ مێژووییەکان لە بەرهەم نەبوو. بەرهەمی هونەری لە پلەو پایەی کەتوارێکی مێژوویی بە بوونەوەرێکی تاقانە ئەژمار ناکرێت. هەموو خەڵکی لە قۆناخە جیاجیاکاندا یەك چەمەڕاییو یەك هەڵێنجان لە "هونەر"یان نەبوو. ناونیشان یا زاراوەی "هونەر" ئەم دژوارییەی لێدەکەوێتەوە کە بۆ یەك چەشنە وەرگرتنێك دەگەڕێتەوە. ئەم ناونیشانە پێشداوەرییەکانو بڕێك لە دەمارگرژییەکان دروست دەکات. لە یادمان نەچێ کە تا رادەیەك تێکڕای ئەو نەیارییە مێژووییانەی کە لەگەڵ تازەگەریی هونەری کرا، بە ناوی "هونەر" و پێناسەگەلی چەقبەستو و ئەرخەیانگەری ئەنجام درا. سەربردەی

(1) E.H.Gombrich, The story of Art, sixteen edition, London, 1995, PP.16-37.



هونەر تەنیادەتوانێ باسلێکردنی بەسترانەوەی هونەرمەند بە رۆژگارەکەی و ئاسۆی چاوەڕوانیی سەردەمەکەی بێتو بەس. لەپاش گۆمبریج، هوارد.س.بێکر بەهێنانەگۆڕی "دنیا هونەرییەکان" مەسەلەکەی وردتر خستەڕوو. ئەو لە وتاری "هونەر وەکو کردەی هەرەوەزی" نووسی کە بەرهەمی هونەری بەروبووم و بەرەنجامی چالاکیی هونەرییەو ئەم چالاکییە لە شیکاریی بنەتاییدا، هەرەوەزییە و نەك تاکەکەسی، تەنانەت ئەگەر بلیمەتیی تاکەکەسێك دەربڕی بێت.[(٣)] ئەگەریش لە قاڵبی کارێکی تاکەکەسی سەرهەڵ بدا، لە خۆیدا دەربڕینی "کاری پێکبەستراوی شاراوەی هەرەوەزییە.دنیاهونەرییەکان لەکاری تێکڕای خەڵکانێك بیچمیان گرتوە کە بە مەبەستی رەنێوهانینی تایبەتمەندیگەلێ کە لە بەرهەمدا بە"هونەری" ناودێردەکرێ، هەرەپێویستیی تەواویان هەیە. لە راستیدا دنیاهونەرییەکان تەنیا رەژیدەی بەرهەمە هونەرییەکان نین، بەڵکو خولقێنەری بایەخگەلێکی جوانیناسانەن کە بەرهەمانێك بە" هونەری" دەناسێنن.

دەلوێ کە لەگەڵ لۆژیکی بێکر هاوڕا نەبن، بەڵام دژوار بێ نکۆڵی لەوە بکەن کە پێناسەی هەرمانی و هەمیشەیی لە" هونەر" دەستڕانەگەیشتویە. بەهەر حاڵ من بۆ پرسیاری تۆلستۆی کە"هونەر چیە؟" نە وڵامێکی بنەتایی و ئامادەم پێیە و نە دەمەوێ کاتی ئێوە بە هەوڵدان بۆ پەیدا کردنی وەها وڵامێك بە فیڕۆ بدەم. لام وایە وڵامێکی لێبڕاو، تەواو و بنەتایی ناتوانی بەو پرسیارە بدەیتەوە. بەڵام نکۆڵی ناکەم کە تێهزرین لە لایەن و ئاقارە جیاجیاکانی ئەم پرسیارە ئێمە ناچار دەکا لە دیدی فەلسەفی وردبینەوە کە بەتایبەتی لە سەردەمی خۆماندا، ئێجگار پێویستمانە. رەنگە دروستتربێ بڵێم هەمان" پێویستیی ناخی" کە لە راڤەی نامەی وان گوگ بە" مەرجی ژیان" ناودێرکرا، هونەرمەند ناچار بە داهێنانی بەرهەم دەکات. هەر بەم شێوەیە" پێویستیی ناخی"ی دیکە( کە هێشتا نازانین هاوپێوەندیی لەگەڵ پێویستیی ناخیی هونەرمەند کامەیە، بەڵام ئەمە دەزانین کە هەندێ جار تەنانەت باڵادەستتر لەوە) کەسێکی دی، واتە بەرامبەر(گوێگر ـ خوێنەر ) بەرەو بەرهەم رکێش دەکات. بەکاربردنی زاراوەی" پێویستیی ناخی"، خۆی نوێنگەی تەمتومانێکی گەوهەرییە و واتاکەی ئەمەیە کە

(3) H.S.Becker, “Artas collective Action”, in: American sociological Review, 39, 1974.

H.S.Becker, “Art worlds, University of California Press, 1982, P.34.

ئێمە نەمانتوانییوە بە وردی سازوکاری دەرونی و ئەپستمیکی پێویستیی جێی باسمان فام بکەین و بە "ناخی" ناودێرکردنی لە راستیدا، نیشان دەدەین کە شتێکی نەناسراو، لێڵ، یا لانیکەم فرەفاق لە بەردەممانە. پێویستی یا ئاتاجگەلێ کە ئێمە بەرەو ئەفراندنی یا وەرگرتنی بەرهەمی هونەری دەبەنەپێشێ، وەها تێکچڕژاو، نادیاریمەند و لە دۆزینەنەهاتون کە یادکردن لەوان ناتوانێ لە پێناسەی" بەرهەمی هونەری" یاریدەیەکی ئەوتۆمان بدات.

وا دێتە بەرچاو کە ئەم پێداویستییە ناخی و سەربەمۆرانە، بە پێداویستی و ئاتاجێکی دیکە بەستراونەتەوە کە وێدەچێ لەوەش گرنگتر و لە ناسین نەهاتوتر بێ: ئاتاجی مرۆڤ بە دروستکردنی ئازادانەی شتەکان. هەندێ لە توێژەران لەو باوەڕەدان کە وشەی یونانیی" پوئسیس" تەنیا بۆ دروستکردن نەدەگەڕایەوە بەڵکو دروستکردنی ئازادانەی نیشان دەدا. وەك بلێی مرۆڤ پێویستیی بە خەیاڵگەریی ئازاد، هزری ئازاد و کردەی ئازاد هەیە هەر چەند(رەنگە لە بنەڕەت را لەبەر ئەمە کە)  بەردەوام لە رەوتی ژیانی کۆمەڵایەتیی خۆیدا لە جێی ئەم ئازادییانە لەگەڵ سنوردارییەکان و هەرە پێویستییەکان بەرەوڕوو بووە. ئەم ئاتاجە بە رزگاری کە لە پێویستیی دروستکردنی ئازادانە خۆی نیشان دەدا بە مانای تێپەڕاندنی سنورەکان، کەوشەن و قەدەغەکان لە پێناسەی گەوهەری مرۆیی خۆ، یا لە پێناسەی هەڵکەوتی مرۆیی خۆیە. بەمجۆرە کاتێك کە لە بەرهەڤ کردنی بەرهەمی هونەری، یا لە راڤەی واتاکانی، یا لە درك پێکردنی هەستەکیی خۆمان لەوان، بۆ خۆمان رێز دادەنێین، هەواڵێك لە رزگاربوون لەو بەرتەسکی و سنوردارییانە لە دروستکردن یا لانیکەم لە وێناکردنی گەوهەری مرۆییمان دەگاتە دەستمان. ئەم دەربڕینە لە رزگاری، هەڵبەت لەگەڵ چەمکی ئازادی لە ئاسۆی هەڵێنجانە مودێڕنەکان( و بۆ نموونە لەگەڵ واتای ئازادی لە فەلسەفە و سیاسەتی لیبراڵ) چەند لێکچوونێکی هەیە، بەڵام لێی بانتر دەڕوا و بۆ باسێکی فەلسەفی و ئێجگار کۆن لەمەڕ ئازادی لە بەرانبەر هەرەپێویستی و سەرپشکی لە بەرانبەر دیترمێنیت دەگەڕێتەوە. لێرەدا تێدەکۆشم تا وەدەرکەوتنی ئەم ئاتاجە مرۆیی‌یە بە رزگاری لە پێویستیی ئێمە بە ئەفراندنی ئازاد و سەرپشك لە هونەردا پەیدا بکەم. رەنگە کەسانێك بیانەوێ لەم رێگەوە پێناسەیەکیش بۆ کاری هونەری( و لێرەوە بۆ بەروبوومی ئەم کارە واتە بەرهەمی هونەری)  دابتاشن، بۆ نموونە هونەر بە قەڵەمڕەوی ئەفراندنی ئازاد و سەرپشك ناودێر بکەن، بەڵام... هەر لەم دەسپێکەوە رۆشنم کردۆتەوە کە من بە هیچ شێوەیەك نامەوێ پێناسەیەکی بنەتایی و لێبڕاو بخەمەڕوو.



## (٣)

یەکێك لە یەکەمین دەسکەوتەکانی تێکۆشان پێناسەی هونەر، نمونەی" هونەر چەشنی لاساییکردنەوە"یە کە ئەفلاتون وەکو بەرەنجامی توێژینەوەکانی خۆی لەمەڕ هەمبەری هونەر لەگەڵ کەتوار هێنایە پێشێ و هەتا ئەمڕۆ یەکێك لە گرنگترین چەمکەکانی فەلسەفەی هونەر ماوەتەوە. هەم لە پێناسەی ئەفلاتون و هەم لە زۆربەی باسەکانی دیکە تاکو ئێستا لەبارەی چەمکی لاساییکردنەوە هاتوونەتە گۆڕێ، سەرنج لە تایبەتمەندیی ئەرکیی هونەر واتە باندۆری بەرهەمە هونەرییەکان لە ژیانی جڤاکی و رەوشتیی خەڵکی دراوە. گرنگترین دەقێك لە ئەفلاتون کە لەودا بە لاساییگەری یا بە زاراوەی یونانییmimesisهێما کراوە وتووێژی کۆمارە. شوێندەسپێکی باسەکە لەمەڕ لاساییگەری لەم وتووێژەدا ئەم(گریمان)ەیە کە چالاکیی هونەری هاوڕیز لەتەك تکنیکەکان و پیشە کۆمەڵایەتییەکانە. ئەفلاتون هەموو ئەمانەی لە ژێر ناوی" تێخنە" جێ کردەوە کە بە واتای تکنیك و شێواز بوو. لە درێژەی باسەکەدا، ئەو لەمەڕ هونەر قەناعەتی بەخدەیەکی تایبەتی لاساییکردنەوە هێنا، کە لە تایبەتمەندیی لاساییگەرانەی چەشنەکانی دیکەی تکنیکەکان و پیشەگەرییە جیاوازەکان و لە روانگەی نزیکی لە هەقیقەت بێبایەخترە. هەر بۆیە بۆ هونەر رێز و پایەیەکی چەند قات کەمتر لە هەر تکنیك و پیشەیەکی دیکەی دانا. بەرهەمی هونەری لەیەکەم نیگادا، جیاوازییەکی لەگەڵ ئەو شمەکانەی کە ئێمە بۆ دابین کردنی بژێویی رۆژانەمان دروستی دەکەین، نیە. کەسێك پەرداخ دروست دەکا و کەسێکی دی نیگاری پەرداخ دەکێشێتەوە. ئەگەر ئەفلاتون لە روانگەی بایەخدارییەوە بەرهەمی هونەریی لە پایەیەکی نزمتر لە شمەکەکان دادەنا، لەبەر ئەمە نەبوو کە سودی پەرداخی راستەقینە زیاتر لە سودی پەرداخێك کێشراوەتەوە.( لە راستیدا ناتوانی ئەم دوانە بە شێوەیەکی کت ومت پێکەوە بەراورد بکەیت و بە بەرەنجامێکی ئەرخەیانگەر بگەیت) . زنجیرە پلەیەکی بایەخدارانە کە ئەم فەیلەسوفە دروستی کرد پشت ئەستور بەم هۆیە بووکە بە بۆچوونی ئەو پەرداخی راستەقینە لە هەقیقەتی پەرداخەوە نزیکتر دەهاتە بەرچاو. هەرکات بۆ پرسیارێك کە لە سەرەتای ئەم وتارەوە هێنامانە گۆڕێ بگەڕێینەوە و پرسیار بکەین کە" چ شتێك بەرهەمی هونەری لە بەرو بوومەکانی کار و رەنێوهانینی مرۆڤ جیا دەکاتەوە؟" لە ئەفلاتونەوە لە پەرتوکی دەیەمی کۆمار وڵام دەدرێینەوە: بەرهەمی هونەری

لاسایی شتێکی هەبوو لە دنیای ئێمەیە، کە ئەم شتە خۆی لاسایی کردنەوەی بیرۆکەیەکە لە جیهانێکی دیکە دایە. کەوابوو بەرهەمی هونەری دووجار لە هەقیقەت دوورکەوتۆتەوە و لە باقی سازکراوەکانی مرۆڤ کە یەکجار لە بیرۆکە یا هەقیقەت دوورمان، بێبایەخترە. ئەفلاتون لە کۆماردا نموونەیەك لە نوێن یا قەرەوێڵە دێنێتەوە و دەنووسێ کە لە راستیدا سێچەشن قەرەوێڵە و هەن، یەکەم تەخت لە قەڵەمڕەوی بیرۆکە کە خوا دروستی کردوە و لە قەڵەمڕەوی بیرۆکەدا دای ناوە، دووەم تەختێك کە دارتاش دروستی دەکا و سێیەم تەختێك کە نیگارکێش دروستی دەکا. تەختی نیگارکێش لاسایی تەختی دارتاش و ئەمە خۆی لاسایی تەختی یەکەمە. بە دەربڕینی دی نوێنێك کە هونەرمەندی نیگارکێش کێشاویەتی، بە بەراورد لەگەڵ تەختێك کە دارتاش دروستی کردوە یەك پلە دوورتر لە تەختی راستەقینە یا" بیرۆکەیەك"بنەجێ دەبێ.(٤)

لە جیاکاریی سەرەوە یەك بەرەنجام وەدەست دێ: بەرهەمی هونەری بایەخێکی کەمتری لەوەبەرهاتوەکانی تکنیك و پیشەسازی هەیە. هەڵبەت ئەفلاتون جەخت دەکا کە ئەم خاڵە نابێ ببێتە کۆسپی سەرنجی ئێمە لە ئەرکگەلی بەرهەمی هونەری. هونەر وەکو یەکێك لە چەشنەکانی نزمی تێخنە، بەهەرحاڵ لە گۆشەی ئەم ئەرکانەوە لە ئارادایە. پێوانەی ئێمە لە نرخاندنی بەرهەمی هونەری، بەر لە هەرشتێك رێژەی کارایی و سود بەخشیەتی. واتە ئێمە دەبێ لە تاوتوێی بەرهەمی هونەریدا لە هەنگاوی یەکەمدا سەرنج بدەین کە بەرهەم تا چ ئاستێك لە راژەی ئامانجە شکۆمەندە کۆمەڵایەتی، رەوشتی و فێرکارییەکان خۆدەنوێنێ. بە سەرنجدان لەم ئامانجەیە کە هەڵسوڕێنەرانی کۆمەڵگا ئەو مافە پەیدا دەکەن کە کاری هونەرمەند چاوەدێری و سەرپەرەشتی بکەن و تەنانەت ئەگەر پێویست بکا ببنە لەمپەری درێژەدانی و هێندە بچنە پێشێ کە هونەرمەند سزا بدەن یا خۆ لە وڵات دەری بکەن. لەبەرئەوەی کە ئەفلاتون لەبەرهەمی هونەری (هەر چەند کە لە بەروبوومەکانی دیکەی کاری مرۆڤ مەودایەکی زیاتری لەتەك هەقیقەت هەیە)  وەکو هەربەروبوومێکی دیکەی فیکر، کاروتکنۆلوژیی مرۆڤ لە گۆشەی کاراییەکانی و دواجار لە گۆشەی سودبەخشینیەوە سەرنجیدا، بە بەرەنجامێکی ئێجگار سەرەڕۆیانە گەیشت.گریمان، تەلارسازێك کە شارەزای کارەکەی نیە، دیوارێکی لار لە سەریەك هەڵبچنێ. ئایا ئەرکی سەرشانی ئێمە جگە لەمەیە کە هەر چۆن و

(٤) افلاطون، **دوره اثار** ، ترجمەی م.ح. لطفی، تهران، ١٣٦٧، ص ١٢٥٢



بە هەر رێگەیەك بێت پێش بە درێژەدانی کارەکەی بگرین و بۆ نموونە بە جەخت کردن لەسەر تکنیکی تەلارسازی یا هۆشداری دان و ناوهێنانی ئەو مەترسییانەی کە بوونی ئەم دیوارە لارە بۆ نیشتەجێیانی ماڵان یا رێبواران دەی رەخسێنێ، تەلارسازەکە ناچار بکەین کە یا کارەکەی دروست فێرببێ و دروست ئەنجامی بدات، یاخۆ کارێکی دی کە زیاتر لەگەڵی ئاشنایە ئەنجام بدات؟ ئەگەر لە روانگەیەکی هەمەکییەوە کاری هونەرمەند لەگەڵ کاری تەلارساز هاوسان بزانین (وەها کە ئەفلاتون هەردووکی لە ئاستی" تێخنە"دا جێکردەوە)  ئەوکات بەناچار دەبێ لە بەرهەمی هونەریش وەکو بەروبوومی کاری تەلارساز لە گۆشەی بەرەنجامگەلێ کە بە باریان دێنێ، ورد بینەوە. کەوابوو، هەرکات بتوانین بسەلمێنین کە بەرهەمێکی هونەریی تایبەت هاوشێوەی دیوارێکی لار رەژیدەی مەترسیی شێلگیر بۆ کەسانی دیکەیە، ئەو مافە بە خۆمان دەدەین کە پێش بە سەرهەڵدان و پێشکەوتنی بگرین. لەوە گرنگتر، هەرکات بتوانین بسەلمێنین کە کاری هونەر( یا چەشنێك لەو بۆ نموونە شاعیری)  دروستکەری مەترسیگەلێ بۆ کۆمەڵگە، یا نەوەی لاوە، ئەوکات دەتوانین ببینە لەمپەری چالاکیی هونەرمەندان و شاعیران. بە رای ئەفلاتون وەها کارێك بە پێی ئەو بەراییانەی کە باسکران لۆژیکی، ئاوەزمەندانە، بە قازانجی جڤاك و هەرامەیەکی هەرە پێویست دەبێت. ئەفلاتون بە تێروتەسەلی روون دەکاتەوە کە بۆچی بەڕای ئەو بەرهەمگەلی شاعیرانەو هونەری وێرانگەری سیفەتە شکۆمەندە مرۆیی‌یەکان لە لاواندانو هەر بۆیە لە دژی شاعیر و هونەرمەند هەڵوێست دەگرێ، تا ئەو جێیەی شاعیر لە ئارمانجشاری خۆی وەدەردەنێ:" وەلێ ئەگەر کەسێك بێتە وڵاتی ئێمە کە بەهرەی هەموو کارانێکی هەبێو بتوانێ بە هەر بیچمێك خۆی بنوێنێو لاسایی هەموو شتێك بکاتەوەو بیهەوێ شیعرەکانی خۆی بۆ ئێمە بخوێنێتەوە، وەکو پیاوێکە سپیتاو سەمەرەوروژێنو لە دڵاشیرین رێزی لێ دەگرین، وەلێ پێی دەڵێین کە لە کۆمەڵگای ئێمەدا بۆ خەڵکانی وەکو ئەو جێیەك نیە و یاسا ئیزنمان پێ نادا وەها کەسێك لە وڵاتی ئێمەدا نیشتەجێ بێت. رۆنێکی بۆنخۆش لە سەروقژی دەدەینو تاجێکی کوڵکن لە سەری دەنێینو پاشان بۆ وڵاتێکی دیکە رەوانەی دەکەین".(٥)

لە راستەڕێی فێرکاریی هونەر و بە سەرنجدان لە هەرەپێویستی کاراییەکانی بەرهەمی هونەری، ئەفلاتون تەنیا شیعرگەلێ پەسند دەکا و ئیزن پێدراو دەزانێ کە بە راشکاوی لە

(٥) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٩٦٨.

پەسنی سیستمی ئایدیالیی کۆمەڵگای ئەو بن، لەو شتەی بە مەزنی لێیان دەدوێ داکۆکی بکەین‌و هیچ سیفەتێك کە ئەو ناپەسندی دەزانێ پەسن نەکەین. بەم شێوەیە لە پەرتوکی سێیەمی **کۆمار** ڕۆشن دەکاتەوە کە شاعیران تەنیا لە پەسنی خوایان‌و لە بەیانکردنی دلێری‌و مەردایەتی، دڵاوایی و بۆشناخی و... ئازادن کە شیعر بهۆننەوە و زیاتر لەمە نابێ بچنە پێشێ‌و هەر بۆ نموونە تەنانەت مافیان نیە کە لە ترس و دوودڵیی ئەو دنیا بدوێن،[٦] یا مەرگ ترسهێنەر نیشان بدەن، یا پاڵەوانانی ڕۆژگارانی رابردوو لە دۆخی شین‌وگریان نیگارنوێن بکەن،[٧] یا مێرخاسان لە حاڵەتی پێکەنین نیشان بدەن. لەمەڕ ئەمەی دوایی هۆیەك دێنێتەوە کە: "لاوانی ئێمە نابێ تامەزرۆییەکی زیاد لە پێویست نیشان بدەن، چونکە پێکەنینی زۆر بەردەوام وەڕسیی زۆری بەدواوەدێ"[٨]. سەرەنجام ئەفلاتون لە هەمووش زیاتر تێ دەپەڕێنێ:"بەس نیە کە تەنیا لە کاری شاعیراندا کەتوانە*بکەین ئەوان ناچار بکەین کە لە شیعرەکانی خۆیاندا سیفەتە باش‌و توانامەندییە مرۆیی‌یەکان زەق بکەنەوە و گەر وانەبێ لە شیعر گوتن لە شارەکەماندا خۆ ببوێرن، بەڵکو دەبێ کەتوانی** هەموو هونەرمەندان‌و پیشەوەران بین‌و نەهێڵین چ لە نیگارکێشی‌و چ لە پەیکەرسازی، چ لە تەلارسازی و چ لە بەرهەمەکانی دیکە کە دەیان خوڵقێنن سیفەتگەلی ناپەسند لە جۆری بەرەڵڵایی‌و نەفس نزمی و دزێوی دەربخەن و ئەگەر نەتوانن یەکانگیر لەگەڵ ئەم رێسایە کار بکەن ، دەبێ ڕێ لە ڕەخساندنی بەرهەمە هونەرییەکان لە لایەن ئەوانەوە بگرین".[٩]

لە دیدی ئەفلاتونەوە لەنێوان "پوئسیس" واتە سازکردن‌و داهێنان لەگەڵ "تێخنە" واتە پیشەو تکنیك‌و سەنعەتگەری جیاوازیی ئاشکرا و دیار نییە و ناتوانی بۆ هونەرمەند بە

(٦) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٩٥٢-٩٥٣.

(٧) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٩٥٣.

(٨) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٩٥٥.

* نظارت: (ناظر) ، هەنبانە بۆرینە، هەژار.

** کەتوان: (ناظر) ، هەنبانە بۆرینە، هەژار.

ئەمە لەگەڵ کەتوار بە واتای (واقع ـ واقعیّت) تێکەڵ نەکرێت. کەت + وار بە واتای (کەوتە وارەوە) وار: شوێن، لە دۆخی پاشگر.

(٩) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٩٧٣.



قەواڵەی پەیوەستبوونی چالاکییەکانی بە قەڵەمڕەوی ئازادی لە ئەفراندن‌و داهێناندا مافێکی تایبەتی ڕەوا بزانی. ئامرازی ڕەخنەکاریی کاری هونەرمەند لە بنەڕەت را خۆی هەمان ئامرازی ڕەخنەکاریی هەر ڕەنێوهانینێکی دیکەی مرۆییە. ئەم رایەی ئەفلاتون لەمەڕ بەسترانەوەی ڕەژیدەیی بە یاسای سودبەخشیی کۆمەڵایەتی هێشتاش لەقاڵبی تێڕوانینێکی سەرەڕۆیانە بۆ هونەر لەجێی خۆیەتی. ئەم تێڕوانینە بۆ هونەر تەنیا لە گۆشەی ئەرکە کۆمەڵایەتییەکانی (دەور و نەخشی ڕەوشتی، دینی، فێرکارییەکان‌و...ی) داوەری دەکا و بەردەوام چاوەدێری لەسەر کاری هونەرمەند پاساو دەداو بە ڕەوای دەزانێ. خۆشبەختانە رای ئەفلاتون لە مەڕ هاوشێوەیی "تێخنە"و "پوئسیس" تاقانە ئاخاوتە لە فەلسەفەی هونەردا نەبوو، هەر بۆ نموونە جێی پەسندی گەورەترین قوتابیی ئەو، واتە ئەرەستۆ، دەرنەچوو. ئەرەستۆ لە وتارنامەی **پۆیەتیك** دا لەنێوان چەشنەکانی بەروبوومەکانی کاری ڕەنێوهێنەریی مرۆیی جیاوازیی دانا و لەو نێوەدا هونەری زەق کردەوە. ئەگەر ئەمڕۆ بڕیارێکی چەقبەستووی سەرەڕۆیانە کە ڕادەگەیەنێ دەبێ هونەر لە گۆشەی ئەرکەکانی لەبەرچاو بگرین، قبووڵ ناکەین، لەبەر ئەمەیە کە لە ئەرەستۆ فێر بووینە کە لەنێوان بەرهەمی هونەری‌و هەر ڕەنێوهانینێکی دی جیاوازی دابینێین، کە هێشتا نەمانتوانیوە دووخاڵی جیاواز، واتە بەرهەمی هونەری‌و بەروبوومێکی ناهونەری پێناسە بکەین. ئەرەستۆ خۆیشی کە دەسپێکەری باس لە جیارکاریی نێوان "تێخنە"و "پوئسیس" بوو، خۆشبەختانە بە پێناسەگەلی هەمەکی، ئەبستراکت، بنەتایی‌و بانمێژوویی کۆتایی پێنەهێنا. جیاوازیی نێوان بەرهەمی هونەری‌و بەروبوومەکانی تێکنۆلۆژی وەبیرخەری هێمای سێنت ئۆگۆستین (کە چەندین سەدە پاش ئەرەستۆ دەژیا) بە سەردەمە. ئەو لە پەرتوکی **دانپیانانەکان** دا گوتویەتی کە تا کاتێك کە کەسێك لە منی نەپرسیبێ کە سەردەم چیە، وای بۆ دەچم کە وڵامەکە دەزانم‌و دەتوانم کات‌و سەردەم پێناسە بکەم، وەلێ هەرکە کەسێك لێم بپرسێ سەردەم چیە، تێبینی دەکەم کە پێناسەیەك لەوم لە بەردەستدا نیە. هەر بەم شێوەیە تا ئەم مەسەلەیان لە ئێمە نەپرسیبێ کە جیاوازیی نێوان بەرهەمی هونەری وەکو بەرەنجامی "پوئسیس" یا وزەی‌داهێنان، لە بەروبوومەکانی دیکەی ڕەنێوهێنەری (وەکو بەرەنجامەکانی "تێخنە" یا تێکنۆلۆژی) کامەیە، لامان وایە کە وڵامەکە دەزانین، بەڵام کاتێك کە ـ لە بەرهەر چییەك ـ ناچار ببین کە لەم پرسیارە وردتر سەرنج بدەین، دەبینین کە لە ڕاستیدا وڵامێکی بنەتایی‌و لێبڕاومان لە بەردەستدا نیە. بەمەشەوە، ئێمە هەروا "هەرە پێویستی"ی بوونی جیاکاری لەنێوان هونەر و

ڕەنێوهێنانە "ناهونەری"یەکان هەست دەکەین. هەر بەو چەشنەی کە هەرەپێویستیی تێگەیشتنێك لە کات هەست دەکەین. بە دەربڕینی بە ناوبانگی بێرگسۆن، ئێمە درك پێکردنێکی چەندێتیانە لە کات دادەهێنین، چونکە ناتوانین درك پێکردنێکی نێواخندۆزییانەی خۆمان لەو پێناسە بکەین. هەر پێناسەیەك کە تا هەنووکە لە هونەر کراوە درك پێکردنێکی بەدەر لە نێواخندۆزی‌یە کە ناتوانێ پێناسەی بنەتایی‌و تەواو بێت‌و لە هەمان کاتدا هەرە پێویستیی درك پێکردنێکی نێواخندۆزییانە لەو نیشان دەدا.

بە سەرنجدان لەمە کە بە هاویەك زانینی بەرهەمی هونەری لەگەڵ بەروبوومەکانی ڕەنێوهانین‌و تێکنۆلۆژیی مرۆیی دەتوانێ دەرکردنی بڕیارە سەرەڕۆ و تۆسنەکان، هاوشێوەی فرمانەکانی ئەفلاتون دژی هونەر و هونەرمەندی لێ بکەوێتەوە، ئێمە کە هەر کامان تا ئاستێك و تا رادەیەك لە تەك هونەر سەروکارمان هەیەو چەندقات ڕێخۆشکەریی ئەوەش لە ژیانی فیکری‌و تاکەکەسیی خۆمان ئەزموونمان کردوە و زانیومانە پێویستیمان پێیەتی‌و دان بەوە دادەنێین کە لە تێکڕای کولتورە مرۆیی‌یەکان بە شێوەیەك لە شێوەکان ڕەنێوهانینی بەرهەمە هونەرییەکان پێشڤەچوە و لە ریزی کارەکان‌و چالاکییەکانی پلە باڵای مرۆڤ ناسراوە، بەم بەرەنجامە دەگەین کە دەبێ بتوانین هێڵێکی هاوێرکەرەوە بکێشینەوە کە بەرهەمی هونەری لە وەبەرهاتوەکانی هزر وکاری مرۆیی جیادەکاتەوە. دەتوانی ببینی کە فەلسەفەی هونەر و جوانیناسی لە سەر بنەمای هەوڵ‌و تێکۆشانی دانەدووکەرانە بە مەبەستی هێڵ‌کێشانەوەی وەها پەڕژین‌و سنورێك بیچمی گرتوە و هەرچەند هەزاران خاڵی دیکەش لە ڕەوتی پێشکەوتنی توێژینەوە لە قەڵەمڕەوی ئەو لق‌وپۆیانەی هزرینگەریی مرۆیی هاتۆتە پێش، بەردەوام ئەو خاڵەی سەرەوە لە نێوەندی باس و کاردا جێی‌گرتوە. هەر بۆیە،سەرنجدان لە کاری کەسانێك کە لە کێشانەوەی ئەم هێڵە تێهزریون، دەتوانێ دڵکێش‌و هیراگەر بێت. بەڵام لە یادمان نەچێ کە ئارەزووی کێشانەوەی هێڵی هاوێرگەر شتێکە و گریمانی دەستڕاگەیشتن بە بەرسڤی بنەتایی‌و لێبڕاوانە شتێکی دی. بەو چەشنەی کە پێشتر دیتمان، ناکرێ ئەو هێڵە کێشراوە و ئەو سنورە لێبڕاوانە وەدەستهاتوو گریمان بکەیت، چونکە هێشتا پێناسەیەکی هەمەلایەن‌و کورت‌وپوخت لە هونەروبەرهەمی هونەری نەخراوەتەڕوو و بەپێی هۆگەلێ کە هێناومانەتەوە وەها پێناسەیەك ناتوانێ بێتە ئاراوە ـ ئەم کەتوارە کە هێشتا وەها سنورێك نەکێشراوەتەوە و هزرڤانانێك کە لە بارەیەوە هەوڵی خۆیان خستۆتەگەڕ، جیا لە توانا سەرسورهێنەرە زەینی‌و زانیاریی بەرینیان، نەیانتوانیوە دوایین ئاخاوتە بێتە سەر زمان، خۆی دەتوانێ هۆیەك بێت کە



ئێمەش کاری خۆمان بنەتایی و خاڵی کۆتایی باس‌و پەیجۆر نەزانین. بەوەشەوە کەڵکەڵەی هاوێرگەری لەنێوان هونەر و بەدەرلەهونەر بەردەوام یەکێك لە دەرنگخایەنتر و باڵادەستترین کەڵکەڵە فەلسەفییەکان بووە. لە تێکۆشان لەسەر کێشانەوەی ئەو سنورە، بەردەوام پرسیارانێکی تازە سەریان هەڵداوە و خاڵگەلی تازە ڕۆشن بوونەتەوە کە پێشتر مرۆڤ لێیان تێهزریبوو و ئەمە یەکێك لە سودەکان‌و لەو هۆیانەیە کە درێژەی کار و هەوڵدان لەم ڕێچکەیە پاساو و هان دەدا.

## (٣)

ئەمە بەرهەمی ئەدەبی نیە کە بە بابەتی پۆیەتیك دەزانرێت. بابەتی تایبەتی (بەرهەمی ئەدەبی) تایبەتمەندییەکانی ئاخێوێکی تازەیە کە ناوی ئاخێوی ئەدەبی‌یە... ئەم زانستە چیدی لەگەڵ ئەدەبیات دەمەدەمە ناکات، بەڵکو لەگەڵ ئەدەبیاتی لواو، لە تەك تایبەتمەندیگەلێکی ئەبستراکت کە تایبەتمەندیی تاقانەی بەرهەمی ئەدەبی دەخوڵقێنێ، لەگەڵ ئەدەبیبوون، سەروکاری هەیە".

تزڤیتان تۆدۆرۆڤ [١٠]

هەموو ساڵێك، بەتایبەت لە ڕۆژانی پشووی هاوینە، خەڵکێکی زۆر بۆ دیتنی ئەشکەوتەکانی لاسکۆ لە پارێزگای دوردونی فەرەنسا، لە باکووری ڕۆژئاوای ئەم وڵاتە،دەچن. دیوارەکانی ئەم ئەشکەوتانە بە وێنەی مانگا و مامزان نەخشاون. لەساڵی ١٩٤٠ کە ئەم نیگارانە دۆزرانەوە هەتا ئەمڕۆ، توێژینەوە لەبارەی کۆنی و دێرینیی نەخش و نیگاری سەر دیوارەکان درێژەی دراوەتێ و ئیدی بە دڵنیاییەوە مەزەندە دەکەین کە نزیکەی حەڤدە هەزارساڵ لە مێژووی کێشانەوەیان تێپەڕیوە. سەیرانکەرانی ئەشکەوتەکان لە فەزای نیوەتاریك، بەسەرسامی و ڕێزلێنانەوە لەو نەخش و نیگارانە دەڕوانن کە نزیکەی چواردە هەزار ساڵ بەر لە پەیدا بوونی ڕێنوس و کولتووری نڤیسیاری کێشراونەتەوە. مەودای کات و سەردەمی ئێمە لەگەڵ مرۆڤێك کە ئەم نەخش و نیگارانەی کێشاوەتەوە، حەوت بەرابەر زیاتر لە مەودایەکە کە ئێمەی لە ئەفلاتون جیاکردۆتەوە.

---

(10) T.Todorov, poetiqe, paris, 1968, pp.19-20.

ئێمە لەبارەی نیگارکێشێك کە کارەکەی لەسەر دیوارەکان نەخشی بەستوە هیچ شتێك نازانین. بۆ ئەم وێنانەی دەکێشایەوە؟ ئایا ئەم نەخش و نیگارانەی  بە خەیاڵی ئاسانکاریی راوکردنی ئاژەڵان کێشابوویەوە؟ ئایا نیگارەکان کۆمەڵێك تەوتەم بوون و نیگارکێش و ئەوانیدی بە پەرەستنی خۆیان ناچار دەکرد؟ ئایا لە بنەڕەت را بە کەڵکی شتێك دەهاتن، یا تەنیا لە بۆ سەرگەرمی دەکێشرانەوە؟ ئایا بەناوی بەرهەمانێکی هونەری دەخولقان و وەهاش پەسند دەکران؟ هەموو ئەمانە نازانین و هەرگیز ناشزانین. بەڵام بیرمان بە لای هەندێ خاڵدا دەچێ: یەکەم ئەوەیە کە ئەم نیگارانە بە چ ئامرازێك کێشراونەتەوە،دووەم ـ و گرنگتر ـ ئەمە کە نیگارکێشی ئەم نیگارانە، وێنایەکی لە" گشت قەڵافەتی" ئاژەڵان لە مێشکدا هەبووە. ئەو نەیدەتوانی ئەندازەکان ڕەچاو بکات، هەر کاتێك لە سەرەتاوە چەمکێك لە هەمەکێتی لە مێشکیدا نەبوو، چۆن دەیتوانی بوونەوەرێك کە قەبارەیەکی هەیە و فەزایەکی داگیر کردوە، لەسەر دیوار لە دوو ڕەهەند دا گەمارۆ بدات، ئەگەر وێنایەکی لە کۆی بوونەوەرێك کە دەبایە بکێشرێتەوە، لە مێشکیدا نەبایە؟هەر بەو چەشنەی کە ئێمە ئەمڕۆ بە بێ وێنایەك لە هەمەك و ئاکامی کار، ناتوانین شتێك دروست بکەین، تەنانەت ئەگەر ئامانجمان کێشانی نیگارێکی ئەبستراکت بێ. تەنانەت لە نیگارکێشانی ئەبستراکت یا لە نڤیسیارە میکانیییەکان بەو شێوەیەی کە سورریالیستەکان مەبەستیان بوو، واتە لە پێشان وێنایەکی لێڵ و ناڕوون لە کارێك کە دەمانەوێ ئەنجامی بدەین، لە مێشکمانە. توانایی هێنانە زەینی شتێك، بەر لە هەرچەشنە هەوڵێك بۆ دروستکردنی توانایییەکی ئاکامناسانەیە کە تەنیا دەتوانێ کاری زەینێکی هۆشمەند بێت. نیگارەکانی ئەشکەوتەکانی لاسکۆ، لەبەرئەوەی کە لە ئێمەدا هەستێکی( بۆنەیی)  لەگەڵ ڕێزێکی بێ پایان دەوروژێنێ کە تێبینی دەکەین کە لەگەڵ کارێکی مرۆیی و ئاکامناسانە بەرەو ڕووین. کارێل مارکس لە **سەرمایە** دا نووسیویەتی کە کاری خراپترین تەلارسازان لە کاری کارامەترین هەنگەکان لە دروستکردنی کەنوو و لە کاری وردی جاڵجاڵۆکە لە چنینی تەونەکەی گرنگترە، چونکە تەنانەت تەلارسازێکی هەڵەشە و ناشارەزاش هەر لە سەرەتاوە ـ تەنانەت بەر لە دەست پێکردن بەکارـ دەزانێ کە دەیەوێ بە چ شتێك بیچم بدات:" لە کۆتایی هەر بانهەڵکشانێکی کار، ئێمە بەرەنجامێك وەدەست دێنین کە لە فیکری کرێکار، بەرلەوەی دەستی بەکار کردبێ هەبوو و لەم ڕووەوە بە نەخت لە شێوەی بیرۆکە(ideel)  لە ئارادا بوو."[11]

(11) K.Marx, capital, trans.B.Fowks, London, 1976, vol.1.p.284



ئێمە بەهێنانە پێشەوەی خدەی ئاکامناسانە، توانیومانە کاری نیگارکێش یا نیگارکێشانی لاسکۆ بە "مرۆیی" ناودێر بکەین، بەڵام هێشتا ڕۆشنمان نەکردۆتەوە کە جیاوازیی ئەم کارە لەگەڵ کاری مرۆیی لە دروستکردنی پەرداخێك یا شتانی دیکە لە کوێدایە. ئەفلاتون گەوهەری هەردووك ئەمانەی بە یەك شت دەزانی و لە" تێخنە" دەدوا، بەڵام ئەرەستۆ ڕێگەی بۆ باس و تێڕوانینێکی تازە خۆش کرد. ئەو بەبێ ئەوەی لە زاراوەی" جیهانی بەرهەم" دەدوێ، چەمکی سەرەکیی ئەوەیشی لە وتارنامەی پرشنگداری **پۆیەتیك** بەکارهێنا و کت ومت هەر ئەم چەمکە بووبە ڕێخۆشکەری تێڕوانینێکی تازە کە هێشتاش لە جوانیناسیی ڕۆژگاری ئێمەدا لە گۆڕێدایە.[12] خاڵی جێی سەرنج ئەمەیە کە تاکەکانی مرۆڤ لە ڕەوتی ئەفراندنی هونەری دەتوانن ـ و لە ڕاستیدا ناچارن ـ لە بەرتەسکییەکانی وەبار هاتووی کاراییی شتان تێپەڕن و بانتر هەڵکشێن. چونکە هەرەپێویستییەك لە گۆڕێ نیە کە بەرهەمی هونەری لە جیهانی ڕاستەقینەی ژیانی ڕۆژانە جێ بگرێت، بەڵکو بۆ دنیایەکی دی دەخولقێت. پەرداخ لەم جیهانەدا بەکەڵکی شتێك دێت و گشت ڕێساکانی لەسەر بنەمای ئەم هەنتەشی پەرداخە لە جیهانی ڕۆژانە سەردەردێنن و واتا پەیدا دەکەن. کاتێك پەرداخێك دروست دەکەین، لە پێشان ئاگادارین کە ئەم پەرداخە دەبێ بەکەڵکی خواردنەوەی ئاو و تراوەکانی دیکە بێت. لە ڕاستیدا، سەبارەت بەم ئەرکەیە کە ڕەنجی دروستکردنی دەگرینە ئەستۆ. ئەم ڕۆڵی تایبەت یا ئەرکەی پەرداخ هەندێ کەندوکۆسپ لە ڕەنێوهێنانی لێ دەکەوێتەوە. هەر بۆ نموونە، دەبێتە هۆی ئەوە کە لە کەرەستەگەلی تایبەت کەڵك وەرگرین، بیچمێکی تایبەت ساز بکەین و لە ڕێساگەلی دیاریکراو لە فرمانی دروستکردنی پەیڕەوی بکەین. کاتێك نیگاری پەرداخێك دەکێشینەوە، بەرلەهەمووشتێك لە جیهانێکی دیدا، بەدەر لە جیهانی ژیانی ڕۆژانەمان دای دەنێین. جیهانێك کە بە" هونەری" ناودێری دەکەین و لە دەستنیشانکردنی ویستی خۆماندا ڕۆڵێکی گەورەی هەیە و یەکلاکەرەوەی بیچمێك کە

لە وەرگێڕانی ئینگلیزیی **سەرمایە** چاپی مۆسکۆ بەشی کۆتایی ڕستەکە ـ ڕەنگە بە خەیاڵی ئەمە کە قسەکەی مارکس ئایدیالیستیيەـ وەلانراوە.

K.Marx, capital , Moscow , 1978, vol.1.p.174

(١٢) وتارنامەی **پۆیەتیك** ی ئەرەستۆ دا چەند جارێك بە فارسی پاچەڤە کراوە و ژێدەری کاری من لەم وەرگێڕانەدا ئەمە بووە:

ارسطو،**فن شعر**،ترجمەی ع.زرین کوب،تهران،١٣٥٣

کێشاومانەتەوە دەبێت. ئەمە ئێمەین کە دەتوانین بڕیار بدەین کە ئایا ئەم پەرداخە نیگار کراوە بێنینە نێو ژیانی ڕۆژانەمانەوە (وەکو کارە گرافیکییەکان لە ریکلامدا) یا لە واری ژیانی نەخەین (وەکو پەرداخێك کە مگریت نیگاری کردوە). ئەمە ئێمەین کە بڕیار دەدەین پەرداخ لە کام" جیهانی بەرهەم"دا جێ بکەینەوە. ڕاستە کە ویستی ئێمە لەمبارەوەش ناکۆتا و بێکەوشەنە و بە پێی سەرباشقە هونەرییەکانی ڕۆژگاری خۆمان (کە خۆی بە سەرباشقە زانستی، تکنیکی، فیکری و فەرهەنگیی سەردەم دیاری دەکرێ) بیچم دەگرێ، بەڵام قەڵەمڕەوی ئازادیی ئێمە لە ڕەوتی ئەفراندنی هونەریدا ئێجگار بەرینتر لە چوارچێوەی ئازادیی ئێمە لە دروستکردنی پەرداخێکی ڕاستەقینە لە جیهانێکی ڕاستەقینەی ژیانی ڕۆژانەمانە.کاتێك نیگاری پەرداخێك دەکێشین، دەتوانین بچینە ژێر ڕکێفی ڕێساگەلێکەوە و کاری خۆمان لە لاساییکردنەوەی شتێك کە دەبینین قەتیس بکەینەوە. بەڵام دەتوانین وەها کارێك نەکەین و پەرداخەکە وەها خۆمان دەمانەوێ بەلامانەوە دروست و شیاو یا جوان بێت، بکێشینەوە، واتە چەند لایەنێکی بە پێی حەزوئارەزوی خۆمان هەڵبژێرین (و لەم دۆخەدا لە تەنگ و چەڵەمەی کاری خۆمان کەم بکەینەوە) و چەند لایەنێکی دیکەی یەکسەر پشتگوێ بخەین. ئەگەر نیگارکێشی" هاوشێوەکێش" خۆی بە تەواوی پابەند و سنوردار زانیبا، نیگارکێشی ئەمڕۆ، بە تایبەت لە پاش ئەزموونی کوبیزم، ئەم سنووردارییەی پەسند نەدەکرد. کوبیزم ئایدیالی نیگارکێشی مودێڕن دەردەبڕێ کە لەودا شتێك کە نیگارکێش تێدەهزرێ گرنگە، نەك شتێك کە ئەو دەیبینێ. تەنانەت، لەو خاڵانەدا کە نیگارکێشەکان کاری خۆیان یەکسەر بەدەر لە پەیڕەوی لە ڕێساگەلی زاڵ و تایبەتی نیگارکیشان درێژە دەدەن، ئاگادارن کە ئەم ڕێسایانە ڕەها، جێی پەسندی هەموان، هەرمانو هەمیشەیی نینو خۆشبختانە مرۆڤ بەردەوام بەم خدە گۆڕانهەڵگرەی ڕێساگەلی هونەری زیاتر لە توانای گۆڕانی ڕێساکانی هەر شتێکی دیکە ئاگادار بووە. یەکێك لە هۆیەکانی ئەم خاڵە هەرە پێویستیو مکوڕیی بنەواشەی تازەگەری لە هونەرە، کە بەردەوام هەبووەو داوەریی بەرهەمی هونەری بە بارتەقایەکی زۆر ئاگاداری لایەنە تازە و جوانکارییەکانی کردوە. سەرنجدان لە فراژووبوونی مێژوویی هەر هونەرێکی تایبەت لەمبارەوە ئێجگار هیراگەرە. هەر بۆ نموونە، نەبوونی پرێسپکتیڤ، لە نیگارکێشی پێش ـ ڕێنسانسی ئەوروپا بەباشی نیشان دەدا کە ڕێساکانی نیگارکێشان بە شێوەیەکی ڕێککەوتەیی لە گۆڕێدانوپەسنددەکرێنو بنەواشەش ڕۆنراوی هەرەپێویستیی ڕەچاوکردنیان نیە و ئەگەر لە سەردەمێکدا ڕەچاو دەکرێن لە بەر هەبوونی



متمانەو باڵا دەستیی سەرباشقەکانی هونەرێکی تایبەتە کە لەگەڵ سەرباشقەگەلی زانستی، تکنیکی، فیکریو فەرهەنگیی ڕۆژگاردا یەکانگیرن. بەڵام ئەم سەرباشقانە ڕێیتێدەچێ لە نێوبچن، یا بگۆڕدرێن. لە ڕاستیدا هەمان توانای مرۆیی "هێنانە زەین"وە یا "گەڵاڵەرێژی" کە بە ئاکامناسانە ناومان لێنا، خۆی لەسەربنەمای یەکانگیریی سەرباشقە هونەرییەکان لەگەڵ سەرباشقەگەلی زانستی، فەلسەفی، ڕەوشتیو... دەلوێ. بە دەربڕینی باشتر لە دیاریکارییەکانی "ئاسۆی سەردەم"دا جێ دەگرێ، بەڵام هەر ئەم خاڵەش بە باشی نیشان دەدا کە بەرتەسکییەکانی نیگارکێشان سەرچاوەی سروشتیو چیەتیانەیان نیە، بەڵکو لە بنەتادا پەیوەستن بە ڕێککەوتنە نیشانە ناسانەکان.

گرنگیی نیشانەناسی لەمەدایە کە نیشان دەدا لە ئافرێنەریو لاساییگەریی هونەریدا مەسەلەی ئەركو سودەکانی بەرهەم مەسەلەیەکی گەوهەریو پێوەندیدار بە خدەی بەرهەمی هونەری نیە. بە سەرنجدان لەم خاڵە کە لە هەر کاروچالاکییەکدا لایەنی ئەرکیی ڕەنێوهانینی،ڕەژیدەی سنورداریی سەرەکییە، کەوابوو بە گریمانی دەربازبوونی بەرهەمی هونەری لە وەها سنوردارییەك دەتوانین لە جۆرێك ئازادیی ڕێژەیی هونەرمەند بدوێین. واتە هەرکات لەگەڵ نیشانەناسان هاوڕاببین کە بەرهەمی هونەری بە شێوەیەکی گشتی، دەتوانێ ملکەچی ئەرکگەلی کۆمەڵایەتی نەبێت، یا هاوزمان لەگەڵ ئەرەستۆ بێژین کە لە هونەردا مەسەلەی گرنگ نەك "ئەو شتەی کە هەیە" بەڵکو "ئەو شتەی کە دەبێ هەبێ یە، دەگەینە ئەم بەرەنجامە کە بەرهەمی هونەری بە بارتەقای بەروبوومەکانی دیکەی تێکنۆلۆژی مرۆڤ بەرتەسكو پابەند نیە. بە دەربڕینی دی لە هونەردا ئێمە ئازادی ئەزموون دەکەین. نەبوونی هەرە پێویستیی ئەمە کە بەرهەمی هونەری لەگەڵ سودەکانو ئەرکەکانی دیاری بکرێت ـ کە هەڵبەت شتێکی ڕێژەیییەو لە قۆناخە جۆربەجۆرەکانی مێژوی هونەر بیچمگەلی هەمەجۆر و ئێجگار فرە چەشنی پەیدا کردوە ـ ڕەنگە لە ڕواڵەتدا وەهاگرنگ نەیەتەبەرچاو، وەلێ دەتوانێ بە خاڵێك ئەژماربکرێت کەباسی جیایی بەرهەمی هونەری لە بەروبوومەکانی دیکەی تێکنۆلۆژیو ڕەنێوهانین لەوەوە دەست پێبکاو بیچم بگرێت. دەزانین کە لە جوانیناسیی کلاسیکدا، بە تایبەتی لە **هەڵسەنگاندنی وزەی داوەری ی کانتدا**، ئەم بنەواشەیە لە پێناسەی جوانی بە کارهاتوە و یەکێك لە چوار ڕوخساری سەرەکیی پێناسەی جوانی دێتە ئەژمار. ئێمە ئەگەر پەرداخێك بەر لە دروستکردن، یا لە ڕەوتی کاردا، یا لە پاش دروست کردن، لە جیهانێکی "بیرۆکەیی" بنەجێ دەکەین، بە مەبەستی بەراوردکردنی لەگەڵ پەرداخێکی

دیکەیە کە ئەرکی سەرەکی و جێی مەبەستمان لە پەرداخ دێنێتە دی. لە کاتێکدایە کە بە دانانی بەرهەمی هونەری لە جیهانێکی بیرۆکەیی، نامانەوێ لە دیمەنگەی ئەرکییەوە لێی بڕوانین. بەرهەمی هونەری لەگەڵ بەرهەمێکی دیکە بەراورد ناکەین تا بزانین کە ئایا "ڕۆڵی تایبەتیی کۆمەڵایەتی خۆی" کتومتو تەواو دێنێتەدی یان نا. دەلوێ بۆ بەرهەڤکردنی ئامانجێکی زانستیو هیراگەرانە وەها بکەین، وەلێ لەم دۆخەدا بەرهەمی هونەریمان نەك لە ژێر ناوی بەرهەمی هونەری، بەڵکو وەکو بەڵگەنامەی زانستێك یا هیراگەرییەك لەبەرچاو گرتوە، واتە بۆ مەبەستێکی دی بەدەر لە مەبەستی جوانیناسانە وەگەڕمان ختسوە. دەلوێ کەسێك بڵێت کە ئەم بەرهەمە هونەرییە لەویدی باشتر خزمەتی ئامانجێکی رەوشتی یا سیاسی بکات، وەلێ لەم دۆخەدا ئەو بەرهەمەکەی بە هونەری نەزانیوە، بەڵکو ئەوەی بە ئامرازێك بۆ راژەی ئامانجێکی ناسراو و لەم ڕێڕەوەدا بەراوردی سەقامگیر کردوە. لە راستیدا، کاتێك بەرهەمی هونەری لە پلەوپایەی بەرهەمێکی هونەری لە بەرچاو دەگرین، ئەوە لە جیهانی بەراوردە لۆژیکیو ئاوەزمەندانەکان، واتە لەدنیای چەندو چۆنییەکان جێیێ ناکەینەوە، بەڵکولە قەڵەمڕەوی بێ سنوری ئازادی بنەجێی دەکەین، جێیەك کە دەمانەوێ و دەبێ لە هەرچەشنە هەرەپێویستیو سنورداری رزگار بین. جیهانی دەق، یا جیهانی بەرهەمی هونەری دنیایەکە کە هونەرمەند ئازادانە لەودا بە شتێك کە خوازیاریەتی، بە ئایدیالەکانی، ویستەکانیو بە دوارۆژی بیچم دەدا. تێکڕای بەروبوومە رەنێوهێنەرییەکان، جگە بەرهەمی هونەری، خدەی روودرانیان هەیە، واتە بەروبوومی کاتی ئێستان، هەواڵی رابردو دەگەیەنن و پێداویستیەکی ئەمڕۆیی بە کەڵك وەرگرتن لە ئەزموونگەلی مێژویی (واتە ئەزموونگەلی ئەمڕۆ ودوێنێ) بەرهەڤ دەکەن. رووداو گرێدراوی رابردو و ئەمڕۆیە، لە حاڵێکدا کە تەنیا دەتوانی داهاتوو پێشبینی بکەیت. داهاتوو رووداو نیە. داهاتوو لە رەوتی تکنۆلۆژیو رەنێوهانینی تکنیکی مرۆیی لە شێوەی ئەرکیدا دەردەکەوێو لەودا بنجبەست دەبێت. شتێك ئەمڕۆ دروست دەکرێ تا سبەینێ بە کاربێت. داهاتوو لە رەنێوهانیندا بەرتەسك و کۆت دەبێو بە هیچ شێوەیەك قەڵەمڕەوی ئازادی نیە. لە هیچ کام لە بەروبوومە رەنێوهاتوەکانی ئێمە دوارۆژ بەو بیچمەی کە بەدەر لە هەر دیاریکاری و ئەرك بێت، دەورناگێڕێت، مەگەر لە بەرهەمی هونەریدا. بەرهەمی هونەری نەك تەنیا لە رابردو و ئێستا هەواڵمان دەداتێ، بەڵکو بە دوارۆژ، بە ئەگەر و شیمانیش گرێ دەدرێ. هەر ئەمە کە شتێك کە دەمانەوێ هەبێ وێنا دەکەین یا لە پەیکەرێکی مەتریالیدا دەیخولقێنین، لە خدەی روداوێك رزگار و بە دوارۆژە



پەیوەستی بکەین. واتە نە لە زیندانی تاکە چارە نووسێك،بەڵکو لە قەڵەمڕەوی ئازادی بنەجێی دەکەین. هەر ئەمە کە شتێك نەك سەبارەت بە سودی هەنوکەیی یا قازانجداریی ئەمڕۆیی خۆی، یا وەکو بەڵگەنامەیەك لە سودەکانی دوێنێ، بەڵکو سەبارەت بە دەربڕینی ئارەزویەك کە بۆ سبەی رۆژ هەمانە، وێنابکەین یا دروستی بکەین، ئەوەمان بانتر لە لایەنی روودانو وەکو هەمەکێتییەکی هەرەتمەند، شتێك پێکبەستراو بە دوارۆژ، هێنانەوەتە گۆڕێ. ئارەزوی ئێمە بۆ سبەی رۆژ، ناتوانێ بەدەر لە درك پێکردنی هەنوکەیی ئێمە لە ئازادی و هەڵبەت لە هەرەپێویستییە ئەمڕۆییەکان بێت. بەرهەمی هونەری "نا ـ هێشتا ـ ئازادی"یە. هەربۆیە خودی ئازادی نیە، بەڵکو ئەزموونی ئازادییە. بەرهەمی هونەری دوارۆژ بۆ هەنووکە رکێش دەکات. ئێمە بە گەڵاڵەکردنی شتێك کە بەلامانەوە"دەبێ هەبێ" یا "دەبایە هەبا"، شتێك کە "دەبێت" دروست دەکەین. کتومت بەم واتایەیە کە والتێر بنیامین دەیگوت یەکێك لە گرنگترین ئەرکەکانی سەرشانی بەرهەمی هونەری ئاتاجگەلێکە کە هێشتا کاتی بەرهەڤکرانیان نەهاتوە،[١٣] و لە زاری ئاندرە بێرتۆن دەینوسی: "بەرهەمی هونەری تەنیا کاتێك پڕبایەخ ئەژمار دەکرێ کە لە لەرینەوەکانی داهاتوو وەلەزرین بکەوێ".[١٤] بە دەربڕینێکی سادەتر ئێمە شتێك دەخەینە نێو رووداوە هەنوکەییەکانی دەرەوە و جیهانی رووداوگەلی سبەی رۆژی، دوارۆژ، جیهانێك کە لە دنیای ژیانی رۆژانەمان جیایە. ئێمە لە بەرهەمی هونەریدا دەچینە نێو "جیهانێکی دی"، واتە "دنیای دەق یا بەرهەم". جیهانێك کە ئەمڕۆی، سبەینێی ئێمەیە.

ئەرەستۆ، کاتێك کە هونەری لە ئاستی "پوئسیس" سەرتر لە تێخنە دەزانیو لە پلەوپایەی ئافرێنەریی دایدەنا و بەرەنجامی وارسکەگەلی وەکو مەیل بۆ لاساییگەریو تامەزرۆیی بۆ فێرکردنو فێرەزانین دەیناسی،[١٥] لە کردەیەکی عەقڵانیو ئاکامناسانە دەدوا و بۆ هونەر پلەوپایەیەکی شکۆمەندی دادەنا. هونەرمەند دەتوانێ بنەتای کار و ئاکامێك وێنا بکات کە هەموان نایزانن. هونەر لە رووداودا قەتیس نابێتەوە کە هەرامەیەکە رووی داوە یا خەریکە رودەدا. هونەر پەیوەستە بە وێنایەکەوە کە لە خەیاڵی هونەرمەند دایە و گەیشتنە

---

(١٣) و. بنیامین، **نشانه‌ای به رهایی**، ترجمه‌ی ب. احمدی، تهران، ١٣٦٦، ص ٢٦٥.

(١٤) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٢٨٤.

(١٥) ارسطو، **پیشین**، صص ٣٠-٢٩ .

ترۆپکی پێگەیشتنی زەینی دەخولقێنێ. هونەر پێوەندیی بەو جوانییەوە هەیە کە دەبێ لە داوڕۆژدا بیچم بگرێت. هەربۆیە ئەرەستۆ شاعیرێتی بەکارێکی فەلسەفیتر لە مێژونوسی دەدایە قەڵەم و بەڕاشکاوی دەینوسی:" کاری سەرەکی و کردەوەی شاعیر ئەمە نیە کە کارو بارەکان بەو جۆرەی کە روویان داوە بگێڕیتەوە و دەری ببڕێ، بەڵکو کاری ئەو ئەمەیە کە کاروبارەکان بەو شێوەیەی کە دەلوێ روویان دابێ بگێڕێتەوە... جیاوازیی مێژوونوس و شاعیر لەمەدا نیە کە یەکێکیان گێڕانەوەی خۆی لە قاڵبی شیعردا وێکناوە و ئەویدی لە قاڵبی پەخشان، چونکە دەلوێ کە مێژوی هێرۆدۆت بهۆنرێتەوە و وەلێ ئەو پەرتوکە هەروا و وەکو خۆی مێژوو دەبێت. بەڵام جیاوازیی(نێوان مێژونوس و شاعیر) *لەمە دایە کە یەکێك لەوان لەو چەشنە پێشهاتانە دەدوێ کە لە راستیدا روویان داوە و ئەویدی قسەکەی لەمەڕ ئەو پێشهاتو رووداوانەیە کە دەلوێ روو بدەن. لەم روەوەیە کە شیعر فەلسەفیتر لە مێژوویەو هەم پلەوپایەی لەو بەرزترە. چونکە شیعر زیاتر لە هەرامەی هەمەکی دەدوێ، لە کاتێکدا کە مێژوو باس لە هەرامەی هەندەکی دەکا".[١٦]

شاعیر یا هونەرمەند جیهانێکی تازە دەخولقێنێو کارەکەی لە دنیای هەنووکەییدا تەسك ناکاتەوە. هونەرمەند بەگەلاڵەکردنی رووداوگەلێ کە دەشێ روو بدەن، هەنگاو لە بازنەی تەنگ و داخراوی رووداو و" دنیای هەنوکەیی" دەهاوێتە دەرێ و شیعر یا بەرهەمی هونەری وەکو بەیانگەر یا ئەرمانەری**" دنیای لواو" دەرەخسێنێ. هونەرمەند بە پێچەوانەی مێژونووس کە زیندانی ئاسۆی رووداوە رووردراوەکانە، لە جیهانی کاروباری پەنگراو و توانستەکانی ژیان دەژیێ، کەوابوو لە جیهانێکی تازە هەواڵمان بۆ دێنێ، دنیایەکی خۆبژێو کە رەنگە برێك لە ماکەکانی یا تەنانەت تێکڕایان لە جیهانی ئاشنا و هەبوو دروست کرابن، بەڵام لە قەڵافەتی هەمەکیی خۆیدا، لە بوونی هەرەتمەندی خۆیدا، لە جیهانی بەڕاستی هەبوو و لە ژیانی رۆژانە بانتر دەکشێ. ئەم بانتر هەڵکشانە، جگە بە ئازادیی خەیاڵ و کردەوەی داهێنەرانەی هونەرمەند نالوێ. ئەرەستۆ تێگەیشتبوو کە هونەر بە ئازادیی مرۆییەوە گرێ دراوە و خەیاڵگەریی مرۆیی جگە بە بەرینبوونەوەی ئەم ئازادییە ناچێتە پێشەوە.

---

* تێبینی لە نووسەرە.

(١٦) هەمان سەرچاوەی، لاپەڕەکانی ٤٧-٤٨.

** ئەرمانەر: نمایشگر، لە دیالکتی هەورامی وەرگیراوە. (وەرگێڕ)



## (٤)

رەخنەی هێرمێنۆتیکی ولاَمگەلی بنەتایی بۆ پرسیارانێکی مرۆیی، بە مانای هەڵسەنگاندنی بیرەکان، بانگەشەکان و ئەو تیورییانەیە کە بە شێوەی هەمە جۆر باوەڕیان بە بوونی" چاودێر ـ داوەر" هەیە. بە پێی روانگەیەکی دێرین و هێشتا برەودار (هەم لە ئەپستمۆلۆژی، هەم لە رەوشت) ، دەتوانی ببی بە ناسێنەری دانا، چاوەدێر و خاوەن ماف کە خاڵی ئەرخمیدۆسیی ئەم دنیایە پەیدا بکەیت و جێ پێی لەسەر قایم بکەیت. بە پێی ئەم روانگەیە، دەتوانی ببی بە چاوەدێرـ داوەرێکی سەربەخۆ لە کات و شوێن، واتە لە پێگەیەکی بانتر لە هەڵوێستەکان، شوێنگەکان، بایەخەکۆمەڵایەتییەکان و جەستەی خۆمان جێ بگرین، جێگەیەك کە لەودا لە پێڕستبەندیی دانایی سەردەم و سەرباشقە زانستی و فەرهەنگییەکانی رۆژگار یەکسەر دەرباز و سەربەست بمێنێتەوە. کاتێك بووینە خاوەنی وەها گوروتینێك ئەوکات دەتوانین وەکو خوایانی ئۆلۆمپ لەو بلێندایییانەوە چاوێك بەسەر پێشکەوتن و کاروبارەکان بگێڕین و خەریکی داوەریی مەسەلەکان، رووداوەکان، گوتەکان وکردەگەلی مرۆیی بین و لە بەرەنجامدا پێناسەگەلی بانمێژوویی، باندەقی، بانئاخێوی، بانزمانی، بان فەرهەنگی بخەینە روو. وزە و گوروتینێك کە دەتوانێ بۆ نموونە، بەم پرسیارە کە" بە چ شتێك دەڵێن بەرهەمی هونەری؟ " بە خێرایی وڵام بداتەوە:" لە نێو کۆمای بەروبوومەکانی رەنێوهانینی فیکری و کردەکیی مرۆڤ، بەرهەمە هونەرییەکان خودان تایبەتمەندیی Aن" لێرەدا مرۆڤ، رەنێوهانینی فیکری و کردەکیی ئەو و بەرهەمە هونەرییەکان تێکڕا بانمێژوویی دێنە ئەژمار و خدەی Aلە راست تێکڕای بەروبوومە هونەرییەکان، لە هەر قۆناخێکی مێژوییدا و هەر بیچمێکی ژیانی مرۆڤ بە راست دەزانرێت. لە حاڵێکدا کە، لە راستیدا تاکەکانی مرۆڤ بەو پێیەی لە کامە جڤاکی مرۆییدا دەژین، بەکام " بیچمی ژیان" و کام فەرهەنگی مرۆیی پەیوەستن، لە سەر بنەمای کام دەستە لە سەرباشقە زانستی، فەلسەفی، دینی، رەوشتی، سیاسی، دەروونناسانەکان و ... رەفتار دەکەن، لە قەڵەمڕەوی کام هەمبەرێتیگەلی رەنێوهانین کار دەکەن، سەر بە چ چینێکن، و... پێکەوە جیاوازن و ناکرێ پێناسەیەکی تاقانە، بنەتایی، لێبڕاوانە و بێ ئەملاو ئەولا لە راست هەموویان یا دەسکەوتە فەرهەنگییەکانیان بە راست بزانی.

ئەمڕۆ، لە دیدی هەر خوێندکار و توێژەرێکی هونەریی ڕۆژئاوایی پەیکەری میکل ئانژ شاکارێکی حاشاهەڵنەگر لە مێژوی پەیکەرسازی و بەرهەمە هونەرییەکانی سەردەمی ڕێنسانسی ئیتالیا ئەژمار دەکرێ. لە حاڵێکدا لە دیدی زۆر لە موسوڵمانان ئەم پەیکەرە نەك تەنیا بەرهەمێکی هونەری و جێی پەسن نیە، بەڵکو بەروبوومێکی ئەهریمەنی و کوفرئاسایە کە پێغەمبەری خوا بە رووتی، زەق و لە قەڵافەتی بتێك دەردەخا، نەك بەرەنجامی بلیمەتیی هونەرمەندێك بەڵکو بەروبوومی وارسکەیەکی چەپەڵ، پڕئاڵۆش و گوناهکارە. هەر پێناسەیەك کە قۆناخێك لە کارکردن و داتاشینی پاتۆرێك بەردی مەڕمەڕ بە پێی ڕێسایەکی بانمێژویی و بان فەرهەنگی" دەسپێکی دروستکردنی بەرهەمی هونەری" ناو بنێ، بە سەرنجدان لەم ئەزموونەی پەسندکردن و وەرگرتنی بەروبوومێکی ڕەنێوهانەرانە چەوت دەبێت. پەیکەرێکی بودا لە پەرستگایەکی ژاپۆنیدا لە دیدی ژاپۆنییەکەوە شمەکێکی سپیتا، لە نیگای توێژەرێکی ڕۆژئاواییەوە بەرهەمێکی هونەری و لە ڕوانگەی هەندێك لە موسوڵمانانی ئیماندار بتێکە. هەموو ئەو تایبەتمەندییانەی کە ئەم پەیکەرە لە پاتۆرە بەردێك جیادەکەنەوە و هێشتا بەس نین تا ناونیشانی بانمێژویی بەرهەمێکی هونەری لە ئاستیدا پاساو بدەن. پەیکەرەکانی داود و بودا تەنیا لە ئاسۆی ئاماژەگەلی فەرهەنگیی تایبەت ـ بە پێی پێناسەگەلی بەرتەسك و ڕێژەیی ـ بە بەرهەمی هونەری دەزانرێن، هەر بەوجۆرەی کە بەپێی پێناسەکانی دی دەتوانن شتانێکی دیکەبن.

لە وڵامی ئەم ڕوانگە ئەپستمۆلۆژیك و ڕەوشتییەی کە بە بوونی چاوەدێرێکی بێلایەن باوەڕی هەیە، دەتوانین بێژین:دانا، نەك چاوەدێرێکی داوەر،بەڵکو بەشداریکەری کاروبارەکانە. کەسێك ناتوانێ لەدەرەوەی کات و لە دەرەوەی چیەتی، کردە و فەرهەنگی مرۆیی خۆی سەقامگیر بێت. خەیاڵکردی داوەریی بەدەر لە بایەخەکان خەیاڵێکی پووچە. لەم ڕووەوە، پێناسەی بانمێژوویی لە شتەکان بەدی نەکراو نیە و ناتوانین وڵامێکی هەرمان، تاقانە و بنەتایی و لێبڕاو بۆ پرسیاری" بەرهەمی هونەری چیە؟" بەرهەڤ بکەین، وەلێ دەتوانین وڵامگەلێکی فرەفاق، کاتی، ڕێژەیی و سنووردار کە لە باشترین دۆخدا تەنیا ڕۆشنگەری بڕێك لە خاڵەکان بێت بخەینەڕوو. قازانج و ڕێژەی کارایی وەها بەرسڤانێکیش سنووردار وئاگایی لە لایەنی ڕێژەییان ئەو قازانجە زیاتردەکا. تەنانەت لە ڕۆژگاری مانگی دەستکرد و" هۆزی جیهانی"، باشقەی ئایدیالیی بوونی ـ یا بزاڤ بەرەو ـ فەرهەنگێکی یەکپارچە و گشتگیر جگە لە خەیاڵێکی پووچ و گاڵتەجاڕانە شتێکی دی نیە. فرەفاقێتی و فرەچەشنیی سەمەرە



خولقێنی وڵامگەلێ کە نەك تەنیا لە فەرهەنگە جیاوازەکان، بەڵکو تەنانەت لە قەڵەمڕەوی یەکێك لە فەرهەنگە مرۆیی و بە شێوەیەکی هاوکات بە پرسیارێکی وەکو" بەرهەمی هونەری چیە؟" دەدرێتەوە، ڕۆشنگەر و بە مانای سەلماندنی گوتەکانی سەرەوەیە، فرەچەشنیی ئەم بەرسڤانە، بە باشی نیشان دەدا کە هەرچەند بەرسڤی بنەتایی بەدی نەکراوە، بەڵام تاسە یا کەڵکەڵەی دەستڕاگەیشتن پێی دەتوانێ پێشکەوتنی باسەکان و هزرینگەری لێ بکەوێتەوە. ڕەنگە هەر ئەم بەرینبوونەی باسەکان و ئاوەزیانەکان بۆتە هۆی ئەوە کە نەوە دوای نەوە، مرۆڤان کە دەیان دی وڵامەکانی پێشو تەنانەت ڕێگەیەکیان بەرەو هێنانە ئارای وڵامی بنەتاتی ئاوەڵا نەکردوە، هەمدیس بە تامەزرۆیی دەستڕاگەیشتن بە وڵامێکی لێبڕاو هەوڵیان داوە. سەیرپەسندە! کە ئەمڕۆ لە پانتایی ژیانی ڕۆژانەی سەردەمی ئێمە، کە بە ڕۆژگاری" پۆست مودێرن" ناودێریان کردوە، لە وڵامی هەمان پرسیاری بنیایی و هەمیشەیی، چ فەرمانگەلێکی زۆر و زەوەند و جیاواز بۆیان لواوە کە پێك بێن، ببەنە بابەتی ڕەخنەکاری، بە کەڵکی کارێك بێن و لە نێوبچن. قەت ناشاردرێتەوە کە ڕێکەوەندی" بەکار بێن" دەرخەری ویستی هێزە. ویستێکی ڕاشکاو کە دژوار بتوانێ خۆی لە پشتی پەیڤەکان و بۆ نموونە لە پشتەوەی ڕێکەوەندی" ویستی هەقیقەت" وەشێرێ.

بە بنەجێ کردنی" بەرهەمی هونەری" لە بەرینانی ڕێژەبیرانیی فەرهەنگی و مێژوویی، لە هەنگاوییەکەمدا، خاڵگەلی سادە پەیدا دەبن، کە لێرەدا تەنیا بە هەندێکیان هێما دەکەم: ١) ئێمە ئەمڕۆ، دیاردەگەلێ بە هونەری ناودێر دەکەین کە لە ڕۆژگاری نەچەندان دووردا، بۆ نموونە لە سەدەی پێشودا، یا لە بنەڕەت ڕا بوونیان نەبوو، یا هونەری نەدەزانران.

٢) ئەم" ئێمە"یە کە بە شتانی تازە ناونیشانی هونەری دەدەین، ناتوانێ بەیانگەر یا دەرخەری هەموو ئەو مرۆڤانە بێ کە ئەمڕۆ لە بەرینانی فەرهەنگە جۆربەجۆرەکاندا دەژین و بەکاری ڕەنێوهێنەرانە خەریکن." ئێمە" لە ڕاستیدا، میتافۆرێکە و بەس لەبۆ یەکێك لە بیچمەکانی ژیان و فەرهەنگ دەگەڕێتەوە.

٣) بەروبوومێکی ڕەنێوهاتوو دەتوانێ بۆ کەسێك هونەری بێت و بۆ کەسێکی دی ـ تەنانەت لە قەڵەمڕەوی هاوبەشی ژیان و فەرهەنگ چ بگات بە فەرهەنگێك یا ڕۆژگارێکی دی ـ هونەری نەبێ. " خەتخۆشی" کە" فێرخوازێکی هونەر"ی خاوەن بەهرە لە سەر لاپەڕەی پەڕاوگێکەوە دەیکێشێتەوە، دەتوانێ لە دیدی مامۆستاکەی یا چاوەدێرێکی دی شاکارێکی

هونەری بێت کە خۆی لە قەرەنی خەتی میر*بدات. بەڵام هەر ئەم بەروبوومە لە دیدی ئەو کەسەی کە خۆشنوسی( یا بە شێوەیەکی گشتی، یا هەل و مەرجی ئەمڕۆ) بە پیشەگەری دەزانێ، نەك هونەر، بەروبوومێکی پڕبایەخ ئەژمار ناکرێت.

٤) تەنانەت خاڵگەلێ کە لە چاوی زۆرێك لە "ئێمە" ئەمڕۆ ئاشکراو سواو دێت، بۆ نموونە ئەمە کە بەرهەمی هونەری زادەی هێزێکی خوڵقێنەر و زەینێکی مرۆیی‌یە، بۆ درك پێکردنی رێژەیی و مێژوویی ئێمە لە تاکخوازیی دەگەڕێتەوە. هیندە بەسە بە شێوەیەکی رەخنەکارانە چەمکی تاکخوازی" زادەی ئابووریی بازاری کلاسیك و درك پێکردنی سیاسی و رەوشتی لیبراڵ"، بزانین، تا بتوانین نکۆڵی لە گرنگی و رۆڵی سەردەمەکانی پێشوی" مێژوی فەرهەنگ" و " مێژوی هونەر" بکەین. هزرڤانێکی فیمینیست دەتوانێ بە یاریدەی تیڕوانینێکی لە راست رۆژگاری مودێرن بڵێت کە هایدنناسیی تاکگەرایانە ئاخێزاوی ئەزموونێکی پیاوانە لە جیهان و ژیانە و لە راستیدا پشت ئەستورە بە باشقەی تاك وەکو پیاوێك لە چینی دەسەڵاتدار و دەوڵەمەند. ئەم هزرڤانە هەرگیز ناچێتە ژێرباری ئەوە کە کاری ژنێکی رێسەمان** لە وڵاتێکی دواکەوتوو بە پێوەری" بەرهەمی هونەری"ی پیاوێکی رۆژئاوایی هەڵسەنگێنێ.

هەنووکە بە سەرنجدان لە گومانکاری لە واتای" ئێمە"دا ئاشکرا دەبێ کە کاتێك کە دەنووسین:" ئێمە، دیاردەگەلێ بە هونەری ناودێر دەکەین کە لە رۆژگاری نەچەندان دوور دا، بۆ نموونە لە سەدەی پێشو( سەدەی نۆزدە) *** یا لە بنەڕەت را هەر نەبوون، یا بە هونەری نەدەزانران"، زیاتر لە ئەگەری بەرەوڕوو بوونەوە لەگەڵ هونەر دواوم و نەك لە هاتنەدی یا سەرهەڵدانی لێبڕاو و بێ ئەملاوئەولای هونەر. ئێمە ئەمڕۆ بۆمان دەلوێ کە گریمان، پێشانگایەکی" مۆدیلی جل و بەرگ" بە پێشانگا و نواندنی هونەری بنرخێنین و بە پێی پێوەرە ئەمڕۆییەکانمان لە هونەری نواندن داوەریی بکەین، وەلێ ئەم ئەگەرە لە سەدەی هەژدەهەم نەك تەنیا نەبوو، بەڵکوتەنانەت وێناکردنیشی بێ ئاوەزانە بوو. ئێمە ئەمڕۆ ئەگەری ئەوەمان هەیە کە لەسایەی پێشکەوتنی تێکنۆلۆژیی پیت خستنەوەی کاڵاکان و سەبارەت بە

* جۆرە خەتێك لە خۆشنوسیدا. (و)

** بافندە

*** تێبنیی لە وەرگێڕە



دەسکەوتەکانی هەردووك شۆڕشی ئەلکترۆنێك و ئێنفۆرهاتیك، لەگەڵ هونەرانێکی تازە سەروکار پەیدا بکەین کە تەنانەت بیری بوونیشیان لە سەدەی هەژدەدا بە زەینی کەسدا نەدەهات، هونەرانێکی وەکو سینەما، وێنەگرتن، ڤیدیۆ. هەروەك والتێر بنیامین لە وتاری" بەرهەمی هونەری لە سەردەمی پێت خستنەوەی میکانیکیی خۆیدا" نیشانی داوە، ئێمە ئەمڕۆ توانیومانە بە یاریدەی فراوانبوونی میکانیکیی بەرهەمە هونەرییەکان، کۆتایی بە خدەی تاقانە و دوور لە دەستڕاگەیشتنی بەرهەمی هونەری بێنین و لە مەودای هونەر لەگەڵ هەڵکەوتەکانی ژیانی رۆژانەی خۆمان کەم بکەینەوە.(١٧) بنیامین دەیگوت کە لەم حاڵەتەدا دەرکەوتی بەرهەمی هونەری لەنێودەچێ. رەنگە وەها نەبێ و ئێمە لەگەڵ دەرکەوتێکی تازە لە بەرهەمی هونەری بەرەوڕوو بین، رەنگە باوەڕی بنیامین بە رەوینەوەی دەرکەوت و پێشکەوتوو زانینی ئەم رووداوە دروست نەبێ، وەلێ بەهەرحاڵ خاڵێك دەمێنێتەوە کە ناتوانی هیندە بە دڕدۆنگی لێی بڕوانی: لە شێوەی لێڕوانینی " ئێمە" بۆ بەرهەمی هونەری جیاوازییەکی هەرەمەزن ئاشکرا بووە. لە بەرەنجامدا، بە هونەرگەلی تازە، سەرباشقەگەلی تازە و چەمکگەلی نوێ بەرەوڕووین و هەر ئەمانە دەبنە هۆی ئەوە کە بە هەڵێنجانێکی تازە لە هونەر و جوانی بگەین و جوانیناسیی کلاسیك( واتە جوانیناسیی سەدەی رۆشنگەری) بۆ ناسینی مەسەلە هونەرییەکانی سەردەمەکەمان، ئیدی پڕکەمایەسی دێتە بەرچاو. هەر بۆیە دەبێ بە چاوی گومان و دڕدۆنگییەوە لە پێناسەکانی رۆژگاری رۆشنگەری لە هونەر بڕوانین و هەڵبەت لە هەر پێناسەیەکی ئەمڕۆییش کە خۆی بە ئاخاوتەی بنەتایی دەناسێنێ.

(١٧) بنیامین، **پیشین** ، صص ٢٣٥-٢٨٧

**(٥)**

ئایا دەتوانی بەرهەمی هونەری تاقانە بەرجەستەیی، یا تەنیا" دەربڕینی" جوانیناسانە بزانیت؟ لە کاتی بلاوبوونەوەی پەرتوکەکانی **جوانیناسی** ی بێندتۆ کرۆچە و **بنەواشەکانی هونەر** ی ر.ج.کالینگڤوود، پێناسەیەك لە هونەر کە بە" بەیانگەر" دەیناسێنێ و ئەزموونی جوانیناسانە لە هەست و سۆزە (هەڵچوونەکان، سۆزەکان، سەرمەستی و تامەزرۆییەکان) مرۆییەکان قەتیس دەکاتەوە، لە باسی جوانیناساندا پێگەیەکی تایبەتی پەیدا کرد.(١٨)

یەکەمین کاردانەوە بەم باسە، وەبەرپلارخستنی چەمکی" بەیانگەری" بوو. هەنووکە، پاش تێپەڕینی چەندین دەیە، چەمکی" بەرهەمی هونەری"ش وەبەر تاوتوێی رەخنەکارانە کەوتوە. هزرڤانانێك، بەهۆگەلێ کە رێگەی باس و خواس و قووڵبوونەوە خۆش دەکەن، وەها رای خۆیان دەربڕیوە کە بەرهەمی هونەری ناتوانێ تاقانە بەرجەستەیی بێ،(بەڵکو دەتوانێ) تەنیا" دەربڕین" و یەکتا رەژیدەی ئەزموون یا چرکەساتەکانی جوانیناسانەی ژیانی مرۆیی بێت. ئەمڕۆ، لەنێوان هەندێ فەیلەسوفانی شرۆڤەگەرا باسێك لەگۆڕێدایە کە ئایا تاقانە بەرجەستەکردنی وەها ئەزموونێك هەمەوو جارێ" بەروبوومێکی رەنێوهێنەرانە"یە، یا ئەم بیچمە دەتوانێ " بیچمی بەرجەستە" نەبێ و بە چەندین شێوەی دیکەش بێتەگۆڕێ. بە دەربڕینی دیکە، پرسیاری ئەوان وەهایە: ئایا بەرەنجامی ئەزموونی هونەری بەناچار دەبێ لەسەر مەتریالێك تۆمار بکرێ و بە گوتەی مارگۆلیس" قەڵافەت پەیدا کردوی جەستەیی" (phisically embodied) (19) بێت یا دەتوانێ بە بیچمێکی یەکسەر زەینیش بوونی هەبێ؟ دوا خاڵ تا رادەیەك وەبیرهێنەری خاڵێکە کە لە فەلسەفەی عیرفانیی فلوتیندا هاتبوویە ئاراوە و لە رۆژگاری رێنسانسدا، لیۆناردۆداڤینچی، جارێکی دی، لەو لە ژێر ناوی" شتێکی هزرین ئاسا(cosa mentale) باسی کردبوو.فلوتین لە وتارنامەی هەشتەم لە **ئێنئاد**

(١٨) لەمبارەوە بڕواننە پەرەگرافی یەکەمی وانەی سێزدەهەمی پەرتوکی ب. احمدی، **حقیقت و زیبایی** ، تهران، ١٣٧٤

(ئەم پەرتوکە لە لایەن وەرگێرەوە بە ناونیشانی: ب. ئەحمەدی، هەقیقەت و جوانی، و. مەسعود بابایی، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی، ٢٠٠٨ کراوەتە کوردی.

(19) J.Margolis, Art and Philoso phy, new York , 1978



ی پێنجەم لە بارەی "جوانیی ماقوول" نووسیبووی "چونکە هونەر دەتوانێ چۆنایەتییەك پێك بێنێ کە رەنگدانەوەی خۆیەتیو بە یاریدەی چەمکی سیمابەخشی ئەو شتەی دروستی کردوە، شتێك جوان دەکا، کەوابوو دەبێ خودان جوانییەکی گەورەتر و راستەقینەتر لەوە بێت کە بە شمەکەکانی دەرەوە دەیبەخشێ، چونکە جوانی بە هەمان رێژە کە لە خۆی دەهاوێژرێتەدەرێو لەمەتریالدا بەرینتر دەبێتەوە، لاوازتر لەو جوانییەیە کە لە یەکەی نەبزوتو نەگۆڕدا دەمێنێتەوە".(٢٠)

مەبەستی من لەم هێماکردنە مێژوویییە ئەمە نیە کە بلێم روانگەی نوێ ئەفلاتونی کە بڕوای بە بوونی "بیرۆکەی جوانیی رەها" هەبوو، ئەمڕۆ لە قالبی باسێکی فەلسەفی هەمدیس هاتۆتە گۆڕێ. بەلام پرسیاری سەرەکی وادێتە بەرچاو کە لە هەردووکیاندا هەر یەك شتە: ئایا بەرهەمی هونەری تاقانە دەربڕینی ئەزموونی جوانییە؟ لانیکەم بە لای هیندێك لە هزرڤانانی فەلسەفەی شیکاری، ئەمڕۆ، وادەنوێنێ کە هونەر بە بێ تۆماری ئەزموونی جوانیناسانە لەسەر مەتریال، واتە بە بێ ئەوەی کە دەربڕینی ئەزموون بیچمی بەروبوومێکی مەتریالی بە خۆوە بگرێ (و لە بەرەنجامدا لە دەرەوەی خولگەی پێوەندیی نێوان مرۆیی) دەتوانێ لە زەینو وزەی فیکریو ئافرێنەری کەسێك سەرهەڵبدا و بەردەوام ببێ. ئایا ئەم خاڵە کە ناتوانین ئەزموون، دۆخ، هەست، نێواخندۆزی یا دیناوی ئانو ساتیی خۆمان بۆ ئەوانیدی روون بکەینەوە، یا ئەمە کە ناتوانین لەگەڵ ئەوانیدی لە سەربنەما و بنچینەیان پێوەندی رایەڵ بکەین، هیندە بەسە کە هەموویان بە "هونەری" نەزانین؟

بە بۆچوونی برێك لە بیردۆزەوانان متمانەو بڕەوی بەرهەمی هونەری بریتییە لە لایەنی پێوەندیکاریی خۆی. ئەزموونێك کە لە دەرەوەی پێوەندیی مرۆیی بیچم دەگرێ، هێشتا ناتوانێ هونەری بێت. پەیکەربەندیی بەرهەمێك تەنیا کاتێك واتا دەگەیەنێ کە کەسێکی دی رەمزشکێنیی بکات. بەردەچنی و ستونەکانی تەختی جەمشید نزیکەی دووهەزار و پێنجسەد ساڵ لە تاریکیدا مانەوە تا شاندی زانستیی رۆژهەلاتناسیی زانکۆی شیکاگۆ لە ساڵی ١٩٣٠ تا ساڵی **١٩٣٩** توێژی سەرەوەی خاکی تەختی جەمشیدیان راماڵیو کۆشکی ئاپاداناو پاشماوەی شاری کەونارا دۆزرایەوە. تەنیا لەم کاتەوە کە ئەو کاولاشانە کەوتنە خولگەی پێوەندیی مرۆییەوە، بوون بە بەرهەمی هونەری. لەم روانگەدا، ئەزموونی هونەر وەها

(٢٠) فلوطین، **دوره آثار**، ترجمەی م. ح. لطفی، تهران، ١٣٦٦، ج ٢، صص ٧٥٧ـ ٧٥٨.

ئەزموونێك دێتە بەرچاو كە بەپێی چیەتیی خۆی، بانتر لە زەینییەتی تاكە كەسێك هەڵدەكشێ‌و لە بنیاتی خۆیدا پێوەندییەكی "نێوانزەینی"و "نێوان مرۆیی"یە. وادەنوێنێ كە هەركات چركەساتەكانی جوانیناسانەی ژیانی مرۆڤان لەسەر كەرەستەیەك تۆمارنەكرێن، رێگە و ئەگەری دروستكردنی پێوەندییان بۆ نارەخسێ‌و لە واتای وردی وشەدا "هونەری" نابن. ناكرێ لەویدی چاوەڕوانیمان هەبێ كە هەستی ئاخنەیی و دیناوی مەعنەویی من لەوێدا كە هێشتا دەرنەبڕاوە، فام بكا و لەودا لەگەڵ من هامباز[*]ببێ. ئەگەر من ئەزموونی خۆم لە رێگەی تۆماركردنی لە سەر كەرەستەیەك‌و لە قاڵبی سیستمێكی نیشانە ناسانە بەیان نەكردبێ، ئیدی هیچ پێوانەیەك‌و رێسایەك پەیدا ناكات كە لە سەر ئەو بنەمایە هەستی نێواخنیی من فام بكات‌و وەكو دیناوێكی جوانیناسانە ئەژماری بكات. هەر بەو چەشنەی كە زمانی تاكایەتی بوونی نیە، زمانی هونەریی تاكایەتی بوونی نیە.

وەلێ هەروا دەتوانی بپرسی: هونەر كامەیە؟ هەست‌و دیناوێكی نێواخنی، یا هەست‌و دیناوێك كە بەیان‌و لە سەر كەرەستەیەك تۆمار بكرێت، تا بە كەسێكی دیكە بنوێنرێت؟ ئایا هونەر نێواخندۆزییەكی نێواخنی‌یە كە وێدەچێ تەنانەت نەتوانێ بێتە دەربڕین یا تۆماری نیشانەكان‌و رەمزەكان لە سەر پەردە نەخشێك، پەڕواگ، مەڕمەڕ... ؟ رازێكە كە لە چركەساتێكدا بۆ كەسێك ئاشكرا دەبێ‌و وێدەچێ باندۆرێكی درێژخایەن لە سەر زەین‌و بیرەوەریی ئەو دادەنێ، بەڵام دەكرێ تۆمار نەكرێ‌و رێگەی پێوەندی لەتەك مرۆڤێكی دیكە پەیدا نەكات، یاخۆ هەرەپێویستە كە لەگەڵ ئەویدی بخرێتە بەرباس؟ ئایا تێكڕای ئەو چركەساتانەی فیلمی **هاملێت** كە تاركۆفسكی لێیان تێهزریبوو (فیلمێك كە ئەم هونەرمەندە هەرگیز لە توانای نەهات تەنانەت بڕگە دیمەنێكیشی دروست بكا) هونەرن، یاخۆ تەنیا ئەو بڕگە دیمەن‌و سكانسانەی كە بەڕاستی لە ئاوێنە، ستاكەر و فیلمەكانی دیكەی تاركۆفسكی هەن، هونەر ئەژمار دەكەین؟ بەرهەمە هونەرییەكان دەسكەوتی هەمان چركەساتگەلی جوانیناسانەی زەینین، چ ئەو چركەساتانەی لە ئەزموونی دانەر و پێكهێنەرەكانیان، چ ئەو چركەساتانەی لە ئەزموونی گوێكران‌و خوێنەرانیدان. ئایا دەتوانی لەم تێبینییە، وا بەرەنجامگیری بكەیت كە دەبێ ملكەچی "زەین باوەڕی"ی پەتی بێت و تەنیا ژیانی نێواخنی‌و ئەزموونی نێوەكیی زەینی تاكەكەسێك بە هونەری بزانیت؟ راستە كە هەر كات ئەم ژیانە

---

[*] شریك.



نێواخنی‌یە لە گۆڕێدا نەبایەو خدەی هونەریی پەیدا نەكردبا، نووسەرێكی وەكو مارسێل‌پرۆست نەیدەتوانی رۆمانێكی هەرەمەزن لە باسلێگەریی دیناوێكی كت‌وپڕ كە وەكو پڕوزگێكی زووگوزەریاو[*]بوو، بنوسێ، بەڵام ئەم خاڵە تەنیا سەرچاوەی بەرهەمی هونەری نیشان دەدا و هێشتا هۆیەكی هەند بۆ سەلماندنی ئەم بڕیارە نیە كە بەرهەمی هونەری تەنیا هەمان دیناوی مەعنەوی و نێواخنی یە.

مارتین هایدگێر كە لە سەرچاوەی بەرهەمی هونەری دەدوا و لەسەر پێناسەی بەرهەمی هونەری رادەنەوێستا، زانیبووی كە پرسیاری بونیادی لە "سەرچاوە"وە دەست پێدەكا.[٢١] هایدگێر بۆ باسێك كە دیتمان لە نێوان فەیلەسوفانی شیكارگەر لەمەڕ بەرهەمی هونەری درێژە دراوە، بەرسڤێكی ژنەفتەنی هەیە و ئەمە تاقانە خاڵێك نیە كە ئەو دەتوانێ رێگەیەكی نوێ بە فەیلەسوفانی شیكارگەر نیشان بدات.[٢٢] بە بۆچوونی هایدگێر رەخسێنەری بەرهەمی هونەری لە جیهان شتێك دەبیسێ‌و ئەزموونێكی نێواخنی پەیدا دەكات. زەوی لە قاڵبی نێواخندۆزییەكی هونەری دێتەگۆ. بەمجۆرە، هونەر سەرچاوەی بەرهەمە، نەك هونەرمەند و بەرامبەر (گوێگر ـ خوێنەر) .

هەتا چوار دەیەی پێشو، ئەم شتە ئێجگار ئاشكرا دەهاتەبەرچاو كە بەرهەمی هونەری بەرناسێكی رەخساو و تەرخانە لە بەردەمی ئێمە، كە هونەرمەندێك رەخساندویەتی، واتە هزرەكانی، ئەزموونگەلی هونەری چەند چركەساتێكی جوانیناسانە لەژیانی فیكری و مەعنەویی خۆی بە سیستمێكی تایبەتیی هەر هونەرێك لە قاڵبی ماتریال بە ئێمە پیشكەش كردوە. كەمتر فەیلەسوفێك لەمبارەوە دڕدۆنگ دەبوو كە بەرهەمی هونەری، بەروبوومێكی رەنێوهاتوی، مرۆیی واتەartefact یا شتێكی دەسكردە. پێناسەگەلی بەناوبانگیش كە لە هونەر دەهاتە ئاراوە، بۆ نموونە كە هونەر" لاسایی كردنەوە" یا "بەیانگەرە" یا "ئەفراندنی بیچمگەلی سیمبۆلیكە"، یا... تێكڕا لەمەڕ" بەروبوومی" رەنێوهێنانی مرۆیی بوون، لە باشترین دۆخدا، ئەم خاڵە پەسند دەكرا كە بەروبوومێك یا دەستكردێك پێی ناوێ هەموو جارێك فیزیكی بێت، واتە هەرە پێویست نیە كە تەنیا لە شێوەی جەستەیی و ماتریالی بوونی

---

[*] جراقەای زودكذر

(21) M.Haar, Loeuverd art, Essais sur Iontologie des oevres, Paris, 1994.

(22) H.L.Dreyfus, Bing-in-the world, Combridge, Massachusetts, 1991, PP. 1-10.

هەبێ، بەڵكو كۆپلەشیعرێك لە یادەوەریی ئێمەدا، یا تەنانەت تیۆرییەكی زانستیش بەروبووم و دەسكردن، بێ ئەوەی بە شێوەیەكی ماتریالی لە جێیەك تۆمار كرابن. بەڵام بە شێوەیەكی هەمەكی، بەرهەمی هونەری بە شتێكی ئامادە دەزانرا، شتێك كە بە چەشنێكی دەسبەجێ و راستەوخۆ دەكرێ ئامادە بكرێ.

لە دەیەكانی رابردوودا، هەندێك لە فەیلەسوفان شیكاریی ئەم پرسیارەیان هێناوەتە پێشێ كە ئایا دەسكردبوون یا بەروبوومێكی رەنێوهێنان بوون، مەرجی سەرەكی و لێ دەربازنەهاتوی پێناسەی بەرهەمی هونەرییە؟ لە دەیەی١٩٥٠، پۆل زیف لە وتارنامەی"پەیامنامەی پێناسەیبەرهەمێكی هونەری"[٢٣]، موریس ویتز لە وتارنامەی" دەوری بیردۆزە لە جوانیناسیدا"[٢٤] و ویلیام كنیك لە وتارنامەی "ئایا جوانیناسیی نەریتی لە سەر بنەمای یەك هەڵە رۆنراوە؟"[٢٥]، ئەم پرسیارەیان تاوتوێ كرد. رێگەیەك كە ئەم فەیلەسوفانە بۆ بەرتەكدانەوەی هەرە پێویستیی بوونی بەرهەمی هونەری لە ژێرناوی بەروبووم هەڵیان بژارد، جارێكی دی ئێمە بە هەمان پرسیاری بونیادی دەگەیەنێ كە نووسینەكەی خۆمان بەوەوە دەست پێكرد: ئایا دەكرێ هونەر و بەرهەمی هونەری پێناسە بكەیت؟ ئەوان بە هەوڵدان لەمبارەوە كە هەرە پێویستیی بەروبوومبوونی بەرهەمی هونەری بەرتەك بدەنەوە، نكۆڵییان لە ئەگەری هێنانەگۆڕی پێناسەیەكی بنەتایی، خۆباوەڕ(essentalist) ، هەمەلایەن و پوخت لە هونەریش كرد. رێگەیەك كە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە گرتیانەبەر و وەپشت سەریان نا، وشیارانە هەمان رێچكەیە كە ڤیتگنشتاین لە روونكردنەوەی" لێكچوونە خێزانییەكان" لە نێوان كایە زمانییەكان گرتبوویە بەر. ئەوان رایان گەیاند كە هونەر( و بەرهەمی هونەری) خودان مەرجی گەوهەری، هەرەپێویست و هەند نیە. وەها نیە كە هەركە بەرناسێك یا شتێك لەم مەرجە پشكی بەركەوێ، بە هونەری دەزانرێت. ئەندامانی هەودای" بەرهەمی هونەری" نەك لەبەر خدەوتایبەتمەندییەك كە لە هەموویاندا هاوبەش بێت، بەڵكو لەبەر هۆیەكی تێكچڕژاوتر بە " هونەری" دەكرێن. ئەوان لە كۆمایەكی ئێجگار تێكچڕژاو لە " لێكچوونە خێزانییەكان"

---

(23) p.ziff,” the task of definig a work of art”, philosophical review, 62, 1953, pp.58-78.

(24) M.Wetiz, “the role of theory in aesthetice”(1955) in: f.j.coleman ed, contemporary studies in aesthetics” , new York, 1968, pp.84-94

(25) W.Kemick, “ does traditional aesthetics rest on a mistake?” mind , 67, 1958,pp.317-334



جێ دەگرن. بەرناسی"A"  لەگەڵ بەرهەمی هونەریی”B” لەبەرئەوەی كە لەگەڵ بەرهەمی هونەریی “C” لە خدەیەكی دیكەدا هاوبەش بووە، بە هونەری زانراوە، هەر بەم بیچمە هونەریبوونی "C" خدەیەكی هاوبەش كە لەتەك بەرهەمی هونەری "D" هەیبووە و كارەكەی بەم رەوتە پێشڤە دەچێ. لە بەرەنجامدا ئەگەری ئەوە هەیە كە لە نێوان بەرهەمی "A"و بەرهەمی "Z" ئیدی هیچ خاڵێكی هاوبەش، واتە تەنانەت ناتوانی خدەیەكی هاوشێوەش بەدی بكەیت. لەگەڵ ئەوەی كە ئەم دوانە هیچ شتێكی هاوبەشیان نیە، بە هۆی رۆخسارگەلی هاوبەش كە لەگەڵ ئەندامانی دیكەی كۆمكارەكەدا هەیانە، بە "بەرهەمگەلی هونەری" ناودێر دەكرێن. كەوابوو لە بەرئەوەی كە بەروبوومی رەنێوهاتوو و هەرامەی دەسكردنو لە بەر هیچ خدەیەكی خودێتی، هەمەكیو هاوبەشی دیكە نیە كە بە "هونەری" ناودێریان دەكەین. شتێك (هزرێك، رووداوێك، كردەیەك، هەرامەیەك، خەیاڵێك)  دەتوانێ بەروبووم و دەسكرد نەبێ، بەڵام خدەیەكی هاوبەشی لەگەڵ بەرهەمی هونەری هەبێو لە بەرەنجامدا بە هونەری بزانرێت. چیلكەیەك، لە توێكڵی درەختێك لە دارستان، رەنگە لە دیدی كەسێكەوە "لێكچووی یەكێك لە پەیكەرەكانی ئیسامونوگۆشی" بێت. لەم دۆخەدا ئەم چیلكەیە دەبێتە بەرهەمی هونەری. هەر شتێك یا هەر دۆخێك كە بتوانێ بە گوێرەی داوەریی كەسێك بۆ بەرهەمێك ـ كە پێشتر بە هونەری زانراوە ـ هاو شێوە ببێ، دەگۆڕێت بۆ بەرهەمی هونەری.

ئەم روانگەیە، بەرەنجامێكی ئەرێنیو رێخۆشكەری هەیە، چونكە نیشان دەدا پێناسەیەكی خودباوەڕ لە هونەر بە شێوەیەكی لۆژیكی نالوێو ناتوانی هونەر بە گەوهەرێكی هاوبەش لە نێوان بەرهەمەكان ناودێر و پێناسە بكەیت. لە بەڵگاندنی ویتز و ئەوانی دی، بنەمای كارەكە رۆنراوی گریمانكردنی هاوشێوەیی شتێكە لەگەڵ شتێكی دی كە پێشتر بە بەرهەمی هونەری زانرابێ. "گریمانكردنی هاوشێوەیی" چەمكێكە هەڵەشەو نادیاریكەر. ناكرێ بە وەها داتایەكی نارۆشن بەرەو پێناسەیەك لە بەرهەمی هونەری بچیتە پێشێ. هەڵەشەبوونی كەوشەنی لۆژیكیی "گریمانكردنی هاوشێوەیی" ئەگەری ئەوە دەڕەخسێنێ كە هەركەس بە دڵخوازی خۆی ئەزموون یا شتێك لەگەڵ ئەزموون یا شتێكی دی كە پێشتر بە هەر هۆیەك هونەری زانراوە، بە هاوشێوە بزانێت. دەتوانی بە سانایی وێنابكەیت كە هەر شتێك لە دیدی هەر كەسێكەوە هونەری بێت. هەڵبەت ئەم خاڵە نە ترسناكە و نەتۆقێنەر، تەنیا رێگەی هێنانەگۆڕێ پێناسەگەلی بنەتاییو خودباوەڕ دادەخات. لە مێژوی هونەردا بەردەوام ئەم ئەگەرە رەخساوە كە تازەگەرییەكان لەسەر بنچینەی "هونەری گریمانكردن" لەلایەن تاقمێكەوە

پەسند بکرێن. ئەگەر کەسانێك نەبان کە شیعرەکانی نیما یوشیج و توندەرێکیا بە "هونەر" بزانن‌و لەوان داکۆکی بکەن، کۆنخوازان لە سەر بنەمای "پێناسەگەلی" چەقبەستوو و خودباوەڕیان، نەیان دەهێشت کە شیعری فارسی تازە بکرێتەوە. باسی ویتز و ئەوانیدی، لە راستیدا دەربڕینی دیمۆکراتیکی هونەرناسی‌یە، بەلاَم لە خودی ئەم خاڵەشدا بەباشی نیشان دەدەن کە هێنانە ئارای پێناسەیەکی بنەتایی، هەمەکی‌و خودباوەڕیش لە هونەر نالوێ.

تا ئێرە، چەندقات لەمبارەوە باسکرا کە هەوڵدان بۆ دەستڕاگەیشتن بە پێناسەیەکی بنەتایی‌و خودباوەڕ لە هونەر مەحکوم بە دارِمانە و وەها پێناسەیەك وەدەست نایەت. هەنوکە، دەبێ بە جەختەوە بێژم کە بە سەرنجدان لە مێژووی فەلسەفەی هونەر دەتوانین ببینین کە تێکۆشانی فەیلەسوفان‌و بیردۆزەوانان بۆ پێناسەی هونەر هەر چەند بە ئامانجی سەرەکیی خۆی نەگەیشت (و نەیتوانی بگات) ، بەلاَم بەرەنجامگەلی پەنانەکیی ئەرێنیشی وەبارهێنا و بووە هۆی پێشکەوتنی باسگەلی رێخۆشکەر و گەشەی هزرینگەری‌و سەرهەڵدانی بیردۆزەگەلی تازە. لەم رووەوە، ئامانجی خاڵگەلێ کە لەپلارگرتن لە تێکۆشانی هزرینگەرانە بۆ دەستڕاگەیشتن بە پێناسەی بنەتایی هونەر نوسیم، بێڕێزکردنی تێکڕای دەستکەوتەکانی ئەو تێکۆشانە نەبوو، چونکە ئەم هەولاَنە بوونەهۆی بەرەنجامگەلی ئێجگار گرنگ لە زێواری رێگەی سەرەکیی خۆیان. پەیجۆری پێناسەی هونەرهەرچەند نەگەیشتە ئەنجام، بەلاَم زۆرجاران بووبە بەستێنسازی باس لەمەڕ لۆژیکی چەمکی هونەر، ئەگەری دەستەبەندی‌ونرخاندنی بەرهەمە هونەرییەکان لە سەردەمە جۆربەجۆرە مێژووییەکان و هێنانە ئارای خاڵەکان‌و زراڤییە جوانکارییە تیۆریکەکانی رەخساند و ئەمە خۆی دەسکەوتێکی کەم نەبوو. ئەگەر ئەفلاتون لە پێناوی وردبینکردنی پێناسەی "هونەر وەکو لاساییگەری" تێنەکۆشابا، ئەو هەموو باس‌و خواسە کلیلی‌یە لە بواری فامکردنی فەلسەفی لە هونەر نەدەڕەخسا و رێگە بۆ باسی ئەرەستۆ خۆش نەدەبوو. ئەگەرخولیای کانت بۆ دەستڕاگەیشتن بە پێناسەیەك لە جوانی نەبایە، لە کوێوە دەمانزانی لە خاڵگەلی سەرسووڕهێنەر ئاگادار بین کە ئەو لە سێهەمین رەخنەکاریی خۆیدا خستنیە روو؟ لە رۆژگارێکی نزیك لە ئێمەشەوە، سەبارەت بە گەیشتن بە پێناسەیەکی تازە لە هونەر بوو کە باسی بیرمەندێکی وەکو جاندیوی لەمەڕ "هونەر وەکو ئەزموون" کرانەوەیەك بۆ کارەکانی بیرمەندانی وەکو رۆرتی رەخساند، یا هەوڵدانی جۆرج دیکی بۆ پێناسەی هونەر نیگایەکی تازەی بۆ تاقمێك لەو دامەزراوە کۆمەلاَیەتییانەی کە لەگەڵ "دنیای هونەر"( the artworld) پێوەندییان هەیە، لێ کەوتەوە،[٢٦] یا باسی نێلسۆن گودمەن لە جیاکاریی نێوان دووجۆرە بەرهەمی هونەری، بیچمی گرت.[٢٧] باسی گودمەن نموونەیەکی باشە تاکو تێبگەین چۆن‌و بە چ جۆرێ هەوڵدان لە پێناسەی هونەر بە بەرەنجامگەلی پەنانەکی‌و خاڵگەلێکی تازە رێگە دەدا. گودمەن لە پەرتوکی **زمانەکانی هونەر** سەرنجی لە دژوارییەکانی پێناسەی هونەر دا و بە خەیاڵی ئەم پێناسەیە چەشنەکانی دەستەبەندییە تیۆریکەکانی خستەڕوو. ئەو لەنێوان بەرهەمی هونەریی "خۆتۆمارگەرانە"یا autographigue و بەرهەمی هونەریی "ئەویدی تۆمارانە" یا allographigue جیاوازیی دانا. بەرهەمی هونەری خۆتۆمار لەسەر ماتریال تۆمارکراوە و لە خۆیدا ئاشکرایە، کەوابوو دووپات ناکرێتەوە و نموونەکەشی تابلۆی نیگارکێشی یا پەیکەرە. بەرهەمی هونەری ئەویدی تۆماری زەینی، "بیرۆکەیەك"، شیانی فراوانبوون‌و لە یەك واتادا شیانی دووپاتبوونەوەیە. هەر بەو چەشنەی کە دەقێکی ئەدەبی لە شێوەی پەرتوك‌و کۆپلەیەکی مۆسیقا لە ژەنیندا دێنە دی. ژمارەیەك لە بەرهەمە هونەرییەکان لە هەڵکەوتێکدا بنەجێ دەبن وەکو نیگارکێشان، بەلاَم ژمارەیەکی دیکە لە دوو یا چەند هەڵکەوتێکدا جێ دەگرن، وەکو کۆپلەیەك مۆسیقا کە بە شێوەی هەوادایەك لە نۆتەکان دەنوسرێت، یا بەشێوەی راستەوخۆ دەژەنرێ‌و هاوکات لە رادیۆ پەخش دەکرێت. گودمەن جەخت دەکات کە بەرهەمی هونەری هەرگیز بۆ بابەتی بەرگەگرتن‌و سەقامگیریی خۆی دانابەزێ، چونکە هەبوونی لە کردەکان‌و بیچمی سەرهەڵدانی سەربەخۆیە. ئێمە هەرگیز دووجار کۆپلەیەکی مۆسیقا نابیسین و دووجار لە تابلۆیەکی نیگارکێشان ناڕوانین. بەرهەمە هونەرییەکان بە هەر جار سەیرکردنێك، هەڵکەوتێکی تازە پەیدا دەکەن‌و دەبن بە شتێکی تازە. لەم باسەی گودمەن دەتوانی بەرەنجامێك وەدەست بخەیت. ئەزموون یا چرکەساتی جوانیناسانە لەخۆیدا هەرچەشنە هەوڵدان بۆ دەستڕاگەیشتن بە پێناسەیەکی بنەتایی لە هونەر نەلواو دەکا. رۆشن نیە کە سەرەڕای جیاکاری‌دانان لە نێوان هایدنی هونەر و بیچمی سەرهەڵدانی بۆچی دەبێ هەروا چاوەڕوانی پێناسەیەکی بنەتایی لە هونەر بین. چونکە بەردەوام لەگەڵ لەمپەرانێکی گەورەی وەرگرتنی هونەر و ئەزموونی جوانیناسانە کە کاروباری مێژوویین، بەرەورووەدەبین و ناتوانین پێشەوەتر بچین.

---

(26) G.D.ickie, Aesthetics, Indianapolis, 1971.

(27) N.Goodman, Languoges of Art, 2 nd edn, Indianopolis, 1976.

تێڕوانینی مێژوویی بۆ هونەر جیێ مەبەستی برێك لە هزرڤانانی فەلسەفەی شیکارگەری‌و لە باسی جۆرج دیکی‌و ئارتور. سی. دانتۆ لە قاڵبی چەمکی "دنیای هونەر" لە گۆڕێدا بووە. ئەوان بە هێنانە پێشی ئەم چەمکە، ئەگەرەکانی دەربڕینی هونەرییان لە سەردەمە مێژوویی‌یە جیاوازەکان خستۆتەڕوو. تیۆرییەك کە لەسەر ئەم بنەمایە بچێتە پێشێ. خاڵگەلی وەکو "هونەر"و "جوانیناسی" بە بەروبوومی چالاکییە کۆمەڵایەتیە سەراساکان دەناسێ و نیشان دەدا کە تاکەکەسەکان لە دنیایەکدا کە خودان ڕێساگەلی فرچك گرتووی تایبەت بە خۆیەتی چالاکی دەنوێنن، هەرچەند خۆیان لایان وایە کە ئەمە جیهانێکە سەربەخۆ لە جڤاك. خاڵێ گرنگ لە نێوەندی وەها باسێك "جۆرێکی سەراسا لە چالاکیی بە کۆمەڵ یا تاکەکەسی‌یە کە دواجار خدەیەکی کۆمەڵایەتی هەیە،بەڵام خۆی سەربەخۆ دەنوێنێ". یەکێك لە سادەترین و وردترین بیچمەکانی دەربڕین باوەڕ بە "دنیای هونەر"و پێناسەگەلێکە کە لە سەر ئەو بنەمایە گەڵاڵە کراوە (و) لە پەرتوکی بازنەی هونەری دیکی هاتوە.[٢٨] ئەو زنجیرەیەك لە پێناسەکانی هێناوەتە گۆڕێ: "١) ـ هونەرمەند بە تێکڕای ئەو کەسانە دەگوترێ کە بە شێوەیەك لە شێوەکان ئاگادار و بەئاگا لە دروستکردنی بەرهەمی هونەری بەشدار بن. ٢) ـ بەرهەمی هونەری هەر چەشنە بەروبوومێکە کە دروست دەکرێ تاکوو پێشکەش بە ئاپۆرای خەڵك لە دنیای هونەر پێشکەش بکرێ. ٣) ـ ئاپۆرای خەڵك لە دنیای هونەردا ئەندامانی هەر گرۆیەکی کۆمەڵایەتین کە وەها فێرکراین و بە ئاستێك لە دانایی گەیشتبن کە تا رادەیەك بتوانن بەرهەمگەلی هونەری کە پێشکەشیان دەکرێ، بناسن. ٤) ـ دنیای هونەر، تەواوەتی سیستمەکانی دنیای هونەرە. ٥) ـ سیستمی دنیای هونەر ئەو شتە یەکە چوارچێوەی پێویستەکان بەرهەڤ دەکا تا بەرهەمی هونەریی هونەرمەند بە بەرامبەرانی دنیای هونەر پێشکەش دەکرێ.

ئەم پێناسانە کە بە ئاشکرا ڕەژیدەی بازنەیەکی داخراون، هەرچەند لە هەندێ لایەنەوە ڕۆشنگەرن، بەڵام سەرەنجام لە سەر ئەم لەپێشدانانە ڕۆنراون کە گشت چالاکیی هونەری تەنیا لە سەر بنچینەی درك پێکردنی دووسەرەی هونەرمەند و بەرامبەر

(بیسەر ـ خوێنەر) دەشێ بیچم بگرێت. دژواریی وەها پێناسەگەلێ لە لایەنی وەستاویانە. دنیای هونەری کە بە پێی ئەم پێناسانە دروست دەکرێ، وەستاوە و لەودا

(28) G.Dickie, The Art Circle: A Theory of Art, New York, 1984.



تازەگەری جێی نابێتەوە. چۆن‌و بە چ جۆرێ هونەرێك کە بەرامبەر (بیسەر ـ خوێنەر) (هێشتا) درکی ناکات دەتوانێ لە بازنەی دنیای هونەر جێ بگرێ؟ لە مێژووی هونەردا، ڕەسەنترین بەرهەمە هونەرییەکان ئەوانە بوون کە بەردەوام چاوەڕواننەکراوترین ئەژمار دەکران. تێڕوانینی دیکی لەگەڵ ئەوەی کە لە گریمانگەلی کۆمەڵایەتی‌و مێژوویی دەست پێدەکا، وەلێ خودان خدەی گەوهەریی مێتۆدی مێژوویی نیە و ناتوانێ نیشان بدات کە چۆن بەرامبەران (بیسەر ـ خوێنەر) ی دوارۆژ دەبێ بە لێککەیشتن‌و درك پێکردنی کاری هونەرمەندی رابردوو بگەن؟ بۆ ئەوە کە بتوانن بە وەها ولامێك دەستمان رابگات، کە لەخۆیدا بە چەمگەلی تازە لە مێژو و نەریت پێویستیی هەیە، دەبێ لە سنوری تێڕوانینی داخراوی شیکاری تێپەڕین و پێ بنێینە قەڵەمڕەوی ئاخێوی هێرمێنۆتیکەوە. لەم دۆخەدا چەمکی دنیای هونەر لەگەڵ چەمکگەلی وەکو ئاسۆی چاوەڕوانییەکان‌و تێك کردنەوەی ئاسۆکان جێگرەوە دەبێت‌و باسەکە دەکەوێتە ڕێچکەیەکی تازەوە.

دژوارییەك کە لە کاری پێناسەکانی (دیکی) دا هەیە، هەربەم شێوەیە لەمەڕ پێناسەیەك کە ئارتور.سی.دانتۆ لە هونەر هێناویەتە ئاراوە، بەدی دەکرێ.دانتۆ بە ڕێگای دیکی نەچوە و ئەم خاڵە کە چۆن بەرهەمێك شایانی پێدانی ناونیشانی هونەری دەبێت، بەرەنجامی لێك تێگەیشتنی دووسەرەی بەرامبەر( بیسەرـ خوێنەر) و هونەرمەند نەزانیوە، بەڵکو لە خاڵێکی چەندقات ئەبستراکتتر سودی وەرگرتوە. بەرناسەکان لە چوارچێوەی هەر سیستمێکی دنیای هونەر، سەبارەت بە هەمبەرێکی تایبەت کە لەگەڵ مێژووی هونەر و هەروەها بیردۆزە باو و زاڵەکان لە بارەی هونەر پەیدای دەکەن، بە هونەری دەزانرێن. دانتۆ لە وتاری"دنیای هونەر" نوسیویەتی:" هەرەپێویستیی ئەمە کە هەرامەیەك بە هونەری ببینین شتێکە کە چاو ناتوانێ لێك هاوێری بکات، کەش و هەوایەکی تیۆریی هونەری، زانینێك لە مێژووی هونەرە".[٢٩] شتێك کە بەرناسێك دەگۆڕێت بۆ بەرهەمێکی هونەری، شێوەیەکە کە ئەم توخمانە لە تەك بیردۆزەیەك کە پێشتر هاتۆتە ئاراوە هاوئاهەنگ دەبن. دانتۆ دەنوسێ کە هونەریبوون تەنیادەتوانێ لە ئاخنەی ئەو شتەی کە پێشتر زانراوە بەرەنجامگیری بکەیت و نەك لە جێیەکی دی.[٣٠] وەلێ ئەم بەرەنجامگیرییە و ئەم یەکانگیرییەی توخمی تازە لەتەك توخمگەلێ کە پێشتر

(29) A.C.Danto, “the artworld”, journal of philosophy, 61, 1964 pp. 571.584
(30) A.C.D. the transfiguration of the commonplace : A philosophy of art, Harvard university press, 1981.

به هونەری زانراون، تەنانەت نارۆشنتر لە لێك تێگەیشتنی جێی مەبەستی دیکی‌یە. خاڵێکی تازە کە لەگەڵ نەریتدا بەراورد دەکرێ، لەبەر ئەم هۆیە بە هونەری نازانرێت کە لەگەڵ شتێك لەنەریت یەکانگیرە، بەڵکو لەبەر ئەم هۆیە بە هونەری دەزانرێت کە دەتوانێ شتێك بخاتە سەر نەریت و پێوەی زیاد بکات. نەریت بەو چەشنەی کە هەبووە هەرگیز لە بەردەمماندا هەڵناقورتێ، بەڵکو لە بیچمێکدا کە ئەمڕۆ پەیدای کردوە، خۆ دەردەخا. بە ڕێکەوەندێکی دیکە،نەریت یەکانگیر لەگەڵ ئاسۆی چاوەڕوانییەکانی ئەمڕۆ سەرهەڵدەدا، دەگۆڕێت و لەگەڵ هونەری تازەدا یەکانگیر دەبێت.[٣١]

ئەمە ئیدی پێوەرێك بۆ نرخاندنی هونەر نیە. چونکە ئەم شتە خۆی کە بە" پێوانە" زانراوە، لەگەڵ بەرهەمی هونەری(کە هێشتاش نەمانزانیوە کە بۆچی بەرهەمی هونەری‌یە) دەگۆڕدرێت. لە لایەکی دیکەوە، مێژوی هونەر و تیۆریی هونەر خاڵگەلی تاقانە و جێگیر و نەگۆڕ نین، بەڵکو لە سەر بنەمای راڤەکانی دواتر( پشت ئەستور بە پێشداوەرییەکانی راڤەکان) دروست دەبن و لەبەرەنجامدا بەستراوە بە کردەی راڤەیی و لێکدانەوەیی راڤەکار بوونیان هەیە. ئایا دانتۆ پەسند دەکات کە هەرکەس دنیای خۆی ساز بکات؟ ئایا لە جێی یەك جیهانی هونەر، یا یەك سیستمی دنیای هونەر دەتوانێ قبووڵ بکات کە بێ ئەژمار دنیاگەلی هونەر، تەنانەت بە ژمارەی راڤەکارانی بەرهەمە هونەرییەکان بوونیان هەبێ؟ ئەگەر دانتۆ پێ بنێتە ئەم قەڵەمڕەوی" نەبوونی دیاریکاری"، ئیدی ئاشکرا نیە کەپێناسەی بنەتایی لە هونەر لە بنیاتی خۆیدا، بە کەڵکی چ دێت؟ دەتوانین ببینین کە" دنیای هونەر" بە کاری پێناسەی بنەتایی نایەت، بەڵام ئەگەری تێهزرین لەمەڕ لۆژیکی چەمکی هونەر و بەرهەمی هونەری دەڕەخسێنێ.

"دنیای هونەر" ئەگەر وەکو چەمکی ئاسۆ لە دیاردەناسی و لە ئاخێوی هێرمێنۆتیکی مودێڕن بزانرێت، کاراییەکی تازە پەیدا دەکات. لەم دۆخەدا، دەتوانی پێناسەگەلی جیاواز لە سەر بنەمای سیستمگەلی هەمە چەشنی دنیاکانی هونەر لە دەورەیەکی" مێژوی هونەر" بخەیتە گۆڕێ. بەم چەشنە، چەمکی تیۆریکی دنیای هونەر کە تا هەنووکە بڕیار بوو بەکاری هێنانە ئارای پێناسەگەلی

(٣١) ئەم خاڵە لە یەکەمین خاڵگەلی تیۆریکە کە لە هێرمێنۆتیکی مودێڕندا لە بارەی جوانیناسی هاتۆتە گۆڕێ. بڕواننە وانەی بیستەمی **هەقیقەت و جوانی*** و سێ وتاری بەشی یەکەمی کتێبی گادامێر:
H.G.Gaclamer, L actualite de beau, trans. E.Poulain paris, 1992
* ئەم پەرتوکەی (ب. ئەحمەدی)  لە لایەن وەرگێڕەوە کراوەتە کوردی:
ب. ئەحمەدی، **هەقیقەت و جوانی**، و. مەسعود بابایی، دەزگای بڵاوکردنەوەی موکریانی، ساڵی ٢٠٠٨، هەولێر.



خودباوەڕ لە هونەر بێت، دەبێت بە ئامرازی باسێکی ڕێژەیینوارِ. هیندە بەسە کە پەسند بکەین ئەم پێناسەیەی کە دەستمان پێی راگەیشتوە و باوەڕمان پێ‌هێناوە، هەرامەیەکی بەرتەسك، مێژویی و کاتی‌یە، تاکوو پێناسەکە کەڵکێکی باشتری هەبێ. دنیاکانی هونەر ئەگەر ڕێگەی پێناسەگەلی کاتی و گوزەریاو ئاوەڵا بکەن، وەبیرخەری باسێك دەبن کە ریچارد وۆلهایم، لە پەرتوکی **هونەر و بابەتەکەی** بە باندۆر وەرگرتن لە ڤیتگنشاین هێنایە پێشێ و هونەری بە" بیچمێك لە ژیان" ناو لێنا کە لە سەردەمە مێژویی‌یە هەمە چەشنەکاندا جیاوازیی تێ دەکەوێ.[٣٢] لەبەرجەوەنێکی دیکەوە، تیۆدۆر ئادۆرنۆش لە یەکەمین لاپەڕەکانی **تیۆریی جوانیناسی** ی خۆی لە پلارگرتن لە چەمکی سەرچاوەی بەرهەم، نووسیبووی کە هونەر لە ڕێچکەی مێژودا بەردەوام لە گۆڕانهاتوویە و کارێکی شیاو نابێت هەرکە تێبکۆشین تاکو بە یاریدەی بنەواشەیەکی گۆڕانهەڵگر پێشاوپێش پێناسەی بکەین.[٣٣] هەروەها ئەم خاڵە کە ئادۆرنۆ چەند قات هێمای بۆکردبوو لە یادمان بێ کە هونەر لە لایەکەوە بە مێژو و لە نێو مێژودا بیچمی گرتوە، بەڵام جۆرێك لە سەربەخۆیی ڕێژەییشی لەو هەیە و ئەمە رازی دژوارییەکی زێدەبار لە پێناوی پێناسەکردنیەتی. کەسانێك کە ویستویانە پێناسەیەکی مێژویی لە هونەر بێننە ئاراوە، بە زۆری لەو سەربەخۆییە ڕێژەیی‌یە وردنەبوونەتەوە و کەسانێکیش کە ویستویانە پێناسەیەکی بنەتایی بۆ بکەن، لە خدەی مێژویی سەرەدەرەیان نەکردوە. ریچارد شوسترمان و نوئێل کارۆل فەیلەسوفانێکن کە لە قەڵەمڕەوی فەلسەفەی پراگماتیستی کاریان کردوە، بە جەختکردن لە سەر ئەم خدە مێژویی‌یەی هونەر، هێنانە ئارای پێناسەیەکی بنەتایی لەویان بە نەلواو ناودێر کردوە و نووسیویانە کە چالاکیی هونەری خۆی بەرەنجامێکی فەرهەنگی‌و مێژویی‌یە و هەربۆیە باشترە زاراوەی هەمەکی‌و هەڵەشەی "هونەر" وەلا بنێین و لە "هونەرگەلی فرە چەشن" بدوێین. هەر هونەرێك خودان مێژو، پێشینە، ئاسۆ و سنوردارییە تایبەتیەکانی خۆیەتی‌و لە گەڵاڵەی تێکڕایان ناتوانی بە پێناسەیەکی نامێژویی‌و بنەتایی لە هونەر بگەیت.[٣٤] بەمجۆرە هەر هونەرێکی تایبەت، کە لە بەر هۆیەکی تایبەت بە هونەر زانراوە، کاروچالاکییەکی سەراسایە کە بە سەرنجدان لە ڕێچکەیەکی مێژویی تایبەت کە پێواویەتی، دەناسرێتەوە.

(32) r.wolheim, art its objeets, London, 2970.
(33) t.w.adorno . theorie esthetique , trans. M.jimenez, paris, 2974,p.11.
(34) R.Schusterman, Pragmatist Aesthetics, Cambridge, Massachusetts, 1993.
N.Carroll. “Art, Practice, and Narrative”, Monist, 71, 1988, PP. 140-156.

## (٦)

هونەرمەندێك كە دەیەوێ جیهان بەو چەشنەی كە دەیەوێ نیگار بكاتو بەرامبەرێك كە بەرهەمی هونەری لە سەر بنەمای ویستی خۆی، واتە وێنایەك كە خۆی لە ئازادیو كامەرانی هەیەتی راڤە دەكات، لە بەرهەمی هونەریدا جۆرێك ئۆخژنی رۆحی، یا بەگوتەی بەناوبانگی ئەرەستۆ "پالاوتنی گیان" پەیدا دەكات. گوایە بڕیارە كە بەرهەمی هونەری دەوری ئۆخژنكەرەوەی رۆحی بگێڕێت. بێگومان تێڕوانینی ئاكامناسانە وەها دەورێك دەخاتە ئەستۆی بەرهەمی هونەری، وەلێ جێی سەرنجە كە نە ئەم ئۆخژنە بەردەوام بیچمێكی تایبەتی هەیەو نە داخوازیشی بەردەوام لە یەك رێگاوە دەلوێ. ئەو ئازادییە دەستەبژێركردنە كە لە جەرگەی بەرهەمی هونەریدا وەشێراوە، بە هەرحاڵ دەبێت بە ئازادیی راڤە لە ئازادی و بەختەوەری. لە نامەكانی وانگۆكدا دەخوێنینەوە كە نیگاركێش لەم رووەوە نیگاری كەسانو شوێنانی دەكێشا (چونكە) لەوان دەترسا، واتە سەبارەت بە بوونی ئەوانە تووشی دڵەڕاوكێ و خەمۆكی بوو. ئەو پێی وابوو كە بە كێشانەوەی پەردەكانو گەڵاڵەكانی نیگار كێشان، ئارام و بە شێوەیەكی تایبەت، لە گێچەڵی دڵەڕاوكێو كەڵكەڵەكان رزگاریی دەبوو. وان گۆك لە دوو نامەدا كە لە ساڵی ١٨٨٨ لە ئارێل بۆ براكەی تئۆوان گۆك ناردی، نووسیبوی:"لێرەدا كەلیسایەكە بە ناوی پەرستگای ترۆفیم و بە شێوازی گوتیك. من، تازە لام ئاشكرا بووە كە ئەم كەلیسایە چەندە پڕنرخ و جوانە. بەڵام لەودا، شوێنەوارێكی ترسناكو تۆقێنەر، وەكو مۆتەكە هەست پێ دەكەم. ئەم یادگارە پڕنرخە بەم شێوازە ئێجگار باشە لە دیدی منەوە وەكو تارمایی دنیایەكە كە لەگەڵ بیر و رۆحمدا سازگار نیە. دەبێ راست بێژمو دان بەوە دابنێم كە خەڵكی ئێرە، سەربازانی ئەلجەزایری، ژنانی یانە گشتییەكان، كیژانی بچوكو دڵڕفێنی ئارلی، قەشەكان چوارشانەنو قەڵافەتی سامناكیان و هەروەها هۆگرانی ئارەقی ئەبسەنێت، تێكڕا بەلامەوە بوونەوەرانێك لە دنیایەكی دی دێنە بەرچاو..."[٣٥] وە: "تیۆی ئازیزم، بەم تەتەرە، گەڵاڵەیەك لە تابلۆی "قاوەخانەی شەو"م بۆت نارد... لە تابلۆی قاوەخانەدا، ویستم تا ئەم خاڵە روون بكەمەوە كە قاوەخانە شوێنێكە كە مرۆڤ دەلوێ لەوێدا شێت ببێ، یا تاوانێك بقەومێنێ. تێدەكۆشم ئەم بەرهەمە بەكەڵك وەرگرتن لە تێككردنەوەی رەنگە زراڤە گڵی، سوری جەرگیو

(٣٥) وانگوگ، پیشین، ج ٢، ص ٣٧.



رەنگی تۆخی شەرابی، لەگەڵ (رەنگی) سەوزی خۆشڕەنگی سەردەمی لویی پانزدەهەم، سەوزی ورۆنێز و رەنگەكانی سەوزی تۆخ و سەوزی شینباو بڕازێنمەوە. ئەم رەنگانە پەڕانپەڕی گەرم وگوڕی قاوەخانەو ئازار و رەنجی شاراوەی بەرجەستە دەكاتەوە. تۆخیو تاریكانێك كە هێشتا كاریگەریو وزەیان لەكیس نەداوە..." [٣٦] .

چەمكی "پالاوتن" (catharsis) كە لە دیدی زۆر كەسانەوە رۆڵی تایبەتی بەرهەمی هونەری یا گرنگترین ئەركی دیاری دەكا، چەندین سەدەیە كە لە چەقی باسگەلی جوانیناسانەی فەیلەسوفانو هونەرمەندان جێی خۆش كردوە. زۆربەی خەڵك لە بەروڕووبوونەوە لەگەڵ بەرهەمی هونەری گۆڕدرانی هەستو حاڵ، هزر و تەنانەت جیهانبینی خۆیان دەخوازن. زۆرجاران پێوەری ترۆپكی پێگەیشتنی بەرهەمی هونەری، هەر ئەم بارتەقای شوێندانەریو هێزی گۆڕێنەری زانراوە. كارێكی ئاسان نیە كە لە بەرانبەر پێویستی یا داخوازی خەڵك كە بە درێژایی سەدەكان دركێنراوە و وزەی وروژێنەری كاری زۆربەی هونەرمەندان بووە، بەرەنگاری بكەی و وەها بڵێی كە پالاوتنی رۆحی هونەرمەند و بەرامبەر (بیسەر ـ خوێنەر) كە دەوری سەرەكیی بەرهەمی هونەری لە قەڵەم دراوە، چەمكێكی لێڵە و هێندە جێی راڤەگەل و لێكدانەوەی هەم چەشن دەهێڵێتەوە كە سەرەنجام ناتوانی بە وردی رۆشن بكەیتەوە كە مەبەست لێی تەنانەت لە هەمەكیترین شێوەیدا دەتوانێ چ بێت. بەمەشەوە، بیچمگەلی ئاگا و نائاگای وەها بەرەنگارییەك لە بەرانبەر چەمكی پالاوتن، مێژوی جوانیناسی لێوڕێژ كردوە. زۆر لە مشتو مڕە فیكرییەكان لە فەلسەفەی هونەردا هەر بۆ ئەم چەمكە دەگەڕێنەوە. هەر بۆ نموونە بە وردبوونەوە لە باسی ئەرەستۆ لە پاری شەشەمی **پۆیەتیك** بە هیچ شێوەیەك رۆشن نابێتەوە كە مەبەستی راستەقینەی فەیلەسوف لە بەكاربردنی پەیڤی catharsis یا "پالاوتن" چیە. لە نیگای یەكەمدا وادێتەبەرچاو كە دەڵێ تراژێدی بەزەییو ترس دەوروژێنیو لە راستیدا بەم كارە دەبێتە هۆی پالاوتنی ناخی مرۆڤ لەم سۆز و هەڵچوونانە.[٣٧] ئەم راڤەیە لە رێكەوەندی لێڵو ناڕوونی ئەرەستۆ مەرج نیە هەمووجارێ راستودروست بێت، چونكە لە خاڵگەلی دیكەدا ئەو پالاوتنی لە واتایەكی هەمەكتیر بە كار بردوە و دەوری هونەر تەنیا لە

(٣٦) وانگوگ، پیشین، صص ٩٣-٩٤.

(٣٧) ارسطو، پیشین، ص ٣٦.

وەلانانی سۆز وبەزەیی و ترس قەتیس ناکاتەوە. لە (پەرتوکی) **رامیاری** (Politics)دا پالاوتنو هیراگەری هاوئاست و هاوشانی یەکدی بە کار براون.(٣٨)

پالاوتنی رۆحو گیانی مرۆڤ دەتوانێ بەرەنجامی هۆکارگەلی بەدەر لە بەرهەمی هونەریش بێو لەمبارەوە بەردەوام دینو عیرفانو سۆفیگەری رەقیبانی سەرسەختی هونەر بوونە، بەلام رەوشت، فەلسەفە، و تەنانەت ئەوینو سۆزە پڕمەستەکانیش لە کۆمەڵی ئەم رەقیبانەدا جێیان هەیە. تەنانەت ئەگەر باس لە هونەردا ببڕینەوە، هەمدیس مەسەلەکە ئاسان چارە ناکرێ. لە کوێوە دەتوانی تێبگەیتو پەسند بکەیت کە گیانێك لە بەر کاریگەریی بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ بەرهەمی هونەری (یا پەیامەکەی) گۆڕاوە و باشتر بووە؟ ئامرازی ناسینو دەربڕینی ئەم گۆڕان یا لە خەم رەخسانە چیە؟ چەمکی پالاوتن دژواریسازە و لێناگەرێ تا بەرسڤێکی کتومت بۆ پرسیاری سەرەوە بەرهەڤ بکرێو رەچەی باسە تێکچڕژاو و فرەچەشنەکان دەشکێنێ. هەر ئەم خالە کە کاتێك دەمانەوێ گۆڕانی رۆحیو نێواخندۆزییانەی تاکەکەسێك لەبەر باندۆر وەرگرتنی لە هونەر بێنینە ئاراوە، لە کۆتی پرسیارانێکی ناکۆتا لەمەڕ خدە کۆمەلایەتییەکانی هونەر تووش دەبین، بە باشی نیشان دەدا کە ناتوانی پالاوتن زۆر سادە و بەسانایی پێناسە بکەیت و لە کۆڵی بکەیتەوە. هەر گۆڕانێك یا چاکبوونەوەیەکی بارودۆخێکی رۆحی، بۆ پێشداوەریی مرۆڤان و ناخودئاگایان دەگەڕێتەوە. ئەگەر باسەکە لەم بەستێنەدا درێژە بدەین، خالگەلی تازە دەخرێنەڕوو کە لە خۆیاندا دەرخەری خدەی راڤەیی ئەم گۆرانکارییە رۆحییەن. ئێمە وا گریمان دەکەین کە لە هەلکەوتیA بەهەلکەوتی B گەیشتوین. ئەم گریمانە لەسەر کۆلەکەی پێشداوەرییەکانی راڤەیەکی لواو و بە ئاسۆیەکی دانایی تایبەت دیاری دەکرێت. بە دەربڕینێکی دیکە، هەرکام لە ئێمە لە" پالاوتنی رۆح" بە واتایەکی سەراسا و تاقانە دەدوێین. هەر راڤەیەك لە پالاوتنی رۆح و گۆڕانکاری و سارێژی رۆحی، لە راستیدا هیچ نیە جگە دەربڕین یا پێشنیارێکی سیستمدار بۆ باشتر ژیان. باسی بە روالەت جوانیناسانەی پالاوتن، لە فراژووبوونی خۆیدا، دەبێت بە باسێکی رەوشتی، کام بیچمی ژیان شایستەیە؟ ژیانی شیاو کامەیە؟ لام وایە لەوەی باسکرا ئەم خالە رۆشن دەبێتەوە کە چەمکی پالاوتنی گیان کە ئەرەستۆ هێناویەتە پێشێ، چەمکێکی رەوشتی ـ سیاسیـیە کە تەنیا لە قەلەمڕەوی رێژەیینواڕیی فەرهەنگی دێتە گۆڕێ و دەناسرێتەوە. پێشنیارانێك بۆ زیندەگانیی

---

(38) Aristotle, The Polieics, trans. T.A.Sindair, London, 1978,P.314.



باشتر و دروستتر، بێجگە راڤەگەلێ لە ژیانی ئەمڕۆیی ئێمە شتێکی دیکە نین. هەر بەم شێوەیە ئازادیی ئێمە لە خەیالپەروەری لە بارەی ئەم گۆڕانکارییە رۆحییە

(وەکو ئازادییەکی بونیادی کە بەرهەمی هونەری لە بەرهەمی ناهونەری جیادەکاتەوە) خدەی رێژەیی، سنوردار، مێژویی و بەستراوەیی بەکات و شوێن پەیدا دەکات.

ئازادی بەرەنجامی راڤەیەکە کە ئێمە لە ژیانی خۆمان لە هەل ومەرجی هەرەتی و شوێنی هەمانە، راڤەیەکە کە لە بارتەقای دارایی و نەدارییەکانی ئێمە، لە تێکرای ئەو شتانەی کە دەمانەوێن و لە بەردەستماندا نین و هەنوکە لێیان تێدەهزرین و گەلالەی دەستراگەیشتنمان دادەرێژین، یا رەنگە باشتر بێت کە بێژم گەلالەیەك لە ئەگەری هاتنە دییان لە مێشکماندا پەروەردە دەکەین. وێنای ئازادی، بەم چەشنە، لەوەی هایدگێر بە پێش ـ فامەکانی ئێمە ناودێری دەکرد، جیا نیە. خەیالێکە بۆ بانترچوون لە سنوری بەرتەسکێتی و تێك شکاندنی حەساری هەرە پێویستێتی، بەلام بەم سنور و حەسارەوە دیاری دەکرێ. بە ئازادی ناگەین، بەردەوام لە بەردەمانە، هەرکە بەو شتەی کە دەمانەوێ دەستمان رادەگا، داخوازێکی دی لە بەردەماندا قووت دەبێتەوە، کەوابوو هەمدیس تامەزرۆیی بەگەلالەرێژی لەگەڵ ئەگەری دەستراگەیشتن پێی هاوپێناو دەبێ و وێنایەکی تازە لە ئازادی بەرهەڤ دەکا. هەرگیز ئەو گۆڕانکارییە تەواو و بێ هاوتا و پەتی و بنەتاییەی گیان، کە بە ئازاد ناودێریبکەین، نە لە هونەرەوە بەرەنجامگیری دەکرێت و نە لە هیچ شتێکی دی. هەرگیز بەرهەمێکی هونەری ناتوانێ ئێمە لەسەرەتا پێ بگۆڕێت، ژیانمان بە شێوەیەکی رەها بگۆڕێت، گۆڕانکاری بەسەر هەبوونمان بێنێت و بونیادی باوەڕەکانمان بکات بە بونیادێکی تازە. وەلێ بەرهەمانێکی هونەری هەن کە ئاسۆی درك پێکردنمان لە ئازادی دەگۆڕن و لەم رێڕەوە دا ژیانی ئێمە دەخەنە رێچکەیەکی تازەوە، تا لەم رێگە نوێیەدا هەمدیس خوازیاری شتانێکی دیکە ببین. هەرگیز بەو ژیانە کاملەی کە بە شێوەیەکی تەواو شایانی ژیانکردنی بزانین ناگەین، بەلکو بەردەوام دەیخوازین و لەم روەوە ژیان بردنەسەر بۆ ئێمە واتا پەیدا دەکات. ئەگەر چەمکی پالاوتن بە واتایەکی تازە وروژانی تامەزرۆیی بە گوڕانکارییەکان لە زەینی ئێمەدا بێت و نەك خودی گۆڕانکارییەکان، ئەوکات دەتوانین هونەر بە پالێوەری گیان ناودێر بکەین. بەلام هونەر لەم دۆخەدا تەنیا نابێ. ئەوین، یەکەمین و ئاشناترین وزەی پالێوەرە کە شان لە شانی هونەر دەدا و هەمدیس رەقیبانی دیکەش دەبن.ئێمە ناتوانین لە ئاسۆی دانایی رۆژگارەکەمان و لە سنوردارییەکانی ماتریالیستیی سەردەمەکەمان بانتر بچین.( وشەی یونانیی horos بە واتای

ئاست و کەوشەن، رەچەڵەکی وشەیhorizon ە کە ئەمڕۆ لە زمانە هیندوئەوروپاییەکان بە هاوواتای ئاسۆ بەکاردێت) . تەنانەت لە قەڵەمڕەوی خەیاڵپەروەریشدا لەگەڵ کەوشەن و چوارچێوەیەکی ئازاردەر بەرەوڕووین کە کارەکەمان لەودا سنوردار دەبێت. هیچ بەرهەمێکی ئەدەبی و سینەمایی لە قەڵەمڕەوی ئاخێوی خەیاڵگەری* ـ زانستی(science fiction) ناتوانی بەدی بکەیت کە لە سنورەکانی هەنوکەیی دانایی ئێمە کە بەسەرباشقەگەلی زانستی، فیکری، فەرهەنگی و ئایدیۆلۆژیك دیاری کراون، بانتر بچێ. هەربەو چەشنەی کە ئێمە کە لە زیندانی دانایی زانستیی سەردەمەکان لە دنیاکانی دی، یا بۆ نموونە بە شێوەیەکی دیکە لە ژیان لە فەزادا تێدەهزرین و لە باشترین دۆخدا هەروا فەزایەکی" مرۆڤ تەوەر" وێنا دەکەین، لە قەڵەمڕەوی گۆڕانکاریی رۆحیی وەبارهاتوی بەرهەمی هونەریش سنورێك لە بەردەماندا هەیە کە بانتر لەو ناچین و نابینین. هونەر تەنیا دەتوانێ تامەزرۆیی بە هەڵهێنانی(مەتەڵ) و خەیاڵکردنەوە لەمەڕ ئاسۆکانی دیکە بورژێنێ. هەر چەندەیش رووبەڕووی ئەم هەڵهێنانەش سنوردار بێت، هەمدیس دەبێ بڵێین کە خودێتیی ئەو فڕینە ئازادەی خەیاڵ شتێکی کەم نیە. بە تایبەتی لە رۆژگاری مودێڕندا کە هەموو شتێکی ئیمە لەکۆتی دەکارکردن (مصرف) دیل دەکەن و بە پێشوازیمان دەبات. کەوابوو کارەکەمان ناتوانێ تەنیا ئەمە بێت کە بێتواناییەکی هونەر لە گەیشتن بە هێڵی ئاسۆ باس بکەین، بەڵکو دەتوانین و دەبێ کە تواناکانی لە جێگۆڕکێ و کەوابوو لە گۆڕاندنی هێڵی ئاسۆش وەبیربێنینەوە. کت و مت بەو چەشنەی کە کاتێك لە بیاباندا سەیری هێڵی ئاسۆ دەکەین، جێگەیەك وێنا دەکەین کە لەوێدا زەوی و ئاسمان بەیەك دەگەن. هەتا ئێمە لە پێگەو وێستگەی خۆماندا نەجوولابین، ئەو هێڵی ئاسۆیەش جیاوازی تێناکەوێ، تەنیا کاتێك کە جێگەمان بگۆڕین، هەنگاوێك بۆ پێشەوە هەڵگرین( یا بۆ دواوە، یا گۆشەیەکی دیکە) هێڵی ئاسۆ جیاوازی تێ دەکەوێ. ئەو هێڵە، هەمدیس دەستڕانەگەیشتویە و ئێمە هەرگیز لە شوێنێکدا ساوکە ناگرین کە ئاسمان و زەوی بەیەك بگەن، بەڵام دەتوانین ئاسۆ بگۆڕین، ئاسۆی نوێ بخولقێنین. رەنگە لەم ئەفراندنەدا ئاسۆی تازەی شتێك لە بەرجەوەنی دیدارێماندا دەرکەوتنوێن دەبێ، تەپۆڵکەیەك، درەختێك یا تراویلکەیەك. رەنگە کاتێك بەو شتە تازە وەدیارکەوتوە بگەین، لامان وابێت کە لە هێڵی

---

* fiction بە واتای ئەفسانە و چیرۆکیش بەکار دێت، بەڵام لێرەدا مەبەست فیلمە( خەیاڵی /زانستی) یەکانن.( وەرگێڕ)



ئاسۆداین، بەڵام لێرەدا ئاسۆیەکی دیکە لە بەرانبەرمانەوە بیچم دەگرێ و ئێمە تەنیا لە ئاسۆی رابردودا ساوکەمان گرتوە. خەیاڵکردی خۆشبەختی و کامەرانی، خولیای زیندەگانیی شایانی ژیانکردن کە هونەر دەیخۆڵقێنێ، خەیاڵکردی درەختێکە لە بیاباندا، لە هێڵی ئاسۆدا. کاتێك کە بگەینە درەختەکە، ئارەزوی تازەمان گەیشتن بە ئاسۆیەکی تازە دەبێت. هەرچەند بە پێی ئەم نیگایە، هونەر بەردەوام و وەدواکەوتنی هاتنەدیی ئارەزوەکانە، بەڵام لەم وەدواکەوتنەدا دانایی و بینادارییەك وەشێراوە: جووڵە دەکەین، بە جێیەکی تازە دەگەین، دەبینە مرۆڤێکی تازە.

# خەياڵكردى كەتوار

## (١)

بۆ منداڵێك كە لە نیوەشەودا لە ترسان رادەچەنێ و بەگریانەوە گۆشەیەكی تاریك نیشان دەدا و دەڵێ:" شتێك لەوێیە!"لەم دنیایەدا هیچ شتێك راستەقینەتر لەو" یەك شتە" نیە.بۆ منداڵێك كە بەر لە خەوتن چیرۆكی شازادە خاتونێكی میهرەبان دەبیستێ، بوونەوەرێكی راستەقینەتر لەو شازادەخاتونە بوونی نیە. بۆ تەماشاوانێكی تابلۆی لیۆناردۆداڤینچی" حەزرەتی مریەم و مەسیح و قددیسەكەی"، دوو ژن، منداڵ، بەرخۆلە، رەوەزەكان، درەختەكان، شەماڵ و شیبا لانیكەم بۆ چركەساتانێك راستەقینەن. هەرامەی خەیاڵی بە گوتەی ژان پۆك سارتر دەسەلمێنێ كە دركی ئێمە لە كەتوار ئێجگار پڕكەمایەسییە.[١]

یەكێك لە كۆنترین و تێكچڕژاوترین باسە هونەرییەكان كە بۆ ئەفلاتون و ئەرەستۆ بەهەمان شێوەی گەرم و گوڕ بۆ جوانیناسان و فەیلەسوفانی رۆژگاری ئێمە لە گۆڕێدا بوو، پێوەندیی نێوان هونەر و كەتوارە. تێكچڕژاویی مەسەلەكە لە نارۆشنیی چەمكی كەتوار لە ئاخێوی فەلسەفی و فەلسەفەی هونەر دەست پێدەكا. چۆن و بەچ جۆرێ شتەكان لە چالاكمەندیی خۆیاندا هەن؟ ئایا ئەم چالاكمەندییە، یا ئەم بوونە، هەمان كەتوارە؟ ئایا شتەكان لەگەڵ ئەوەی وەبەرچاو دەكەون، واتە لەگەڵ دەركەوت (بیچمی سەرهەڵدان، روخسار یا appearance) جیاوازییان هەیە؟ بە دەربڕینی دیكە، ئایا جیاوازییەك هەیە لە نێوان چالاكمەندی و لەئارادابوونی شتێك (یا خودی ئەو شتە) لەگەڵ ئەو شتەی لە چاوی چاودێرێك، یا تاقمێك لە چاودێران، دەركەوتی هەیە، یا وادێتە بەرچاو كە " هەیە"؟ ئەگەر جیاوازییەك هەیە، ئایا راستەقینەیە یا ئێمە تەنیا وەكو یەكێك لە هەمبەرە لواوەكان باوەڕمان پێ هێناوە؟ ئەگەر باس لە هەمبەر لواو بێت، ئایا شتەكان دەتوانن لەودا جێ بگرن و بەم پێیە لە گۆڕێدا نەبن، یا خاوەن كەتوار نەبن؟ ئەگەر جیاوازیی نێوان خودی شتەكان و دەركەوتیان پەسندبكەین ـ كە هەندێك لە گەورەترین فەیلەسوفان، بۆ نموونە كانت و شۆپێنهاوێر، وەها جیاوازییەكیان پەسند كردوە ـ ئایا ناتوانین بەرەنجامگیری بكەین كە گرنگ

(1) j.-p.sartre, L imaginaire, paris , 1948



نیە خەڵك تا چ ئاستێك لەمەڕ چیەتیی هەرامەیەك هاوڕابن، چونكە بەهەرحاڵ ئەو هەرامەیە وەكو كەتوارێك لەـ خۆوە لەگەڵ ئەو شتەی كە وادێتە بەرچاو راستەقینەیە، لێك هاوێرە؟ ئەگەر وابێ ئەم پرسیارەی خوارەوە نابەجێ نابێت. ئایا جیهانی "راستەقینە" بوونی هەیە؟ زۆربەی خەڵك( و نەك هەموویان) وڵامی بەڵێ بەم پرسیارە دەدەنەوە. ئەوان دڵنیان كە ئەم خامە و ئەو درەختە لە تەنیشتیاندا" هەن" بەڵام، بە هەرحاڵ دەتوانی بپرسی كە دنیای راستەقینە لە چ ئاستێكدا و بەچ بارتەقایەك، بوونی هەیە؟ ئایا لە ئاستی هەستەكان، درك پێكردنەهەستەكییەكان و ئەزموونە هەستپێكراوەكانی ئێمە بوونیان هەیە، یا لە ئاستی تیۆریگەلی هەمەجۆری فەلسەفی، مێژوویی،جڤاكناسانە، كۆمەڵایەتی و ...هتد؟ ئایا دەتوانین بێژین كە ئەم دوو ئاستە لە یەكدی جیا و سەربەخۆن یان نا؟ ئایا هیچكات ناكەونە دژبەرایەتی یەكدی؟

بە پەسندكردنی جیاكاریی دەركەوت و كەتوار، بە شێوەیەكی رێژەیی و تا ئاستێك ئەم خاڵەش قبووڵ دەكەین كە بیچمی سەرهەڵدان یا دەركەوت بە هیچ شێوەیەك ناتوانێ كەتوار" دەرەوست" و بەرتەسك بكات. كەتوار( كە هەندێ لە فەیلەسوفان لەم دۆخەدا بە" كەتواری بەرهەست" ناودێریان كردوە) دەتوانێ لە بڕكردنی تێكڕای توێژینەوەگەلێ كە ئێمە تاكو ئێستا لە بارەیەوە ئەنجاممان داون، بانتر و پێشەوەتر بچن. هەر ئەم خاڵە بوخچەی ئەوە دەپێچێتەوە كە ئێمە لە ئەزموونەكان و بیردۆزەكانی خۆمان تەنیا بیچمە لواو و هەمە جۆرەكانی" كەتوار" بێنینە ئاراوە و لە سەر بنچینەی ئەم بیچمانە لە "داتاكانی كەتوار" یا شتێك كە بێرتراند راسێل بە facts of reality ناوی لێناوە بدوێین و بانگەشە بكەین كە ئەمانە" شیانی نرخاندن" ن.

رۆشنە كە چەمكی" كەتوار" واتاگەلی هەمە جۆر و دژبەری پەیدا كردوە. رەنگە بتوانی یەكێك لە هۆیەكانی ئەم كارە گرێدرانی بە چەمكەكانی دیكە بزانیت كە بە نۆرەی خۆیان بە ئەندازەی پێویست تێكچڕژاو و چارەسەرنەهاتوو دێنە بەرچاو. ئایا هەرامەی راستەقینە هەمان "هەرامەی دروست"ە؟ ئایادەكرێ بێژین كە یەك شتی راستەقینە "شتێكی سروشتی"یە؟ دەیان چەمك كە لە تێكچڕژاویدا شتێك لە "راستو درۆ"و "سروشتی"و "ناسروشتی" كەم ناهێنن، لەگەڵ مەسەلەی فەلسەفیی كەتوار هاوپێناو دەبن. هەر بۆیە هەندێ مەسەلە كە لە تێهزرین لە كەتوار سەرهەڵدەدەن، ئێجگار تێكچڕژاون: چ هەمبەرێك لە نێوان بیچمەكانی هونەر و هەڵێنجانە تیۆریكەكان لە كەتوار كە ئێمە دەیهێنینە پێشێو ستراتیژە

کردەکییەکانی وەبار هاتوی، بوونی هەیە؟ ریالیزمی فەلسەفی لەوێدا سەرهەڵدەدا کە ئێمە پەسند دەکەین (تەنانەت، یا لانیکەم، وەکو گریمانەیەك) کە جیهانی بەرهەست یا لە شێوەی کەتوارێکی ئۆبژەکتیڤ بوونی هەیە و یا بەشێوەی هەودایەك لە "کەتوارەکان"یا "ئەگەرەکان" کە خەڵك لە بەرچاو خۆیاندا دەیان بینن، یا دەیان خولقێنن یا خەیاڵیان پێوەیان سەرقاڵە. دژواریی مەسەلەکە لەم جیاوازییە زراڤەوە دەست پێدەکات کە لەنێوان هەڵێنجان لە کەتوار وەکو داتا یا هەرامەیەکی هەبوو و هەستپێکراو و هەڵێنجان لێی وەکو هەرامەیەکی خەیاڵی،مەودا دروست دەکا. ئایا دەتوانین بڵێین کە رووداوەکانو کەسیەتییەکانی شانۆی **خاڵۆ وانیا** ی چیخۆف کە خەریکین سەیری دەکەین، بە هەمان واتایەك "راستەقینەن" کە رووداوەکانو کەسانێك کە ئێمە لەگەڵیان لە پاش کۆتایی شانۆکە لە شەقامدا بەرەورووەبین؟ لە هەمان ساتەکانی تەماشای شانۆ، ئایا دەتوانین بێژین، ژنێك کە دەوری سۆنیا کایەدەکا راستەقینەیە (واتە خۆیەتی) یا سونیا؟

فەیلەسوفان لە رۆژگاری پێش سوکرات تێبینیان کردبوو کە جیهانی دەرەکیی ئەوان لەدۆخی گۆڕانی بەردەوامدایەو دەستڕاگەیشتن بە کاروباری راستەقینە ئەگەر نەلواو نەبێ، کارێکی لە رادەبەدەر دژوارە. تا ئەوەندە دژوارە کە بمانەوێ هەمبەری نێوان کاروباری راستەقینە تێبگەین. یەکێك لەو کاروبارانە بەرهەمە هونەرییەکانن. بۆ ئافرێنەرانی ئەم بەرهەمانەش پرسیاری کەتوار وەکو گرێکوێرەیەکی چارەسەرنەکراو بیچم دەگرێ: ئایا هونەر "لەبارەی" کەتوارە؟ ئایا دەری دەبڕێ، یا روونکردنەوەی لەبارەوە دەکات؟ ئایا وەکو هەمدیس نوێن یا بەیانگەر (representative) ی بڕێك لە هەوێنەکانی جیهانی راستەقینە کار دەکات؟ نەخاسمە خۆی بە شێوەی شتێکی دیکە بەدەر لە روونکردنەوەی کەتواری لێ دەربچێ؟ نوێ ئەفلاتونییەکان بەرهەمی هونەرییان بە"کەتواری دووەم" ناو دەنا و (لیۆناردۆ داڤینچی) ش کاتێك نیگارکێشانی بە cosamentale یا "شتێکی هزرین ئاسا" ناودێر دەکرد، بە کەتوارێکی تازە لە قەڵەمی دەدا. بەرهەمی هونەری بەرلەوەی هەمدیس نوێن یا بەیانگەری کەتوار بێت، خۆی کەتوارێکی تازەیە کە بە شێوەی ماتریالیستی رووبەڕوومانە و بەشێوەی گەوهەریو بێ بگار لە قووڵایی هزر و ئاگایی ئێمەدا جێی خۆش کردوە و دنیای خۆی ساز دەکا.

هەنوکە بەرهەمی هونەری کە یەك دنیا مەسەلە و کێشە دروست دەکا بۆ ساتێك وەلادەنێین و بۆ باسی فەلسەفی لە کەتوار دەگەڕێینەوە. ئێمە بەردەوام تێدەکۆشین تا رۆشن



بکەینەوە کە ناسینمان لە "کاروباری کەتوار" کامەیە. **وتارنامەی لۆژیکی ـ فەلسەفی** ی ڤیتگنشتاین بەم گوزراەیە دەست پێدەکا کە "جیهان تێکڕای ئەو شتەیە کە دۆخی کەتوار (بە ئاڵمانی fall بە ئینگلیزی ) caseە"و لە یەکەمین روونکردنەوەشدا دەڵێ کە "جیهان کۆی هەبووەکانە وtatsache(یا ) factنەك کۆی شمەکەکان thing یا ) [2]."ding(" بەم چەشنە، لە یەکەمین هەنگاوەوە، ناسینی کەتواری جیهان، دەبێت بە ناسینی "هەبوونەکان" کە یەکلاکەرەوەی جیهان و"دۆخی کەتوار"ن. چ کارەکە لە ناسینی "هەبووەکان"ەوە دەست پێبکەین، یا لە هەمان کەتواری کاروبارەکان یا کاروباری راستەقینە کە بەلای زۆر لە فەیلەسوفان جێی بایەخ بووە، بە هەر حاڵ دژواریی کاری ئێمە لە پەیداکردنی بارتەقا و پێوەرێکە کە "دروستی یا راستی"ی بەرەنجامەکان دەستەبەر دەکات. ئێمە راستودروستیی هەر ناسینێك بە گەڕاندنەوە بۆ کەتوار دەستەبەردەکەین، راستو دروستیی ناسینی کەتوار دەبێ بە چ شتێك دەستەبەر بکەین؟ " ناسینی راستەقینە" کە ئسپینۆزا لێی دەدوا و پەرۆشیی فەلسەفیی کانت بوو، چیە؟ وەها دەنوێنێ کە لە دیدی ئسپینۆزا ئێمە بە ناسینێکی ئێجگار سەرەتایی لە کەتوارەکان دەست پێدەکەینو سەرەنجام بە ناسینی راستەقینە دەگەین، سپینۆزا لە **وتارنامەیەك لە بیرازتنی تێگەیشتن** دا لە دروستکردنی ئامراز نموونە دێنێتەوە کە لە دروستکردنی سادەترین ئامرازەکان بە ئامرازگەلی تێکچڕژاو دەگەین.[٣] لەڕاستیدا فەلسەفەی مودێرنیش وەکو فەلسەفەی ئەفلاتون ئێمە لە بەرورووبوونەوە لەگەڵ "کەتوار" ئاتاجمەندی چەمکێکی چەندقات تێکچڕژاوتر دەکا، چەمکێکی رەها بە ناوی "هەقیقەت" کە گریمان دەکەین لە پشتەوەی تێکڕای کەتوارەکانەوە دانیشتوە و هەموو شتێك پاساو دەدات. میتافیزیك بە "بیرۆکە"، "هەقیقەتی کۆتایی"، "خوا"، "ناسکاری بەرین" سەرگەرمی تێگەیشتن لە کەتوارەکان بووو رێگەیەکی درێژی پێوا تا مارتین هایدگێر ئەم چەمکە لە هەقیقەت وەلا بنێت و رێگەیەکی دیکە بخاتە بەردەمان.[٤]

---

(٢) ل. ویتگنشتاین، **رسالەی منطقی ـ فلسفی**، **ترجمەی** م.ش. ادیب سلطانی، تهران، ١٣٧١، ص ٩.

(٣). ب. اسپینوزا، **رسالە** در اصلاح **فاهمە**و بهترین راه برای رسیدن به شناخت حقیقی **چیزها**، **ترجمەی** أ. سعادت، تهران، ١٣٧٤، صص ٢٨-٢٩.

(٤) لەمبارەوە بڕواننە دوو نووسینی هایدگێر.

M.Heidgger, “La doctrine de Platon sur la verite”, Questionsii, Paris, 1973.

له لایەکی دیکەوە چەمکی کەتوار لە باسی هایدنناسیشدا لە ئارادایەو هایدگێریش باسەکەی تا ئەم ئاستە پەلکێش کردوە). هەبوونی ئێمە لە جیهاندا، یا هەبوونی هەرشتێك لە جیهاندا، دەتوانێ وەکو کەتوارێك گریمان یا بناسرێت. کانت کاتێك لە **هەڵسەنگاندنی ئاوەزی پەتی** دەینووسی: "کەتوار لە چەمکی پەتیی تێگەیشتندا بریتی‌یە لە شتێکی وەها کە لەگەڵ هەستێکی بە گشتی هاوچەمەڕایە، واتە ئەوشتەی چەمکەکەی خۆی لە خۆیدا هایدنێك (لە کاتدا) نیشان دەدا".[٥] فامێکی هایدنناسانەی لە کەتوار هەبوو. ئایا ئەم هەبوون ـ لە ـ کات هەمان بوونی شتەکانو قەومانی رووداوەکانە؟ ئایا نها-چالاك (فعلیت) ە؟ ئایا تەنیا لە هەرامەیەکی هەستپێکراودا دەبڕێتەوە یا هەرامەیەکی خەیاڵیش دەگرێتە خۆی؟ (ئۆن فینك) ی دیاردە ناس سەرنجی لەم خاڵەی دوایی دا و هەرامەی خەیاڵی وەکو هەمدیس نوێن، وێنەو رەنگدانەوە و هەرامەی راستەقینە ناودێر کرد: درەختێك لە لێواری رووباردا وێنەکەی لە ئاودا کەوتوە و رەنگی داوەتەوە. رەنگدانەوە چیە؟ هەمدیس رەنێوهانینی راستەقینە و رەسەنە".[٦] ئەم خاڵە لە نێوەندی کاری ژانپۆل سارتر لە پەرتوکێکی ئێجگار گرنگ کە لە ساڵانی جەنگدا نووسیی، واتە **هەرامەی خەیاڵی** بنجی بەست. سارتر لەم پەرتوکەدا و بە تایبەت لە دوابەشی بەرەنجامگیرییەکەیدا کە لەبارەی هونەرە، نیشانی دا کە جیهانی خەیاڵیی بەرهەم راستەقینەیە، هەر بەو چەشنەی کە جیهانی راستەقینەی ئێمە زادەی خەیاڵی ئێمەیە.[٧] لە سەر ئەم ئەستوونە، دژوارە بتوانی قبووڵ بکەیت کە کەتوار تەنیا و تەنیا "شتێك بوون"ە و واتاکەی لەو شتەی رەچەڵەکی لاتینیی وشەکە دەیخاتە روو قەتیس دەبێتەوە. لە لاتیندا realis بە واتای "شتێك بوون"ە.

ئەم بەرتەسك کردنەوەی کەتوار لە قەڵەمڕەوی هەرامەی هەستپێکراو گۆنگەڵی بۆ فەیلەسوفان ناوەتەوە. نموونەش دژوارىی کاری فەیلەسوفانێکە کە هەرامەی راستەقینەیان هاودیمەن لەگەڵ رەها و دژیەك لەگەڵ هەرامەی رێژەیی زانیوە. وەکو لایب نیتیس کە لە نامەیەکدا بۆ ئارنۆ نووسیبووی:" بزاڤ هەرامەیەکی رێژەیی‌یە، بەڵام وزە شتێکی راستەقینە و

M.Heidgger,”Quest-ce gue la metaphisigue?” Questionsi, Paris, 1976 .

(٥) . ا. کانت، **سنجش خرد ناب**، ترجمەی م. ش. ادیب سلطانی، تهران، ١٣٦٢، ص ٢٤٦.

(6) E.Fink, “Lart et le jeu”, in Deucalion, 6. 1956, P.10.

(7) Sartre, op, cit, PP.239-246.



رەهایە".[٨] بە پێی هەڵێنجانی لایب نیتیس لە نێوان کەتوار، رەها، وزە و ئەرخەیانی پێوەندیی هەیە. گەلاڵەی وەها هەڵێنجانێك لە فەیلەسوفێکی ئاوەز باوەڕی سەدەی حەڤدەهەم دوور لە چاوەڕوانی نیە. باڵادەستیی ئەم هەڵێنجانە لە کەتوار لە رۆژگاری رۆشنگەریو لە سەدەی نۆزدەهەمیشدا هەوا ماوەیەوە و بیچمی بە زۆرێك لە چەمکگەلی زانستیو باوەڕەکانو رێبازگەلی جوانیناسانە بەخشی. هەڵبەت ئەم هەڵێنجانە رەگاژۆی بەهێزی لە ئاوەزباوەڕیی پێش سەدەی حەڤدەهەمیش هەبوو و بەروبوومی لە ناکاو و بێ دەسپێکی ئەو رۆژگارە نەبوو. بەڵام سەدەیەك کە بە دڵنیاییەوە بە فرانسیس بیکۆن بە مێتۆدی زانستیو بە تلسکۆپی گالیلۆ دەستی پێکرد و بە نیوتن کۆتایی پێهات، سەدەیەك کە بەگوتەی میشل فۆکۆ تەشقی پێڕستبەندیی دانایی رۆنراوی بەیانگەریو هەمدیس نواندنەوە بوو، دەیتوانی لێبڕاوانە کەتوار بە نها-چالاك و هەرامەی هەنوکەیی هاویەك بناسێنێو هەموو ئەمانە بەیانگەری هەقیقەت بزانێ. کاتێك سەدەی دواتر، واتە چاخی رۆشنگەری دەستی پێکرد، ئیدی هیچ بۆشناخێك باوەڕ بە مکووڕیی دۆزینەوەی نهێنییەکانی سروشتو دەستڕاگەیشتن بە هەقیقەتی لەڕێگەی زانست بە خۆشخەیاڵی نەدەزانیو هزرینگەران لەگەڵ یەکدی هاودەنگ بوون کە سەردەمی سەرکەوتنی مرۆڤ بە سەر سروشت هاتوە. ئەوان بانگەشەیان دەکرد کە تەنانەت رێگە بۆ ئەوەی کە مرۆڤ بتوانێ لەگەڵ خۆیشی بەرەوڕوو بێو خۆی بناسێ، خۆش کراوە. هەرچەند هێشتا ئاوازی لاوازی ئیماندارانی وەکو پاسکال بەرگوێ دەکەوێ کە لە بێبنەتا و لە بێدەنگی ناکۆتایی ئاسمانە تاریکەکان ترسیان لێ دەنیشت، بەڵام خۆش بینیی زانستی گرنگترین دەسکەوتی فەلسەفیی سەدەی ئاوەز بوو و بە رۆشنگەران دەسپێردرا تا بە یاریدەی ئەم میراتە کە دالامبێر "گەنجینەی بە نرخ و رێخۆشکەر" ناوی لێنابوو، کەتوارە هێشتا نەناسراوەکان بناسن. بۆ فەلسەفەی مودێڕن ئیدی ئەم هەرامەیە لێبڕاوانە بوو کە مەسەلەی دۆزینەوەی هەقیقەت نەك بە پشت بەستن بە ئیمان، یا یارمەتی وەرگرتن لە نێواخندۆزیی دینی، بەڵکو بەو شتەی بیکۆن "شیکاریی لۆژیکی و ئاوەزپەسند لەسەر داتاکان" ناودێری کردبوو سەرەنجام ئەگەری رەخسانی هەیە. ئاوەزی مرۆییو زانست، بوون بە وشەگەلی تازەی سپیتا.

(8) A.Lalande, Vocabulaire technhgue et critigue de la philosophie, Paris, 1685, P.900 .

## (٢)

بەڵام باوەڕی فەلسەفەی مودێرن بە ئاوەزی مرۆڤ لایەنێکی دیکەشی هەبوو. دیکارت نیشانی دابوو کە ئەرخەیانیی ئێمە بێجگە زەینەکانی خۆمان واتە وزەی تێهزرینمان نیە.بوونی جیهانی"راستەقینە"لەسەر بنچینەی هەڵێنجانە زەینییەکانی ئێمەو چەشنی تاودانەوەی تێهزرینی ئێمە بە کاروباری هەستپێکراو دەسەلمێنرێ. ئەو شتەی کە ئەرخەیانکەرەوەیە نەك "کەتوار"ی جیهانی دەرەوە، بەڵکو کەتواری بوونی کەسێکە کە تێدەهزرێ. کەتواری بنچینەیی یا ئەرخەیانکەرەوە هەمان هزری منە و کەتوارەکانی دواتر لە سەر بنەمای ئەم کەتوارە رۆنراون. لە کۆتایی سەدەی رۆشنگەری هەر ئەم سەرتربوونەی ناسکاری ناسینەوەی هزرینگەر کێشەی لێکەوتەوە. کانت سەلماندی کە سنوورەکانی ناسینی ناسکار، نەك بە واتای بێکیانبوونی جیهانی دەرەکی، بەڵکو بەواتای شاراوەمانەوەو نەناسراومانەوەی هەمیشەییەتی. ئەو، باوەڕ بە توانایی رەهای ناسکار و ئاوەزیی مرۆیی لە ناسینی رەها لە کەتواری وێران کرد و نیشانی دا ئەم وێنایە کە ئاوەزی مرۆڤ بە بێ یارمەتی وەرگرتن لە توخمێکی دیکە کە دەتوانێ بە هەقیقەتی بنەتایی شتەکان بگات و تێکڕای کەتوارەکانی جیهانو هایدن بناسێت، بانگەشەیەکی پووچەڵە و بەس. ئاوەزی ئێمە بەردەوام ناچارە کە لەسەر کەتوارگەلی هەستپێکراو و کەرەستە بەراییەکانی کاربکات کە دێنە بەردەمی‌و لە چالاکی بە مەبەستی ناسینیان ناچارە کە بیچمگەلی هەمە چەشنی ئەپستمیك‌و درك پێکەرانەی خۆی وەگەڕ بخات و بە واتای وردتر ئەم بیچمانە بەسەر ئەو کەتوارانە بسەپێنێ. کانت هەرچەند وەکو جان لاك لە وباوەڕەدابوو کە تێکڕای زانینی ئێمە لەگەڵ ئەزموونگەلی هەستەکیمان هاوپێناوە، بەڵام بە پێچەوانەی ئەو (کانت) وەها بەرەنجامێکی وەدەست نەدەهێنا کە زانینی ئێمە کە لەم ئەزموونانە دەست پێدەکا، دەتوانێ بەوانەوە کاملّ ببێ و تا بێبنەتا یا ناسینی رەها بچێتە پێشێ.

ئەزموون، وشەی سپیتای لاك، هیومو ئەزموونگەرایانی دیکە بوو. ئەوان بە یاریدەی ئەزموون نەك تەنیا بانگەشەیان دەکرد کە کەتوار و سروشت هەنگاو بە هەنگاو دەناسن، بەڵکو قایل بەبوونی یەکپارچەی ناخی مرۆیی بوون. بەم چەشنە، ئەزموون دەبوو بە رەژێدەی پشێوییەك کە کانت بە "فرە فاقیی پڕئاژاوەی هەستەکان" ناودێری کرد. بە لەبرەوکەوتنی ئەزموون چەشنی تاقانە پێوانەی ناسین، ئیدی نەدەکرا زەینی مرۆڤ وەکو تەختەنووسێکی نەنوسراو و سپی کە جان لاك بڕوای پێ هەبوو، بێنینە گۆڕێ. کانت ئەم خاڵەی بەرتەك دایەوە



کە زەینی ئێمە تەختەنووسێکە کە بڕیارە کەتوارەکان بەرەبەرە هەقیقەتی خۆیان لە سەری هەڵکەنن. بە پێچەوانەوە بەرەبەرە ئەم خاڵە هاتە گۆڕێ کە زەینی ئێمە تەنیا کاتیك دەتوانێ کەتوارێك فام بکات کە کانت گوتەنی "ملکەچی گوتەزاکانی تێگەیشتنی خۆی بکات". ئەزموونیش بە شتێك دەناسرا پەیوەست بە زەینێك کە بەتەکووزی دەکا و لەسەر بنەمای پێش ـ گریمانگەلێ راڤەی کاروباری راستەقینە دەست پێدەکات. بەم چەشنە زەینی ئێمە، ئەو تاقانە ئەرخەیانیی دیکارتی، نیشانی دا کە جیهانی دەوروبەری ئێمە، بەڕاستی جیهانێکە خولقێنراوی ئەم زەینە و بەرهەڤکراوی راڤەکان. دواین خاڵ رێخۆشکەری ئەم هەڵێنجانەیە کە جیهان بەروبوومی زمانپاراویی ئێمەیە. هەڵبەت تا ئەم بەرەنجامە رادیکاڵە، واتە بە هەڵێنجانەکانی نیچەو ڤنیگنشتاین بگەین، رێگەیەکی ئێجگار درێژ و دژوار لە بەردەمدا بوو، بەڵام گیانی ئاخاوتە لێرەدایە کە ئەم رێگایە کرابوویەوە.

ئیدی، کات‌و شوێن نەك دیاریمەندیگەلی راستەقینە، بەڵکو بیچمگەلی درك پێکردنی مرۆیی دەزانران. هەم کات‌و شوێن‌و هەم هەمبەرەکان‌و وێنای لێکبەسترانی هۆیی کەتوارەکان، شتانێکن کە زەین سازیان دەکا و بەسەر کەتوارەکان دەیسەپێنێ. ئێمە هەڵبەت دەتوانین لە سروشتی وەرگرتنەکانمان ئاگادار بین، لە بەر ئەم هۆیە کە خۆمان دروستیان دەکەین، بەڵام ئەم خاڵە نابێ بەم واتایە بزانی کە ئێمە توانای ئەوەمان هەیە "هەقیقەتی کۆتایی" شتەکانیش بناسین. چونکە ئێمە لەگەڵ رواڵەتەکان‌و هەمدیس دەرکەوتەکان سەروکارمان هەیەو ناتوانین تێبگەین کە کەتوارێك کە گریمان لە دەرەوەی زەینی ئێمە و بەدەر لە بیچمگەلی درك پێکەرانەی ئێمە هەیە، چیە. لە یەك ئاخاوتەدا، کانت گوللەی تالوکەی تەقاندبوو. ئەو رۆشنی کردەوە کە ئێمە هەرگیز لە تواناماندا نابێ جیهان بە تەواوی بناسین. هەروەها، ئێمە ناتوانین بزانین کە جیهانی راستەقینە چیە. ئەم دنیایە بەو چەشنەی سەربەخۆ لە درك پێکردنی هەستەکیی ئێمە و وزەی عەقلانی و ئەپستمیکی ئێمە هەیە، هەرگیز ناناسرێ و ئاشکرا ناکرێ. ئەو رۆشنی کردەوە کە ئێمە هەرگیز ئەو توانایەمان نابێت جیهان بە تەواوی بناسین. هەروەها ئێمە ناتوانین بزانین کە جیهانی راستەقینە چیە. ئەم دنیایە بەوشێوەیەی کە سەربەخۆ لە درك پێکردنی هەستەکیی ئێمە و وزەی عەقلانی و ئەپستمیکی ئێمە هەیە، هەرگیز ناسراو و ئاشکرا نابێت. زانستێك کە بانگەشە دەکەین کە بەوەوە شتانێك لە جیهانمان ناسیوە (کە هەڵبەت بانگەشەیەکی پووچەڵیش نیە) زانستە لە جیهانی دەرکەوتەکان‌و دیمەنەکان یا بە گوتەی بە ناوبانگی کانت جیهانی دیاردەکان. لە راگەیاندنی جەنگی فەلسەفەی رەخنەگرانە لە

دژی چەقبەستەکان، هەواڵی بێتوانایی ئێمە لە ناسینی ڕەها و نهێنی ئاسامانەوەی نەمرانەی جیهان کە"لە خۆوە" بە ڕوومان داخراوە، دەبیسرا و ئەمە یەکەمین ورتەورت دژی ئەزموونگەرایی‌و پۆزەتیڤیزم بوو. پەسندی ئەمە کە زانست لەگەڵ دیاردەکان سەروکاری هەیە و نەك لەگەڵ کەتوارەکان، ڕێخۆشکەری هزرێك بوو، کە کەمتر لە سەدەیەك پاشتر لە زمانی نیچەوە گوتی کە جیهان نەك کەتوارەکان، بەڵکو ڕاڤەکانی ئێمە لە کەتوارەکان‌و هەودای پەیتاپەیتای ڕاڤەگەلێکە کە لە ڕاڤەکانی دیکەوە دێنە ئاراوە.

نەژناسیاگریمانی (agnosticism) ی کانتی لە ڕێگەی شۆپێنهاوێرەوە گەیشتە نیچە. شۆپێنهاوێر نیشانی‌دا کە ئێمە لە گرنگترین هەڵکەوتگەلی ئەپستمیك، نەك لەڕێگەی ئەزموون یا لەسەر ئەستونی درك پێکردنی هەستەکی‌و نەك لەڕێگەی ئاوەز باوەڕیی مێژوویی هێگلی واتە باوەڕ بە ڕێچکەی ئۆدیسەی ڕۆح، بەڵکو لە ڕێگەیەکی جیاوازەوە دانایی وەچنگ بخەین، لە ڕێگەی سەمەدێك یا پاڵنەرێك کە ئەو ناوی "ویست"(will) ی لێ نا. بە بۆچوونی شۆپێنهاوێر مرۆڤ لە بونیادی خۆیدا هەمان ویستە و ئەم ویستە هەمان هەوڵ بۆ درێژەدانی ژیان و وەچنگ هێنانی شتەکانە. ناسکار، داتاکانی جیهان (کاروباری ڕاستەقینە) ناخاتە ژێر ڕکێفەوە تا یەکانگیر لەگەڵ بیچمگەلی گەوهەریی ناسین تەکووزیان بکات‌و بیانناسێت.[٩]

ناسکار بەر لە هەرشتێك سەبارەت بەوە جیهان‌و کەتوارەکان فام دەکات کە باندۆری خۆی لە سەریان دابنێ، بیانگۆڕێ‌و هەموو شتێك ملکەچی ویستەکانی خۆی بکات. ئەم ویستە، کە شتەکان لە بیچمی ویستراوی خۆی وێکدەنێ، ئەگەر بە پێویستی بزانێ ناسینەوەش دەخاتە ڕۆژەڤی خۆیەوە. بەڵام نابێ فەرامۆش بکەیت کە ناسین لەم دۆخەدا یەك ویست دەبێت. بە هەر حاڵ نابێ لە ویستی دانایی بەم بەرەنجامەی بگەیت کە مرۆڤ لە بناوانی خۆیدا "ئەژناسا"یە. شۆپێنهاوێر بە جەختەوە دەڵێ کە مرۆڤ بەر لە هەر شتێك و گرنگتر لە هەر شتێك "خوازیار"ە و تەنیا لە ڕێگەی ویستەوە، ئەگەر هەرەپێویستییەکی بینی، دەبێتە ناسێنەر. بە دەربڕینی دیکە ئێمە نەك تەنیا خوازیارین، بەڵکو لە ڕێگەی ویستەوە ناسێنەرین.

(٩) لەمبارەوە بڕواننە بڕگەی پێنجەم لە یەکەمین پەرتوکی جیهان چەشنی ویست‌و هەمدیس دەرکەوت:
A.Schopenhauer, Le modecomm Volonteet commeresentaition, trans. A.Burdeau, Paris. 1992, pp.37-44



لە دیمەنگەیەکی میتافیزیکییەوە، کە شۆپێنهاوێر لە گەلاڵەکردنی ترسێکی نەبوو، جیهانیش یەکسەر، بە تەواوی ویستە.[١٠] ویستی ئێمە هاوپێناو و لەڕاستیدا پاژێك لە ویستی جیهانە. هەقیقەتی جیهان کە لە چاوی کانتەوە نەدۆزراوە مایەوە، هەر ئەم ویستەیە و نە شتێکی دی. هەر بۆیە هەر کەتوارێکی ئەم جیهانە بەلامانەوە تەنیا لە ڕوانگەی ویستەوە دێتەگۆڕێ‌و نەك لە ڕوانگەیەکی دیکەوە. ئەگەر وردبینەوە تێبینی دەکەین کە جیهان کەتوارێکە و ئەوەش ویستە کە بەهەڵە وەکو هەمدیس دەرکەوت یا بەیانگەری دەیناسین. جیهان درێژە پەیدا دەکا، چونکە ویست درێژەی هەیە، ئێمە درێژە بە ژیان دەدەین چونکە بەردەوام خوازیاری شتانێکین. تەنانەت ئەگەر ویستی ئێمە تەنیا درێژەی ژیان بێت، هەمدیس جێی سەرنجە کە لەم درێژەی ژیانە دڵنیاین‌و خوازیاری بەردەوامین. شۆپێنهاوێر دەڵێ کە ئێمە لەم شتە وردانە ئاگادار نین، بەڵام بە باشی دەزانین کە لە جێیەکەوە هەودای ژیان دەپسێ. باوەڕ دێنین کە ویستەکانمان قەت تەواو نابن و بە بێ هیچ هۆیەك و بە شێوەیەکی پووچ، بە ئاکام ناگەن. لە دیدی شۆپێنهاوێرەوە لە بەرئەوەی کە ئێمە لەگەڵ ڕوانگەی میتافیزیکی ئەو تەبا نین و ویستی خۆمان بە پاژێك لە ژیانی سروشت لە قەڵەم نادەین، بەردەوام خۆمان تاقی لە جووت جیا* ئەژمار دەکەین، قبووڵ ناکەین کە بمرین‌و هەودای ویستەکانمان نەڕێسراو و ناکام بپچڕێت.[١١]

شۆپێنهاوێر هێندە گوێی بەم ترسان لە مەرگە نەدەدا، بەڵام قبوڵی دەکرد کە دەبێتە ڕەخسێنەری تێکڕای بێ‌هیوایی‌و تەنیاییەکان‌و پەرۆشییەکانی ناخمان. بەم چەشنە ئێمە بە شێوەیەکی نەسازە ئاسا و پێکناکۆك خوازیاری درێژەکێشانی شتێکین کە جگە لە وەڕەسبوون، نائۆمێدی‌و پەژارە و ماخۆلیان شتێکی دیکە نیە: ژیان. مایکل تنەر لە وتارنامەیەکی کورت و ڕۆشنگەری خۆی لە بارەی شۆپێنهاوێر هێما بۆ ڕستەیەك لە دەسپێکی فیلمی وودی ئالێن

(11) ibid, PP. 213-219.

* خوێنەر ئاگادار بێت ڕێکەوەندی "تاقی لە جووت جیا" وەرگێڕانی ئیدیۆمیی "تافتەی جدا بافته"ی فارسی‌یە، بۆیە ڕەچاوی واتای ئیدیۆمیی کراوە، نەك کت‌ومت.

(11) ibid, PP. 349-364.

به ناوی **مەنهاتان** دەکا کە دەڵێ: "ژیانی ئێمە تۆقێنەر، پڕ لە دڵشکان، ناکامی، هەڵوەدایی و ئێجگار کورتە؟[١٢]

جەنگێك کە کانت لەدژی باوەڕ بە ئەگەری دۆزینەوەی هەقیقەتی بنەتایی جیهان وەڕێی خست، هەرچەند لە دیدێکەوە میتافیزیکێکی تازە، واتە جیهان وەکو ویست کە شۆپێنهاوێر هێنابوویە پێشێ، لێکەوتەوە، بەڵام گەوهەری شۆڕشگێڕانەی، واتە دڕدۆنگی لەهەمبەر بانگەشەکانی ئەزموون باوەڕان، لە کاری هەمان شۆپێنهاوێردا بە زیندویی مایەوە و بە یاریدەی بەرهەمەکانی ئەو وەکو چەکێك گەیشتە دەست نیچەی بەگوڕ. نیچە بوو کە بە راشکاوی رای گەیاند:" نەخێر، کەتوار کتومت هەمان شتە کە بوونی نیە، تەنیا راڤەکان هەن. ئێمە ناتوانین کەتوارێك "لە ـ خۆوە" رایەڵ بکەین: رەنگە لە بنەڕەت ڕا شێتی بێ کە بمانەوێ وەها بکەین".[١٣] هێز و گوڕ وتینی قاوبێژیی نیچەو بوێریی هزرینگەرانەی ئەو بڕشتی ئەم چەکەی باشتر نیشان دا. نیچە وەبیریخستەوە کە کاتی ئەوە هاتوە کە پەیجۆری پڕکەڵکەڵەی هەقیقەت وەلاوە بنێێنو هۆیەکی بونیادی کە ئێمە بۆ ئەم پەیجۆرە رکێش دەکا و دەبێتە هۆی ئەوە کە تا هەقیقەت بە زمانپاراویی خۆمان دابهێنین، سەرقاڵ بین. ئێمە دەبێ هەڵە گەورە و سەرەکییەکان بناسینەوە و ئیدی تووشمان بە تووشیانەوە نەبێت. باسلێکردنێکی زراڤ و ئێجگار رۆشنگەر لە "**چوار هەڵەی گەورە**" لە **ئاوابوونی بتەکان** دا هاتوە و لەوێدایە کە دەبینین رۆژگاری مودێرن بە هەڵە رۆح و کەتوار لێك ناکاتەوە.[١٤] هاوتەریب لەگەڵ هەوڵی نیچە لە ئاخێوی فەلسەفیدا، لە قەڵەمڕەوی ئەفراندنی هونەریو جوانیناسیدا، ریشارد ڤاگنێر (کە ئەویش زۆر شت لە شۆپێنهاوێرەوە فێر ببوو) بە گوتەی (فرانتێس لیسێت) ی هاوڕێی هەوڵیدا تا پەرستگایەك کە لەسەر بنەمای "رێبازی پەرەستنی کەتوار" بنیات نرابوو، وێران بکا. ئەو نوسی:" ژیان، مەرگ. و تێکڕای متمانە و برەوبوونی جیهانی دەرەکی، هەندێ مەسەلەن لە ئاستی بزاڤی نێوەکیی زەین".[١٥] لەم روەوە، لە شاکارەکەیدا (واتە) **ئۆپێرای تریستانو ئیزۆلدە** گرنگترین سنورداریبیان، واتە ئەو بەربەستەی کە لە

(١٢). م. تنر، **آرتور شوپنهاور**، **ترجمەی** خ. دیهیمی، تهران، ١٣٧٣، صص ٥٤-٥٥.

(13) F.Nietzsche, The will To Power, trans, W.Kaufmann, New York, 1968, P. 267.

(14) F.Nietzsche, Twilight of ldols, trans. R.J.Hollingdol, London, 1971,P.50.

(15) R.Wangner, onmusic and Drama, ed. A.Goldman and E.sprinchorm, New York, 1964, P.270.



بەردەمی ئەڤینیاندا قووت دەبێتەوەو سەرەنجام بەرەو"مەرگێکی ئەڤیندارانە" رکێشیان دەکا، نەك کۆمەڵگای دەرەبەگی، یا یاساگەلی زەمینیو رەوشتی، بەڵکو سنورداری یا بەربەستێکە کە دێتەڕێی بزاڤی نێواخنیی ویستە مرۆییەکان. گێرە و کێشەی سەرەکی شەڕێکی بێ ئامانە لە نێوان خرۆشو شۆر و وارسکەی مرۆیی کە زادەی ویستەو لە لایەکی دیکەوە سنورداریی مرۆڤبوون، واتە سنوردارییەك کە کەوشەنەکانی کردەی عەقڵانیی مرۆڤ دیارییان دەکات. لێرەدا ویستو وارسکە نەك تەنیا لە بەرانبەر رەوشتدا قووت دەبنەوە، بەڵکو لە بەرانبەر هەرە پێویستیی ژین بردنەسەرودرێژەدان بە ژیان لە کۆمەڵی مرۆییدا قووت دەبنەوە. گرفتەکە قوربانیکردنی یەکێك لەم دوانە بە قازانجی ئەویدییە.

بە گەلاڵەی گرنگیی ویست و بەرجەوەنگەرایی نیچەیی، واتە ئەم هەڵێنجانە کە هەرکەس جیهانو کەتوار لە دیمەنگەی تایبەتی خۆی دەبینێ و لەم روەوە گوتن لە کەتواری تاكو تەرا و لە هەقیقەت شیاو نیە و ئێمە دەبێ بەردەوام دەبێ وشەی کەتوار لە جووت کەوانە ("  ") دابنێینو باشترە خوو بگرین کە لە کەتوارەکان بدوێین و نەك لە یەك "کەتوار"، بە شێوەیەکی سەراسا دەچینە نێو جیهانی کۆمەڵناسانەی ناسین کە ماکس شلر لە پاش نیچە و هەڵبەت بە سەرنجدان لە باسەکانی ئەو بەردی بناخەی دانا.[١٦] ئەمڕۆ ئێمە نەك تەنیا لە رێچکەیەك کە شلر بۆمان ئاوەڵای کرد بەڵکو لە رێو رێچکەکانی وەکو جڤاکناسیی کارل مانهایم و لەوەش گرنگتر لە رێگەی پێش ـ گریمانە سەرەکییەکانی باسەکەی مارکس، واتە ئەم گریمانە کە باوەڕەکانو سیستمگەلی فیکری بەرەنجامی فراژووبوونی ژیانی ماتریالیستین، سەرنج لە پێوەندیی کەتوار و ناسینەوە دەدەین. راست ئەمەیە کە رووتێکردنی کۆمەڵناسان لەم باسەو بە تایبەت لە بەر گۆشەیەکی سەراسا کە ئەوان لەوێوە هاتنە نێو باسەکە، کاری فەیلەسوفانی سەدەی بیستەم ئاسانتر بوویەوە. ئیدی فەیلەسوفان دەیانتوانی لە کەتوارێك کە تەرخانو رەخساوی کۆمەڵگایە بدوێنو بدۆزنەوە کە بە پێی کامە بانهەڵکشانو لە چ رێگەگەلێکەوە کەتوار بیچم دەگرێ. بە یاریدەی رێژەیینواریی فەرهەنگی لە کۆمەڵناسیو مرۆڤناسیدا ئاسانتر دەیانتوانی دۆگمای "کەتوار" وەلا بنێنو دروستیی بڕیاری پاسکال بسەلمێنن کە

(16) P.Berger and T.Luckmann, The socialconstuction of Reality, London, 1979,pp.19-20.

ث. ل. برگر و ت. لوکمان، **ساخت اجتماعی واقعیت**، **ترجمەی** ف. مجیدی، تهران، ١٣٧٥، صص ١٥-١٧.

ئەوەی لەو دیوی کوێستانی پیرنە هەقیقەتە، لەم دیوی پیرنەوە هەڵەیە. فەیلەسوفان لەمبارەوە هەروەها لە یارمەتی توێژەرانێك کە لە لقێکی دیکەی زانستەمرۆڤایەتییەکاندا کاروچالاکییان دەنواند سودیان وەگرت. ئەمجارەیان دەرونشیکاران یاریدەی فەیلەسوفانیان دا و دوابەدوای فرۆید باس لە"گرتنەبەری ڕێچکەی کەتوار" (reality-orientation) یان هێنانە پێشێ. ئەوان نیشانیاندا کە ئەرکی سەرشانی دەرونشیکار بەر لەهەر شتێك ئەمەیە کە ڕادەی شوێندانەریی کەتوارێك کە"نەخۆش" بۆ خۆی سازی کردوە، لە سەر پێکهاتەی دەرونیی ئەو بناسێت، نەك ئەوە کە بدۆزیتەوە کە ئەوشتەی ئەو دروستی کردوە بە ڕاستی هەرامەیەکی ڕاستەقینەیە یان نا. ئەم درك کردنە لە کەتوار بە نۆرەی خۆی کاری فەیلەسوفانی سادەتر کردەوە.

## (٣)

لە سەرلەبەری مێژوی میتافیزیکدا مەسەلەی کەتوار لەوێدا دژوارتر و تەنانەت وەکو گرێکوێرەیەك دەهاتە بەرچاو کە باشاری کەتوار و هەقیقەت دەهاتە گۆڕێ. تا ئەو جێیەی کە کەتوار بە بیچمی سەرهەڵدان یا دەرکەوتی هەقیقەت بزانرێت، مەسەلەکە دژوار نیە، یا لانیکەم دژوارییەکەی لە ئاستی هەمان سەختییەکانە کە "بیرۆکە"ی ئەفلاتونی دەخولقێنێ. بەڵام لەو جێیەی کە لەبەر هەر هۆیەك بێت، نەتوانین لە بیچمی سەرهەڵدانەوە، پەی بە هەقیقەت بەرین، کارەکە ئێجگار سەخت دەبێت. لەمبارەوە بڕیارگەلی زۆروزەوەند و دژبەری فەیلەسوفان بە ڕاستی سەرگێژە هێنەرە. ئایا کەتوار شتێکە کە ئێمە دەتوانین لەودا دەستوەردان بکەین، واتە سەرەنجام گۆڕانی بەسەردا بێنین، بەڵام هەقیقەت شتێکە کە لە هەر جۆرە دەستوەردانی ئێمە بەدەرە؟ ئایا دەکرێ کەتوار تەنیاوتەنیا دیمەن دەرکەوتی هەقیقەت بزانین؟ هێنانە پێشی چەمکی هەقیقەت دەلوێ بە شێوەیەکی باڵادەستو لێبڕاو ڕێگە لە بەردەم درێژەدانی باسەکە دابخات، بەڵام بە واتای فەلسەفی چارەی ناکات. لە بەر ئەم هۆ سادەیە کە هەقیقەت خۆی بە هەمان بارتەقای کەتوار و تەنانەت زیاتر لەوەش دژوارییسازە و دەبێتە هۆی سەرلێشێوان. ئەرەستۆ لە دەسپێکی پەرتوکی "ئالفای بچوك" **مێتافیزیك** نوسی:"ڕامان لە هەقیقەت لە لایەکەوە دژوار و لە لایەکی دیکەوە ئاسانە. هۆی ئەمەش لەوە دایە کە هیچ کەس ناتوانێ، وەها کە شایانی خۆیەتی دەستی پێ ڕابگات، بەڵام تێکڕای مرۆڤانیش لەم تێکۆشانە بە هەڵەدا ناچن، بەڵکو هەرکامیان لە بارەی سروشتەوە شتێك دەڵێ



و هەرچەند بە تاکو تەرا شتێك لە هەقیقەت تێناگا، یا تۆزقاڵێکی تێدەگا، بەڵام لە کۆکراوەی هەموویان بارتەقایەکی بایەخدار پێك دێت".[١٧] (من) گوتەی ئەرەستۆم تەنیا بە گەواهیدەری دژواریی هێنانە پێشی چەمکی هەقیقەت نەخستۆتە ڕوو، بەڵکو بە هێماکردن بەو (گوتەیە) دەمەوێ نیشان بدەم کە باسەکەی ئەو تا چ ئاستێك ئەمڕۆیی و بە یەکانگیر لەگەڵ باس و دەسکەوتە فەلسەفییەکانی هێرمێنۆتیکی مودێرنە.

هەر کام لە ئێمە دەستمان بە کەتوارگەلێ ڕادەگاتو هیچ کاممان بە تەنێ دەستمان بە گشت هەقیقەت یا هەقیقەتی کۆتایی ڕاناگات. یەکەمین دەرکەوتی دیمەنەکانی هەقیقەت لە"گردکراوەکانی هەموو زانراوەکانی" ئێمە ئاشکرا دەبن و سەرەنجام"بارتەقایەکی بە نرخ"ی لێ دەزانرێت. بەرەنجامێکیش کە ئەرەستۆ لەم باسەی خۆی وەدەستی هێنا، ئێجگار پێشکەوتوویە: "کەوابوو دادپەروەرانەیە کە ئێمە نەك تەنیا لە کەسانێك کە لەگەڵیان هەمبازین، بەڵکو هەروەها لە کەسانێکیش بیردۆزانێکی زیاتر ڕووکەشییان دەربڕیووە سپاس بکەین". بە وردبوونەوە لە گومانگەریی بیرمەندانێك وەکوو مۆنتنیو نیچەو پێشکەوتنی باسگەلی ڕێژەبیینوارانە لە فەلسەفەیزانستی ئەمڕۆ و دەستکەوتەکانی هێرمێنۆتیکی تازە، ئاشکرا دەبێ کە هەرکات بمانەوێ لە گۆشەی "بنەواشە بەرایییەکانو ئاوەز باوەڕیی میتافیزیکی لە هەمبەر کەتوار و هەقیقەت سەرنج بدەین، گیرۆدەی چ دژواریگەلێکی لە چارەنەهاتوو دەبین. لە لایەکی دیکەوە نەك تەنیا کەتوار، بەڵکو هەقیقەتیش زادەی زمانپاراوی بزانین، ناچار دەبین کە چاوێك بە سنوری کەتوار و هەرامەی خەیاڵی بخشێنینەوە. ژاك دێریدا لە وتارنامەی درێژی "توخمی هەقیقەت" کە لە پەرتوکی **کارت پوستاڵ** دا هاتوە، لە پلارگرتن لە باوەڕ بە هەقیقەت لە دەرونشیکاریی هاوچەرخ کە لە بەرهەمەکانی فرۆیدو بە تایبەت لە نووسینەکانی ژاك لاکاندا هاتوە، بێبەر بوونی ئاوێزانبوونی هەقیقەتی هێناوەتە ئاراوە. کاتێك لەنێوان کەتوار و هەقیقەت جیاوازی دادەنێین، وەها کە گشت نەریتی فەلسەفی وەها جیاوازییەك دادەنێ، بە خێرایی ئەم بەرەنجامەش وەدەست دێت کە هەقیقەت خۆی لە پێکهاتەی نەزیلە بەیان دەکا. لاکان کە لەسەر باشاری هەقیقەت/کەتوار پێداگری دەکاو تا

(١٧) ارسطو، **متافیزیک**، ترجمەی ش. خراسانی، تهران، ١٣٦٦، ص ٤٧. لە بارەی هەمبەری هەقیقەت لەگەڵ کەتوار بڕواننە:
T.H.Irwin, Aristotels first Principles, oxford University Press, 1990, P.62,63,145,168,171.

ئاستی پارادۆکسێکیش ئەیخاتە ئاراوە، باشارێك هەتا دەلوێ ئۆرتۆدۆکس دەخاتە روو، تەنیا بەم خەیاڵەوە کە گوزەر لە هەقیقەت بۆ نەزیلەگۆیی لەودا ئاسان بکرێتەوە. ئەو لەمبارەوە هاوهەنگاو لەگەڵ تێگەیشتنی هەموان دەچێتە پێشێ، چونکە هەموان بەردەوام جیاکاری نێوان کەتوار و هەقیقەت لە راستیدا بە جیاوازی نێوان کەتوار و نەزیلە تێدەگەن. ئەوەی هەیەو من ئەزموونی دەکەم، لە گێڕانەوەیەك دەدوێ کە من ئەزموونی ناکەم، بەڵام باوەڕی پێ دەهێنم. ئەم نەزیلەیە یا بیرۆکەیەکی ئەفلاتونی یە، یا وزەیەکی بەرین، وەکو خوا یا وزەیەکی جادویی. لاکان بە گەلاڵەی هەقیقەت، لەم خاڵەدا لەگەڵ خەڵکی هاوڕایە کە هەقیقەت تەنیا دەتوانێ لە قاڵبی ئەفسانەدا جێ بگرێ‌و لە شێوەی نەزیلەدا بەیان بکرێت. ئەویش نەزیلە بە دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوا دەزانێ.[18] بەم چەشنە ئیدی باس لە هەقیقەت بەو چەشنەی کە لەمەڕ نووسینەکانی فرۆید دەهاتە بەرچاو لەسەر بنەمای هەقیقەتی دەق نیە (خولیا وەکو دەق، توخمەکانی رەژیدەی خولیا چەشنی زمان)، بەڵکو هەقیقەت وەکو واتایەك یا شتێکی هەمەکی، نەزیلەیەك کە دەبێ بی بیستین، دێتە گۆڕێ.[19]

هەنوکە بە وەلانانی ئەم باوەڕە کە کەتوار هەمدیس دەرکەوتی هەقیقەتە، لە گێچەڵی گرێکوێرەیەکی کۆنی فەلسەفە رزگار دەبین. ئێمە دەتوانین لە هەبوونی خۆمان لە جیهاندا بەو بەرەنجامە بگەین کە بۆ ناسینی هەڵکەوتمان (یا بە گوتەی هایدگێر "ئازادیمان") پێویستییەکی ئەوتۆمان بە هەقیقەت وەکو بیرۆکە یا هەرامەی رەها نیە. باوەڕ بە وەها هەڵێنجانێك لە هەقیقەت، بەتایبەت لەو باسەهونەرییانەدا دەبێتە هۆی سەر لێشێوان. ئەگەر کەتوار هەمدیس دەرکەوتی هەقیقەت بێ و بەرهەمی هونەری هەمدیس دەرکەوتی کەتوار، ئەوکات راستیەکە بە لای ئەفلاتون دەشکێتەوە کە ئێمە لە چالاکی و ئەفراندنی هونەریدا دووجار لە هەقیقەت دوور دەکەوینەوە. لە درێژەی ئەم وتارەدا دەبینین کە ئەفلاتون بەیاریدەی چەمکی "لاساییگەری" ئەم باسەی هێناوەتە پێشێ‌و لەوەوە بەرەنجامگەلی سەمەرەخولقێن و سەرەڕۆیانەی وەدەستهێناوە. لە نێوان هەقیقەتێکی رەها کە گریمان دەکرێ لە جێیەکدا هەیەو هەموو شتێك هەمدیس دەرکەوتگەلی پلە یەك و پلە دووی ئەون‌و بەندایەتی مرۆڤ ،

(18) J.Derrida, La Carte Postale De Socrates afreud et au – déjà, 1980, pp. 454 – 456.
(19) .ibid , p. 489.



هەمبەرێك هەیە کە فەیلەسوفان بەردەوام ناچار بوونە بیخەنەڕوو. کۆمەڵێ لەوان ئەم هەمبەرەیان پەسند کردووە و یا پاساویان داوە، بەڵام بڕێکی کەمیش پەسندیان نەکردون.

بە سەرنجدان لە خاڵگەلێ کە تا ئێستە باس کران، دەتوانین لەمەڕ ریالیزمی فەلسەفی هەڵوێستێك کە زیاتر لە رێژەیینوارِی نزیکتربێ،هەڵبژێرین.ریالیزم لەهەرقەڵەمڕەوێکی هزردا، یا وردتر بێژین لە هەر قەڵەمڕەوێکی ئاخێو (discourse)دا رێبازێکە کە رادەگەیەنێ بڕێك لە خاڵگەلی هەبوو کە لەم قەڵەمڕەوەدا بنەجێ بوونە، کاروباری راستەقینەن. لە تێگەیشتنی هەمواندا، واتە لە باوەڕی هەمواندا، ئەم هێزە، ئەم مێزە، ئەو خامەو ئەو درەختە، شتانێکی راستەقینەن، چونکە هەن‌و دەستڕاگەیشتون، دەتوانین دەستیان لێ بدەین، دەتوانین بیان بینین و یا کەڵکیان لێ وەربگرین. فیزیکزانێکی ریالیست دەڵێ کە ئەلکترۆن‌و نۆترۆنەکان هەر چەند نابینرێن‌و هەستگرو هەستپێکراو نین، دیسان هەر راستەقینەن، چونکە هەن‌و دەتوانی لەگەڵ "ئەرکەکانیان" سەروکارت هەبێ. دەروناسێکی ریالیست دەڵێ کە هۆیەکانی خەمۆکیی کەسێك کاروبارێکی راستەقینەن، چونکە ئێمە بەهەرحاڵ لەگەڵ لێکەوتەکان یا بەرهۆکانیان سەروکار پەیدا دەکەین‌و تەنانەت جاروبار دەتوانین لە کاریگەرییان بخەین. هەر بەم شێوەیە، بەلای دەرونشیکارێکەوە نەستی تاکەکەس راستەقینەیە. بۆ منداڵێك کە باسەکەم بەوەوە دەست پێکرد، بوونەوەری خەیاڵیی نیوەشەو لە سووچی ژووری نووستنی ئەو راستەقینەیە. مەسەلەکە لە سەر شێوەی دیتنە. لە یەك چرکەساتدا کەسێك لە دۆخی تەماشای خاڵۆ وانیا لە کایەی نیارڤانێك تێدەهزرێ کە دەوری سۆنیا دەگێڕێت‌و لە بەرەنجامدا تەنیا یەك دەور دەزانێ، بەڵام تەماشاوانێك کە لە تەنیشتییەوە سەرنجی لەلای سۆنیایەکە کە بە وانیا دەڵێ کە لە رەنجە زەمینییەکان لە داهاتوودا رزگار دەبێ‌و لە دنیایەکی دیکەدا ئۆخژنی بە ناخدا دێتەوە. کەسی یەکەم رەخنەکارانە سەرنجی لەسەر نیارڤانە و نیارڤان بە راستەقینە دەزانێ، کەسی دووەم نغرۆی دنیای شانۆی چیخۆف بووە و سۆنیا بە راستەقینە دەزانێ. هەر کام لەو کەسانەی کە لێیان دوام، لە قەڵەمڕەوی خۆیاندا بە شتانێکی راستەقینە دێنە ئەژمار. بۆ هەرکامیان دەتوانی بە یاریدەی چەند بەڵگەیەك، راستەقینەبوونی کەسەکان، شتان یا کاروبارەکان لەهەمان قەڵەمڕەوی ئاخێودا بسەلمێنی یا بەرتەك بدەیتەوە. لە ئاخێوێکدا، رووداوێك کە لە رابردوویەکی ئێجگار دووردا رووی داوە، بۆ نموونە جەنگەکانی سالامیس، راستەقینەن، لە ئاخێوێکی دیکەدا DNA راستەقینەیەو لە ئاخێوی سێهەمدا مافێك

رەوشتییە. کەوابوو رەنگە بتوانین بڵێین کە ریالیست کەسێکە کە لە قەڵەمڕەوی ئاخێوێکی تایبەتدا بوونی شتانێك راستەقینە بزانێت.

کاتێك دەبێژم: "مەسەلەکە لەسەر شێوەی دیتنە" تەنیاو تەنیا چاوم نەبڕیوەتە بەرجەوەنگەلی هەمە چەشنی تاکە کەسەکان کە نیچە خستونیەتی بەردەممان، یاخۆ بەرەنجامەکانی ئەم باسە لە هێرمێنۆتیکی ئەمڕۆدا. لێرەدا هیما کردنی لودڤیگ ڤینگنشتاین لە برگەی یازدەهەمی پەرتوکی دووەمی **توێژینەوە فەلسەفییەکان** تا هەمان ئاست گرنگیی هەیە. ئەو لە دیتنی ناونیشانی (seeing as) دواوە و نووسیویەتی کە "ئێمە شتەکان راڤە دەکەین‌و چۆن راڤەیان دەکەین وەها دەیانبینین".[٢٠]

ئێمە لە بەرناسێك دەڕوانین‌و لە شێوەی شتێك‌و بە ناوی شتێك دەیبینین. مەرج نیە هەموو کەسان لەم شێوەی بینینەدا، واتە لە دیتنی ئەو بەرناسەدا وەکو شتێکی سەراسا، لەگەڵمان هەمباز بن. دەتوانین گەلاڵەی ئێجگار بەناوبانگی مراوی ـ کەروێشکی ڤیتگنشتاین یا مراوی یا خۆ کەروێشك ببینین.[٢١] ئەگەر روومەتی ئەو بە لای چەپی پەڕاوگ بێ بە مراوی دەبینرێ‌و ئەگەر روومەتیشی بە لای راستی پەڕاوگدا وەرسوڕێ، کەروێشك دەبینرێ.وێنە، دەبڕین یا هەمدیس دەرکەوتی شتێکەو ئێمە دەتوانین ئەوە وەکو هەمان شت ببینین یا نەبینین. دیتن بێ‌لایەن‌و بێ پێشبار نیە. ئەو داوەرییە جیاوازانەی کە دەسپێکیان دیتنە،جیاوازیی خۆیان لە چەشنەکانی دیتن، واتە لە چەشنەکانی راڤەدا پەیدادەکەن، دیتنی کەسێك یا شتێك بە سەمەدگەلی دەروونیی جیاواز، پاڵنەرە تایبەتییەکان، پێش ـ گریمانەکان، زانراوەکان، بیرەوەرییەکان و خالآنێکی لەئەژمارنەهاتوی دیکە بەستراوەتەوە. بەشێك لەم خالآنە شوێنگەی کۆمەڵایەتی، چینایەتی، رەگەزی‌و فەرهەنگیی تەماشاوانە.

کوربە کە لە ئاتلیەی نیگار کێشیی خۆی تابلۆیەکی بۆ یادگار هێشتەوە، ئێجگار تێکۆشا تا کارگایەکی "ڕاستەقینە" بکێشێتەوە. ئەو دوو مندالّی گوندیی کە لەوێدا کێشابوویەوە، مندالآنێك بە جلوبەرگو سەرپایی* دڕاو، ئارایی کەتواری لە کارگای خۆیدا ناسیبوو و

(20) L. Wittgenstein, philosophical Investigations, trans. G.E.M.Anscombe, oxford, 1989, pp.193-195.

(٢١) ڤیتگنشتاین ئەم گەلاڵەی لە پەرتوکی ڕاستییەکانو ئەفسانەکان لە دەروونناسی لە نووسینی jastrow بە دی کردبوو.

* جۆرێك کەوشی قەیتاندار، (صندل)ی فارسی، (نعل)ی عەرەبی. (وەرگێڕ)



ناساندبووی. هەنتەشی ژنێکی رووت کە لە تەنیشت نیگارکێشەوە راوەستابوو، رەنگە بە سەرنجدان لە پیشەکەی وەکو "مۆدێل"ێك پاساو بدرێت. بەڵام یەك سەدەونیوە کە تەماشاوانان ئەم ژنەیان بە سیمبۆلی "هەقیقەت" زانیوە، سیمبۆلێك کە لە زۆرێك لە بەرهەمە کلاسیکییەکان‌و بە تایبەتی کلاسیکی تازە و رۆمانتیك دووپات بۆتەوە و لەواندا رووتیی هەقیقەت هەمان ژنی رووت بووە. نیگارکێشی ریالیست، بێ ئەوەی بیهەوێ یا بزانێ، ئەگەری سەرهەڵدانی بە راڤەگەلی تازە بەخشیبوو. ئەو نەیدەتوانی کەتواری کارگای خۆی، هەرچەندەیش بۆ خۆی جێی پەسند و سپیتا بوو، بسەپێنێ یا خۆی هەرمانی بکات. فرانتس‌هالس پسپۆری گەورەی هۆڵەندی، لە رێبازی نیگارکێشی سەدەی حەڤدەهەمی هوڵەندا بوو. هاوشێوەکێشێکی بێ‌هاوشان کە لە تەماشاوانانی بەرهەمەکانیدا ئەم هەستەی دەوروژاند کە لەگەڵ بوونەوەرێکی "زیندوو" سەروکاریان هەیە. لە راستیدا هەرچەشنەهاوشێوە کێشانەوەیەك پێویستی بە بینەرێك هەیە کە لێکچونی رەسەن‌و نەسکی دووەم پەسند بکات. واتە هەندێ رێککەوتن لە نیگارکێشاندا پەسند بکات لە سەر بنچینەیان لێکچون بە فەرمی بناسرێت‌و بزانرێت. ئەمڕۆ ئێمە لە بەرهەمەکانی ئەو وەکو کارانێکی لێزانانە، پشت بەستوو بە هێزوگوڕی دەست‌و زەین دەنۆڕین‌و راستنوێنیی ئەوانە بەلای ئێمەوە گرنگییەکی پلەدوو پەیدا بکات. ریچارد وۆڵهایم لە تاوتوێی رەخنەکارانەی خۆیدا لەبارەی پەرتوکی **هونەر و خەیاڵکرد** ی گۆمبریچ دانی بەوە داناوە کە لەکاتی تەماشای تابلۆکانی کلۆدمۆنە دایە کە خۆی "لە جەرگەی بەرجەوەنەکان" هەست پێدەکا.[٢٢] وەبیرخۆمانبێنینەوە کە مۆنە هاوشێوەکێش نەبوو و نەیدەویست کە هەرامەی راستەقینە نۆژەن بکاتەوە، بەڵکو باندۆرەکانی تیشکی دەکێشایەوە، وەلێ بەلای بینەری بۆشناخی ئەمڕۆیی خۆی، فەیلەسوفێك بە ناوی وۆڵهایم، بەرجەوەنگەلێ کە ئەو نەخشی کردوون هێندە لە کەتوار دەچن کە خۆی لەواندا دەبینێتەوە.هەروەك بەلای کۆرۆساواوە لە فیلمی **خولیاکان** دا تابلۆیەکی نیگارگەریی وان‌گۆگ، تا ئەم ئاستە راستەقینەیە. هەستی بەرامبەر(بیسەر ـ خوێنەر)و پەسندکردنی راستنوێنیی بەرهەم پەیوەستە بەشێوەی دیتنی ئەو و ئەم شێوەیە بەستراوەتەوە بە توخمگەلی فەرهەنگیی زۆر و زەوەند و لێکدانی ئێجگار تێکچڕژاویان. شێوەی دیتن‌و هەستی تاکەکەسی، شێوە و هەستێکی گشتی‌و بانمێژوویی نین. لە نێوان پەیکەربەندیی ماتریالیی بەرهەم‌و ئەو شتەی ریکۆر بە بان پەیکەربەندی ناوی لێناوە، کە هەمان وەرگرتنی بەرهەمی هونەرییە، پێوەندییەك هەیە کە مێژوویی‌یەو بە زمان‌وفەرهەنگەوە بەستراوەتەوە. نێلسۆن‌گودمەن لە پەرتوکی **زمانەکانی**

هونەر دا پێشگریمانە راستەقینەکانی خوێندنەوەی بەرهەمێکی تاوتۆیی کردوە و نیشانی داوە کە ناتوانن وەکو بنەواشەیەکی جوانیناسانە لە بەردەمماندا قوت ببنەوە، چ بگات بەوەی کە بیانهەوێ رێبازێك دامەزرێنن.[٢٣] تێکڕایی پێشگریمانەکان لەگەڵ لەمپەری راڤە بەرەڕوو دەبن. بۆنموونە کاتێك بەرهەمێك بە ریالیستی لە قەڵەم دەدەینو رادەگەیەنین کە زۆرترین رادەی زانیاری لەبارەی بابەتەکەی پێمان دەدا، بەڵام چەمکی "زانیاری" بە شێوەیەکی هەمەکی، ئەبستراکتو نارۆشن دەخەینەڕوو. بە وەدیارکەوتنی ئەم چەمکە، ئاشکرا دەبێ کە توخمگەلی یەکانگیر و نایەکانگیری زۆر لە کاردان کە دەبێ هەرکامیان بە شێوەیەکی سەربەخۆ تاوتوێ بکرێن و باندۆری دووسەرەیان کە خۆی هەرامەیەکی مێژوویی‌و راڤەیی‌یە، دەبێ تاوتوێ بکرێ و بزانرێت.

## (٤)

هەنوکە لەگەڵ ئاخێوێك سەروکارمان دەبێ کە لە شیمانو ئەگەر دەدوێو کاروباری لواو لە بەرهەمێك یا ئاخاوتەیەك یا دەقێکی راستەقینە رەنگرێژ دەکا. ئەرەستۆ بە هێنانەگۆڕی هەرامەی شیمانکراو لە جێی هەرامەی کەتوار باسەکەی لەم خاڵانەوە دەستپێکرد. بەڵام بەرلەوەی سەرقاڵی دەسکەوتی گەورەی ئەو کە رێخۆشکەری خاڵگەلی تازە و رەوێنەری زۆر لە دژوارییەکان لەفەلسەفەی هونەرە، ببم، باشترە کە سەرەتا لە کاری مامۆستاکەی، واتە ئەفلاتون، وردبینەوە. باسی ئەرەستۆ لەچەند لایەنێکی گرنگەوە واپێدەچێ وڵامی تێورییەکانی ئەفلاتون لەمەڕ هونەرە. هەڵبەت وردبوونەوە لەباسی ئەفلاتون قازانجی تایبەت بە خۆی هەیەو ئێمە لەگەڵ سەروەریی کەتوار بەسەر هونەردا ئاشنا دەکا. باسێك کە ئەفلاتون لەمەڕ "کەتوار"و "هەقیقەت" هێنایە پێشێ یەکێك لە بەناوبانگترین باسگەلی فەلسەفی‌یەو کەمتر هزرڤانێك هەڵدەکەوێ کە ئاگای لێ نەبێ. چەکی "بیرۆکە"کە لە جیهانێکی دیکەدایەو مەسەلە ئەپستمۆلۆژیکەکان کە ئەفلاتون دوابەدوای هێنانە ئارای"بیرۆکە" خستنیەڕوو و بە تایبەت ئەلیگۆریای ئەشکەوت لە کتێبی حەوتەمی **کۆمار** زۆر لەوە بەناوبانگترن کە بمەوێ کاتی خوێنەر بە باس‌وخواس لە بارەیانەوە بگرم. خاڵی گرنگ لەم وتارەدا، هەمبەرێك کە

[٢٣] Goodmen, op. cit, p. 35.



ئەفلاتون لە نێوان هونەر و کەتوار داینابوو و دیدی ئەو لە بارەی لە برەوکەوتنی هونەر و بە تایبەت هونەری شاعیرێتی سەبارەت بە دوورمانەوە لە هەقیقەتە.

ئەفلاتون بە گەڵاڵەکردنی چەمکی "هونەر چەشنی لاساییکردنەوەی کەتوار" باسی خۆی لە هەمبەری هونەر لەگەڵ کەتوار، دەست پێکرد. ئەو لەم باسەدا خدەی ئەرکیی هونەر و باندۆری بەرهەمە هونەرییەکان لە ژیانی کۆمەڵایەتی زەق کردەوە و لە هەنگاوی یەکەمدا کاری هونەریی لە ریزی ئیش‌وکاروپیشە کۆمەڵایەتییەکان ئەژمار کرد. ئەم شێوەی باسەی ئەو لەنێو هزرڤانانی یونان بێ‌مێژینە نەبوو. لە یەکەمین پزیسکەکانی هزرینگەریی فەلسەفی لەمەڕ هونەر کە لە چوارچێوەی ژیاری یونانی هەڵگڕان، یونانییەکان بەرهەمی هونەرییان لەبەراورد لەگەڵ رەخساوەکانی دیکەی رەنێوهانینی فیکری و کردەکیی مرۆیی، تاقی لەجووت جیا نەدەزانی. دەتوانین بێژین کە یونانییەکان تا سەردەمی ئەرستۆ، لەنێوان کاری تەلارسازێك وەکو تکنیك‌و پیشەیەك بەمەبەستی دروستکردنی بینایەکی بەسود کە خودان ئەرکگەلی کۆمەڵایەتی و دیاریکراوە و دەبێ وڵامی ئاتاجەکانی مرۆڤ بداتەوە، لەگەڵ کاری ئەو بە ناوی "هونەر"ێك کە بە گوێرەی رێساگەلێ بانتر(یا لە هەندێ لایەنەوە بانتر)لە پێداویستییەکانی ژیان هەموو رۆژێ بیچم دەکرێ جیاوازییەکی چیەتییانەیان دانەدەنا. ئەفلاتونیش لە وتووێژەکانی خۆی سەرەتا هەرجۆرە وەبەرهاتوویەکی تێکنۆلۆژی لە یەك پلەدا جێکردەوە و لە پۆلێن بەندی خۆیدا لەنێوان دروستکردنی شتانی بەسود، واتە ئەو شمەکانەی کە بەکەڵکی کارێك دێن، وەکو جامولکەیەك بۆ ئاوخواردنەوە، یا کەشتییەك بۆ پەڕینەوە لە رووبار و دەریا، یا پەرستگایەك بۆ پەرستنی خواوەندان، لەگەڵ بەرهەمی هونەری (زۆربەی ئێمە ئەمڕۆ لەبۆی دەورێکی سەرتر لە دابینکردنی پێداویسییە ساکار و سادەکانو ئاشنای ژیانی رۆژانە دادەنێن) جیاوازییەکی ئەوتۆی دانەنا.

ئەفلاتون نەك تەنیا لەمەڕ بەرهەمی هونەری ئەو لایەنە"سپیتا" یا لانیکەم سەراساو تاقانەیەی پەسند نەکرد کە چەندین سەدە پاشتر لە جوانیناسیی کانت، بە گەڵاڵەی "ناچەمکی‌بوونی بەرهەمی هونەری و دەربازبوون لە هەر چەشنە قازانج و سودی دیاریکراوی تاکەکەسی‌و کۆمەڵایەتی" جەختی لەسەر کرا،[٢٤] بەڵکو لەنێو وەبەرهاتوەکانی تێکنۆلۆژی،

(٢٤) لەمبارەوە بڕواننە وانەی چوارەم لە: ب، احمدی، حقیقتو زیبایی، درسهای فلسفەی هنر، تهران، ١٣٧٤. ب. ئەحمەدی، هەققەت و جوانی، وانەکانی فەلسەفەی هونەر، و. مەسعو بابیی، موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٨. (وەرگێڕ)

بەو جۆرە دواتر دەبینین، تەنانەت کەم بایەختر لە باقیی ئەوانیدی زانی. ئەمە کە ئەفلاتون، دوابەدوای باوەڕ و دابی سەردەمەکەی، لە چەکێکی یەکبوو و لە یەك وشە لەهەردووك باری دروستکردنی شتێکی بەسود و رەخساندنی بەرهەمی هونەری کەڵکی وەردەگرت، خۆی رۆشنگەری خاڵی سەرەوەیە. ناوبراو ئەو شتەی کە ئێمە ئەمڕۆکە بە هونەر ناودێری دەکەین بە پەیڤی یونانیی "تێخنە"(tekhne) دەستنیشان دەکرد، کە خاوەنی واتاگەلی فرەچەشن وەك تکنیك و شێوازیش بوو (هەر بۆیە بە رەچەڵەکی هەر دوو وشەی ئەمڕۆیی "تکنیك"و "تێکنۆلۆژی"یش دێنە ئەژمار). لە دیدی ئەفلاتونەوە بیناکردنی پەرستگایەك یا دروستکردنی مێزێك بە هەمان بارتەقای هۆنینەوەی شیعرێك، یا نواندنی شانۆیەك، یا ژەنینی سازێك "تێخنە"بوو. هێز و بڕشتی رامیاریزانێك لە پێشکەشکردنی دواندەری یا باسێك، لێوەشاوەیی سوکرات لە گفتوگۆ فەلسەفی‌یەکانو هونەری هۆمیرۆس لە هۆنینەوەی سرودە قارەمانێتی‌یەکان، هەرسێکیان لە قەڵەمڕەوی "تێخنە"دا جێیان خۆش دەکرد، چونکە تێکڕا وەکو ئەفراندنو لە هەنگاوی دواتردا تەرخانو رەخسانی باوەڕەکانو چەمکەکان ئەژمار دەکران. کەوابوو جێی سەرسووڕمان نیە کە سوکراتی ئەفلاتون لە یەکەمین پەرتوکی **کۆمار** (بڕگەی**٣٣٣**) هەم تکنیك یا هونەری دادپەروەری بە "تێخنە" ناو دەناو هەم پیشەی پێڵاو دوورین (یا پینەچیەتی)[٢٥].

لە دیدی یونانییەکانەوە، "تێخنە" کە هەروەك دیتمان بە هەردووك واتای تکنیكو هونەر بوو، زیاتر لەگەڵ وشەیەکی دیکە واتە "پوئسیس" (Poesis) بە واتای داهێنان، ئەفراندنو رەخساندن هاوپێناو دەبوو.لەبەرهەمەکانی ئەفلاتوندا بەرهەمی هونەری "پویەتیك" (واتە کارێك لەئاستی ئافرێنەری،داهێنانو "پوئسیس") بوو، وەلێ ئەم خاڵە بە دەسەرێك بۆ بەرهەمی هونەری ئەژمار نەدەکرا، چونکە دروستکردنی کۆزەیەك یا درومانی کراسێکیش هەر بەو چەشنە لە قەڵەم دەدرا. ئەگەر وەکو بڕێك لە توێژەرانی فەرهەنگی یونان، پەیڤی "پوئسیس" بە واتای دروستکردنی ئازادانەش بزانین، هەمدیس بەسەرنجدان لە وتوویژەکانی ئەفلاتوون بۆمان دەردەکەوێ کە لە دیدی ئەوەوە هۆنینەوەی هۆزانێك یا نواندنی شانۆیەکی تراژیدی لەگەڵ دروستکردنی کۆزەیەك بەرابەر بوو و ئەم چالاکییانە بەشێوەیەکی یەکسان دەرخەری ئازادیی رەژیدەکانیان لە هەڵبژاردنی کەرەستەکان، قاڵب و گەڵاڵە ئەژمار دەکران. بەرهەمی هونەری

(٢٥) افلاطون، دوره اثار، ترجمەی م.ح. لطفی، تهران، چاپ دوم، ١٣٦٧،ج ٢،



لەدیدی ئەفلاتونەوە شوێنگەیەکی هەڵکەوتوی نەبوو، بەڵکو تەنانەت بایەخێکی کەمتری لە باقی وەبەرهاتوەکانی دیکە هەبوو. بەڕای ئەفلاتون بەرهەمی هونەری لاساییکردنەوەی شتێکی هەبوو لەم دنیایە دایە و ئەم شتە خۆی لاسایی لە بیرۆکەیەکە کە لە جیهانێکی دیکە دایە، کەوابوو دەتوانین بێژین کە بەرهەمی هونەری دووجار لە هەقیقەت دوور کەوتۆتەوە و لە دروستکراوەکانی دیکەی مرۆڤ کەم بایەخترە. ئەفلاتون لە **کۆمار** دا نموونەی تەختێك دێنێتەوە و دەنووسێ کە سێ جۆر تەخت هەن، یەکەم تەخت لە قەڵەمڕەوی بیرۆکەیە کە خوا خولقاندویەتی، دووەم تەختێکە کە دارتاشەکان دروستی دەکەنو سێهەم تەختێکە کە نیگارکێش دەیکێشێتەوە. تەختی نیگارکێش لاسایی تەختی دارتاشو ئەمەشیان لاسایی تەختی خوا یا بیرۆکەی تەختە. بەم چەشنە، تەختێك کە هونەرمەند نیگاری دەکێشێ لە تەختی راستەقینە کە دارتاش سازی دەکا یەك پلە دوورترە لە تەختی راستەقینە یا ئایدیالی.[٢٦] سوکراتی ئەفلاتون لە کۆتایی **کۆماردا** دەڵێ: "بە دڵنیاییەوە دەتوانین بێژین کە تێکڕای شاعیران، بە هۆمیرۆس و ئەوانیدیش، چ لەمەڕ تواناداریی مرۆیی‌و چ خاڵگەلی دیکەشەوە، تەنیا تارمایی و سێبەرگەلێ بە ئێمە دەنوێننو لە درکی تواناداریی راستەقینەو راستییەکانی دیکە دۆش دەمێنن".[٢٧]

ئەفلاتون دوو ناتۆرەی سەرەکی خستە دووی هونەر و شیعر. ناتۆرەی یەکەم ئەم بوو کە هونەر وێنەیەك یا هەمدیس دەرکەوتێکە کە لە جێی خودی کەتوار دەناسێنرێو دەبێتە کۆسپی سەرنجی بەرامبەر (خوێنەر ـ بیسەر) لە هەرە پێویستیی تێگەیشتنی راستەخۆی کەتوار. هونەر لەبەرئەوەی کە لاسایی شتانێکە کە خۆیان لاسایی بیرۆکەن، لە هەقیقەت ئێجگار دوور دەکەوێتەوە. ناتۆرەی دووەم ئەمە بوو کە هونەر لەدیدی رەوشتی و سیاسی‌یەوە مەحکوومە، چوونکە پشت بەستو بە تامەزرۆیی‌و ئاڵۆشەو ئەگەری سەرهەڵدانیان بۆ دەڕەخسێنێ. چڕبەستی باسەکە لە سەر "ئەرکەکانی هونەر" کە بەرەنجامی لە پاڵێەکنانی هونەرە رەنێوهێنانە ماتریالییەکانی دیکە لە یەك ریزدا واتە لە ئاستی "تێخنە" بوو، رێگەی بۆ ئەفلاتون خۆش دەکرد تا ئەگەر هات و ئەم خاڵە سەلمێنرا کە هونەر لە فێرکردنی لاوانو تاکەکانی جڤاك خودان ئەرکگەلی نەریتی‌و بەرەنجامگەلی وێرانکەرە،تەرەی بکات. هەڵبەت

(٢٦) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ١٢٥٢

(٢٧) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ١٢٥٧

ئەو شتانەی بە ئەرککگەلی نیگەتیڤی هونەر ناوی لێناون، بەواتای نایەکانگیریی رۆڵی تایبەتی هونەر لەگەڵ چەقبەستەکانو بنەواشەکانی جێی پەسندی خۆی بووە.

لەم نێوەدا چەند خاڵێکی دڵکێش دێنە گۆڕێ. سەرەتا ئەمە کە ئەفلاتون خۆی باسی فەلسەفیی خۆی بە شێوەیەکی هونەرمەندانە خستۆتە روو و ژانری ئەدەبیی وتووێژ کە ئەو لە زۆربەی بەرهەمەکانیدا بە کاری هێناوە، بیچمێکی هونەریو شاعیرانەیە. لە بەرەنجامدا، ناتۆرەی ئەفلاتون بە دووریی هونەر لە هەقیقەتو بەسترانەوەی بە وارسکەکان، چێژەکانو ئاڵۆشەکان تا رادەیەکی زۆر نووسینەکانی ئەویش دەخەنە ژێر باڵیانەوە. خاڵی دواتر ئەمەیە کە لەبەرچی سوکراتی ئەفلاتون کە هەم لە **کۆمار** و هەم لە زۆرێك لە وتووێژەکانی دیکەدا جەختی لە سەر گرنگیی "ئەڤین" لە بیچمگیریی ئاخێوی فەلسەفی کردوە و لە راستیدا بنەمایانی "ئێرۆتیك"ی بۆ فەلسەفە لەبەرچاوگرتوە، پشت ئەستوریی هونەر بە ئێرۆس بە ناپەسند دەزانێ؟ ئەفلاتون روونی نەکردۆتەوە کە بۆچی پشت بەستن بە ئێرۆس لە فەلسەفەدا جێی پەسندە و لەهونەردا ناپەسند. لە سەرەتاکانی پەرتوکی شەشەمی **کۆماردا** دەخوێنینەوە: "فەیلەسوفان بەردەوام ئەوینداری دروستکردنی ئەو هایدنە تاقانە هەرمانەنو لە هیچ پاژێك لە پاژەکانی بەحز و سەرپشکیی خۆیان چاوپۆشی ناکەن، کتومت وەکو دەسەڵاتخوازانو شاگردانی ئێرۆس کە نموونەمان لێ هێناوە".[٢٨] وەلێ ئەم ئەڤینداری هەقیقەتە کە کتو مت چەشنی شاگردانی ئێرۆسە، لە هەمان **کۆمار** دا لە دژی هونەرمەندان و هۆزانڤانان دەڵێ:" ئێمە تەنیا رێ بە شیعرانێك دەدەین بێنە جڤاکمانەوە کە نێوەرۆکیان پەسنی خواوەندانو پیاوانی بە شەرەف بێ. ئەگەر شیعرەکانی دیکە، چ تراژێدیو قارەمانێتی، بهێڵی بێنە وڵاتەکەت، جڵەوی جڤاك بە دەستی چێژ (eros) و ژان دەکەوێو یاسا (nomos) و ئاوەز کە لە هەمو کاتو شوێنێکدا باشترین فەرمانڕەوان، لە کۆمەڵگاکەت دەڕۆنو بارگەیان دەپێچنەوە".[٢٩] هەمدیس شیاوی پرسینە کە بۆچی ئەفلاتون لە باسگەلی تێکچڕژاوی فەلسەفیی خۆیدا بەردەوام هانای وەبەر ئەلیگۆرییە ئەدەبیو هونەرییەکان بردوە و لەبەرچی

(٢٨) هەمان سەرچاوەی پێشو، لاپەڕەکانی ١٠٨٧ ـ ١٠٨٨.

(٢٩) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ١٢٦٧



ئەو هەموو ئەفسانەو ئوستورە یونانیو میسری... هتد لە وتووێژەکانیدا بە کارهاتونو جێی باسگەلی "بەڵگە هێنانەوەییو ئەقڵانی"یان گرتوە؟[٣٠]

بەڵام، ئەگەر راستییان دەوێ من لێرەدا چەندان عەوداڵی رۆشنکردنەوەی ناکۆکییەکانی کاری ئەفلاتون نیم و زیاتر دەمەوێ باسەکە بۆ هەمبەری هونەر و کەتوار بگەڕێنمەوە. هەنوکە، بە سەرنجدان لە گرنگیی رای ئەفلاتون لەبارەی هاویەکبوونی "پوئسیس"و "تێخنە" یا لێکهاوێرنەبوونی ئەفراندنی هونەری لە بیچمەکانی دیکەی ئافرێنەری،جێی خۆیەتی کە وردتر و بە پشودرێژییەوە سەرنج لەم خاڵە بدەین. بۆ ئەم کارە، لە چەمکێکی دیکە ورد بینەوە کە یونانییەکان بە "ئێپیستیمە"(epistéme) ناویان دەهێنا و لە دەقگەلی فەلسەفیی ئەمڕۆ (بە سەرنجدان لە باسەکانی فەیلەسوفانی وەکو هۆسرێلو فۆکۆ) زیاتر بە "دانایی"یا "پێڕستبەندیی دانایی" پاچەڤەی دەکەن. ئەفلاتون پەیڤی "ئێپیستیمە"ی هەندێجار لە بەستێنی واتایی "داهێنانی ئاگایانە" بە کار دەبرد. بە رای ئەو هەر کات کردەی ئافرێنەری لە سەر بناخەی ئاگایی ئەنجام بدرێو ببێتە هۆی وەدەرکەوتنی دانایی لە کەسانی دیکەشدا، ئێمە لەگەڵ "ئێپیستیمە" سەروکارمان هەیە. رەنگە بتوانین بێژن کە "ئێپیستیمە" جۆرێکی سەراسا لە "تێخنە"یە، واتە بیچمێك لە تێکنۆلۆژیو سازکردن کە لە سەر بنچینەی ئاگایی چێدەبێو دەبێتە هۆی داناییەکی تازە لەنێو کەسانی دیکەشدا.

پەیڤی epistème ناوێکە کە کرداری یونانیی epistasthai بە واتای "زانینی ئەمە کە بە چ جۆرێ کارێك ئەنجا بدەین" داڕێژراوە. بە دەربڕینێکی دیکە، ئێپیستیمە جۆرێك یا بیچمێکی تایبەت لە دانایییە و نەك دانایی بە واتای رەها: هەر بەم شێوەیە، لە نووسینەکانی هزرینگەرانی یونانیی پێش ئەفلاتونو لە بەرهەمەکانی خۆیشیدا، "ئێپیستیمە" بە واتای "ئاگایی ئێمە لە تواناییمان بۆ ئەنجامی کارێك" هاتوە. بە سەرنجدان لەم واتایە، هەرکات ئێمە وشەی "ئێپیستیمە" بە "دانایی" وەرگێڕین، لە راستیدا ئەو واتا دێرینە کە خودان لایەنێکی تایبەت، واتە ئاراستەی ئاگایانەی ئەنجامدانی کار بوو، لە بەرچاومان نەگرتوە. هەر کات "تێخنە" کە کارو پیشەیە، نەتوانێ جگە لە شێوەی ئاگایانە بە ئاکام بگات، دەگۆڕێت بۆ کارێك کە دەبێ لە رووی ئاگاییو ئێپیستیمەوە ئەنجام بدرێ. هەڵبەت

(٣٠) لە مەڕ ناکۆکییەکانی باسی ئەفلاتون بڕواننە یەکەمین وتاری ئەم کۆمارەی خوارەوە:

S.Rossen, The Quarrel Between Philosophy and Poetry, Lonodn, 1993.

برێك جار ئەفلاتون ئەم ئارایی ئاگاییی‌یەی لە کردەی تێخنە بەشێوەیەکی هەمەکیش هێناوەتە ئاراوە، بۆ نموونە لە وتوویژی گورگیاس لە زمانی سوکراتەوە ئەم خاڵەی وەها روون کردۆتەوە: "من ناتوانم شتێك کە لە ئاگاییی‌و ناسینەوەی (ئێپستیمە*) داماڵڕاوە بە هونەر (تێخنە**) ئەژمار بکەم".[٣١] لێرەدا ئەگەر لە بەستێنی باسی ئەفلاتون ورد بینەوە،تێبینی دەکەین کە ئەو لەنێوان کارامەییی‌و چاپوکی لەگەڵ داهێنانی ئاگایانە جیاوازیی داناوە و پێکەوە برەوداریی جۆرێك لە پیشەو هونەری بە "ئاگاییی"یا "دانایی" زانیوە. واتە لە دیدی ئەوەوە، هەر بەو جۆرە بیچمگەلێ لە کار، کردە، پیشە یا داهێنان هەن کە ئاگایانە نین‌و تەنیاو تەنیا بە کارامەییی‌و چاپوکی گرێ دەدرێن‌و لە بەرانبەردا، کارێکی دیکە هەیە کە تەنیا دەتوانێ بە شێوەی ئاگایانە بچێتە پێشێ. هەڵبەت، ئەفلاتون ئەم جۆری دووەمی کارەکەی سنوردار و قەتیسی ئەو شتەی ئێمە ئەمڕۆ "هونەر"ی پێ دەڵێین نەدەکرد و وەها کە پێشتر باسکرا هونەری لەگەڵ هەرجۆرە رەنێوهێنانێکی دیکەی مرۆیی کە سودمەند لە تێهزرین‌و ناسین بێ، بە هاوشێوە دەزانی، هەرچەند لە دانەدوی باسەکە متمانەو برەوداریی‌یەکی کەمتری بۆ دادەنا. ئەمە ئەرەستۆ بوو کە پاشان لە نێوان تێخنەو ئێپیستیمە جیاوازیی داناو هەرکامێکیانی بە یەکێك لە بیچمەکانی ئەزموونی هزرینگەریی ئاخێوئاسا زانی. ئەو ئێپیستیمەی لەمەڕ جۆرێك لە ئاخێوی عەقڵانی کە بە "بەڵگەهانین"و "نموونە هێنانەوە" (demonstration) بەناوبانگە، بەکار برد.

بەڵام ئەفلاتون، لە نێوان "ئێپیستیمە" لەگەڵ هەرامەیەك کە خۆی بە "دۆکسا" ناودێری دەکرد، جیاوازیی دادەنا. ئەم جیاکارییە دەتوانی لە هێمایەك لە وتوێژی **منون** بە orthe doxa بەدی بکەیت. لەوێدا فەیلەسوف لە نێوان "ئێپیستیمە"(کە لە پاچەڤەی فارسی‌دا منون بە پەیڤی "دانش" (زانین) پاچەڤە کراوە)و "دۆکسا"(کە لە وەرگێڕانی فارسیدا بە "پندار درست" (خەیاڵکردی راست) ناودێر کراوە) جیاوازیی داناو لە زاری سوکراتەوە لە مەڕ **منون** وەها دوا کە "زانین" مانگارە، بەڵام "خەیاڵکردی راست" هەڵەداوانە و دەبێ بە "زنجیری هۆ و بەڵگە" کۆت بکرێ، تا بتوانێ بمێنێتەوە. هەرچەند هەم "خەیاڵکردی راست"و

* تێبینی لە نووسەرە.

** تێبینی لە نووسەرە.

(٣١) افلاطون، پیشین، ج ١، ص ٢٨٦.



هەم "زانین" بەرفێرانە و دەستخەرانە*ن، بەڵام زانین مانگارترە.[٣٢] لە دوایین پەرتوکی **کۆمار** دا، ئەفلاتون "دۆکسا"یا"خەیاڵکردی راست"ی دایەپاڵ "تکنیکێکی کاربەرانە" و "ئێپیستیمە"ی دایە پاڵ "تکنیکێك" لە سەر بناخەی دانایی". هەر بۆ نموونە رەژیدەیەکی هەوساری ئەسپ خاوەنی "دۆکسا"یە، بەڵام ئەسپ سوار خودان "ئێپیستیمە"یە. لەوێدا دەخوێنینەوە: (مەگەر) نیگارکێش دەزانێ کە هەوسار و لغاوی باش چۆن دەبێ باش بن؟ کەسانێکیش کە ئەو شتانە ساز دەکەن، زیندرو و ئاسنگەر ئەم بابەتەش نازانن. بەڵکو تەنیا کەسێك ئاگاداری ئەم بابەتەیە کە ئەو کەرەستانە بەکار دەبات".[٣٣] ئەمە لەو خاڵگەلە ئێجگار دەگمەنە لە بەرهەمەکانی ئەفلاتونە کە ئەو جیاکاریی نێوان "دۆکسا"و "ئێپیستیمە" تا ئاستی باس لە بەرهەمی هونەری بەرین کردۆتەوە. رەنێوهێنانی بەرهەمی هونەری دەتوانێ لە ئاستی "دۆکسا"دا بێت، هەرچەند گرێدراوی ئافرێنەریی‌و "پوئسیس"ە، بەڵام لە قەڵەمڕەوی ئێپیستیمەدا جێی نابێتەوە، تەنیا لە کاربردەی بەرهەمدایە کە دۆخی بەسترانەوەی بە ئێپیستیمە دەڕەخسێ. لەوێدایە کە کارەکە دەبێ لە ئاستی زانین‌و ئاگایی بچێتە پێشێ. مخابن ئەفلاتون خۆی ئەم باسە تیوریکەی درێژە نەدا و لە بەرەنجامدا بە خاڵێکی نەیار لەگەڵ بڕیاری سەرەکیی **کۆمار** دەستی رانەگەیی‌و هەروا لە سەر ئەم باوەڕە مایەوە کە رێگەیەك نیە جگە لەوەی بەرهەمی هونەری‌و کاری هونەرمەند لەسەر بناخەی سودمەندی‌و کارایی‌یەکەی داوەریی بکەن. جگە ئەم خاڵە کە بەستێنی تێوریك یا باشتر بڵێم پێشبارە تێورییەکانی باسێکی تازە گەڵاڵە کراوە(بەڵام هیچی لێ شین نەبووە) لە برێك لە بەرهەمەکانی دیکەی ئەفلاتونیشدا جیاکاریی دانایی‌یەکانی وەبارنیشتوی "تێخنە"و "دانایی وەبارهاتوی هونەر" بەدی دەکرێ، هەرچەند لە تێکڕایی ئەم خاڵانەشدا بەرەنجامێك کە دەیتوانی لە دژی روانگەی ئەرکیانەی هونەر کەڵکی لێ وەربگیرێ، وەدەست نەهاتوە. رەنگە هەر لە بەر ئەمە کە سەرەداوی سەرەکی دانەدو نەکراوەو بەرەنجامێکی تێوریك لەجیاکارییەکانی جێی‌مەبەست وەدەست نەهاتوە. زۆر لە توێژەران‌و راڤەگەرانی بەرهەمەکانی ئەفلاتون، لە باسی بیرو باوەڕەکانی ئەو لەمەڕ هونەر، لەم خاڵانە ورد نەبوونەتەوە. یەکێك لەو خاڵانەی کە سەرنجی

* آموختنی إکتسابی.

(٣٢) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل. ٤١.

(٣٣) پیشین، ج٢، صص ١٢٥٨ ـ ١٢٥٩.

نەدراوەتێ جیاکارییەکە کە ئەو لە بڕگەی **٢٣٥**ی وتووێژی **سۆفیست** لە نێوان دووچەشنە "تێخنە" داینا و ئەگەر لەم جیاوازی‌یەیە لە نزیکەوە نۆڕی‌بان‌و بەرەنجامگەلی رادیکاڵ کە دەیتوانی لەگەڵ خۆیدا بیهێنێ خرابانە بەرسەرنج، ئێمە لە هەمان پانتایی هزری ئەفلاتوندا، دەکەوتینە کەش‌و هەوایەکی تازەوە و بەستێنێکی تیۆریکمان وەدەست دەهێنا کە لە بەرانبەر باسەکانی **کۆمار** و بەرەنجامە سەرەڕۆکانی رابوەستین. لە بڕگەی جێی مەبەستمان، ئەفلاتون لە نێوان دوو بیچمی "هونەری نیگارسازی"یا "هونەری لاساییگەری" جیاوازیی دانا[٣٤].ئەو لە لایەکەوە "هونەری هاوشێوەسازی"یا " هونەری نەسك هەڵگرتنەوە" (eikastike tekhne) ریزبەندکردو لەلایەکی دیکەوە"هونەری خەیاڵی"یا "هونەری فریودەر" ( Phantastike tekhne). بە بۆچوونی ئەو، هونەرێك هەیە کە خاڵی هاوشێوە یا نوێنراوەی ورد و کت‌ومت یا بەرهەڤدانی تەواو (eikastos) لەگەڵ باشقە لواو دەکا، لێرەدا هونەرمەند "بە درێژی‌و پانی‌و قووڵایی سەرباشقەی خۆی‌و هەمبەرەکانیان لەگەڵ یەکدی سەرنجی تەواو دەدا و بەم سەرنجەوە لاسایی دەکاتەوە و ئەوکات بە بەرهەمێك کە رەخساندویەتی رەنگێکی شایان دەپاشێ‌و بەم شێوەیە نیگارێکی لێکچوی سەرباشقە پێك دێنێ"و لە لایەکی دیکەوە هونەرێك هەیە کە بارتەقا راستەقینەکان هەمدیس نارەخسێنێ،بەڵکوتەنیاو تەنیا ئەفراندنی جوانی لە بەرچاو و لە سەر بنچینەی خەیاڵ (phantastikos) دروست دەکرێ. لێرەدا هونەرمەند"کاری بەسەر هەقیقەتەوە نیەو عەودالی هەمبەرە راستەقینەکان نیە، بەڵکو تێدەکۆشێ تا هەمبەرەکان وەها دەربخات کە ئەوەی بە لاساییکردنەوە پێکی هێناوە، جوان بێتەبەرچاو". ئەگەر چەشنی دووەمی هونەری "نیگارگەری" بە وردی تاوتوێی بکەین تێبینی دەکەین کە لەگەڵ بونیادی باسی ئەفلاتون لەبارەی هونەری لاساییگەرانە کە لە پەرتوکی دەیەمی **کۆمار** (و هەروەها لە یاساکان، **٦٥٧ ـ ٦٥٦** پ. ز) هاتوە، یەکانگیر نیەو ئێجگار هاوشێوەی باسەکانی ئەرەستۆ لە وتارنامەی **پۆیەتیك** ە. دەبێ بە جەختەوە بێژین کە تێکڕای پلارگرتنەکانی ئەفلاتون لە هونەری لاساییگەری تەنیا بەوچەشنەی یەکەم واتە "هونەری هاوشێوەسازی" دەگەڕێتەوە. هونەری خەیاڵی یا فریودەر هونەرێکە کە لە تێخنە بە واتای باوی خۆی دووردەکەوێتەوە و قەرار نیە شتێك لە جیهان بە تەواوی و بە وردی نۆژەن بکاتەوە، بە پێچەوانەوە، جیهان‌و شتەکان وەها کە دەبێ هەبن، واتە وەها کە جوان بێنە بەرچاو،

(٣٤) پیشین، ج٣، صص ١٥٠٠ ـ ١٥٠١.



نیگاردەکات. هەربۆیە "هونەری خەیاڵی" لە بیرۆکەوە نزیکترە لەهەموو شتەکانی دیکە کە لەم دنیایەدا دروست دەبن‌و ئەگەر وەکو ئەفلاتون بڕوامان بە بیرۆکە هەبێ‌و بوونی هونەری خەیاڵیش وێنا بکەین، دەگەینە ئەو بەرەنجامەی کە جۆرێك لە هونەر سەرتر لە "تێخنە"یە. لەبەرئەوەی کە هونەری خەیاڵی سەرتر لە "تێخنە"یە، سودێکی دەستبەجێ‌و راستەوخۆی نیە، واتە بڕیار نیە و بۆ ئەوەی ساز نەکراوە کە بە کاری شتێك بێت، بەڵکوئامانجەکەی تەنیا رەخساندنی جوانی‌یەو بەس. کەوابوو ناتوانی لەمەڕ وەها هونەرێکەوە لەسەر بناخەی سودەکان‌و ئەرکەکانی داوەری بکەیت، بەڵکو دەبێ خدەی ئاکامناسانەی لە بەرچاو بگریت و ئەو کات لە بارەیەوە داوەری بکەیت‌و ئەمە کارێکە کە لە گەوهەری خۆیدا لەمەڕ بەروبوومە رەنێوهاتوەکان جیاوازیی هەیەو پلەوپایەی تایبەتیی شێوەی تاوتوێی تایبەتیش دەخوازێت. دەبینین کە بە هەمان جیاکاریی گرنگی بڕگەی **٢٣٥**ی **سوفیست**، تەنانەت لە بنچینەی باسی کانت لە جوانی لە (پەرتوکی) **هەڵسەنگاندنی وزەی داوەری** ش نزیك بووینەتەوە. لێرەدا تێبینی دەکەین کە رێگەی دەستڕاگەیشتن بە دیتەیەکی تەواوتر لە هونەر لە بەرپێی ئەفلاتوندا کراوە بوو، بەڵام بەداخەوە ئەو وەدوی تێڕوانینێکی دیکە کەوت کە بۆ هونەر سودو ئەرکێکی کۆمەڵایەتی‌و دەستبەجێی داخواز دەکرد، کەوابوو لە **کۆمار** دا نووسی:"بە لایەنگرانی شیعریش کە خۆیان شاعیر نین، ئیزن دەدەین بە داکۆکی لە شیعر دواندەرییەك بە پەخشان پێشکەش بکەن‌و ئێمە قایل بکەن کە شیعر تەنیا ئامرازێك بۆ رەخسانی چێژ نیە، بەڵکو بۆ تاکەکەس‌و جڤاك سودمەندە. ئەگەر دواندەریی ئەوان بە پەخشان سادەو شیانی تێگەیشتن بێ بە سینگفراوانی‌یەوە ئامادەین کە بی‌بیستین".[٣٥] هەڵبەت شاعیران کە تەنانەت لە داکۆکی لە خۆیان ناتوانن شیعر بهۆننەوە، دەبێ لە فەیلەسوفی ـ فەرمانڕەوا زۆریش سپاسگۆ بن کە رێگەی پەخشانی سادە و پاراوی بە روویان دانەخستوە، هەرچەند ئەرخەیان بووە کە ئەوان ناتوانن لە داکۆکی لە خۆیان متەقیان لێوە بێت. تۆمەتباریی بارگرانی ئەوان ئەمەیە کە (دەبێژن)[*] هۆنراوە بە کاری چێژ دێت‌و بۆ تاك‌و جڤاك بەسود نیە و هەر بۆیەش مەحکومە. هەڵبەت کەسانێك کە توندوتیژیی فرمانی ئەفلاتون لەمەڕ وەدەرنانی شاعیران لە یۆتۆپیا دەنگی نارەزایەتی هەڵدەبڕن دەبێ بزانن کە فەیلەسوف لەمەڕ شاعیران ئێجگار رەوادار بووە

(٣٥) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل١٢٦٨.

* تێبینی لە وەرگێڕە.

که تەنیا بە وەدەرنانیان قایل بووە و فرمانی کوشتنی نەداون، چونکە ئەو هەمان کەسە کە نووسیویەتی :"... کە وابوو زانیت کە جڤاکی ئێمە چ جۆر دادوەر و پزشکێکی دەبێ هەبێ. یاسایەك کە لەمبارەوە پەسندی دەکەین وەهایە: پزیشكو دادوەر دەبێ مشوری خەڵکانێك بخۆن کە لە رووی جەستەو رۆحەوە تەندروستن. کەسانێك کە لەشی نەخۆشو کەساسیان هەیە دەبێ لێگەڕێن تا بمرنو ئەوانەی کە رۆحێکی گەندەڵو چەپەڵیان هەیە دەبێ بیانکوژن"[٣٦]

خاڵگەلی نایەکانگیر لە تەك بیردۆزەی سەرەکیی ئەفلاتون لەمەڕ هونەر دەتوانی لە رەوتی باسێکی تیۆریك ببەیتە پێشێ، بەڵام باس لە جیاکارییەکان لەبەرانبەر بنەواشەی سەرنجدان لە هونەر لە بەرجەوەنی ئەرکەکانی کە بەگوڕ و هێزی زۆر و بە تێروتەسەلی لە **کۆماردا** هاتوە، لە دیدی توێژەرانو راڤەگەرانی بەرهەمەکانی ئەفلاتون تەریك کەوتوە و روانگەی بنەتایی و سەرەکیی ئەو وەها نیگار کراوە کە گوایە هەر جۆرە رەنێوهێنانێکی مرۆیی سودمەند لە سەرچاوەی دانایی بە سەقامگیر دەزانرێو بەرهەمی هونەری دەسەر و سەرتر بوونێك لەهەمبەر هەر بەروبومێکی دیکە لە گۆشەی سودمەندییەکەی دەخرێتە واری نرخاندن و داوەرییەوە. هەنوکە لە باس لە بارەی روانگە لاوەکییەکانی ئەفلاتون چاوپۆشی دەکەمو بەرجەوەنی تازە لە فامکردنی هەمبەری هونەر و کەتوار و درکێکی نوێ لە چەمکی لاساییکردنەوە لە نووسینەکانی مەزنترین قوتابیو رەخنەگری ئەو واتە ئەرەستۆ پەیجۆر دەکەم.

**(٥)**

یەکەمین جیاکاریی ئاشکرای روانگەی هونەریی ئەرەستۆ لەگەڵ دیدگای ئەفلاتون، لەمەڕ چەمکی لاساییکردنەوە بوو. ئەرەستۆ نکۆڵی لە مەودای نێوان هەرامەی هەنوکەیی یا راستەقینە لەگەڵ هەرامەی لاساییگەرانە نەدەکرد، بەڵام هەر بە تەنێ بوونی ئەم مەودایەی بە واتای سەرتربوونی هەرامەی یەکەم لە هەمبەر دووەم نەدەزانی. هەرامەی هەبوو و هەنووکەیی لەبەرئەوە گوزەراوە، مەرج نیە هیراکەر بێت، بەڵام هەرامەی لاساییگەرانە بەردەوام دەتوانێ هیراگەر بێت. هێندەبەسە کە پەسندبکەین لە هەرامەی لاساییگەرانە کارێك دەوەشێتەوە کە هەرامەی هەنوکەیی ناتوانێ رای پەڕێنێ. رەنگە هەر لەبەر ئەمە لە دیدی ئەرەستۆ برەوداریی لاساییگەری پەیوەستە بە خدەی فێرکارانەی. لەدەسپێکی پاری چوارەمی **پۆیەتیك** دا ئەو

(٣٦)  هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٩٨٥.



نووسی:"(مرۆڤ) زیاتر لە گیانەوەرانی دیکە بەهرەی لاساییگەری هەیە، هەروەك زانیاری بەرایی خۆی هەر لەم رێگەی لاساییگەریو لێگوتنەوە بەدەست دێنی".[٣٧] لە لایەکی دیکەوە لاساییکردنەوە لە دیدی ئەرەستۆ بەواتای نۆژەنکردنەوەی شتێکی نەگۆڕ و وەستاو نیە کە چەشنی رەنگدانەوەی "بیرۆکە" بیچمی گرتبێ. هەرامەی هەبوو و سروشتی پەیتا پەیتا گۆڕانی بە سەردا دێتو لاساییکردنەوەی بەردەوام بە واتای لاساییکردنەوەی توانامەندییەکان و"کران"ە. لاساییگەری وەدەرخستنی شتێکە کەهێشتا کامڵ نەبووە، بەڵام لەرەوتی فراژووبووندایە. ئەرەستۆ لە **تیۆریی دەربڕین** دا رایگەیاند کە باشترین میتافۆر ئەوەیە کە شتان لە دۆخی کردەو گۆڕانکاری نیشان بدا.[٣٨] ئەم خاڵە لەمەڕ هەرجۆرە هەمدیس دەرکەوتو نمایشگەری وەڕاست دەگەڕێ. بنچینەی لاساییگەری نەك هەرامەی سروشتی بەڵکو کردەی گۆڕانکارییە. ئەم خاڵەش هەمبەری نێوان پۆیەتیك و تیۆریی دەبڕین (rhetoric) نیشان دەدا و هەم رۆشنگەری دابڕانی لێبڕاوانەی ئەرەستۆ لە باوەڕە ئەفلاتونییەکانە.

ئەرەستۆ لە وتارنامەی **پۆیەتیك** دا شیعر بەرهەمی هونەری لە ئاستی رەخساندن یا "پوئسیس" دەناسێنێو لە جیهانی سودەکانی رۆژانە، واتە لە تێکنۆلۆژیو "تێخنە" جیایان دەکاتەوە. بە بۆچوونی ئەو، هونەر لە جۆرێك لە ئاخێوی عەقلانی کە بە "ئەرمانەری"و "بەڵگە هانین" (demonstration) کۆتایی پێدێت، جیایەو هەربۆیە لە "تێخنە" دوور دەکەوێتەوەو ئیدی ناتوانی تائاستی رەنێوهێنانی هەر بەرووبومێك دای بەزێنی. هونەر لە پلەوپایەی خولقێنەریو پوئسیس بەرەنجامی وارسکەگەلی وەکو مەیل بۆ لاساییگەریو تامەزرۆیی بە فێربوونو هیراگەرییە.[٣٩] لەم روەوە هونەر لە شیکاریی بنەتاییدا، کردەیەکی عەقلانیو ئاکامناسانەیە کە دەتوانێ لانیکەم لە هەندێ بارەوە لە ئاستی باو و ناسراوی (یا فۆکۆگوتەنی لە ئاستی خوازە) بە کاربەریی رێو شوێنی ئاوەزمەندانە بانتربچێ. هونەرمەند دەتوانێ ئاکامێك وێنا بکات کە بە لای هەموانەوە ناسراو نیە. هونەر لە "رودوا"دا گەمارۆ نادرێ کە دیفاکتۆیە یا لە دۆخی روودان دایە، بەڵکو بە دوارۆژ، یا باشتر بڵێم، بە وێنایەك لە دوارۆژ کە لە مێشکی هونەرمەندا بوونی هەیە بەستراوەیەو پوختەبوونی زەینێك هەمدیس

(٣٧) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٢٩.

(38) .Aristotle, The works, vol xi, Rhetorica, ed.W.D.Ross, oxford University Aristotle,Press, 1971, 1411b.

(٣٩) ارسطو، فن شعر، ترجمەی ع. زرین کوب، تهران، ١٣٥٣، صص ٢٩-٣٠.

دەخولْقێنێ. هونەر لەگەڵ ئەو جوانییەی کە لە دوارۆژ دا بیچم بگرێ پێوەندیی هەیە. هەربۆیە ئەرەستۆ شاعیرێتی بە کارێکی فەلسەفیتر لە مێژونوسی دەزانی.[٤٠]

شاعیر یا هونەرمەند جیهانێکی تازە دەخولْقێنێو کارەکەی لە دنیای هەنوکەییدا قەتیس ناکاتەوە. ئەرەستۆ رادەسپێرێ کە شاعیرانیش مێتۆدی نیگارکێشەکان بگرنەبەر و وەکو ئەوان "کاتێك دەیانەوێ رەسەنی شتێك نیگار بکەن،نیگارێك دروست بکەن لەشێوەی رەسەن،بەلاّم لەو باشتر".[٤١] شاعیر و هونەرمەند لە سەر بنەمای لاساییکردنەوە لە سیفەتە بلّیندەکان یا نزمەکان (واتە لە سەر بنەمای ئەو خدانەی کە بە دەرکەوتو بیچمی سەرهەلْدان پێوەندیدار نین، بەلْکو لە خالْگەلی لواو دەدوێن) و بە گەلاّلەی رووداوگەلێ کە شیمان دەکرێ روو بدەن، لە بازنەی تەنگو داخراوی روداو و "دنیای هەبوو و هەنوکەیی" هەنگاو دەهاوێنە دەرێ و شیعر یا بەرهەمی هونەری وەکو بەیانگەر یا ئەرمانەری "دنیای لواو" دەڕەخسێنن. هونەرمەند بە پێچەوانەی مێژونوس کە زیندانیی ئاسۆی رووداوگەلی ئەکتیڤە، لە جیهانی کاروباری پەنگراو و توانامەندییەکانیدا دەژیێ. لەم روەوە هونەرمەند لەجیهانێکی تازە دەدوێ، دنیایەکی پشت ئەستور بە خۆ کە رەنگە برێك لە توخمەکانی، یا تەنانەت تێکڕایان، لە جیهانی ئاشنا و هەبوو سازکرابن، بەلاّم لە قەلاّفەتی هەمەکیی خۆیدا، لە بوونی هەڕەتمەندیدا، لە جیهانی بەڕاستی هەبوو و لە ژیانی رۆژانە بانتر دەچێ. ئەم بانهەلْکشانە جگە بە ئازادیی خەیاڵ و ئازادیی کردەوەی ئافرێنەرانەی هونەرمەند نالوێ. هەر وەك پۆل ریکۆر نیشانی داوە درکی ئەرەستۆ لە لاساییکردنەوەش بە سەرنجدان لەم چەمکە تیۆریکەی "جیهانی دەق" شیانی ناسینە.[٤٢] بە بۆچوونی ئەرەستۆ، لاساییکردنەوە وەکو نۆژەنکردنەوەی تەواو، یا خستنەڕووی ئەسکالْتی* گوتراو، کردە یا رووداو نیە. لەلاساییکردنەوەدا دەتوانی هەموو شتێك باشتر یا خراپتر،بەرزتر یا نزمتر لەوەی کە بەڕاستی هەیە، نیگار و بەیانگەری بکەیت. ئەرەستۆ نووسیویەتی هەر بەوچەشنەی کە نیگارکێشەکان لە کێشانەوەی شتانی دنیای راستەقینە ناچار بە رەچاوی بارتەقا راستەقینەکان نین، هونەری شانۆییش

(٤٠) هەمان سەرچاوەی پێشو، لاپەرەکانی ٤٧ـ ٤٨.

(٤١) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٦٩.

(42) .P.Ricoeur, Temps et recit, vol.I,Paris, 1983,p.83.

* نسخەی بدل/ وەرگێڕ.



کاروکردارەکان بە برێك جیاوازیی دەنوێنێ و "هەر ئەم جیاوازییەیە کە تراژێدی لە کۆمێدی جیادەکاتەوە، چونکە ئەمیان خەلْك نزمتر و سوكو چروکتر لەوەی کە لەڕاستیدا هەن نیگار دەکا و ئەویان خەلْك لەوەی کە لە راستیدا هەن، سەرتر و بلّیندتر نیشان دەدا".[٤٣] لە پاری سێهەمی وتارنامەی **پۆیەتیك** دا دەخوێنینەوە لە هەرجێ کە سوفۆکلیس لە کرداری کەسانێك دەدوێ کە بلّیندتر لە کرداری ئێمە لە ژیانی رۆژانە جێ دەگرێ، لە زمانی قارەمانێتی هۆمیرۆس نزیکتر دەبێتەوە، واتە لەم خالاّنەدا ئەو نەك لە کەتواری هەبوو و هەنوکەیی، بەلْکو لە ئارمانجەکان لاسایی دەکاتەوە و لە بەرانبەر لە هەرجێ لە کرداری کەسانێك دەدوێ کە وەکو ئێمە مرۆڤانی ئاساین و "لە دۆخی کردە و جوولّە"ن، لاسایی کەتوار دەکاتەوە و لە ئاریستۆڤانس نزیك دەبێتەوە.[٤٤]

کەوابوو دەتوانین بێژین کە لاساییکردنەوەی هونەرێك مەرج نیە لاساییکردنەوە لە هەرامەیەکی راستەقینە بێ، بەلْکو پشت ئەستورە بە هەلّێنجانی زەینیی هونەرمەند لە کەتوار. هەربۆیە ئەرەستۆ دەلّێ ئەگەر کەسێك سوچ لە شاعیر و هونەرمەند بگرێ کە ئەو شتەی هێناویەتە گۆڕێ دامالْراوە لە هەقیقەتو بە پێچەوانەی کەتوارە، ئێمە ولاّمی دەدەینەوە کە "شاعیر لاساییگەریو نیگاری کاروبار و شمەکەکان بەو چەشنەی کە دەبێ هەبن کردوە".[٤٥] بەوچەشنەی کە دەبێ هەبن، نەك بەوچەشنەی کە بە راستی هەن. هەر بەو جۆرەی کە نیگارکێش نیگارێك سازدەکا هاوشێوەی رەسەن "بەلاّم باشتر لەو". نیگاری ئەمرۆیی شتێك کە "دەبێ بە بیچمێکی دیکە بێت"، لە بەرگرەوەی وێنەیەك لە تاکەکەسە. ئەم وێنەیە نالوێ مەگەر ئەوەی کە ئێمە وێنایەك ـ تەنانەت بێ سەروبەر ـ لە دوارۆژ، رەوتی بەکاملْبوونو گرنگتر لە ئاکامی کار لە مێشکماندا هەبێ. وێنای هونەرمەند لە هەمەکێتییەك کە ناچارە توخمگەلێ لەو بناسێنێو لە بنەتادا مێتۆدی کاری ئەو لە دەربڕینی ئەم توخمانەدا، نیشان دەدەن کە کاری هونەری ئاکامناسانەیە. ئەرەستۆ لە **پۆیەتیك** دا، ئەم خالّەی لەمەڕ هونەرگەلی شانۆییو بە تایبەت تراژێدی باس کردوە و لە زاراوەی muthos سودی وەرگرتوە کە لە پاچەڤەی فارسیدا بە "ئەفسانە" ناودێر کراوە، بەلاّم بە وردی بەرابەرە

(٤٣) ارسطو، پیشین، ص ٢٦.

(٤٤) هەمان سەرچاوەی پیشو، ل ٢٧.

(٤٥) هەمان سەرچاوەی پیشو، ل ١١١.

بەو شتەی ئێمە لە تیۆریی ئەدەبیی ئەمڕۆدا بە"تانو پۆ" ناودێری دەکەینو بە هاوواتای "چیرۆك" بەکاری دێنین. شاعیر و چیرۆکنوس تانوپۆ بە "سەرچاوە و رۆحی تراژێدی (و بەرهەمی هونەری گێڕانەوەیی) دەزانن،[٤٦] و شتانی دیکە لە هەمبەریدا لە پلەی دووەمی گرینگیدا ریزبەند دەکەن. ئەم دانایییە بە واتای هەرەپێویستیی ئاگایی شاعیر لە سازوکاری بانهەڵکشان لە لۆژیکی ژیانی رۆژانە و هەنگاونان لە قەڵەمڕەوی "جیهانی بەرهەم"ە کە لەودا ئەو بەرامبەرەکەی (خوێنەر ـ بیسەر) چەند قات ئازادترن.

ئەرەستۆ بە هێنانەئارای تانوپۆ، یەکێك لە نوێترینو ئەمڕۆییترین خاڵەکانی لە تێکڕای تیۆرییە هونەرییەکانی دنیای کلاسیك هێنایە پێشێ. گرنگیی هەمبەری نێوان mimesis یا لاساییگەری لەگەڵ muthos یا تانوپۆ کاتێك دەزانرێ کە سەرنج لە تیۆریی پۆلریکۆر لەمبارەوە بدەین کە لەبنەڕەتی خۆیدا لەسەر بنەمای فراوانکردنو بەرینکردنەوەی رای ئەرەستۆ بیچمی گرتوە. ریکۆر لە یەکەمین بەرگی پەرتوکی **هەڕەتو راپۆرت** دا لە مکوڕیو لێبڕاوێـتی ئەم هەمبەرە لە **پۆیەتیك** ی ئەرەستۆ داکۆکی کردوە.ئەرەستۆ لە ناسینی خەدی لاساییگەرانەی تراژێدیدا نووسیویەتی: تراژێدی لاسایی کەسەکان نیە، بەڵکو لاسایی کردەکان، ژیان، شادمانیو بەڵاوکارەساتە، بەڵام لە کردەی ئێمەی تاکی مرۆیی ـ لەو شتەی ئەنجامی دەدەین ـ شادیو پەژارەی ئێمە وەشێراوە. کەوابوو لە شانۆدا کەسێك بە ئامانجی نواندنی خەدی خۆی دەور ناگێڕێت. خەدە هەڵبەت دەناسرێت، بەڵام لەرێگەی کردەوە.کەوابوو ئامانج و بنەتای تراژێدی ئەو کردانەن کە لە تانو پۆ دا جێ دەگرنو ئامانجی هەموویان خاڵی سەرەکییە".[٤٧] لە لاپەڕەی دواتریش لە درێژەدا دەڵێ:"سەرچاوە و رۆحی تراژێدی، تانو پۆ یە". لە راستیدا ئێمە توخمەکانی بەرهەمی هونەری بە هەندێ لاساییگەری لە خاڵگەلی هەبوو و هەنوکەیی دەزانین. بەڵام باسەکە لێرەدا کۆتایی پێ نایەت. ئەم توخمانە لە بەرهەمێکی ئەدەبیدا، واتە لە گەلاڵەیەکی گێڕانەوەییدا، یا لە تانوپۆدا جێدەگرن. تانوپۆی چرکەساتە هەڵبژێراوەکانی دانەر بەردەوامیی کەتواری جیهانی دەرەکییە. ریکۆر لەم باسەی ئەرەستۆ، دەگاتە ئەو بەرەنجامەی کە ئێمە هەر توخمێکی بەرهەمی هونەری، یا هەر خاڵێکی لاساییگەرانە بە جێکردنەوەی لە تانو پۆ لە راستیدا لە جەرگەی کاتدا بنەجێ دەکەین. کات،

(٤٦) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٤٠.

(47) .Aristotle, The works, voL, xi, Rhetorca/ Poetica, ed. W.D.Ross, oxford University Press, 1971, 1450 a.



لەوێدا دەبێت بە کاتێکی هایدنناسانەو مرۆیی کە پشت بەستو بە بیچمێك یا جۆرێك لە گێڕانەوە دەبێت. تەنانەت چیرۆکە رەوشتی، پەندەکان (وەکو ئەو پەندانەی کە لە زاری عیسا مەسیحەوە لە ئینجیلدا هاتون) یا نەزیلەکانی وەکو چیرۆکەکانی خۆرخەلوئیس بورخسو فرانتس کافکاش کەتوارگەلی هەڕەتمەندن، چونکە خاڵی لاساییگەرانە لە گەلاڵەیەکی هەڕەتمەندوگێڕانەوەیی جێیان خۆش کردوە، گەلاڵەیەك هەڵبژێردراوی گێڕەوەکانیان.

ئەرەستۆ گەلاڵە یا تانو پۆی هەڕەتمەندی لە بڕگەی ٤٥٠ ب. وتارنامەی **پۆیەتیك** دا خودان سەرەتا، نێوەڕاستو کۆتایی زانیوە و بە وردی باسی لێوە کردوە.[٤٨] ریکۆر لەو باوەڕەدایە کە دوو هۆکاری هەڵبژاردنی دانەر و وەرگرتنی لە لایەن بەرامبەرەوە (خوێنەر ـ بیسەر) هۆکارگەلی سەرەکین کە پێکهاتەی هەڕەتمەندی تان و پۆ سازدەکەن. دەبێ بتوانین لەنێوان کردەی لاساییگەرانەی دانەری بەرهەم و خەدی وەرگرتن جیاوازی دابنێین. هەروەك دواتر دەبینین ریکۆر بانهەڵکشانە جیاجیاکانی پەیکەربەندیی بەرهەم کە کاری دانەرە هەمدیس پەیکەربەندییەکەی کە کاری بەرامبەر (خوێنەر ـ بیسەر)ە، هێناوەتە ئاراوە. ئەو لاساییکردنەوە بە پەیکەربەندی (configuration) دەزانێو نیشان دەدا کە ئەوەی لە کاری کراندابوو، لێرەدا دەگۆڕێ و بە شێوەیەك لە شێوەکان ساوکە دەگرێ و لەوە بەدواوە،باقی و مانگار دێتەبەرچاو. هەرامەی سروشتی یا راستەقینە، بەستێنو جیهانی پەیکەربەندییە. هێشتا لە تانو پۆ، لە جیهانی گێڕانەوەییدا کە هەڕەتمەندە جێی نەگرتوە. هونەر وەك پراکسیسێك ئەم بانهەڵکشانی گۆڕانە هەڕەتمەند دەکاو لە تانو پۆدا جێی دەکاتەوە. بەرهەمی هونەری هەرچەند بە رواڵەت نەگۆڕ و مانگار دەنوێنێ، بەڵام لە هەڕەتدا جێی دەبێتەوە. بە لاساییگەری، رەخساندنەکان و فێربوونەکان دەست پێدەکا، واتاکان بیچم دەگرن، راڤەکان لایەنی دیاری کراو وئاشکرا پەیدا دەکەن. جیهانی پێش گێڕانەوەییو پێش لاساییگەریو پێش پەیکەربەندی بەهۆی لاساییەوە گێڕانەوەدەکرێ و پەیکەردار دەبێت. ریکۆر نوسیویەتی:" لاساییکردنەوە بەواتای دروستکردنی وێنەیەك لە شتانی پێشتر هەبوو نیە، جۆرێك کامڵبوونی واتایە لە پانتایی کردەی بیچمێکی چەندقات سەرتر. خۆی لەگەڵ شتێك کە بە نەخت هەیە، بەرابەر ناکات، بەڵکو لە کردەدا لاساییکردنەوە دەخولقێنێ".[٤٩]

(٤٨) ارسطو، پیشین، صص ٤٢ـ ٤٣.

(49) .P.Ricoeure. "Mimesis and RePresentations, in: Annals of scholarship, nos" 2-3, 1981, P.16.

ریکۆر دوو بیچمی لاوەکی لە سیستمی لاساییکردنەوەدا دەناسێ: بیچمی یەکەم، گەڕانەوە بۆ ئەو شتەی کە پێشتر هەبوو و هێشتاش هەیە. ئاماژەیەکە بە جیهانی هەبوو و هەنوکەیی کە لە ریالیزم و ناتۆرالیزمدا گرنگییەکی کلیلییان پەیدا کردبوو. بیچمی دووەم ئەو شتەی کە بە پێش ـ فام ناودێری کردوە. بنەماکانی ناسینی ئێمەیە کە چ لە ئەفراندنی بەرهەم و چ لە خوێندنەوە یا وەرگرتنی گرنگییەکی کلیلیی هەیە. جیهانێك کە لە هەڵکەوتی وەرگرتنی بەرهەم دروست دەکرێ لە جیهانی بەرهەم جیایەو هەردووکیان لە جیهانی ماتریالیی یەکەم، جیان. ئەوەی کە لە سەدەکانی ناڤیندا جیهانی خەیاڵی بەرهەم "mundus imaginalis" ناودێر دەکرا، رێخۆشکەری ناسینی جیهانێکە کە بەرامبەر (خوێنەر ـ بیسەر) دەیخولقێنێ. تانو پۆ یا گەلاڵەیەك کە دانەر لە سەر بنچینەکەیەوە جیهانی بەرهەم دەرەخسێنێ، تاقانە گەلاڵەی لواو نیە، بەڵکو هەر بەرامبەرێکی(خوێنەر ـ بیسەر) بەرهەمیش تانو پۆیەك دەخولقێنێ.

جیهانی راستەقینە بۆ بەرهەمی هونەری ئەگەری لە ئەژمارنەهاتو دەرەخسێنێ. هەر بەم شێوەیە جیهانی بەرهەم بۆ وەرگرتنە هەمەجۆرەکانی بەرامبەرانی (خوێنەر ـ بیسەر) بەرهەم، لە دەستەو تاقمی جیاواز و لە هەڵکەوتی مێژوویی‌و فەرهەنگییە جیاوازەکان، ئەگەری بێئەژمار دەرەخسێنێ. ریکۆر ئەم بانهەڵکشانی نۆژەنکردنەوەی بنەتایی بەرهەم لە زەینی هەر بەرامبەر(خوێنەر ـ بیسەر)ێك بە "هەمدیس پەیکەربەندی" (re- figuration) یا "بان پەیکەربەندی" ناودێر کردوە.[٥٠] کردەی پەیکەربەندی کاری هونەرمەند و کردەی هەمدیس پەیکەربەندی کاری بەرامبەر (خوێنەر ـ بیسەر)ە.خوێنەر بەردەوامبوونی واتایی دەق دادەهێنێ. ئەو لە تانو پۆ بانتردەکشێ‌و ئەگەرەکانو هەڵکەوتەکان وێنا دەکات.رەهەندی کاتداری پەیکەربەندیکراو ئەمڕۆیی دەکاتەوە.ڕاڤە گوزەر لەپەیکەربەندی بۆ هەمدیس پەیکەربەندی یە. پەیڕەوانی گادامێر کە لە گواستنەوەی ئاسۆی واتایی دەقێك کە بە رابردووەوە پەیوەستە، بۆ کاتی ئێستا، واتە کاتی وەرگرتنی دەق‌و لە ئاوێتەبوونی ئاسۆکان باس دەکەن، دەتوانن رەگاژۆی باسی خۆیان بە بژیوانیی **هەرەتو راپۆرت** ی ریکۆر لە **پۆیەتیك** پەیدا بکەن. لە وتارنامەی ئەرەستۆ بەستێنی تیۆریکی پێشکەوتنی باسەکە ـ هەڵبەت بە شێوەیەکی سەرەتایی‌و خاو ـ بەرهەڤ کرابوو.

(50) .P.Ricoeur, Temps et recit, voL. I.pp.116-117.



بەئاشکرا، روانگەی ئەرەستۆیی لە ئەفراندنی تیۆرییەکانی جوانیناسیی وەرگرتن گرنگیی کلیلیی هەیە. ئادامز لە پێشگوتاری **کۆمکاری تیۆریی رەخنەگرانە لەپاش ئەفلاتون** بە دروستی دەنوسێ کە تیۆریی لاساییگەریی ئەرەستۆ ناتوانی لە هەمدیسنوێنی یا کۆپی کردنی سادەی جیهان کورت بکەیتەوە. ئەرەستۆ لە بەر ئەم هۆیە لە دژی دژایەتیی ئەفلاتون لەگەڵ لاساییکردنەوەی هونەری ئاخێزا بوو -کە تێبینی دەکرد- گۆڕان، بانهەڵکشانی هەمیشەیی‌و لێبڕاوانەی سروشتەو لەبەرئەوەی کە سروشتی بە وزەوهێزی خولقێنەر دەناسی کەخودان پێناو و راستەڕێی ماقوولە، نەیدەتوانی (هەمدیس دەرکەوتی) سات بەساتی ئەم بانهەڵکشانی گۆڕانە بە بێ بایەخ گریمان بکات. بە پێچەوانەوە، ئەو هەمدیس دەرکەوتیشی چرکە ساتێك لە بانهەڵشکانی بزاوتی عەقلانی‌و ئاوەزپەسند ئەژمار دەکرد. بانهەڵکشانی ئەفراندن لە کاری هونەریی شاعیرێك هاوشێوەی گۆڕانکارییە پەیتاپەیتاکانی سروشتە، بانهەڵکشانێکی وەستاو و تاکرەهەند نیە. شاعیر شتێك بە بیچمێکی تازە دروست دەکا، بیچمێك کە لە سروشتدا بوونی نیە، بیچمێك کە سەرچاوەی لەبن نەهاتویی تەکووزمەندییەکان، رێساکانو هەر بەم شێوەیە ناسینەکانو راڤەکانە. بەمجۆرە کاری هونەرمەند بە تەواوی لە کاری کۆپیلەیەك جیادەبێتەوەکە ناچارە لە شتێکی راستەقینە نەسك هەڵگری بکات. بە پێچەوانەوە "لەم شێوە تایبەتیەی لاساییگەریدا، شاعیر بیچمی بنەتایی کردەکان دەدۆزێتەوە".[٥١]

(51) .h.Adams ed, critical Theory since Plato, New York, 1971, P.47.

## هونەر و کەتوار

کە منداڵ بووم هەرڕۆژ دەمتوانی بۆ تەماشای شانۆی بووکەڵان، بچم بۆ باخی لۆکزمبۆرگ‌و تەنانەت لە سەرلەبەری ڕۆژ لەوێدا بەسەربەرم. ئەو نواندنو ئەو بووکەڵە قسەکەرانە کە بەرێدا دەچوونو بە کوتەك دەیان کوتا بە سەر و گوێلاکی یەکدی، بە دەم دڕاوی‌و واق وڕماوی سەیرم دەکرد، بەڵام هیچ وەپێکەنین نەدەکەوتم. شانۆی بووکەڵان وێنەی جیهان بوو کە وەبەر چاوم دەکەوت. سەمەرە خولقێن، نامۆ، نەلواو، بەڵام هەروا ڕاستەقینەو زۆریش ڕاستەقینە، بەم بیچمە ئێجگار کاریکاتێری‌و سادەکراو، کە وەك بڵێی جەختێك بوو لە سەر سروشتی ناساز و توخسی هەقیقەت؟.

ئێژن یۆنسکو[١]

(1) .E.Ionesco, Notes and COUNTER- notes, trans.D.watson, 1964.P.18.



### (١)

لە زاری ڤێرجینا وۆڵف گێڕاویانەتەوە کە جارێکیان گوتبووی:"هونەر نەسکی دووەمی جیهانی ڕاستەقینەیە. لەو چەپەڵەوە هەمان یەك نەسك بەسە".[٢] توخسیی ئاخاوتەی هونەرمەندی مودێرنیست لە دوو دیدەوە شیانی تێگەیشتن و پاساوە. یەکێکیان بێزاری لەو شتەیە کە بە "کەتوار" ناودەنرێ و زیاتر لە داسەپاندنی یەکێك لە هەڵێنجانە شیمانکراوەکان لە کەتوار لە لایەن ئاوەزباوەڕانو زانستگەراکان بەسەر هەمواندا نیە و دووەمیان بێزاری لە ڕێساگەلێکە کە بە ناوی کەتوارگەرایی لە قاڵبی ڕێبازگەلی وەکو ریالیزمو ناتۆرالیزم بەسەر هونەرمەنددا دەسەپێ. لە ڕۆژگارێك کە وۆڵف نوسینی بە شێوەی شێلگرانە دەست پێکردبوو، کەمتر لە نیوسەدە لە ساویری "هونەرمەند لە پلەو پایەی نیگارگەری کەتوار" دەگوزەرا و ئەم ساویرە هێندە گەورەبوو کە بووە هۆی بەدحاڵیبوونی زۆروزەوەند، تا ئەو جێیەی کە فلۆبیر، ئەو "دوژمنی تینوو بە خوێنی کەتوار" بە ریالیست ناودێر دەکرا و پەرستنی ڕەهاخوازی لەهونەردا، ببوو بە ئایینی هونەری بازاری‌و هونەری سیاسی. کەمێك لەوەو پێش ئیمیل زۆلا ڕای گەیاندبوو کە هونەرمەند وەك زانایەك (مەبەستی ئەو تێگەیشتنە لە زانایانی زانستە سروشتی‌و فیزیکییەکان بوو کە پۆزەتیڤیستەکان دەهێنایانە پێشێ) دەبێ بە نۆڕین، تاقیکاری‌و دۆزینەوەی کەتوار خۆی خەریك بکا و لەم خاڵە تێبگا کە هیچ پەیامنایەك جگە لەمە لە ئەستۆی نیە. زمانی تاڵی وۆڵف داکۆکی لە (لەپەرتوکی) **ژووری جیکۆب** و **بەرەو فانۆسی دەریایی** و قووت بوونەوە لە بەرانبەر **زەوی و ژێرمینال**. نزیکەی یەك ساڵ پێش لەوە، گۆتە پێویست نەبوو تا قسەکەی وۆڵف وەها تاڵ بێنێتە سەر زمان. ئەو پەیوەست بوو بە سەردەم و ڕۆژگاری ڕۆمانتیزمو ڕێزی لە خەیاڵگەریی ڕۆژگارەکەی دەنا و تەنانەت کلاسیستەکانیش ئامادە نەدەبوون کە خەیاڵ لە بەرپێی "پەرستگای کەتوار" قوربانی بکەن. لەم ڕووەوە گۆتە دەیتوانی بە نەرم نیانی‌و نتمی[*] بڵێ:"هونەر، هونەرە، چونکە سروشت نیە".[٣]

(2) .N.Goodman, Languages of Art, IndianapoLis, 1976, P.3.

(*) نتمی: (متانت)/ نتم: (متین)، لە زاری هەورامییەوە وەرم گرتوە، (وەرگێڕ)

(٣) وەرگیراو لە ییێتس لە پەرتوکی:

W.B.Yeats, Explorotions, London, 1962,P.88

ئەرەستۆ لە وتارنامەی **پۆیەتیك**،لە هەمبەری کەتوار و هونەر سەرنجی داوە و هێنانە پێشی چەمکێکی تازە لە لاساییگەری (mimesis) کە لەگەڵ تانو پۆ (muthos) گرێ دراوە، باسەکەی خۆی بردبوویە پێشێ. دەتوانی لە وتارنامەی ئەو وەها هەڵێنجان بکەیت کە ڕاسپاردەی ئەو بە شانۆنامە نوسان، شاعیرانو نوسەران ئەمەبوو کە بەردەوام لە بەرهەمەکانی خۆیدا تێبکۆشن تا دنەی پەسندی خوێنەر بدەن کە توخمەکانی چیرۆك، وەکو هەڵکەوتەکان، ڕووداوەکان، کەسیەتییەکان، کردەکان و گوتەکان، هەموو "شیمانی بوونو ڕووداون" یان هەیە. وادێتەبەرچاو کە بەلای ئەرەستۆوە هەر چییەك لە جیهانی دەرەوەی چیرۆك ناوی "کەتوار"ی لێنراوە، تەنیا لە ژێرناوی ئامرازی ئەفراندنی تانوپۆ گرنگیی هەیەو بە هەرحاڵ لەبەر ئەو شتانەی کە لە چیرۆکدا جێدەگرنو لەدیدی خوێنەرەوە لواون، قورساییەکی ئەوتۆی نیە. ئەگەر بەرامبەر (خوێنەر ـ بیسەر)ی بەرهەمی هونەری پەسند دەکا لە چیرۆکێك کە دەیخوێنێتەوە یا شانۆیەك کە دەیبینێ ڕووداوێکی سەراسا ئەگەری ڕوودانی هەیە، ئیدی چ گرنگیەك هەیە کە وەها ڕووداوێك لە جیهانی دەرەوەی چیرۆکەکە ڕاستەقینەیە یان نا؟ دەروەستیی هونەرمەند بەر لە هەر شتێك بە بەرهەمی هونەرییە و نەك یەکانگیریی کتومت و موو بە مووی توخمگەلی چیرۆك لەگەڵ ئەو شتەی لە جیهانی دەرەکی ڕاست یا چەوت بە "کەتوار" ناودێری کردوە لەقەڵەم دەدرێ. هەربۆیەش ئەرەستۆ لە پاری بیستو پێنجەمی **پۆیەتیك** دا دەنوسێ:"شتی مەحاڵ و لەمپەردار ئەگەر جێی باوەڕکردن بێ، باشتر لە هەرامەی لواوە گەر جێی باوەڕ نەبێ".[٤] ئەگەر لە دەقی ئەم (پار)ە وردبینەوە تێبینی دەکەین کە لێرەدا ئەرەستۆ وڵامی ڕەخنەگرانو پلارگران دەداتەوە کە ڕادەگەیەنن هونەرمەند نابێ لە شیعر و چیرۆکی خۆی بە کاروباری نەلواو و لە ڕادەبەدەر نائاسایی کە لە جیهانی ڕاستەقینەدا ڕوونادەن، خەریك بکات. یەکێك لەو ڕەخنەگرانەی کە هەرچەند ئەرەستۆ ناوی نەدرکاند، بەڵام بە ئاشکرا تیۆرییەکانی جێی سەرنجی ئەرەستۆ بووە، ئەفلاتونە. ئەرەستۆ لە ڕوونکردنەوەی بڕیاری خۆی دەنوسێ کە وێدەچێ هەرامەی‌نەلواوی‌جیهانی دەرەکی، لەگەڵ شایانییەکانی شاعیرانەو هونەریی بەرهەم یەکانگیر بێت، یا بتوانێ بە باشترین شێوە بابەتی جێی مەبەستو باسکردن ڕۆشن بکاتەوە، یا تەنانەت لەگەڵ باوەڕی هەموان هاوگرەوە بێت. هونەرمەند و شاعیر ئەرکی سەرشانیان نیە کە تەنیا لە چوارچێوەی بەرتەسکی ئەو شتەی بڕێك لە

(٤) ارسطو، **فن شعر**، ترجمەی ع. زرین کوب، تهران ١٣٥٣، ص ١٦٦.



بەرامبەرانی (خوێنەر ـ بیسەر) لە ژێر ناونیشانی کەتوار دەیناسن، ببزوێ. کاتێك کە ئێمە باسو خواسی کەرامەتی پەرێزکارانی خواناس لە پەرتوکەکانی عارێفانی سەدەکانی ناڤین بۆ نموونە **تذكرة الاولياء** ی عەتتار دەخوێنینەوە، لەگەڵ کەڵەکەیەك لە سەمەرەکانو کاروباری ڕادەبەدەر نائاسایی ڕووبەڕوو دەبین کە بە بێ هیچ دژوارییەك لە جیهانی دەقدا وەك دەوترێ "جێ دەگرن" و لە ئاسۆی ژیانی کەسێتییەکانو لۆژیکی ڕووداوەکانی ئەو بەرهەمە، دروستوجێی باوەڕ دێنەبەرچاو. گیانەوەرانی سەمەرە کە لە ئەفسانەکۆنەهیندییەکان، یا لە **هەزارو یەکشەو**، یا لە نەزیلەکانی بۆرخێس نەخش دەکرین، شتانی سەیروسەمەرە کە گالیڤێر لە سەفەرەکانی خۆیدا لەگەڵیان بەرەوڕوو دەبێ، بەمێروبوونی مرۆڤێك و یا پاراستنی ئاگایی مرۆیی خۆی لەم قاوغی گیانەوەرییەدا، کە کافکا هێناویەتە پێشێ، تەنیا لەبەرئەوەی کە لە جیهانی دەقدا جێی شیاوی خۆیان گرتوە، بەلای خوێنەرانی ئەم بەرهەمانەوە بروا پێکراو دێتە بەرچاو. ئەرەستۆ کاتێ کە دەیگوت مەحاڵێك کە جێی بروا پێکردن بێت چەندقات باشترە لە لواوێك کە جێی باوەڕپێکردن نیە، سەرنجی لەم خاڵە دابوو. ئێمەش خۆمان لە ئەزموونی وەرگرتنی ڕۆمانەکان یا فیلمە سینەماییەکان زۆرجاران کردە یا ڕووداوێك کە ڕوودانی لە ژیانی ڕۆژانەماندا بە تەواوی دەلوێ، بەڵام لە دەقی ئەو چیرۆکەی مەبەستمانە "جێ نەکەوتوە"، بەرتەك دەدەینەوە و هەر ئەمە دەبنە کاروکەرەستەی تۆرانی سەرنجو هۆگریی ئێمە لەو چیرۆکە یا خۆ فلانە فیلم. بە پێچەوانەوە کەمتر تەماشاوانێك هەیە کە پاش دیتنی فیلمی **ئەی‌تی** بڵێ کە چونکە عەقڵ نایگرێ کە وەها بوونەوەرێکی فەزایی نازدار دابەزێتەسەر گۆی زەوی، ئەم فیلمە بێبایەخودرۆیە. بەڕاستی، ئەم فیلمانە چەندقات لە کەڵەکەی فیلمە ڕیالیستییەکان لە گرنگترین مەسەلەکانی ژیانی ئێمە لە هەسارەکەمان هەواڵی ڕاستو دروستمان بۆ دێنن.

## (٢)

لواو نوێنرانی*، ڕووداو، کردە و خدەی کەسەکان لە چیرۆك، فیلم یا شانۆ، کارێکی ئێجگار زراڤ و هەستیارە. ئەمە ڕەنگە سەختترین، یا لانیکەم یەکێك لە سەختترین ئەرکەکانی سەرشانی ڕەخسێنەرانی بەرهەمگەلی گێڕانەوەیی‌یە. هەڵبەت، هونەرمەند دەتوانێ

* ممکن جلوه دادن.

لە زۆر هۆکاران یارمەتی وەربگریّ. بۆ راستنوێن دەرکەوتنی بەرهەمی هونەری یا توخمێکی بەرهەمێك، رێساکانی ژانرێك کە بەرهەم لەودا جیّدەگریّ، دەتوانیّ یاریدەی هونەرمەند بدات. هەر بەم شێوەیە، هەلّکەوتگەلی سەراسای وەرگرتنی دەق، واتە هەندیّ هەلومەرجی کۆمەلآیەتیو فەرهەنگی دەتوانن یاریدەی پەسندی بەرهەم لەلایەن بەرامبەران (خوێنەر ـ بیسەر)بدەن. بەشێوەیەکی هەمەکی، پەسندکردنی زۆرێك لە توخمگەلی چیرۆکی کە لە پەڕانپەڕێکی یەکسەر نەناسراودا بۆ بەرامبەر (خوێنەر ـ بیسەر) ڕوو دەدەن، ئاسانترە. هەلّبەت خالّی کۆتایی سنوردارییەکانی تایبەتی خۆیشی دەخولّقێنیّ. بەهەرحالّ، ئەوەی لەم نێوەدا هەستیار و یەکلا کەرەوەیە، لەبەرچاوگرتنی هەلومەرجی دەرونیی بەرامبەر (خوێنەر ـ بیسەر)ی ئایدیالییە. لە سەروبەندی هونەری ڕۆماننوسی،نوسەرانی بەرایی لەم مەسەلە هەستیارەی "راستنوێنی" یا "لواونوێنرانی کاروبارەکان"سەرنجی زۆریان دەدا. هەلّبەت هێنری فیلّدینگ و ساموئێل ریچاردسۆن لە رێساگەلی ریالیستیی چیرۆکنوس تیّ نەدەهزرین و لەو هەموو بنەواشە و یاسا و دەبیّ و نابیّیانە کە نزیکەی یەك سەدە پاش ئەوان بوو بە باو، ئاگادار نەبوون، بەلآم وردبوونەوەی ئەوان چڕکراوە لە سەر لواونوێنرانی توخمەکانی چیرۆك بوو و سەرکەوتنیان لەم ڕێگەیەدا بەرچاو و شایانی ئافەرین و دەستخۆشی بوو. فیلّدینگ لە پاری یەکەمی پەرتوکی هەشتەمی **بەسەرهاتی تۆم جۆنز** دەنوسیّ کە هەر نوسەرێکی کارامە خۆی لە چوارچێوەی پێشهاتەکان و کەسانی" شیمانکراو" بەرتەسك دەکاتەوە و" هیچ نوسەرێکی باش هەرگیز پێی لە(بەڕەی) کەوشەنەکانی شیمان زیاتر ڕاناکێشیّ".[٥]

فیلّدینگ لە زاری" یەکێك لە بلیمەتانی پێشەنگ" دەگێڕێتەوە کە" هونەری گەورەی هەر شێعرێك ئەوەیە کە هەقیقەت لەگەلّ خەیالّکرد ئاوێتە بکا تا توخمی جێیباوەڕ لەتەك توخمی سەرسوڕهێنەر گرێبدا". هەلّبەت یەکەمین هەلّێنجانەکانی خودی فیلّدینگ لە هونەری ڕۆماننوسی، کە ڕۆمانی بە هاوشانی داستانی قارەمانێتی دەزانی، یا جەختی ئەو لەسەر گرنگیی سەرنجدان لە وردەکارییە جڤاکی و مێژوییەکان( ئەو تەنانەت **تۆم جۆنز** ی" مێژو" و لەبەرگرەوەی توخمەکانی ژیاننامەی ڕاستەقینە ناو نابوو) دەبووە هۆی ئەوەکە جاروبار تای تەرازو بە قازانجی" توخمی جێی باوەڕ" قورس ببیّ و لە دەوری توخمی خەیالّ کەم بێتەوە. یان وات لە کتێبی **سەرهەلّدانی ڕۆمان** دا وەبیری هێناوەتەوە کە فیلّدینگ لە دوایین رۆژەکانی

(5) . h.fielding. tom jons founding, ware, hert fordshire, 1996, p.273.



ژیانیدا ئەم خالّەی تێبینی کردبوو و ئێجگار حەزی دەکرد کە نیگایەکی رەخنەگرانە بە کارەکانی پێشوی خۆی بخشێنیّ.[٦] هەلّبەت **تۆم جۆنز** باشترین نموونە لە رۆماننوسیدا نیە، چونکە رۆمانێکە لە چیرۆکەکانی پیکارسك، شانۆکۆمیدییەکان و تەنانەت وتارنامە نووسی، بەلآم بەهەرحالّ خودان ئەو شتەیە کە ئەمڕۆ لە رۆماندا زەق و دلّکێش خۆدەنوێنیّ: جیهانی بەرهەم. سەرکەوتنی نوسەر لە گرەوی ئەفراندنی دنیایەکە بەرلەوەی کە لە پەڕانپەڕی راستەقینەی ژیانی نوسەر بدویّ، لە شیرازەداری و هاوئاقاریی توخمەکانی بەرهەم ئاگادارمان دەکا.

گرێدرانی هەرامەی لواو و هەرامەی نەلواو، کە لە سەرەوە هاتەگۆڕیّ، خالّگەلی تیۆریکی دیکەش دێنێتە پێشەوە. یەکەم ئەوە کە کاروباری لواو لە ژیانی ڕۆژانەماندا، بەشێوەیەك لە شێوەکان، بەکاروباری راستەقینەش دەزانرێن، بەلآم کاروباری لواو لە بەرهەمە ئەدەبییەکاندا کاریان بەسەر ئەم کەتوارەوە نیە و دەربڕینی کەتوارێکی دیکەن کە بە "جیهانی بەرهەم"وە پەیوەستن و دەتوانین بە "کەتواری دەق" ناودێری بکەین. خالّی دووەم کە لە یەك واتادا لە خالّی یەکەمەوە وەباردێت، ئەمەیە کە لەهەر بەرهەمێکی هونەریدا رۆنانە هەمەچەشنەکانی کاروباری لواو و کاروباری نەلواو لە گەوهەری خۆیاندا کاروباری دەستەبژێرکراون، واتە بۆ هەلّبژاردنی هونەرمەند دەگەڕێنەوە و لە لایەن کەتوارێك لە جیهانی دەرەوەی بەرهەم، ناسەپێنرێن. ئەم دەستەبژێرکردنە کە یاسا و بەردەوامیی تایبەت بە خۆی هەیە، لەگەلّ یاسای کاروباری لواو و نەلواو لە ژیانی" راستەقینە" جیاوازیی هەیە و وردبوونەوە لێی بەسە تا هەر ملکەچێکی ئۆرتۆدۆکسی ریالیست و بۆ نموونە نوسەرانێك وەکو ئیمیل زۆلای( ناتۆرالیست)یش هیوابڕاو بکات. شیمانکراو نیشاندانی ڕووداوەکان،کردەکان و کەسیەتییەکان کە رۆماننوسانی گەورەی سەدەی هەژدەهەم کە گوایە لەبەر وارسکەی ئەدەبیی خۆیان لەگەلّی بەباشی ئاشنابوون، هەمانە کە لەچاوی ناتۆرالیستەکان لە دوایین دەیەکانی سەدەی نۆزدەهەم داپۆشرا. بە بۆچوونی ئەوان تەنیا ئەو شتەی لە دنیای دەرەکی نەلواو دەزانرێت دەیتوانی بێتە نێو رۆمانەوە. ریشەی ئەم باوەڕە بۆ دەسپێکی سەدەی نۆزدە دەگەڕێتەوە. لەو رۆژانەدا نوسەرانێك دەستیان بە پەسنی" کۆپی هەلّگرتنەوە" لە ژیان کردبوو و هەر بۆ نموونە سێر والّتێر سکات لەتاوتوێی رۆمانی **ئێما** بەرهەمی جین ئاستین دەینوسی:" لە رابردو دا ئەوە لە

(6) .I.Watt, the rise of novel , London, 1974, pp.292-293

رۆماننوس چاوەڕوان دەکرا کە کت ومت لە چوارچێوەیەك کە لەنێوان دوو بازنەی هاوچەقی شیمان و ئەگەردایە ببزوێ و لە بەرئەوەی کە ئەو ئیزنی پێنەدرابوو پێلەم کەوشەنەی ئەگەر بهاوێتە دەرێ، بەناچار بەرینایی گێڕانەوەی خۆی بۆ قەرەبووی ئەم سنوردارییە هەمیشە بەرەولای سنورەکانی شیمان تەشەنە دەدا".(۷) ئەو ئەوەشی گوت کە رۆماننوسی نوێ لەم سنوردارییە تێپەڕ دەبێ و مێتۆدی" کۆپی هەڵگرتنەوە لە ژیانی راستەقینە" هەڵدەبژێرێ و ئیدی خۆی خەریکی ئەفراندنی هەژیانگەلی درۆیینە کە بە ڕای خوێنەر شیمانکراون، ناکا:" شتێك کە لەم شێوازە تازەدا جێنشینی ئەم جۆرە هەژیانانە دەبێ ـ کە بە هەرحاڵ بەشێکی گەورە لە دڵگیری و کارایی خۆیان لە رێڕەوی بەکارهێنانی پەیتاپەیتا و لەئەژمارنەهاتویان لەکیس داوەـ هەر وەك دیارە وێنەگرتنی دروست لە سروشت و نیگارکردنی کت ومت بەهەمان شێوەیە کە لە گۆڕەپانی ژیانی ئاساییدا بەڕاستی بوونی هەیە،هەموو ئەمانەش بەهەمان شێوەیە کە تا لە جێی خستنەڕووی دیمەنە شکۆمەندەکانی لە جیهانێکی خەیاڵکردی، سیمایەکی دروست وەلێ دڵکێش و دڵپەسند لەوەی رۆژانە لە دەوربەری خوێنەردا ڕوو دەدەن بیخەنە بەردەستی".(۸)

لە وەرگێڕانی فارسیی هەمدیس وێژییەك کە لە سێر والتێر ئێسکات هێنامەوە، (پاچەڤەیەکی ئێجگار متمانەدارە) هەڵەیەکی بچوك هەیە. نووسەر لە" هونەری کۆپیکردن لە سروشت"یاthe art of copying from nat ure دواوە، نەك" وێنەگرتنی دروست لە سروشت". لە ساڵی ١٨١٥کە سێر والتێر ئێسکات وتارەکەی خۆی نووسی، هێشتا کامێرای وێنەگرتن دانەهێنرابوو و لە دەقگەلی ئەدەبی و رەخنەگرانە و تیۆریك زاراوەکانی وێنەگرتن بەکار نەدەبران. ئەوەی نووسەر ناوی لێ هێناوە بە کەڵك وەرگرتن لە وشەی" هونەر" مەبەستەکەی باشتر دەزانرێت، شێوازی باوی نیگارکێشان واتە هاوشێوەکێشانەوەبوو کە ئێمە لە فارسیی ئەمڕۆدا جاروبار "کۆپیکردن"ی پێدەڵێین.دەبێ لەسەر هەرەپێویستیی پاچەڤەی دروستی بەکارهێنانی زاراوەکانی هونەرگەلی شێوەکاری لەباسەئەدەبی و تیۆریکییەکان جەخت بکەیت، چونکە رۆشنگەری ئاسۆی بیری هزرڤانی ئەو رۆژگارە لەمەڕ مەسەلەی گرنگی لاسایی

(7) .M.Allott ed, novel lists on the novel, London, 1975, p.63

م.آلوت، رمان **به روایت رمان نویسان**، ترجمەی ع.م. حق شناس، تهران، ١٣٦٨، ص٩٥.

(٨) **پیشین**، ص ١٠٠.(ibid.p.65)



لە کەتوارە. بەسەرنجدان لە دەقی سێر والتێر ئێسکات دەبینین کە ئەو لەسەر هەرەپێویستیی لاسایی لە رووداوەکانی ژیانی رۆژانە، لەو شتەی کە خۆی بە رۆمانی تازە ناوی لێناوە، پێداگری دەکا... بەڵام لەمبارەوە تا چ ئاستێك راستیەکە بە لای ئەودا دەشکێتەوە؟ لە کوێوە بزانین کە ڕووداوگەلی بەڕواڵەت سواوی ژیانی رۆژانەی کەسێك لە دیدی کەسێکی دیکەوە هەرامەیەکی شیمان نەکراو نەبێ؟ یا بە پێچەوانەوە، چۆن دەتوانی دڵنیا بیت کە ئەوەی کە کەسێك بە نەلواوی نازانێ لە دیدی کەسێکی دیکەوە هەرامەیەکی شیماننەکراو نەبێ؟ خۆ دەشێ خاڵگەلێ لەیەك رۆماندا کە لەدیدی رووناکبیرێکی پاریسی یا نیۆیۆرکی ئاشکرا و تەنانەت سواو بن، بۆ خوێنەرانێك کە لە پانتاییەکی فەرهەنگیی دیکەدا دەژین و خوێنەرانی نەوەکانی دواتر، بە بارتەقای رووداوەکانی چیرۆکێکی خەیاڵی ـ زانستی بە لامانە سەمەرە خولقێن بێت. برێك لە هەمبەرێتیگەلی رەوشتی، کردەکان و گوتەکانی کەسیەتییەکان لە( رۆمانی)**ئێما**دا لە دیدی هاوچەرخەکانی جێن ئاستین" ئاسایی" بوو، بەڵام ئەمڕۆ لە دیدی خوێنەرانی ئەوروپاییەوە نە باوە و نە جێی پەسند. لە راستیدا دەبێ دان بەوە دابنێین کە ئەمە وەسفکردنی وردی رووداوەکانی ژیانی رۆژانە لە( رۆمانی) ئێما یا( رۆمانی) **تامساری*** و **پێشداوەری** نیە کە ئێمە بەرەو ئەم رۆمانانە رکێش دەکەن، بەڵکو بەپێچەوانەوە کت ومت هەمان لایەنی نامۆی پێوەندییەکان، رووداوەکان، کردەکان و ویستەکانە کە بۆ خوێنەری ئەمڕۆیی دڵکێشە.

لە لایەکی دیکەوە نەخشە و لە قەرەدانی کۆپیکردنی ژیانی راستەقینە لە بەرهەمی هونەریدا کارێکی نەلواو و ئایدیالیـیە، چونکە بەهەرحاڵ مەودای تان و پۆ، ریتمی رووداوەکان و جۆری بەرودواییەکانی هەڵبژاردەی نووسەر، لەگەڵ ریتمی پەیتا پەیتای" رووداوە راستەقینەکان" هێندە زۆرە کە هەدای بەرەڤانانی تیۆریی کۆپی هەڵگرتنەوە نادا تا داکۆکی لە کارو باوەڕەکانیان بکەن. هەر تان و پۆیەك بەناچار جەختێکە لەسەر ساتەهەڵبژێردراوەکان و لە بەرەنجامدا لەگەڵ رێچکەی دووپانە و کەمتەرخەمی" ژیانی راستەقینە" جیاوازە. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، نامەوێ گوتەی سێر والتێر ئێسکات یەکسەر بێبایەخ بناسێنم، چونکە لەودا هەقیقەتێك وەشێراوە. ئەوەی لە هونەرگەلی گێڕانەوەییدا بەردەوام گرنگیی زۆری هەبووە، راستەقینە نواندنی رووداوەکان، کردەکان و کەسیەتییەکان لەچاوی بەرامبەرانێکەوەیە

* غرور

که بەزۆری لە بنەواشەکانی وەکو" راستنوێنی"ی بەرهەم و" هاوخود گریمانکردنی خۆ لەگەڵ کەسیەتیی گێڕانەوە" دەست پێدەکا. هەربۆیە، رۆماننوسی کلاسیك بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی کە ئامۆژگاریی ئەرەستۆ لەمەڕ شیمانکراونواندنی هەمووتوخمەکان بنوێنێ. ساموئێل ریچاردسۆن لە ساڵی ١٧٤٧ ڕای گەیاندبوو کە "شیمانی روودان" کلیلی سەرەکی‌یە لەکاری دژواری نوسەری. ئەو جەختی دەکرد کە نووسەر دەبێ کارێك بکا کە خوێنەر گۆڕانکارییەکان پەسند بکا و شیمانی رووداوەکانیان بەرتەك بداتەوە. ناکرێ پیاوێکی ژنباز لەناکاو لەبەر هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکی داوێنپاك پاك و بێگەرد بێتەوە. گۆڕانی کەسێتیی ئەو دەبێ بکەوێتە بەر پەسندی خوێنەرـ بیسەر. [٩]

لێرەدا نووسەرێك کە سەرەمرە لەگەڵ کەڵکەڵەی کەتوار بەرەڕوو بووە، خۆی لە بەرامبەر توخمی" رێکەوت" دەبینێتەوە. رێکەوت، گۆڕانی لەناکاو و پێشبینی نەکراو لە رەوتی کاروبارەکاندا، یەکیك لە توخمەکانی ژیانی راستەقینەیە. بەڵام، ئاسان نایەتە بەرچاو بتوانی لە بەرهەمی گێڕانەوەیی جێی بکەیتەوە. گی دی موپاسان دەنوسێ:" ژمارەی خەڵکانێك کە رۆژانە لەم جیهانەدا بە رێکەوت گیانی خۆیان لە دەست دەدەن ئێجگار بەرچاوە. وەلێ ئایا ئێمە دەتوانین ئیزن بدەین لە نیوەرێگەی چیرۆکەکەدا پاتۆرەخشتێك وەبەرسەری قارەمانی سەرەکی بکەوێت؟ یا خۆ دەتوانین بیکەینە ژێر چەرخەکانی قەتارێکەوە تەنیا بەم بیانوە کە مافی دەورێك کە هۆکاری رێکەوت لە ژیاندا دەیگێڕێ، دەبێ بدەین؟". [١٠] زۆر پێش لە گی دی موپاسان کە بە هێماکردن بە هەڵبژاردنی نووسەر دەیهەویست لە دژی دۆگمای هەقیقەتی پەتی بەرەنگاری بکات، ریالیستی گەورەی بریتانیا چارلز دیکنز لەمەڕ کوژرانی خاتوو دیڤارژ لە رۆمانی **چیرۆکی دووشار** ی خۆیدا هەوڵیدابوو تا پێگەی هۆکاری رێکەوت و رووداو دیاری بکات. نووسەری یەکەمین ژیاننامەی تێروتەسەلی دیکنز، واتە جان فۆرستر لە بەرگی سێهەمی پەرتووکەکە لە زاری ئەوەوە دەگێڕیتەوە کە دەبێ هۆکاری روودان هەرکات لە حەز و ئارەزوەکان و کردەوەکانی کەسیەتیی چیرۆك لێك دانەبڕاو نەبێ و لەگەڵ تان و پۆی چیرۆك سەداسەد یەکانگیر بێت، یا لە جەرگەی کردارێك لە لایەن قارەمانەوە ئاخێز بکات کە هاتنە

(٩) پیشین، ص٩٢( ibid, p.61 )

(١٠) پیشین، ص ١١١( ibid, p.71 )



دیی بە فرمانی رەوتی هەمەکیی چیرۆك ناچارانە بێت، لە چیرۆکدا بێنینە گۆڕێ. [١١] لێرەدا پرسیارێکی گرنگ دێتە پێشێ: مەگەر دەکرێ گریمان بکەیت کە ڕووداو لە حەزەکان و کارەکانی کەسیەتییەکان لێك دابڕاو بێت؟ مەگەر زۆرێك لە رووداوگەلی رۆمانەکان کە نووسەر هەڵیان دەبژێرێ، بەڕاستی بە مانای رووداوگەلێ لە ژیانی کەسیەتییەکانی رۆمان نین؟ رۆمان سەرەمرەیی رووداوەکانە، بەڵام رووداوەکانی هەڵبژێردراوی نووسەر. کاتێك شازادە ئاندری لە **شەڕ** و **ئاشتی** بەڕێکەوت ورتەورتەکانی ناتاشا دەبیسێ، کاتێك ئیلزابێت لە **تامساری** و **پێشداوەری** دا بەڕێکەوت لەگەڵ دارسی لە کۆشکی بنەماڵەیی ئەو دیدار دەکات، رێگەیەك بۆ ئێمە جگە داننان بەم خاڵە نامێنێتەوە کە باڵادەستیی هەر نووسەرێك زاڵبوونی ئەو بەسەر رێچکەی رووداوەکان و پێشهاتەکانە و هۆیەکی نیە کە ئەم ئازادیی‌یە بکاتە قوربانیی یاسای سەرسەخت و تەنانەت گەمژانەی ژیانی راستەقینە لە جیهانی دەرەکیدا. هەر بۆیە دیکنزیش بە هەمان گوڕوتینی گی دی موپاسان کە کەمێك کەمتر لە چڵ ساڵ لە پاش ئەو لەگەڵ" هەقیقەتی ژیان" جەنگا بوو، بۆ جان فورستر نووسیبووی:" لام وایە بەس نیە لەبارەی هەر وەسفکردنێکەوە بڵێین هەقیقەتی پەتی‌یە. هەقیقەتی پەتی هەڵبەت دەبێ لە وەسفکردندا هەبێ بەڵام رازی دەسەر(امتیاز) یا رازی هونەری داڕێژەری چیرۆك لە شێوەی دەربڕینی هەقیقەتدایە". [١٢] رۆماننوسی گەورە چەندقات زیاتر لە لایەنگرانی ریالیستی خۆی درکی بە گرنگیی شێواز یا شێوەی دەربڕین کردبوو. میس هابیشام چەندقات زیاتر زادەی شێوازە و وێنەیەك لە خاتوونێکی بەساڵاچوو لە دنیای دەرەوەی **رۆمانی ئارەزوەگەورەکان** نیە.ناتۆرالیستەکان جگە بە چەواشەکردنی هونەری دیکنز، گوگول و باڵزاك نەیاندەتوانی بۆ خۆیان نەریتێك بڕەخسێنن.

کاتێك یەکەمین رۆماننوسانی گەورەی بریتانیایی وەکو ریچاردسۆن، دفو و فیلدینگ خۆیان وەفادار بە کەتوار ناو دەنا، ئەمەشیان دەزانی و بەڕاشکاوی رایان دەگەیاند کە راستنوێنیی بەرهەم بەروبوومی پێش ـ گریمانگەرییەکان یا چەند رێکەوتنێکە لەنێوان بەرامبەران(خوێنەر ـ بیسەر)یش. رۆمان باس وخواسێکی تەواو و رەسەن لە ئەزموونە مرۆییەکانە، بەڵام نەك لەبەر ئەوەی کە دەتوانێ بە تەواوی دانەدوی کەتوار بێت، بەڵکو

(١١) پیشین، ص١٠٢.( ibid, p.66 )

(١٢) **پیشین** ، صص ١٠٢-١٠٣ ( ibid, p.66 )

لەبەرئەوەی کە هەمان ڕێکەوتنگەلێ دەکاتە سەرباشقەی کاری خۆی کە ئەزموونە مرۆییەکان لە سەر بنچینەیان ڕاڤە بکرێن و بناسرێن. ریالیزمی وێناگەر،بەگوتەی یان وات، وەکو ڕێساکانی گەواهیدەر و بەڵگە هێنانەوە، لەسەر بنەمای ڕێککەوتن و باوەڕە هاوبەشەکان بنیات نراوە و ڕۆشن نیە کە بۆچی دەبێ باس و خواسی هەمبەرێتیەکانی ژیان کە لەسەر بنەمای ئەو ڕێککەوتنگەلی جیاواز کار دەکەن.[١٣]

ئێمە دەبێ حسێبی نووسەرانێکی گەورە کە بە کەتوار لە هونەردا وەفادار مانەوە بەڵام خۆیان بە دانەدوکردنی ڕەهای نەدەزانی، لەو ریالیست و ناتۆرالیستانەی کە گوێ لەمستی کەتوار بوون جیابکەینەوە. تاقمی یەکەم، لە کەتوار لە هەمان ئاستی هێنانە پێشی کاروباری شیمانکراو تێدەهزرین و چاك دەیانزانی کە" کۆپی کردنی سروشت و ژیان" پولێکی قەڵب ناهێنێ، مەگەر ئەوەی کە هەمدیسخوڵقێنی تێدا بکرێ و خدەی داهێنەرانەی بدرێتێ، واتە لەسەر هەڵبژاردنی هونەری ڕۆبنرێ و بەمانای ئەفراندنی جیهان بەرهەم بێت. لە یادمان نەچێ کە ئەوان لە هەر دەرفەتێك کەڵکیان وەردەگرت تا لەسەر شێواز و شێوەی دەربڕین وەکو گرنگترین مەسەلەی نووسەرێتی جەخت بکەن. تاقمی دووەم واتە ئەو ریالیستە گڕ بەربوانەی کە کاری خۆیان لەگەڵ زانایانی زانستە سروشتی و فیزیکییەکان بەراورد دەکرد و نۆڕینی زانستییان لە خەیاڵگەریی هونەرمەند سەرتر دەزانی، پەیتاپەیتا دەیانویست لە سروشت، ژیان و کەتوار کۆپی بەرهەڤ بکەن. لە نێوان دیکنز، باڵزاك، گوگول، تۆلستۆی، ئاستین و نووسەرانێکی دیکە کە باشتر لە هەرکەسێك لە گرنگیی دەوری خەیاڵگەریی هونەری ئاگادار بوون و خۆیان بە هەمدیسخوڵقێنی بژێرگەر ناو دەنا، لەگەڵ نووسەر ـ زانایەك کە ئارمانجی ناتۆرالیستەکان و ریالیستەتوندئاژۆکان بوو، درزێکی بێبگار هەیە. تاقمی یەکەم بە کەتوارگەراکان یا" کەتوارنۆڕەکان" یا" کەتوار هزریوان" ناودێر دەکەین و هزری ئەوان لە "کەتوار" بە ڕێخۆشکەر دەزانین، لەحاڵێکدا تاقمی دووەم بە دانەدوگەران و راستیدا قوربانییانی ئایدیالی راڤەی تاك واتایی خۆیان دەزانین.

کەتوارگەرایی تا ئەو جێیەی کە تێهزرین لە هەرامەی راستەقینەی پیشنیار دەکرد پێشڕەو بوو، لە جێگەیەکدا کە ڕێسایەکی لە بەرانبەر" پێشەنگیی زادەکانی خەیاڵ" کە بەهەڵە تەنیا بە بنەواشەی ڕۆمانتیزم دەیزانی، دانا، و سەرتر بوون و دەسەری هەرامەی راستەقینەی لە

(13) . Watt, op. cit, p.35.



بەرانبەر خەیاڵ و شیوازی هونەری هێنایە پێشێ، بوو بە کۆنزێرڤات و ئیدئۆلۆژیك. ریالیستەکان کە" کاروباری راستەقینە"یان زەق دەکردەوە کە بە مەبەستی وردبینکردنی واتای جێی مەبەستی خۆیان، کەتوارگەلی کۆمەڵایەتی و مێژوویی زەق بکەنەوە و کت ومت لێرەوە لەگەڵ راڤەگەلی هەمەچەشن و تەنانەت جاروبار دژبەر لە کەتوار بەرەوڕوو بوون و تەنیا توانییان یەکێك لە راڤەکان واتە راڤەیەك کە جێی پەسندی خۆیان بوو، فەرمی و " راستەقینە" بنوێنن. ئەمە بە نرخی نکۆڵیی فرەفاقێتیی هەرامەی هەبوو و هەنوکەیی ڕووی دا.

ریالیستەکان هەرگیز بە ناسینی پەتیی ئایدیالیی خۆیان نەگەیشتن، بەڵکو راڤەکانیان بەردەوام پشت ئەستور بە بژیوانیی پێش ـ زانراوەکان و لە ڕاستیدا داخوازەکانیان بوو. شتێك کە بەردەوام سڵیان لێ دەکردەوە واتە " ناسینی بەبژیوان"بووبە ملۆزمیان و تەنیا توانییان نکۆڵی لە"کەتوار"ەکەی بکەن. جان تاگ کە لەمەڕ وێنەگرتن(فۆتۆگۆاف)ەوە دەنوسێ، هەمان هونەر کە ریالیستەکان و ناتۆرالیستەکان لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە بە پشت بەستن بەوە بەڵگەیان لێ دەهێنایەوە، لە پەرتوکی **قورسایی هەمدیس نوێنی** وەبیر دەخاتەوە کە" ریالیزم ئەدگاری زاڵی ئاماژە لە جڤاکی بۆرژوازییە".[١٤] ئەمە کە شتێك هێندە لە کەتواری جێی پەسندی من نزیك بێتەوە کە سەرەنجام لەودا بتوێتەوە و لەوە بەدواوە ئیدی هیچ شتێك ڕۆشن نەبێت کەلە بنەچەدا چی بووە، ئارەزوی هەمدیس نوێنیی ریالیستی‌یە و لە گەوهەری خۆیدا دەربڕینی ئارەزویەکی گرنگترە: ئەوەی دەمێنێتەوە لێبڕاوێتی باوەڕ یا راڤەی من لە کەتوار بێ و بەس.

هەڵبژاردنی ڕووداوەکان و ڕێکەوتەکان، دۆزینەوەی لۆژیکی فرەفاقانەی پێشهاتەکان و نکۆڵیی هۆی تاقانەیان، زەقکردنەوەی بڕێك لە چرکەساتگەلی گێڕانەوەیی و وردەکارییەکان و وێڵ کردنی کەڵەکەیەك لە ڕووداوەکان و وردەکارییەکانی دیکە بەر لە هەر شتێك زادەی شێواز و مێتۆدی دەربڕینی نووسەرن. نووسەر چەندقات زیاتر لەوەی دەروەست بە پەیڕەوی لە لۆژیکی جیهانی راستەقینە یا دنیای دەرەکی بێت، ناچارە پەیڕەوی لە پێوەرەکانی شیوازی خۆی بکات و ئەوەی کە لیۆئێسپیتزر بە" یەکێك لە دەروەستییەکانی شێواز" ناودێری دەکرد هۆی سەرەکیی لەوەدایە کە ئەو وەدوی ئەفراندنی لۆژیکێکی تازەی شیاوی چیرۆکێك کە دەیگێڕیتەوە، بکەوێ.[١٥] خەیاڵسازیی نووسەر کە بە نۆرەی خۆی بەر لە هەر شتێك لە شێواز

(14) . J.Tagg. the burden of representantion , London , 1988.
(15) .L.Spitzer, etudes de style , trans. E.kaufholz, A.Coulon M.Foucalt , paris , 1985, pp.53-54.

و میتۆدی دەربڕینی ئەودا دەرکەوتدار دەبێت، گەورەترین چەکی ئەو و گرنگترین ئەدگاری دەسەر و قانی کاری ئەو لەگەڵ هاوکارەکانی دیکەی دێتەئەژمار. دستۆفسکی لە نامەیەکدا بۆ نیکولای ستراچۆف لە **٢٦**فێوریەی **١٨٦٩** هەر ئەم توخمەی زەق کردۆتەوە و نووسیویەتی کە خەڵك بێ هیچ بەڵگەیەکی قایلکەر خەیاڵسازی بە هەرامەیەکی بێ بایەخ و سواو لە ئەفراندنی هونەریدا دەزانن و بە سوکایەتییەوە لێی دەدوێن، ئەمە لە کاتێکدایە کە دەبێ ئەوە لە" بێ بگارترین بەش لە گەوهەری هەقیقەتدا" لە قەڵەم بدەیت.[١٦] ئەو نووسیویەتی کە نۆڕینی وشك و بێ بەری ڕووداوەکانی ژیانی ڕۆژانە نابێ بە کەتوار گەرایی بزانی و ئەمە لە ڕاستیدا کت ومت بە پێچەوانەی کەتوارگەرایيە. هۆگریی دستۆفسکی بەراپۆرتەکانی ڕۆژنامەکان لە ڕووداوە نائاسایی و ناباوەکان لە ژیانی شاری و بە تایبەتی لە تاوانەکان و ئەمە کە وەها ڕاپۆرتگەلێکی بە" ریالیستی" ناو دەنا و لەو باوەڕەدا بوو کە ڕۆماننووسی ئەمڕۆ دەبێ کاری خۆی لەوانەوە دەست پێبکاو بە خێرایی، بە یاریدەی خەیاڵگەری و شێواز لەوانەوە بانتر بچێ، نیشان دەدا کە "کەتوار"ی بە شوێندەسپێکی بزاوتی نووسەر دەزانی، نەك ئامانج. هەر بەو جۆرەی کەفلۆبێریش لە نامەیەکی بەناوبانگدا کە بۆ ئیڤان تۆرگنیۆف نووسی کەتواری تەنیا" تەختەی چراویلە"* ناو لێنا، ئامرازێك کە لەوەوە بۆ پێشەوە بازدەدەین.[١٧] کردەی بازدان و چراویلە، کردەی خەیاڵی نووسەرە، کەتوار وەپشت سەردەنێ. بە گوتەی گی دی موپاسان کەتوارگەرایی دەبێ بتوانێ ڕەژیدەی خەیاڵ بێت. موپاسان بە میتافۆرێك کە ئیدی نەك لە کۆپیکردن لە نیگارکێشان، بەڵکو لە وێنەگری قەرزی کردوە، دەنووسێ:" ریالیست ئەگەر هونەرمەند بێت، هەوڵ نادات وێنەیەکی هەرزە بە ئێمە نیشان بدات، بەڵکو تێدەکۆشێ تا وەها بەرجەوەنێك لەو بخاتە بەردەستمان کە پڕبارتر، زیندوتر و چەندقات ڕاستەقینەتر لە خودی کەتوار بێت".[١٨]

---

(١٦). الوت ، پیشین، ص ١٠٥.( Allott, op.cit, p.68 )

* تەختەیەك کە لەوێوە مەلەوان خۆهەڵدداتە نێو ئاو.ز.هەورامی،(تختەی شیرجە.ف)(و)

(١٧) پیشین، ص ١٠٥.( Allot, op.cit, p.68 )

(١٨) پاچەڤەی ئەم ڕێکەوەندە لە نووسەری ئەم وتارەیە(ب. ئەحمەدی) (Allot, op.cit.p.71). دەتوانین وەرگێرانێکی دیکەی ئەم ڕێکەوەندە بە فارسی لە: الوت، پیشین، ص١١٠ پەیدا بکەن.



## (٣)

یەکەمین هەوڵەکان بۆ گەڵاڵەی" ڕێباز"ێکی هونەریی تازە کە کەتوار شوێندەسپێکی سەرەکیی کاری هونەرمەند بناسێنێ، لە دەیەیەکدا دەستی پێکرد کە تێکۆشان بۆ داهێنانی وێنەگەریش پەیوەست بوو بەو سەردەمەوە. دەڵێن کە یەکەمین جار لە ساڵی **١٨٣٣** ڕەخنەگری فەرەنسی گۆستاڤ پلانشە" ریالیزم" ی بە ناونیشانی بنەواشەی دەربڕینی هونەری بەکارهێنا.[١٩] ئەو دەیهەویست لە هونەرێك بدوێ کە منەتباری خەیاڵگەریی هونەرمەند" و تەنانەت وزەی لۆژیك و بەڵگەهێنانەوەی ئەو" نەبێت، بەڵکو بەر لە هەر شتێك و زیاتر لە هەر شتێك پشت ئەستور بە نۆڕینی وردو کت و مت و وردبینانەی کەتوار بێ.[٢٠] دەربڕینی پلانشە ئێجگار لە تێگەیشتن و دەربڕینی زانست باوەڕانەی نیگارکێشی بریتانی جان کانستبل نزیك بوو، هەرچەند ئەو هێشتا لە وشەی ریالیزم کەڵکی وەرنەگرتبوو. لە دوو دەیەی دواتردا، لە فەرەنسادا بەکارهێنانی ئەم وشەیە زیاتر بە مەبەستی سوکایەتی و بەرتەکدانەوەی بوو . لە ساڵی **١٨٥٧** ژول فلۆری ناسراو بە شانفلۆری نووسەرێك کە لە سەردەمی خۆیدا ناوبانگی هەبوو، وەلێ ئەمڕۆ فەرامۆش کراوە، داکۆکی لە ریالیزم کرد و وەبیری هێنایەوە کە دەبێ لە ڕەنگ و بۆ سیاسییەکان کە لەبەر شۆڕسی **١٨٤٨** لە قەڵافەتی دراون پاك بکەینەوە و بە وردبوونەوە و بێگەردیی هونەری بەکاری ببەین. لە ڕاستیدا یەکەمین ڕۆمانی ئەو بە ناوی **پێشهاتەکانی ژیانی مادموازێل ماریت** کە لە ساڵی **١٨٤٧** بڵاوکرابوویەوە، یەکێك لە یەکەمین ڕۆمانە ریالیستییەکان دێتە ئەژمار. لە هەمان سەردەمدا لە بریتانیا هەندێ ڕۆمان لەبارەی چینی کرێکار دەنووسران کە وێنەیەکی کەتوارگەرایانە لە ژیانی پیشەسازیی مودێرنیان دەخستەڕوو. ئەم نووسینانە لە هەمان ڕۆژگاردا بە" ڕۆمانە پیشەسازییەکان" ناویان دەکردبوو. یەکێك لە یەکەمین نموونەکانی ئەم ڕۆمانانە **مانگرتنی مەنچستر** لە نووسینی هاریت مارتینۆیە کە لە ساڵی **١٨٣٢** بڵاوکرابوویە. **مێری بێرتون** لە نووسینی

---

(١٩) بێرنارد واینبێرگ " یەکەمین جار" بە ساڵی ١٨٣٥ دەزانێ، کە نووسەرانێك " هەقیقەتی مرۆیی" کارەکانی رامبراندیان لە بەرانبەر" ئایدیالەکانی شاعیرانە" ی خوازیاری کلاسکی تازە ڕێزبەند کردبوو:
B.Weinberg, French realism: the critical reaction 1830-1870, London p.114.

(20) E,souriav ed, vocabulaire d esthetique, paris, 1990,p.1203.

گسکل(١٨٤٨)و **ڕۆژگاری سەخت** لە نووسینی دیکنز( ١٨٥٤) نموونەکانی بە ناوبانگتری ئەم ژانرە دێنە ئەژمار.[٢١]

لە قەڵەمڕەوی هونەرگەلی شێوەکاری، لەساڵی ١٨٥٥ کوربە"ڕاگەیەندڕاوی ریالیزم"یبڵاوکردەوە،ئەم" ڕاگەیەندراو"ە نامیلکەیەك بوو هاوپێچ لەگەڵ پیشانگای دوایین بەرهەمەکانی لە کۆخێکی داریندا. کوربە نووسی کە ناونیشانی ریالیست کالآ پڕ بە باڵای هونەرمەندی ئەمڕۆیە و ناونیشانی ڕۆمانتیك بە باڵای باپیرەگەورەی ئەم هونەرمەندە بڕاوە، ئەگەر هونەرمەند بایە. پێناسەی کوربە لە هونەری جێی مەبەستی خۆی سادە و سەرەتایی بوو: ریالیزم واتە نۆڕین و دەربڕینی کەتوار، کە دەکەوێتە باشاری خەیاڵگەری و مێتۆدە ڕێککەوتەییەکانەوە.هونەرمەند دەبێ ئاگای لە پەڕانپەڕی کۆمەڵایەتیی خۆی( و بارودۆخی ژیانی هەژارانی کۆمەڵگە،سەرکوت کراوان،پرۆلێتاریا)بێ وتێبکۆشێ تا" هونەرێکی زیندو" بخولقێنێ. چەمککگەلی زیندو و ژیان لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە ڕۆڵێکی گرنگیان لە باسەکانی جوانیناسانەی ریالیستەکان گێڕا. تەنانەت، کاتێك کلۆد مۆنەی لاو ڕایدەگەیاند کە دەبێ سروشتی زیندو نیگار بکەین و "ئیدی بەسە! زۆر خۆمان بە سروشتی بێ گیانەوە خەریك کرد" پەلاماری شتێکی زیاتر لە میتافۆرێکی بەناوبانگی نیگارکێشان دەدا و بە هێنانە پێشی چەمکی" زیندو" نیشانی دا کە چەکی خۆی لە جبەخانەی ریالیستەکانەوە هەڵگرتوە. بەڵام هەر ئەم چەمککگەلی زیندو و سروشتی کە کوربە و دومیە و کەمێك درنگتر زۆلا دەیان پەرست، ئەوەندە جێگەی چۆن و چەند و چوونیان دەهێشتەوە کە ئیمپرسیۆنیستەکان و پۆست ئیمپرسیۆنیستەکان بتوانن بەناوی ئەم چەمکانەوە هونەری ریالیستی وەلابنێن. هەڵبەت ئەوان بەردەوام خۆیان بە پاشباری نەریتێك دەزانی کە (نیگارکێش)ی لە زیندانی ئاتلیەی* خۆی ئازاد کرد. ناردیە نێو خەڵك و سروشتەوە، بەڵام هەڵێنجانیان لە کەتوار، لەگەڵ هەڵێنجانی ریالیستەکان کە لە نیگارکردنی کەسان و دیمەنەکاندا خۆیان وەفادار بە زۆرێك لە نەریتەکانی نیگارکێشانی کلاسیك نیشان دەدا، ئاسمان و ڕێسمان بوو. دەم و چاوی ژێن ئاوریل کە لوترك نیگاری کردوە، کاتێك تەنیا، بەدبەخت و بە ئاشکرا هەڵوەدا لە" شوێنی کارەکەی" بەرەو

(٢١) لەمبارەوە بڕواننە ئەم" ژانر"ە و پێوەندیی لەگەڵ ریالیزم لە:

P.J.Keating, the working class Victorian fiction, London, 1971.

* ناوی زیندانێکی خوازەییە.(و)



"ماڵ"ەوە دەڕواتەوە، ڕاستەقینەترە لە تێکڕای وێنەکانی ژیانی شارێك کە ریالیستەکان نیگاریان دەکێشا. لێرەدا لە گەڕەکە بەدناوەکان، لە شادییەکانی شەوانە و لە ژیانی وارسکەیی و لە هەمان کاتدا سەرکوتکراوی پاریس، دەکرا مرۆڤی مودێڕن و دەرد و بەڵای مودێڕنیتە بەئاشکرا ببینی. ڕازی سەرکەوتنی نیگارکێشەکانی وەکو لوترك و سێزان لەوەدا بوو کە هەلی سەرهەڵدانی وزەی خەیاڵگەریی خۆیان دەڕەخساند. پابلۆ پیکاسۆ، کاتێك کە دەیگوت کە نیگارکێش دەبێ لەوەی لێی تێدەهزرێ نیگارکێشی بکات و نەك لەوەی دەیبینێ، سەرنجی لەم پێشەنگانە دابوو.

ئەگەر لە هونەرمەند وزەی خەیاڵپەروەری و هەڵبژاردن بستێیننەوە، چی لێ دەمێنێتەوە؟ هیچ شتێك، مەگەر وێنەیەك لە زانایەك لە فەلسەفەی زانستی پۆزەتیڤیستی و چەقبەستوی سەدەی نۆزدەهەم نیگار دەکرا. وێنەیەك کە هەڵبەت فەلسەفەی زانستی ئەمڕۆش بە بێ بایەخ دەیناسێنێ. لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە، بیردۆزەوانانی ریالیست کە زۆر لەوان کەتوارگەرایی (دیکنز و باڵزاك)یان کەم مشور دەناساند وکاری خۆیان وێنەگرتنی ورد و کت ومت لە کەتوارەکان دەزانی و بەس، لەسەر هاوشێوەیی مێتۆدی کاریان لەگەڵ زانایانی زانستە سروشتی و فیزیکییەکان جەختیان دەکرد. ئەوان لەسەربنەمای هەڵێنجانێکی ئێجگار سادەگەرایانە و پۆزەتیڤیستی کاری زانایانی زانستە سروشتی و فیزیکییەکان جەختیان دەکرد. ئەوان لە سەر بنەمای هەڵێنجانێکی ئێجگار سادەگەرایانە و پۆزەتیڤیستی کاری زانستمەند*یان نۆڕین و تاقیکاری دەزانی و دۆگمای ڕزگاربوون لە بایەخەکان و هەرەپێویستیی وەلانانی باوەڕەکان و دەست هەڵگرتن لە دەسەڵاتی خەیاڵگەری و هەڵبژاردنیان لە کاری ڕۆماننوسدا بە هەمان بارتەقای کاری ڕوەکناس یا فیزیکزان برەودار و متمانەدار دەزانی. پشت بەستنی ریالیزمی زێدەڕۆیانە و ناتۆرالیزم بە دەسکەوتە زانستییەکان کە سەدەی نۆزدەی وەها واق وڕماو کردبوو، بووە هۆی ئەوە کە زۆر لە ڕووناکبیران و هونەرمەندانی لاو، ڕوو لەم ڕێبازانە بکەن. لە لایەکی دیکەوە دژایەتیی ریالیستەکان لەگەڵ ڕۆمانتیزم کە ئیدی لەکارکەوتو و کۆنەپەرەستانە ببوو و ڕێنوێنی و شێوازە پێشنیارکراوەکانی کە چەقبەست و فرماندانی لە قاڵبدراوی لێ کەوتبوویەوە هۆیەکی دیکەی ئەم لێڕوانینە بوو. تەنانەت ئۆگۆست ئیستریندبێرگی لاو کە دوو ساڵ لە تەمەنی خۆی بۆ خوێندنەوەی زانستی کیمیا بە فیڕۆ دا بوو، لە دەسپێکی کاری نووسەریدا، خۆی لەگەڵ زانایانی زانستە سروشتییەکان بەراورد دەکرد، یا ئیبسێن بۆ ڕەخنەگرێك کە کاری ئەوی بە زانستی ناودێر

کردبوو، بە ئۆخژنەوە دەینوسی کە:" دواجار هەر نەوەیەك بە مۆری سەردەم لە سەر نێوچەوانی لە دایك دەبێ"[٢٢] ئەمە هەمان زانست باوەڕی بوو کە شۆڕشگێڕانی وەکو مارکس، پرودون و باکۆنینیشی شەیدای خۆی کردبوو و تەنانەت لە ساڵی ١٩٤٨ بێرنۆلێد برێخت (برێشت) دنە دەدا تا لە **ئەرغەنوونی بچوك** بۆ شانۆ لە حاڵێکدا کە هەروەها بە جەنگی خۆی لە دژی شانۆی ناتۆرالیستی درێژەی دەدا، بنووسێ کە شانۆ دەبێ لەگەڵ" سەردەمی زانستی پەتی" یەکانگیر ببێ و لە" سەرزەمینی نوێی زانست"دا بارگەی دابنێ.[٢٣]

کانستبل ی نیگارکێش کە لەو بەرجەوانەی کە دەیکێشانەوە، سۆنگەی راستنوێنی رەچاو دەکرد و بەردەوام ناوی لەریزی ریالیستەکاندا دەهێنین، لە ساڵی ١٨٣٦دا گوتبووی:" نیگارکێشان زانستە و دەبێ وەکو توێژینەوەیەك لە یاساکانی سروشت ئەژمار بکرێت. بۆچی ئێمە نابێ نیگارکێشانی بەرجەوەنەکان وەکو لقێك لە فەلسەفەی سروشت( = فیزیك)* نەزانین؟ بۆچی نەتوانین کەلەودا وێنەکان بە ئەزموونەکان ئەژمار نەکەین؟".[٢٤] لە هەمان رۆژگاردا کە کانستبل هونەرمەند-زانستمەندی** خۆی دەخولڤاند، زانست باوەڕی بوو بەسەمەدی سەرەکیی پەیدا بوون و سەرهەڵدانی وێنەگری.چەنددەیە دواتر، ئەم زانست باوەڕییە بە وەدواکەوتنێکی شیانی فامکردن هاتەنێو قەڵەمڕەوی ئەدەبیاتەوە. بەسترانەوەی وێنەگری بە تازەگەرییەکانی تێکنۆلۆژیك چەندقات زیاتر لە بەسترانەوەی ئەدەبیات بوو و هەربۆیە پەسنی ئاوەزی تکنیکی لە وێنەگریدا زووتر و بنەماییتر بیچمی گرت. لەنێو ئەدیب و وێژەوانانی ناتۆرالیست بەتامەزرۆیی زیاترەوە بە گریمانی لەرزۆکی بوونی هونەرمەند بە زانستمەند ڕووی خۆشیان نیشان دا. ئیمیل زۆلا رۆماننوسی بە زانایەك ناودێر کرد کە هەم نۆڕینگەر و هەم تاقیکارە. ئەو ڕایگەیاند کە لە رۆماندا دەبێ سەرەتا بەوردبوونەوە لە کەتوار بنۆڕیت و پاشان

(22) R.Gaskell, drama and reality: the European theatre since ibsen, London, 1972, p.17.

(٢٣) ب. برشت، درباره تئاتر، ترجمەی ف. بهزاد، تهران، ١٣٥٧، ص٣٣١و ٣٣٧.

** تێبینی لە نوسەرە.

***مامۆستا شوکور مستەفا ئەم وشەیەیلەبەرانبەر"عالم "ی عربی و"دانشمند"ی فارسی بەکار هێناوە،منیش لام وایە لەوشەی"زانا"شیاوترە.ژێدەر:ئەندێشە وهونەر لە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا(وەرگێڕ)

(24) P.Galassi, before photography, new York , museum of modern art, 1981. P.25.



سەرقاڵی تاقیکاریی ڕووداوەکان و کردارەکان بێت. ئەو کاری خۆیشی بە "ریالیزمی زانستی"ناودێر دەکرد: "تێکڕای کاری رۆماننوس لەوەدا کورت دەبێتەوە کە کەتوارگەلێ لە سروشت وەربگرێ و ئەوکات لەواندا دەستوەردان بکا، واتە بتوانێ سازوکاری ئەوانە بخاتە بەر خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە، بێ ئەوەی کە لە یاساکانی سروشت مەودا بگرێ و لێیان لابدات. بەری وەها نۆڕین و تاقیکردنەوەکان لە دوایین شڕۆڤەدا ئەوەیە کە تاکەکەس بە ناسینی مرۆیی، ئەوەش ناسینێکی زانستی لەو، چ لە ئاستی پێوەندیگەلی تاکەکەسی و چ بەکۆمەڵ دەستی ڕادەگات".[٢٦] زۆلا لە یاداشتێك لەبارەی شانۆنامەی **ترێز راکێن** کە لەسەر بنەمای یەکێك لە رۆمانەکانی خۆی نووسیبووی ڕایگەیاند: "ئیدی کاتی ئەوە هاتوە کە شانۆکانی کەتوار بێنینە سەرسەکۆ" و ڕاسپاردەی ئەوە بوو کە سەمەدی سەرەکیی کاری ئێمە دەبێ مێتۆدە زانستییەکان بێت. ئەو وەبیری هێنایەوە کە ناتۆرالیزم لەبەر ئەم مێتۆدانەیە کە دەتوانێ لەسەر رەخنەکاری و لەسەر مێژو و شوێندانەر بێت، چونکە کەتوار ژیانی مرۆڤ دەکات بە بابەتی توێژینەوەکانی خۆی.[٢٧]

ئەم زانستگەرایی و ماتریالیزمە چەقبەستوە بوو کە فلۆبێری تەنگەتاو کرد. لەمەڕ لایەنگرانی زۆلا و خۆی دەینووسی کە ئەم" هەرچی و پەرچی"یانە لە شێواز و خدەی شاعیرانەی رۆمان سەرەدەرە ناکەن و لەگەڵ گرنگیی هەڵبژاردنی هونەری ئاشنا نین. فلۆبێر خۆی کە لە دەسپێکی کارەکەیدا بەهەڵە پێیان دەوت ریالیست و لەم حاڵەش ئازاری دەچەشت (هەر بەو چەشنەی کە هێشتاش بەهەڵە شانۆی چیخۆف بە ناتۆرالیست ناودێر دەکەن)، جەختی دەکرد کە هونەر لەگەڵ نەسك هەڵگرتنەوە لە کەتوار ئاشتی ناکات. کاتێك کە هەندێ لە رەخنەگران **مادام بۆڤاری** یان هەمان شاکاری ریالیستی ناولێنا کە هونەر چاوەرێی دەکرد، فلوبێر نووسی کە لە ریالیزم ئێجگار دوورە." ئەوان لایان وایە کە شەیدای کەتوارم، لە حاڵێکدا کە من لێی بێزارم، من سەبارەت بە نەفرەت لە کەتوار بوو کە دەستم بە نووسینی ئەم پەرتوکە کرد".[٢٨] فلۆبێر لە ١٦ی ژانویەی ١٨٥٢ رێکەوەندێکی نووسی کە ئەمڕۆ ئێجگار ناوی دەرکردوە" ئەوەی من بە جوان دەیزانم، ئەوەی دڵم دەخوازێ ئەنجامی بدەم،

(٢٦) آلوت، پیشین، ص ١٠٧.(ALLOT, op.cit,pp.68-69)

(27) .E.Zola , “preface to therees requin” in:E.Bentley ed, from the modern repertoire, indanna university press , 1965 , pp.515-519

(28) .E.STARKIE, Flaubert , the marking of the master, London , 1967, p.313.

نووسینی پەرتوكێكە لەبارەی هیچ شتێك، پەرتوكێك بەبێ گەڕانەوە بۆ شتێك لە دەرەوەی خۆی، پەرتوكێك كە تا رادەیەك بابەتی نەبێ، یا لەودا تا رادەیەك بابەت لەبەر چاوان ون بووبێ، خۆزیا ئەم كارە دەلوا". ساڵ و نیویێك پاش ئەوە لە**٢٥**ی ژوەنی **١٨٥٣** ئەو نووسی" هیچ جیاوازییەك نیە كە مرۆڤێك لەبارەی چ شتێكەوە بنووسێ".[٢٩] جەختی فلۆبێر لەسەر گرنگیی ڕێباز و ڕاڕایی بەناوبانگی ئەو لەمەڕ تەشقی پێگەیشتنی شێوازەكان و ڕەوانبێژیی ئەدەبیی هەر ڕێكەوەندێك، لەو، پێشگۆی باوەڕی فۆرمالیستەكان بە گرنگیی رەوانبێژی و جوانكاری لە هونەردا ساز دەكا و ئێجگار دوور لە پێوەرە ریالیستییەكان دەیهێڵێتەوە. بازنەی گەورە نووسەرانێك كە فلۆبێر یەكێك لەوان بوو، كەسانی وەكوو تۆرگنیۆف و هێنری جیمز پەیتا پەیتا جەختیان لەسەر ئەم خاڵە دەكرد كە "هونەر بەتەواوی جیاكاری و هەڵبژێرانە". جیمز لە پێشگوتاری **وێرانەكانی پۆینتۆن** دا نووسی: "ژیان هەمووی تێوەردان و تێكڕژان و پشێوی و ئاژاوەیە و هونەر تێكڕای جیاكاری و ناسینەوە و هەڵبژێران".[٣٠]

هێنری جیمز لە ساڵی **١٨٧٦** لە وڵامی رەخنەگرانێك كە **دانیەل درۆندا** ی جۆرج ئیلیوتیان" ناڕاستەقینە" لەقەڵەم دەدا لەسەر ئەم بنەمایە پلاریان تێدەگرت، نووسی:" ئەگەر خەیاڵتان ئاسودە دەبێ بڵێین راستەقینە نیە، بەڵام ئەمە كەی سوچە ،(ئەم رۆمانە)* دنەی خەیاڵسازیم دەدات و ئەمە گرنگە".[٣١] جیمز لە وتاری" هونەری چیرۆك" دا نوسی كە رەخنەگران بەردەوام پێمان دەڵێن كە ناتوانین رۆمانێكی باش بنووسین، مەگەر ئەمە كە خاوەنی" هەستێك بۆ كەتوار" بین. بەڵام مەسەلەكە لە هەبوونی ئەم هەستە كورت نابێتەوە" بەڵكو لەسەر دەربڕینی ئەم هەستەیە كە هەموان هەیانە".[٣٢] فەزای "راستەقینەی" هەر رۆمانێك لە شێواز و ڕێبازی دەربڕین وەچنگ دەخرێ و ئەمە شێوازە كە گرنگیی هەیە. جیمز لە وتارێك لە بارەی گی.دی. موپاسان نووسی كە ئەو هەستە گشتییەی كەتوار دەبێ بە رۆشنی بەیان بكرێت. هەر كەتوارێك لە پاڵێوی خەیاڵی ئێمە تێپەڕ دەبێ و لە رۆماندا دەبێ

(٢٩) هەر دوو هەمدیس وێژیی فلۆبیر لەم ژێدەرە دایە:
j.rousset, “ madame bovory: Flaubert s anti- novel” , in:g. Flaubert, madame bovary , ed, and trans .p.de man , new York, 1965, p.440

(٣٠) الوت، پیشین، ص١١٩.(Allot, op.cit,pp.75-76)

* تێبنی لە نووسەر. (و)

(31) h.james, selected literary criticism , ed. M.shapira, London , 1963, p.67
(32) . ibid.p.85



ئەركی ئەم پاڵێوە دەستڕاگەیشتن بە نەرمیی دەربڕین، ساكاری و زوڵاڵی بێت.[٣٣] جیمز لە وتارێك كە لە ساڵی **١٩٠٢**لە بارەی فلۆبێرەوە نووسی پەسنی ئەو دەكا كە خۆی نەكردە ملكەچی كەڵكەڵەی سادەگەرایانەی كۆپیكاری و لە هەموو حاڵێكدا مێتۆدی دەربڕینی لە وەسفكردنی كەتوار بە باشتر زانی.[٣٤]ئەم یەكتاییی‌یە دروست هەمان شتە كە ناتۆرالیستەكان لە كیسیان داوە. لەجەخت و پێداگریی ئەوان لەسەر پاراستنی كەتواری یەكەمین شتێك كە لەنێودەچێ كەتواری تاكەكەسی و گۆڕانی كەسێتی بۆ كلێشەیەك،" تیپ"ێكە. لەم" نموونەسازی" و تێكەوەپێچانی توندوتیژی تاكایەتییە دەتوانی سەرهەڵدانی ریالیزمی سوسیالیستی ببینی. نموونەی باڵای كەتوارێكی تاقانە كە لە راستیدا راڤەیەكی تاقانە لە كەتوارە و لەجێی هەر راڤەیەكی دیكە و هەر بیچمێكی سەرهەڵدانی تاكایەتی دەنێشێ و هەموو شتێك سەركوت دەكا تا تەنیا یەك دەنگ بەرگوێ بكەوێ، فرمانی فەرمانڕەوای ئایدیۆلۆژی.

به فلۆبێر و هێنری جیمز سەردەمی مودێرنیزم لە رۆماننوسیدا دەستی پێكرد. ئەوان نیشانیان دا كە لە یەكێك لە گرنگترین ئەركەكانی نووسەر و هونەرمەند ئەمەیە كە بەرامبەر(خوێنەر ـ بیسەر)ی خۆی كونجكۆڵ بكا و ببێتە هۆی ئەوە كە ئەو گێرو گرفتەكانی خۆی ئاشكرا و دیار لەقەڵەم نەدا و فێر ببێ كە گومان لە كەتوارەكان بكا. هونەر لە مەودای ئەوشتەی كە خەڵك ئاشكرا و دیار لە قەڵەمی دەدەن دەست پێدەكا. ئەم خاڵە واتایەكی گەورەی بە مودێرنیستەكان دا، چونكە لەسەر بنچینەكەی، تەنانەت كەتواری خودێكی یەكپارچەش كە دیكارت هێنابوویە پێشێ و لە بەشێكی گرنگ لە ئەپستمۆلۆژیی زانستیی سەدەی نۆزدە دووپات كرابوویەوە، دەكەوتە ژێر پرسیار. هەنوكە ئیدی دەكرا هەرامەی لێبڕاوانەی ئاگایی تێكڕایی ناسكاریش بەرتەك بدەیتەوە و رۆمان لەسەربنەمای درك پێكردنێكی فەلسەفیی تازە لە زەینی مرۆیی بنیات بنێی. لە لایەكی دیكەوە ئەو مەودایە لەگەڵ كەتوار، هەمان مەودای زمان لەگەڵ كەتوار زانرا و ئەم گریمانە هێنرایە پێشەوە كە ئەوەی لە نێوان پەیڤ و واتا درزێكی پڕنەكراوە دروست دەكات، گرنگیی زمان لە هونەرگەلی گێرانەوەیی و گرنگیی ڕێباز لە هونەرەكانی دیكە نیشان دەدا. رۆمان لەگەڵ زمان( واتە لەگەڵ ڕێككەوتنگەلی نیشانەناسانە) دروست دەكرێ و نەك بە كەرەستەگەلی سروشتی.

(33) . ibid.p.120
(34) . ibid.pp.264-265

رۆماننوس ناچارە کە لەنێو کەڵەکەی شێواوی تۆخمەکانی دنیای دەرەوە، شتانێك هەڵبژێرێ، بە تەکووزدارییەك بیچم بدا و لەنێوان کەتواری دەرەکی و "هەقیقەتی چیرۆکی" جیاوازی دابنێ.

ڤیرجینیا وۆڵف، ئەم سەرتاپا مودێرنیستە، بە شێوەیەکی دانەدو و ماندونەناسانە، تێکۆشا تا ئەم واتایانە بە زیندویی بهێلێتەوە. ئەو وەبیری هێنایەوە کە مرۆڤ، ژیان و خودی کەتوار لەگەڵ وێنەیەك کە ریالیستەکان لەوانەوە نیگاری دەکەن، هاوگرەوە نین، چونکە لە سروشتی نێواخنیی خۆیاندا یەکپارچە و ئۆرگانیك نین، بەڵام لە سروشتگەرایی ریالیستی وەها دەناسێنرێن. ئەم" هەڵکەوتی گۆڕدران و هەزار پارچەیی"یە هەر ناوێکی لێ بنێین، چ هەقیقەت، کەتوار یان ژیان، بەهەر حاڵ شتێکە دوور لە دەستڕاگەیشتویی ئێمە:" بە شتێکی گەورە لەو زەحمەتە زۆرە کە ئێمە ئەیکێشین تا بەرهەستبوونی چیرۆکی خۆمان بسەلمێنین و لێکچوونی لەگەڵ ژیانی راستەقینە نیشان بدەین، مەخابن زەحمەتێکە نەك تەنیا بە فیڕۆ چووە، بەڵکو بە گشتی نابەجێیە".[٣٥] وۆلف لە هەنگاوی دواتر دا سەلماندی کە هیچکام لە " ئێمە"ش ناسکارێکی یەکپارچە و شێرازەمەند نین، بەڵکو لەگەڵ هەر رەنگێکی ژیان رەنگێکی تازە پەیدا دەکەین و تەنانەت لەیەك کاتدا لە پارچەی جۆراوجۆر بیچممان گرتوە:" هێندەبەسە نووسەر سەیرێکی ناخی خۆی بکا تا ببینێ ژیان وادیارە هیچ نیە، وەك بڵێی ئێجگار لەوەش دوورترە. زەینێکی ئاسایی لە رۆژێکی ئاسایی بێننە بەرچاوتان تا ببینن کە ژیان چۆنە. زەین کەڵەکەیەك کە کارتێکەرییەکان تاقم بە تاقم وەردەگرێ ـ کارتێکەرییە پاژی و خەیاڵکردی و ناسەقامگیر و یا وەها سەقامگیر کە گوایە بەقەد تیژیی نەشتەرێکی پۆڵایین زەینی بڕیوە و لێی چەقیوە. ئەم کارتێکەرییانە لە هەر گۆشەیەکەوە بەرەو زەین شۆڕ دەبنەوە، تۆزقاڵانی بێ ئەژمارمان لە سەرهەڵدان و دەرکەوتی پەیتا پەیتا لە سەر زەین و هەروا کە بەسەر زەیندا دەبارێن، هەروا کە لە قاڵبی ژیانی دووشەممان و سێ شەممان بیچم دەگرن و پێڕستبەندی دەکرێن، لە هەمان حاڵیشدا پاڵپشتی جەخت لە یەکێك دەستێنرێتەوە و لەویدیکە باردەکرێ و لە گرنگیی ئەمیان کەم دەبێتەوە و لەسەر گرنگیی ئەویدی زێدە دەکرێ و ئەم جێگۆڕکێیانە و گۆڕدرانانە هێندە درێژە پەیدا دەکا کە ئەگەر نووسەر ئازاد بوایە و نەك کۆیلەیەك لە ژێر چەپۆکی سەرەڕۆیەك، ئەگەر دەیتوانی ئەوەی کە خۆی هەڵیدەبژێرێ بە خامە نەخشی بکا، ئەگەر ناچار نەبوایە کتومت هەمان شت بنووسێ کە بە سەریدا دەسەپێ، ئەگەر دەیتوانی

(٣٥) الوت، پیشین، ص١٢٢.( allot, op.cit, pp.76-77)



تەلاری بەرهەمی خۆی لە سەر بونیادی هەستەکانو وەرگرتنەکانی خۆی ڕۆ بنێ و نەك لەسەر بونیادی ڕێبازەکانو دابەکانو ڕێککەوتنەکان، لەو کاتەدا لە سەرلەبەری بەرهەمەکەیدا نەهیچ نیشانێك لەوەی لە شێوە باوەکاندا گەلاڵەی چیرۆکی پێ دەوترێ لە بەرچاو دەکەوتو نەهیچ نیشانەیەك لە گاڵتەجاڕیو مەرگەساتو ئەڤینو هۆگری، گەر وەها بایە قۆپچەیەکیش بە شێوەی درومانچیانی شەقامی باندئیستریتی لەندەن لەسەر هیچ کراسێك کە هیی قارەمانانی ئەو بن، تەقەڵ نەدەدرا".[٣٦]

ڤێرجینیا وۆڵف لە وتارنامەیەکدا کە هەمدیس وێژیی درێژی سەرەوە لەوەوە وەرگیراوە، واتە وتارنامەی "چیرۆکی مودێڕن"، لە ئایدیالی نووسەرێتی دەدوێ، کە لەودا دەبێ هەزاران هەزار باندۆر پەسندیی زەینێکی ئاسایی، لە رۆژێکی ئاساییدا، تۆمار بکرێ، تا لە هەموولاوە لە "رێژنە بارانی ئوتۆمە بێئەژمارەکان"، لە ژینی ڕۆژێکی (دووشەممەیی یا سێشەممەیی) بیچم بە خۆی بدا. ئەو نووسیویەتی:" ژیان زنجیرەیەك لە چراکانی گالیسکە نیە کە بە شێوەیەکی هاوئاراستەی لێك نزیك ریزکرابن. بەڵکو ئاخلەیەکی درەوشاوەیە، توێخێکی نیوەزۆلاڵ کە ئێمە لە هەمان دەسپێکی ئاگاییەوە، تا سەرەنجامی حاشا هەڵنەگر، لە خۆیدا نغرۆ دەکا". بەم چەشنە، ئەو دەپرسێ کە مەگەر پەیامنانەی رۆماننووس دەتوانێ جگە لەوەبێ کە "ئەم رۆحە رەنگاورەنگە، نەناسراو و پێناسە نەکراو" "تا ئەو جێیەی کە دەکرێ بە کەمترین نەپالاوتەیی، واتە بە بێ پاژگەلی نامۆ و دەرەکی، (بۆ ئێمە) بگوازێتەوە؟".[٣٧]

زۆربەی چیرۆك و رۆمانەکانی ڤێرجینیاوۆڵف، لە هەمان باشقەی ناسینی نێوەرۆکی زەینی ئاسایی لە رۆژێکی ئاسایی پەیڕەوی دەکەن. وەلێ تا ڕادەیەك هەمویان، بە شێوەیەکی راستەخۆ، لەگەڵ تێکچڕژاوییەکانی خودئاگایی لە هەمبەری لەگەڵ هەڕەت پێوەندیدارن. پۆلریکۆر نمونەیەکی رۆشنگەری لە بەرگی دووەمی پەرتوکی **هەڕەتو راپۆرت** لەمەڕ رۆمانی **خانم دالڤووی** نیشان داوە.[٣٨] زرینگەی زەنگی بیگبێن، کە لە دەسپێکی هەر کاژێرێك دەزرینگێتەوە، لەگەڵ بەرنامەکانی یەك رۆژی خانم الڤووی و میوانیی شەوانەیو مەرگ و بیرەوەریی مەرگ لێك دەدرێنو تێپەڕینی کات بە پاتۆرگەلی جیاجیای ئاگایی مرۆیی گرێ

(٣٦) آلوت، پیشین، ص١٢٣. (ALLott, op. cit, P.77)

(37) .Virginia woolf, “Modern Fiction” in the common Reader, London, 1957, P.189.

(38) .P.Ricoeur, Tem P et recit, Paris, 1984, VOL.2, PP. 152-168.

دەدرێن و بیچمگەلی گوزەراو و کاتی لە خودئاگایی هایدناسانە دەڕەخسێنن کە بە هەرحاڵ، ئەو بایەخە مانگارەی نیە کە فەیلەسوفان بە شێوەیەکی نەریتی بۆی دادەنێن. نموونەیەکی دیکە رۆمانی **شەپۆلەکان** ی وۆڵفە کە ئێمە لەودا دەتوانین بە تەواوی هەمبەری خودئاگاییو کات پەیدا بکەینەوە.لەم ڕۆمانە*دا، وۆڵف لە تکنیکی خستنەڕووی بەرجەوەنگەلی بێئەژمار کەڵکی وەرگرت و نیشانیدا کە ئاگایییە پەرەوازەکانی تاکە کەسە پەرەوازەکانە کە جیهانی بەرناسەکان یا کەتوارەکان ساز دەکەن. شەش ئاگایی کە هەرکام لەوان پەرەوازەیەو بێ شیرازەن، نەزیلەی پێوەندیی نێوەکیی ژیانەکانی خۆیان لە تەمەنی منالییەوە تا نێونجی تەمەن و لەوەش گرنگتر پێوەندیی هەرکام لەوان لەگەڵ کەسیەتیی حەوتەم واتە پێرسیڤاڵ (کە مردوە و مەرگی بۆتە هۆی لێكپسانی زۆربەی یادەوەرییەکان) دەگێڕنەوە. لە **شەپۆلەکان** دا بە پێچەوانەی بڕێك لە گرنگترین رۆمانەکانی وۆڵف، کاتێك دەنگی چیرۆك گێڕەوە لە هەڵوێستی زەینێکی تەرا قسان دەکا، مەسەلەی دەربڕینی یەك "رەوتی ئاگاییەکان" ( stream of consciousness) لە ئارادا نیە. ئەوەی "دەگوترێ" بیچمی هیچ گوتراوێکی تایبەت، یا تاکبێژییەکی نێوەکی کە بتوانێ لە زەینی کەسیەتییەکاندا بەیان بکرێت، نیە. ئەم ئاگاییانە، لە رێگەی پاتۆرگەلی دابڕاو لە پێوەندی لەگەڵ یەکدی، بەرەبەرە، دێنەنێو شوناسی تاکە کەسییەوە و بیچمی پێ دەدەن.

گێڕانەوەی ئەدەبی، زۆرجاران، کەسێتی سازە. بە داهێنانی کەسیەتییەکان ئاسانتر دەتوانێ بە جیهانی بەرهەم بیچم بدا. لە ئاخێوی فەلسەفیدا دۆخەکە وەها نیە. لێرەدا، هیچ شتێك کە بتوانێ لەگەڵ کەسیەتیی ئەدەبی بەراورد بکرێ بوونی نیە. تەنانەت لە وتووێژەکانی ئەفلاتون یا (بێرکلی)ش ناتوانین بە واتای ئەدەبی لەگەڵ کەسێتیسازی بەرەوڕووبین.چڕبەستی ئاخێوی فەلسەفی لەسەر چەمکەکان، واتە کاروباری گشتییە.(٣٩) لە نووسینە فەلسەفییەکاندا هیچ هاوشێوەییەکی ئاشکرا لەگەڵ "کەسیەتی" لە چەشنە ئەدەبییەکاندا بوونی نیە. گێڕانەوەگەلی چیرۆکی (لە قارەمانێتییەکان، حیکایەتە رەوشتییەکان، پەندەکان، نەزیلەکانی منداڵانو هەڵبەت لە رۆمانەکاندا) بە شێوەیەکی راستەوخۆ لەڕێگەی ئەفراندنی کەسیەتییەکان لەگەڵ

* لە دەقەکەدا نووسراوە (دراین زمان) بەڵاّم لە لام وایە هەڵەیەکی چاپە، چوونکە وێدەچێ ئەم پەرەگرافە تەواوکەری رستەکەی پێش خۆیەتی، بۆیە لەم ڕۆمانەدا شیاوترە.(و)

(39) G.Deleuze and F.Guattri, Quest-ce gue La Philosophie? Paris, 1991, PP. 21-37.



کردە و ئەزموون سەروکار پەیدا دەکەن. تەنانەت لە رۆمانە مودێڕنەکانیشدا کەسیەتییەکان بیچم دەگرن، تەنیا لە "رۆمانی نوێ" دایە کە کەسیەتییەکان بە واتایەکی تایبەت وەلا دەنرێن. واتە ئیدی مرۆڤانێکی تایبەت نین کە بکرێ لەوان باشقەکانو نموونەگەلی هەمەکی وێنا بکەیت. ڤێرجینیا وۆڵف لە وتاری "بەڕێز بێنتو خانمی براون"(٤٠) نەیاریی خۆی لەگەڵ بیچمگەلی نەریتیو باوی گێڕانەوەیی لە رۆماننووسیدا دەربڕی. لێرەدا ئەو نیگایەکی خێرا و پوختی لە کەسێتی کە لە هەڵو مەرجی فرەپاتۆریو لە پێوەندیی دابڕاویی بڕگەگەلی بێئەژماری کەسێتیو ئاگایی رووداوە، کردە جێگرەوەی کەسێتی سازی. وتارەکە وڵاّمێکە بۆ گوتەیەکی ئارنۆڵد بنێت، کە تەنیا لەو جێیەدا کە کەسێتیەکان راستەقینە دەنوێنن، رۆمان بەختێك بۆ مانەوەی بۆ دەمێنێتەوە. بەڵاّم وۆڵف بە رۆشنیو بە راشکاوی دەپرسێ: لە بنەڕەت ڕا راستەقینەبوون یانی چی؟ کێ داوەریی لەبارەوە دەکا؟ وۆڵف لە "سەرهەڵدانی سەرسووڕهێنەر"ی خانم براون لە سوچێکی ئەسکەملە*ی شەمەندەفەردا قسان دەکا. ئەو لەم بێخەوشیی ئاخاوتە کە ئێمە تووشی سەرسووڕمان دەکا و لە تێکچڕژاویی هەستو هزر و پێکهەڵپژانو بزربوونەکان لە پشێویی سەمەرەخولقێنی هەزاران بیرۆکەو سۆز دەدوێ. دڵکێشیی ئەم "خاتوونە بە ساڵاچووە، کە لەگەڵ توانا بێ بنەتا و فرە چەشنییە ناکۆتاکانی" نیگار کراوە، لە(ئەم وەك ئەوی)ی ئەو لەگەڵ خودی ژیان دێتە ئەنجام و بۆ وەچنگ هێنانی ئەم دڵکێشییە، ئێمە دەبێ ئامادەی قەبووڵکردنی "وشك هەڵاّتوویی"، تەمتومان، چەند پارچەییو تێکشکان" بین.(٤١) وێنەسازیی نەریتی، ئەم چەند پارچەییە دەداتە پاڵ پێکهاتەیەكو تێکشکان بە خۆبەدەستەوەدانو تەمتومان بە ڕاشکاویو لێبڕاوێتیی گریمانکراوی کەتوار دەبەستێتەوە. بەڵاّم کەتوار بێ واتایە. ژنێك کە لەوێدا لە سەر ئەسکەملە دانیشتوە، بەرلەوەی کە یەکبوونێکی راستەقینە بێت، کتومت وەکو ژیان هەزار پارچەیە.

بە هێنانەوەی وتارێكو دوو رۆمانی وۆڵف بە نموونە و لە راستیدا لەگەڵ تێکڕای کارەکانی ئەو، ئەم پرسیارە دێتە گۆڕێ: ئەگەر هەقیقەتی هەبوونی ئێمە، چەندپارچەییو نەبوونی بەردەوامی بێ، کە هەیە، چ بەسەر ئایدیالی هەقیقەت دێت؟ مەگەر ئەوە نەبوو کە ئایدیالی

(40) .V.Woolf, “MrBennett and Mrs Brown”, in, A Womman, Essays, London, 1992, PP.69-87.

* صندلی.

(41) .ibid, p.87.

نەریتیی فەلسەفە واتە هەقیقەت لە هەمان رۆژگاری ئەفلاتونەوە تا سەردەمی مودێرنیزمی هونەری، بەستراوە بە ئایدیالی خۆ یا خودێکی نەگۆڕ بوو، کە ئەمڕۆ ئیدی لایەنە خەیاڵییەکەی ئاشکرا بووە؟ ئەگەر هەقیقەت بە وێنەیەك لە ناسکارێکی دانا و نەگۆڕ بەسترابێتەوە، کە دێتە بەرەوڕووی بەرناسەکانو تێدەکۆشێ بیناسێت و بە سەریاندا زاڵ بێت، ئایا بە تێك دارماندنی هەڵوەشێنەرانەی ئەو وێنەیە، هەقیقەتیش تێك نارمێ؟ نیچە و پاشان هایدگێر و هەندێك لە گرنگترین فەیلەسوفانی سەدەی بیستەم لە هەرۆڵێی ناسکاری یەکپارچە ئاگادار بوونەوە و رەخنەکاریی خۆیان لە بیچمگەلی فرەچەشنو جۆربەجۆری ئەم چەمکە بردە پێش. ئەوان نیشانیان دا کە یەکبوونی ئاگایی، وەها یەکبوونێکی گەوهەری نیە کە بە درێژایی کات بمێنێتەوە، بەڵکو تەنیا ئەو یەکبوونەیە کە ئێمە لە رەوتی کردەدا بە یاریدەی زمان دەیخولقێنینو درنگتر وەکو توخمێکی نارۆشن لە رەوتی رەژیدەیی زمانیدا بە کاری دەبەین. هەر ئەم خاڵە بووەهۆی ئەوە کە چەمکی نەریتیی هەقیقەتو هەمبەری ئاشنای فەلسەفیی لەگەڵ کەتواریش بچێتە ژێر پرسیارەوە.

ئەم چەمکە تازەیەی ئاگایی زەینی رەنگێکی تازەی بە مەسەلەی تامەزرۆییی نەمرانە بە هەقیقەت بەخشی. کەتوارێك کە خۆی یەکتا نیە و بە شێوەی فرەپاتۆر ئەزموون دەکرێو تەنیا لە رێگەی بەرجەوەنە جۆربەجۆرەکانەوە وێنایەك لە یەکپارچەییو یەکبوونیان لێ دەکەوێتەوە، نەك لە بەرهەمەکانی وۆلفدا بەڵکو لە بەرهەمەکانی مودێرنیستەکان، بە تایبەت جۆیسو پروستدا دووپات کراوەتەوە.ئەوان هەرکام لە رێگەیەکەوە بەم بەرەنجامە گەیشتن کە لە رەوتی دەربڕینی تامەزرۆیی بە هەقیقەت، لە جەرگەی فرەپاتۆریی باندۆرگەلی دووسەرەی خودێکی هەزار پاتۆر و کەتوارێکی لێك پساو، ئەمە نووسینە کە هەروا ئەو تامەزرۆییە کۆنو درێژخایەنە بە هەقیقەت تێر دەکات. نووسین دەتوانێ هەقیقەت بە داهێنانی پەیدا بکات. ژنێویێ لۆید لە بەرەنجامگیریی پەرتوکی درەوشاوەی خۆی بە ناوی **هەبوون لە هەرەتدا** دەپرسێ کە ئەم تێك تەنرانی داهێنانو دۆزینەوەیە بە وردی چیە، چی پێیە کە لەبارەی هەقیقەتەوە کە پێمان بڵێ؟ ئایا تەنیا بە سادەیی دەڵێ کە هەر خودێك لە یەکەگەلی بێ‌ئەژماری (لە ئوتۆمەکان) ئاگایی پێکهاتوە و ئێمە بە هەمان بارتەقا فرەچەشنین بە قەد کردە جۆراوجۆرەکانمان و گفتولفتمان فرە فاقە؟ یا کارێکی گرنگتر دەکاتو نیشان دەدا کە ئێمە لە هەرەتدا وەکو ئاگاییەکی ناجەستەمەند بوونمان نیە، بەڵکو چەشنی ئاگادارێك لە جەستەی زیندوی خۆمان هەینو هەر ئەم جەستە زیندویەیە کە سنور و کەوشەنی ئەوەی دەتوانین هەبین



یا ئەنجام بدەینو یا خۆ تەنانەت ئەوەی کە دەتوانین بە شێوەیەکی شیرازەدار ئەنجامی وێنا بکەین، بەرهەڤ دەکا:" هزرێکی سەرەڕۆ کە بونیادگەلی پتەو بۆ چیرۆکانێك کە لە ژیانی خۆمان پێناسەی سازدەکا".[٤٢]

لۆید دەنووسێ:"تێهزرین لە خۆم وەکو یەکپارچەیی، واتە پەسند و قبوولێ یەکپارچەییو گوتنەوەی چیرۆکێکە. ئەم چیرۆکە دەتوانێ زۆر تانو پۆی هەبێ و لە بەرجەوەنگەلی جۆراوجۆرەوە هەقایەت بکرێت. هەقیقەتی ئاگایی دەتوانێ فرەپاتۆری (پاتۆرپاتۆرکران)* بێت. وەلێ هەر لەم پاتۆرانەیە کە نووسەر دەتوانێ یەکبوونێك ساز بکا و هەر کام لە ئێمە لەسەربنەمای باشقەی شتێك کە هەنووکە سەرنجی لێ دەدەین، کارێکی هاوشێوە لەگەڵ ئەو شتەی نووسەر دەیکات، ئەنجام بدەین. بێرنارد لە **شەپۆلەکان** دا دەپرسێ کە ئەگەر چیرۆکێك نەبێ، کەوابوو چ کۆتاییەك دەتوانێ لە ئارادا بێتو چ دەسپێکێك؟ چیرۆکەکانی ئێمە (گێڕانەوەکانمان لە ژیانو ئەزموونەکانمان)** ناتوانن کۆمەڵێك دەسپێکی رێککەوتەیی، ناڤینەکانو کۆتاییگەلێکیان هەبێ؟ ئەوان زیاتر هاوشێوەی گێڕانەوەگەلی پشت ئەستور بە بەرجەوەنە فرە فاقەکان لە رۆمانە مودێرنەکانن. واتە فرەپاتۆری بە فەرمی دەناسێ و لەوان لە هەمان کاتدا یەکپارچەییەکی رەزاکەر سازدەکەن. بیچمگەلی گێڕانەوەیی دەتوانن بۆ دوارۆژێکی شیمانکراوی ئاگایی، لە سەردەمێکی تایبەت ولأم بدنەوە و لەهەمان کاتدا بە بەردەوامێتیی دیاردەیەکی ئێجگار کۆنتر بمێننەوە ـ زەین بە ئەفراندنی یەکپارچەیی بەرسڤی فرەپاتۆری دەداتەوە".[٤٣]

### (٤)

یەکێك لە گرنگترین باسگەلی تیۆریکی فیلم کە رۆشنگەری دژواریگەلێکە کە چەمکگەلی هەقیقەت و کەتوار لە سینەمادا دروست دەکەن، جیاکاریی نێوان فیلمی چیرۆکیو فیلمی بەڵگەنامەییە. فیلمی بەڵگەنامەیی بە پێی پێناسەیەك کە لە یەکەمین رۆژانی پەیدا بوونی سینەما هاتۆتە گۆڕێو هێشتاش دووپات دەبێتەوە، تۆماری کەتواری بەرهەست لە سەر شریتی فیلمو پێشکەوتنی فیلم لەسەر بنەمای گەواهییە بەڵگەمەندەکانە، وەکو وێنەکانی

(42) .G.Lioyd, Being in Time, London, 1993, PP.162-164.

* تێبینی لە نووسەرە.

** تێبینی لە نووسەرە.

(43) .ibid, P.164.

باخەوانیی ڕاستەقینە ـ و نەك نیارڤانی ـ كە باخچە ئاودێری دەكەن، یا شەمەندەفەرێكی ڕاستەقینە كە دێتەنێو وێستگەیەكی ڕاستەقینەوە. بابەتی فیلمی بەڵگەنامەیی بە كاروباری ڕاستەقینەدەزانرێت كە لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵكی، گیانەوەران یا سروشتدا ڕوو دەدەن. فیلمێكی هەواڵدەری لە بیرئانینێك لە كەلیسادا بۆ شازادە خاتوونێك بە هەمان بارتەقای فیلمێكی هیراگەرانە بۆ نموونە لە نەشتەرگەرییەك، فیلمێكی كازەیی* لە كۆنسێرتێكی موزیك، یا فیلمێكی هەواڵدەری ـ كازەیی لە ئەنجامدرانی پێشبڕكێیەكی تۆپی سەرمێز بە بەڵگەنامەیی دەزانرێت. داكۆكیكارانی ئەم پێناسەیە لە فیلمی بەڵگەنامەیی دەڵێن كە تەنانەت ئەگەر دەرهێنەرێك وەكو ڕابێرت فلاهرتی نەزیلەیەك بكاتە ترش‌و خوێی فیلمی بەڵگەنامەیی خۆی، تا ئەو كاتەی لایەنی گەڕانەوەیی و هەواڵدەری بە سەر فیلمدا زاڵ بێت، دەتوانی هەروا بە بەڵگەنامەیی ناودێری بكەیت. فیلمی بەڵگەنامەیی دەرهێنەرەكەی بیهەوێ یان نا، بە هەرحاڵ بانگەشەی هیراگەریی هەیە،(٤٤) چونكە لەودا بەستێنی پەیام بەسەر لایەنەكانی دیكەی پێوەندیی هونەریدا زاڵ دەبێت. كەسانێك كە باوەڕیان بە جیاكاریی نێوان فیلمی بەڵگەنامەیی‌و فیلمی چیرۆكی هەیە، فیلمی چیرۆكی وەكو نۆژەنكردنەوەیەكی دەسكرد (artificial)ی ڕووداوەكان، كەسیەتییەكان‌و كاروباری ڕاستەقینە گریمان دەكەن‌و دەڵێن كە زیاتر ئاراستەیەكی "نواندنی"ی هەیە و پێكهاتەكەی لە سەر كۆڵەكەی نەزیلەگۆیی بیچمی گرتوە. هەڵبەت كە دەرهێنەری فیلمی چیرۆكی بانگەشەی هاوگرەوەیی تەواو و خەوش هەڵنەگری وێنە لەگەڵ ڕووداو، یا كاروباری ڕاستەقینەی نیە و لەودا لۆژیكی گێڕانەوەیی، كەسیەتییە چیرۆكییەكان، جیهانی نەزیلە و لە یەك ئاخاوتەدا "كەتوارێكی تازە" زاڵە.

لە ڕوانگەی ئەركییەوە، بۆ فیلمی دیكۆمێنتار لایەنی هەواڵدەری دادەنێن، واتە بانگەشە دەكەن كە ئەم چەشنە لە فیلمسازی لە بەستێنێكی "ڕاستەقینە" ئاگادارمان دەكاتەوە و ئەمە مەرجی بوونی خۆی و بنچینەی پێناسەكەی ئەژمار دەكەن، لە حاڵێكدا كە فیلمی چیرۆكی هەرەپێویست نیە كە خودان ئەم لایەنە بێ. لە ڕوانگەی نیشانەناسانە، گێڕانەوەناسانەو پێكهاتەیی ئەم جیاكارییە

* تفریحی: كازەیی/ كازە: تفریح/ هەنبانە بۆرینە، هەژار. (و)

(٤٤) فیلمی بەڵگەنامەیی لە زمانە ئەوروپییەكاندا documentum پێ دەوترێ، ڕەچەڵەكی بۆ وشەی لاتینیی documentumە، كەواتای سەرەكیی وانە و یەكێك لە واتا پەنانەكییەكانی گەواهـ و بەڵگە بوو خودی ئەو لە وشەی docere دێت بە واتای فێر بوونە.



ئەركێكی بێ بایەخە. بە هەرحاڵ،تەماشاوانانی هەر فیلمێك،بۆ نیشانەگەلی سینەمایی فیلم واتا دەخولقێنن و لە ڕاستیدا هەمبەرێك لەسەر بنەمای ڕێككەوتەیی، لە نێوان ئاماژە سینەمایی‌و ئاماژە پێكراوە زەینییەكانیان دادەنێن. بە لای ئێمەوە هەر نیشانەیەك كە لەسەر پەردەی سینەما نەخش دەبەستێ، هەر بزاڤێك كە ببینین‌و هەر دەنگێك كە بی بیستین دەبێت بە "سیفەتی دانەپاڵ"، واتە شتانێك بدەینە پاڵی كە مەرج نیە لە خۆیدا بوونی نەبێ. بە ڕێكەوەندێكی دی، ئێمە (هەڵبەت بە گوێرەی ڕێككەوتنگەلێ) بۆ هەر فیلمێك ڕەمزەكان‌و سیمبولگەلێ ساز دەكەین. ئێمە خەریكین تەماشای فیلمێكی بەڵگەنامەیی دەكەین، بۆ ئەویش هەندێ تان‌و پۆ وەكو تان‌و پۆی فیلمێكی چیرۆكی یا ڕۆمان لە بەرچاو دەگرین. تەنانەت لە فیلمێكی سادەی بەڵگەنامەیی ـ هەواڵدەری بۆ نموونە وانە وتنەوەی مامۆستایەك لە پۆلی خوێندندا، یا شێوەی كاری دەزگایەك لە كارخانەیەكدا، یا ڕێ‌و ڕەسمی بیرئانینی شازادە خاتوونێك، بەردەوامی و بەرو ـ دواییەكان لە هەرەتدا، واتە گێڕانەوەی چیرۆكێك وێنا دەكەین. بۆ مامۆستا، پسپۆڕی تكنیكیی كارخانەو شازادە خاتونێك، كەسایەتی‌و ژیانگەلی چیرۆكئاسا و خەیاڵی دروست دەكەین. ئێمە هەروەها، بە پێی پێش ـ فامگەلێ زەینی خۆمان وەگەڕدەخەین و لە فیلمدا لە پەسند كردن یا بەرتەكدانەوەیان یارمەتی وەردەگرین. ستراتیژیی وەرگرتنی هەر بەرامبەرێك (بیسەر ـ خوێنەر) لە ڕوبەڕوویی هەركەس لە تەك هەر فیلمێك (ئێستە بە هەر سیفەتێك كە كەسانی دی بۆ فیلمیان لە بەرچاو گرتبێ و هەر ناوێك كە لێیان نا بێ) بیچم دەگرێ. گێڕانەوەی فیلمی بەڵگەنامەییش بەلای هەر تەماشاوانێكەوە گێڕانەوەیەكی تایبەتە.

ئەم خاڵە كە فیلمی بەڵگەنامەیی دەتوانێ لە ئاراستەی هەواڵدەریی خۆیدا جەخت لە سەر خەدی هیراگەرانە بكات، ڕاستە. لە قوتابخانەكانی زۆر لە وڵاتان، بەشێك لە هیراگەریی زانستە سروشتی، فیزیكی‌و هەڵبەت زانستە مرۆییەكان خراوەتە ئەستۆی سینەمای هیراگەرانە. بەڵام لەمبارەشەوە ناتوانی پێوەرێكی لێبڕاوانە بۆ جیاكاریی نێوان فیلمی چیرۆكی و فیلمی بەڵگەنامەیی بەدی بكەیت. سەرەتا ئەوە كە زۆر لە فیلمە هیراگەراكان بە ئامانجی دروستكردنی دڵكێشبوون‌و هۆگری لە تەماشاواناندا ترش‌و خوێی نەزیلەیەكی سادەیان لە هەگبەدایە و ئەگەریش نەیانبێ، تەماشاوان خۆی گەلاڵەیەكی گێڕانەوەییان بۆ وێنا دەكات. خاڵی دووەم ئەوەیە كە هەر فیلمێكی چیرۆكیش ئاراستەگەلی هیراگەرانەی هەیە. لانیكەم هەواڵی جۆرێك هەڵێنجانی ڕەژیدەگەرانی* لە بابەتەكەی دەگەیەنێ. هەر فیلمێك بەردەوام

* سازندەگانش. (و)

گەڕانەوەیەکە بۆ بەستێنێكو هەڵکەوتێکی مێژوویی.دەتوانی هەر فیلمێکی چیرۆکی لەگۆشەی گەڕانەوەییو بەڵگەمەندی سەیر بکەیو لانیکەم وەکو بەڵگەیەك لەمەڕ خۆیەوە ئەژماری بکەیت. بە وردبوونەوە لە هەر فیلمێك دەتوانی وانەگەلێ لە مەڕ فیلم هەڵگرتنەوە، مۆنتاژ و دروستکردنی فیلم فێر بیت. مەسەلەکە لێرەشدا بە هەمان باسی ڤینگنشتاین لەمەڕ "دیتن بە ناونیشانی" دەگەڕێتەوە و یاخۆ ئەوە کە ئایا تەماشاوان دەخوازێ فیلمێك وەکو بەڵگەنامەیەکی هیراگەرانە لە بەرچاو بگرێ یان نا.

گەر لەوەش گەڕێین، چەمکی کەتوار کە کۆڵەکەی سینەمای بەڵگەنامەیی دەزانرێت، چەمکی نارۆشنییە. رۆژێك کە لە(فیلمی) **پیاوێك بە کامێرای فیلم هەڵگرتنەوە** بەرهەمی ژیگا ڤۆرتۆڤ (١٩٢٩) لە مۆسکۆدا تێپەڕ دەبێ، رۆژێك کە لە بەرلین، **سەمفۆنیای شاری گەورە** بەرهەمی ڤۆڵتێر روتمان(١٩٢٧) لە کلان ـ شارێکی کۆماری وایمار تێدەپەڕێ و رۆژێك کە لە(فیلمی) **لەبارەی نیس** ی ژان ڤیگۆ(١٩٣٠-١٩٢٩) لە شاری خنجیلانەی رۆخی دەریا تێدەپەڕێ، رۆژانێکی راستەقینە نین، بەڵکۆ رۆژانێکی گێڕانەوەیی و سینەمایین. تەنانەت لە هاوگرەوەیی کاتی ڕووداوی راستەقینە و کاتی ڕووداوی سینەمایی، بۆ نمونە لە کاتژمێرە درێژخایەنەکان کە لە بورجی ئێمپایر ئێستیت لە فیلمی **ئێمپایری** ئەندی وارهۆل تێدەپەڕن، هەمدیس ئێمە لەتەك دووکاتی جیاواز بەرەوڕوو دەبین، یەکێکیان کاتێك کە وارهۆل لە ماوەی فیلم هەڵگرتنەوەدا" بەسەری بردوە" و دووەم کاتی تەماشاکردنی فیلم بۆ هەر تەماشاوانێك، کە لە راستیدا بە واتای کاتە بێ ئەژمارەکانە.وارهۆل خۆیشی نەیدەویست جەخت لەسەر نایەکانگیریی کاتە جۆربەجۆرەکان بکا و سەرنجمان بۆ ئەوە رابکێشێ کە تەنیا لە بەرجەوەنی سەراسای خۆمان فیلم، بورج، جیهان و " کەتوار" دەبینین. من لە "سینەما تەکی پاریس" دانیشتوم و فیلمی **ئێمپایر** سەیر دەکەم، فیلمێك لە بارەی بورجێك لە نیویۆرك. گۆشەی تایبەتی کامێرا یەکێك لە ملیۆنان ئەگەرە دەستەبژێرەکانی وارهۆل بووە و بە واتای کت ومتی کەتوار( کەتوار لە هەمەلایەنیی خۆیدا، کەتواری ئایدیالی فەیلەسوفان) نەبووە و نەیدەتوانێ هەبێ. فیلمی وارهۆل لەبارەی (ئێمپایر ئێستیت)ە وەها کە ئەو دیویەتی و ئەزموونی کردوە و بە دیتن و ئەزموونی من و هیچ تەماشاوانێکی دیکە هاویەك نابێت. هەر بەو جۆرەی کە فیلمی ڤۆرتۆف لە بارەی ژیانی رۆژانەی مۆسکۆی ڤۆرتۆف بووە و فیلمی روتمان لە بارەی ژیانی بەرلینی روتمان. ناونیشانی فیلمی جوانی ژان ڤیگۆ ئێجگار رۆشنگەرە: ئەمە فیلمێکە لە بارەی نیس، دیکۆمێنتارێك کە هەرگیز لەگەڵ "نیس" نابێتەیەك، چونکە تەنیا یەك شاری نیس بوونی نیە،



بەڵکو کۆمەڵێك نیسی بێئەژمار بۆ بەرجەوەنگەلی بێئەژماری مرۆڤانی بێئەژمار هەیە. لە بارەی دروستکردنی فیلمێك واتە گێڕانەوەیەکی تایبەت، واتە بە دەستەوەدانی گێڕانەوەگەلی لواو لەو. هەر بۆیە ڤیگۆ خۆی بە جەختەوە دەیگوت کە فیلمێکی" بەڵگەنامەیی" دروست نەکردوە، بەڵکو " بەرجەوەنێکی بەڵگەدارانە" ی هێناوەتە گۆڕێ. ڤیگۆ بە نواندنی نیس، خۆی گوتەنی" یەکێك لە چەشنە تایبەتەکانی زیندەگانی" واتە ژیانی بۆرژوایی مودێڕنی مەحکووم کردوە.(٤٥) دەنگەوازی توخس و تەوساویی هەمیشەیی ئەو جەخت لەسەر نیگای شەڕاشۆیەك، رەخنەکارێکی بێبەزەیی و سووکایەتییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی دەکا. ئەم شاکارە بە هەمان بارتەقا دەتوانێ لە بارەی نیس بێت کە ئەتالانت دەتوانێ لە بارەی دوو هاوسەر بێت، یاخۆ لەبارەی بەلەمێك، یا لەبارەی نیارڤانانێك(وەکو) میشل سیمۆن، دیتاپارلۆ، ژان داستە یا تەنانەت لە بارەی موزیکی جادویی، خولیایی و فەرامۆش نەکراوی موریس ژوبێر.

سەرنجدان لە وتاری سەرەوە وردتر نیشان دەدا کە ناتوانی لە نێوان فیلمی دیکۆمێنتاری و فیلمی گێڕانەوەیی جیاوازیی دابنێیت. هەردوو دیکۆمنتارانێکن لەبارەی خۆیان و دروستکرانیان و هەردووك چیرۆکگەلێ، گێڕانەوەگەلێ لەبارەی شتانێك لە دنیا دان و ئەو شتانە بۆ دنیایەکی دیکە دەبن، بۆ" جیهانی بەرهەم". هیچ دژوار نیە کە پەسند بکەین فیلمگەلی ناودەرکردو و بە فیلمە بەڵگەییەکانیشەوە جیهانی خۆیان سازدەکەن. لەم جۆرە دۆخەدا ئەو ئەدگارە جیاکارەی بەڵگەنامە و نەزیلە لەنێودەچێ و ناتوانی لەسەر ئەستونی پێناسەکانی فیلمی بەڵگەنامەیی و فیلمی چیرۆکی بەردێك لەسەر بەردێك رۆبنێی. ئەرکەکانی فیلم، هەروەها پاساوێکی تەرخان و رەخساو بۆ جیاکاریی بەڵگەنامەیی/ چیرۆکی نیە. لە "فیلمە چیرۆکییەکان" وەکو **نمرەی رەوشت سفر** ی ژان ڤیگۆ یا **چوارسەد زەبر** ی فرانسواترۆفۆ چەندقات باشتر دەتوانی سیستمی پەروەردە و فێرکردنی فەرەنسا بناسیت تا لە دەیان دیکۆمێنتار کە لەمبارەوە لە مەودای ١٩٣٠تا ١٩٦٠ بەرهەڤ کراون. لە لایەکی دیکەوە، پێکهاتەی گێڕانەوەیی ئەو **شەوەی کە باران باری**...ی( کامران شیردل)چەندقات بەهێزتر لە چنراوی نەزیلەئاسای زۆربەی فیلمگەلی چیرۆکیی ئێرانییە کە تا(ساڵی)١٣٥٢ دروستکرابوون.

توخمگەلی چیرۆکی، یا باشتر بڵێم توخمگەلی گێڕانەوەیی لە" فیلمە بەڵگەنامەییەکان"دا ئاسان دەناسرێنەوە. لەم" چەشن"ە فیلمانەدا کەسێتییەکان دەبن بەو شتەی کە گێرماس بە

(45) . P.E.Salles Gomes, jean vigo, London , 1972, p.68.

"باشقەی کردە"(actants)ناوی لیٚ ناوە، واتە دەورە تایبەتییە گێڕانەوەیی‌یەکان دەخرێنە ئەستۆیان، وەکو کرێکاران لە **بۆریناژ** ی بوریس ئەیونێس(١٩٣٤)، یا وەرزشوانان لە **ئۆلەمپیاد** ی لێنی ریفنشتاڵ(١٩٣٨)، لێرەدا شوێن و ژینگە دەگوڕێن بۆ سەکۆی رووداوەکان"، وەکو سەهۆڵەکان لە فیلمی **نانوك** ی فلاهرتی(١٩٢٢)، یا زۆنگاوەکان لە چیرۆکی **لوییزیانای** فلاهرتی(١٩٤٨) . بەردەوام چەندهێزێکی نەناسراو کە هەنتەشی گێڕانەوەییان هەیە لەپشت هەرشتێك بەڵگەنامەیی گریمانی دەکەین سەرهەڵدەدەن، وەکو مەرگ لە **هەورەبروسکەی سەرئاو** ی ویم وێندرێس(١٩٨٠). فیلمێك کە بڕیارە باسێکردنێك لە دوایین رۆژانی ژیانی نیکۆلاس رەی بێت، لە راستیدا بۆتە فیلمێك لە بارەی وزەی میتافیزیکی، لە هەر فیلمێکی بەڵگەنامەییدا پیشەگەری و تکنیك بە هەمان بارتەقای فیلمە چیرۆکییەکان گرنگیی هەیە. تەڵەکەکانی تکنیکیی فیلم هەڵگرتنەوە،جێی کامێرا، گۆشەی کراوە یا داخراوی کامێرا، قابی وێنە کە بەردەوام خۆی بەسەر تەماشاوان دەسەپێنیٚ و لە بەرانبەر ئەوشتەی نیشانی ئەوی دەدەن مافێکیشی لیٚ دەستێننەوە، تیشك پڕژاندن، دەنگ لەسەردانان و سەرەنجام مۆنتاژ، تێکڕا لە کەتواری پەتی کە لە بەرچاوانی کرێکاران گوزەر دەکەن، چرکەساتگەلی هەڵبژاردە و لێکجیا تۆمار دەکەن. کردەی دەستەبژێرکردنی هەمیشەیی و لە چارەنەهاتوی دەرهێنەر،فیلم هەڵگرەوە و مۆنتێر لە مەڕ سینەماش بڕیاری هێنری جیمز لە مەڕ رۆمان بە هەمان گوڕوتین دەسەلمێنن. لێرەشدا ئێمە لەبەر ئەمە کە لەگەڵ ئەفراندنی هونەری سەروکارمان هەیە و نەك لەگەڵ هەمدیس دەرکەوت یا نۆژەنکردنەوەی تەنیاوتەنیای کەتوار، مەسەلەی سەرەکی لە ئاستی جیاکاری و دەستەبژێر کردن پەیدا دەکەین و نەك لە ئاستی پشتڕاستبوون بە کەتوار و بوار.

تێکڕای بیچمگەلی "ئاخێوئاسا" discursive ئەگەر"نەزیلەبێژ" (fictional) نەبن، "نەزیلەئاسا" (fictive)ن. هیچ دیاردەیەکی ئاخێوئاسا نیە کە نەتوانیٚ لە قاڵبی گێڕانەوەیی جیٚ بگریٚ. هەوڵدان لە تێگەیشتن و ڕاڤەی ئەم دیاردانە، بە تایبەت ئەگەر جەخت لە سەر پێکهاتەی هەرەتمەندیان بێت، یاریدەی پەیدابوونی بیچمگەلی فرەچەشنی وەها قاڵبێك دەدا. ئەم خاڵە لە فەلسەفەی زانستی ئەمڕۆ دا جێی باسە و ئیدی چەندان سەرسووڕهێنەر نانوێنیٚ. بیچمگەلی" ئاخێوئاسا" تێکڕا بە شێوەیەکی لیٚ دەرباز نەبوو لەگەڵ خوازەکانی دەربڕین و بە تایبەت لەگەڵ میتافۆر سەروکاریان هەیە. خوازەکان و هەروەها رەمزەکانی هەر ئاخێوێك مۆری قاڵبی گێڕانەوەییان لەگەڵدایە. راستنوێنیی هەر رەمز و نیشانەیەك، بە راڤەکەی واتە



جیٚ گرتنی لە قاڵبی گێڕانەوەیی دەبەسترێتەوە. کۆڵان و شەقامی فیلمی **پیاوێك بە دوربینی فیلم هەڵگرتنەوە**، مۆسکۆی کۆتایی دەیەی ١٩٢٠بۆ ئێمە دەکاتە هاوشێوەی شارەکانی فیلمە چیرۆکییەکانی ئەو رۆژانە کە لە سۆڤیەتدا دروست دەکران و لە دوو پاژی لێك بەستراوی " دوربین ـ هەقیقەت"ی ئەو تەنیا دوربین دەمێنێتەوە. فامکردنی هەقیقەتێك کە ڤۆرتۆف وەك کۆمۆنیستێك لێی دەدوا، بە هەڵوێستی ئەمڕۆیی هەر بەرامبەرێکی( بیسەرـ خوێنەر) فیلم پەیوەست دەبێت. ڤۆرتۆف ناتوانیٚ" هەقیقەت" ی جێی مەبەستی خۆی بە من ببەڵێەنیٚ* و واتاکانی خۆی بەسەرمدا بسەپێنیٚ. چونکە گێڕانەوەی ژیانی" راستەقینە" و رۆژانە لە مۆسکۆ، لەگەڵ گێڕانەوەگەلی دیکە کە من بیستومە و خوێندومەتەوە، کۆمەڵێك جیاوازیی زۆری هەیە و هەر چۆنێك بێت تاقانە بیچمی گێڕانەوەیی دەربڕینی هەقیقەت نیە. هەقیقەتی ڤۆرتۆف یەکێك لە بیچمەکانی هەقیقەتە کە ئەو خۆی دروستی نەکردوە و تەنانەت هەمان کات کە فیلمەکەی ئەو پیشان دەدرا و فەزای بەرهەمەکەی هێشتا راستەقینە نەدەهاتە بەرچاو و تەماشاوان، بە ڕواڵەت لەگەڵ فیلمە چیرۆکییەکانی رۆژانی خۆی بەراوردی نەدەکرد، هەمدیس لە دیدی روسێکی سپی و کۆچەرێکەوە درۆیەکی گەورە بوو و بەس. نەدەکرا لە هەقیقەتی ڤۆرتۆف تێبگەیت، چونکە هەموو کەسێك هەقیقەتی خۆی دەدی، واتە کەتواری بە هەرامەیەکی سەراسا دەدی. ڤۆرتۆف بە راڤەی خۆی لە هەقیقەت بەگژ هەر راڤەیەکی دیکەدا چوو بوو و وەکو هەر کەسێك کە بچێتە مەیدانی وەها جەنگێکەوە، بۆڕ دەخوات.

هەقیقەتی ساف و بەدەر لە راڤە بوونی نیە. بانگەشەی فیلمی بەڵگەنامەیی کە ئەو شتەی نیشانی دەدا و دەڵیٚ " تێکڕای هەقیقەتە" بانگەشەیەکی پووچە کە ناتوانیٚ شێلگیرانە بزانرێت. کەتوار بە گوتەی دێریدا ئەو شتەیە کە زۆر بە سانایی تەنیا هەیە و راست و درۆبوونی ئێمە دواتر دەیدەینە پاڵی. دوو چەشن نیشانەمان نیە کە یەکێکیان لەگەڵ واتای تاق و راستەقینە مەودای هەبیٚ و ئەویدی نەیبیٚ. هەندیٚ رێککەوتنی نیشانەناسانەمان هەن کە بە گوێرەی ئەوانە رەمزێك راستەقینە لەقەڵەم دەدەین و رەمزێکی دیکە بە ناڕاستەقینە دەزانین. هیچ ئاخێوێك ناتوانیٚ بە شێوەیەکی کت ومت و تەواو شتێك بەرلەوەی خوازرا بێت بەدی بهێنێت، واتە نیازێك بە تەواوی دەربڕیٚ. لە بەرئەوەی کە گوتن و " گواستنەوەی واتا" بە پێکهاتەی خوازەیی دەق و ئاخێو بەستراوەتەوە، بیچمگرتنی ئاماژەگەلی پەنانەکی، واتە

* بقبولاند /بەڵیاندن : قبولاندن (و)

نەزیلەگەلیَ لە پشت ئەو نەزیلەی کە لەبەر هەر هۆیەك بێت سەرەکی لەقەڵەم دراوە، هەرامەیەکی لە چارە نەهاتوویە. ئەو" شتەی کە دەبیَ بگوتریَ، دەبێت بە ڕێخۆشکەری گوتنی(شتێکی)دی، کە هێشتا نەدرکێنراوە. زمان ناتوانیَ بە ئامانجێکی پێشتر دیاریکراو بگات و بەرهەمی هونەری ناتوانیَ بە من بێژێت ئەم دیوارانە کە لە **پیاوێك بە دوربینی فیلم هەڵگرتنەوە** دەی بینی، راستەقینەیە، بەڵام ئەو دیوارانە کە لە (فیلمی) **دایك** بەرەخساوی وۆسواڵد پودۆفکین دەبینی چیرۆکییە. هەردووك، شتانێك لە دنیان کە لە بەرهەمێکدا جێیان گرتووە وئێمە کەتوار و چیرۆك ئاسابوون دەدەینە پاڵیان. لە هەموو حاڵێکدا، ئێمە گێڕانەوەیەك زەق دەکەینەوە، بەڵام مافی ئەوەمان نیە و لە درێژماوەدا ناتوانین ببینە لەمپەری وەگۆهاتنی گێڕانەوەکانی دی.

والتێر بنیامین نووسیبووی:" هیچ شتێك سووك و چروکتر لە هەقیقەتێك نیە کە بەو شێوەیەی کە ناسراوە بێتە دەربڕین"[٤٦]هەرچی و پەرچییەکەی لەخدەی ناجوانیناسانەی ئاخێزدەکا،چونکە ڕێچکەی پێشکەوتنی راڤەگەلی هەمەجۆر و نەیار کوێردەکەنەوە.ئەزموونی پۆزەتیڤیستی بەتاقانە راڤەی دروست لە هەرامەی راستەقینە نیشان دەدا کە ڕەنگە بتوانی بۆ ماوەیەك ڕێگە لەبەردەم فرەفاقێتیی راڤەکان دابخەیت، بەڵام سەرەنجام و لە شرۆڤەی بنەتاییدا، ناتوانی نکۆڵییان لیَ بکەیت. هەر راڤەیەك بەپێی شتێك کە میشل فۆکو" شیرازەی هەقیقەت"ی پیَدەوت بیچم دەگریَ و لەبەرەنجامدا راڤەگەلی جۆربەجۆر لەلایەنی ناچارانەی چەشنەکانی شیرازەی هەقیقەت پێك دێن و پەرە دەگرن. سینەما ـ هەقیقەتی ڤۆرتۆف شیرازەیەکی هەقیقەت زەق دەکاتەوە و لە بەرانبەر کەرەستەکانی دیکە قووتی دەکاتەوە و لە بنەتادا ناچار دەبێت کە نکۆڵی لە راڤەکانی دیکە بکا. ژۆرژفرانژۆ گوتبووی " شتێك بە ناوی سینەما ـ هەقیقەت بوونی نیە. لە چرکەساتێکدا کە دەرهێنەر کاری خۆی دەست پێدەکا، ئاشکرا دەبێت کە سینەماـ هەقیقەت درۆیە، ئەگەر(درۆ) نەبیَ سینەمایەك لە گۆڕێدا نابیَ"[٤٧] ئوستورەی زۆلاڵبوونەوەی راگەیێنی سینەما و گریمانی هاویەکبوونی لەگەڵ هەقیقەت، کە ئایدیالی "سینەمای بەڵگەنامەیییە، بە یەکەمین وێنە و یەکەمین دەنگ لەنێودەچیَ. جان گرایرسۆن، کە لە گەورانی سینەمای بەڵگەنامەیی بریتانیا بوو، دەیوت کە

(46) .W.Benjamin, one- way street and other writings , trans.E.jephcott, London, 1979, p.95.
(47) .G.Roy Levin , documentary explorations: fifteen interviews with film – makers , new York , 1971, p.119.



فیلمی بەڵگەنامەیی تەنیا" هەواڵنامە"یەکە و بەس،تەنانەت ئەگەر وەکو راپۆرتێکی وێنەیی و دەنگیش لیَی بڕوانین، هەمدیس لەئاستی پشت بەستن بە بەڵگە بانتردەچیَ و دەبێت بە هونەر. ئەو بەجەختەوە درێژەی دەداییَ و دەیگوت:" فیلمی بەڵگەنامەیی هونەرێکی تازە و زیندویە". [٤٨] وەلیَ دەتوانین بێژین هیچ هەواڵێك شك نابەین کە بتوانیَ ئەگەری هێنانەپێشی راڤەکان وەلا بنیَ. دەلویَ کە ئایدیالی هەواڵهێن ڕەنێوهانینی پەیامێك بێت کە خۆی ئازادانە بدویَ و تاودانەوەی راستەخۆی کەتوار بێت. یەکسەر بەدەر لە هەر راڤە، لێکدانەوە و باسلێکردنی پاشبار.* پەیامێك کە خۆی ئازادانە بدویَ و تاودانەوەی راستەوخۆی کەتوار بێت. بەڵام، هەر بەو چەشنەی کە وەها هەواڵێك لە دنیادا بوونی نیە، هیچ سینەماگەر و دیکۆمێنتارسازێکیش ناتوانیَ فیلمێك دروست بکات کە تەنیا جیَ و ڕێی یەك راڤە بهێڵێتەوە. تێکڕای فیلمەکان دروستکراوی سنوردارییەکانی وەبارهاتو لە کاری دوربین و ریتمی مۆنتاژن و ناتوانن لە سەروەریی بیچمگەلی دراماتیك خۆ دەرباز بکەن. دەلویَ دیکۆمێنتارسازێك تێبکۆشیَ تا راستییەکە بڵێت، بەڵام لە فیلمی ئەودا، هێڵی جەخت بە ژێر گوتندا دەکێشرێت نەك هەقیقەت. شێواز یا مێتۆدی دەربڕین بە گوتەی ژاك ریوت بەردەوام گرنگترین بابەت و مەسەلەی هەموو فیلمێکە.[٤٩]

ئەلکساندێر کلوگە بەوردبوونەوە لە خدەی ناچارانەی راڤەپەسندیی فیلمە بەڵگەنامەییەکان رایگەیاند:" هەر فیلمێکی بەڵگەنامەیی بە سیَ دوربین  فیلمی لیَ هەڵدەگیرێتەوە:١) دوربین بە واتای تکنیکیی خۆی ٢) زەینی فیلمساز ٣) شێوە گشتییەکانی سازکردنی فیلمی بەڵگەنامەیی، کە بیچم بە چاوەڕوانیی تەماشاوانان دەدەن و ئەم چاوەڕوانییانە بەسەر فیلمسازیدا زاڵ دەبن. هەربۆیە ناکریَ بە سانایی بڵێین کە فیلمگەلی بەڵگەنامەیی ڕاستیەکان وێنە دەگرن. ئەو (فیلمە بەڵگەنامەییانە) لە راستیگەلی دوورەپەرێز لەیەکدی فیلم هەڵدەگرنەوە و کۆیەکی هاوئاهەنگ لەم راستییە تەریك کەوتووانە بەرهەڤ دەکەن، کۆمایەك کە لەسەر بنەمای ئەو سیَ دوربینەی کە ناوم هێنان بیچم دەگریَ. هەر شتێك کە لە راستییەکان دەمێنێتەوە، هەر شتێك لە بەستێنە راستەقینەکانی خۆی جیَ ناگریَ، هەر شتێك

(48) J.Grierso , on documentary , new York , 1971, p.249.

* افزونه

(٤٩) ب. احمدی، **از نشانەهای تصویری تا متن**، تهران، ١٣٧١، ص٢٦٧.

که فڕێ دەدرێ، لەو کۆمایەدا لە پیوار دا دەمێنێتەوە. فیلمی بەڵگەنامەیی لە خۆیدا و بۆ خۆی، بە هیچ شێوەیەك ریالیستیتر لە فیلمە چیرۆکییەکان نیە".[٥٠]کۆمایەك کە کلوگە لێی دواوە بە دەستەبژێرکردنی فیلمساز بەرهەڤ دەکرێ و دەستەبژێرکردن بەردەوام وەلانانی بڕگە و پاتۆرگەلێ لەو شتانەیە کە بە هەقیقەت ناودێر دەگرێ. کەتوار چیرۆکئاساتر لەو شتەیە کە هونەرمەندێك بتوانێ سادەگەرایانە وێنەی لێ هەڵگرێتەوە. هونەرمەند بەردەوام" یەکێك لە کەرەستە راستەقینەکان" وێنە دەگرێ. هەر بۆیە زێدەڕۆیی لە ناتۆرالیزم یا سروشتگەرایی لە فیلمدا دەتوانێ مەرگی ریالیزمی لێ بکەوێتەوە. نموونە باشەکەی کارێکی جوان و ئاگایانەیە کە شانتال ئاکرمەن لە فیلمی **ژێن دێلمەن، ٢٢ کەنارەی کۆمرێس، برۆکسل ١٠٨٠**ئەنجامی دا، ئەو هەندە لە نواندنی چرکەچرکە و کت ومتی ژیانی رۆژانە کارامەیی وەگەڕخست کە خدەی ریالیستی ئەم ژیانەی وەپشت سەرنا. ئەو بەباشی پەی بەوە برد کە زێدەڕۆیی لە ریالیزمدا، توخمی خەیاڵ زەق دەکاتەوە و بە پێچەوانەوە. ئەم گوزەر لە کەتوارەوە بۆ خەیاڵ، گەوهەری هونەرە و لەڕاستیدا یەکێك لە دژوارییەکانی ئەفراندنی هونەری هەر ئەمەیە.لە فیلمی **ئاوێنەی** ئاندری تارکۆفسکی وردبینەوە. فیلمێك وەکو ژیاننامەیەکی خۆنووس کە بڕیارە سالآنی منداڵیی هونەرمەند هەمدیس بنیات بنێ و هاوپێناویان بکات لەگەڵ هەنووکە و ئاوێتەیەك لە یادەکان، "هەقیقەتەکان"، راڤەکان و ویستەکان. فیلم هەموو ئەمانە بەزمانێکی هاوگرەوە لەگەڵ جیهانبینی ئەمڕۆی هونەرمەند، واتە یەکانگیر لەگەڵ روانگەگەلی دینی، فەلسەفی، سیاسی و کۆمەڵایەتی و درك پێکردنی ئەو لە هونەر دەردەبڕێ. ئەمە نیگایەکە بۆ ژیان، لەبەرئەوەی پەیوەستە بە بیرەوەرییەوە، گێڕانەوەیی و نەزیلە ئاسایە. هەم دەتوانێ نیگایەك بێت بۆ هەرچییەك کە رابردوەو هەم نیگایەك بۆ هەر چییەك کە دەکرا بەشێوەیەکی دیکە گوزەرابا.هەم لەمڕۆ، واتە لەوەی کە لە زریان ماوەتەوە، سەرنج دەدا و هەم لە دوێنێ. لە چرکەساتگەلێکی فیلمدا، فیلمێکی بەڵگەنامەیی لە رۆژانی جەنگ لە دژی ئالمانی سەردەمی نازی، کە پەڕینەوەی سەربازانی سوپای سوور(سوپای سۆڤیەت) لە رووباری سیواش نیشان دەدا،جێ کراوەتەوە.سەربازانی ماندو و لەپێکەوتوو تێدەکۆشن تا تەقەمەنیی خۆیان لە رووبارەکە بپەڕێننەوە. وێنەکان تێهەڵکێشی شێعرێکی ئارسنای تارکۆفسکی دەبن و ئەم شیعرە بەوشتەی کەدەیبینین، بە فیلمێکی بەڵگەنامەیی کە فیلم هەڵگرەوەکەی

(50) .A.Kluge , Alexander kluge : a retros pective , the goe the institutes of vorth America , 1988, p.4.



کوژراوە،واتایەکی دیکە دەبەخشێ. پشتڕاستبوون بە کەتوار لەگەڵ شیعر هاوپێناو دەبێ و ئێمە ئاگاداری باشارێك دەکا کە لە وێنەکاندا نەخشی بەستوە: بەرەوڕووبوونەوەی نەمری لەگەڵ مەرگ. بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ تیاچوون، کاتێك کە بڕیارە کە لە رێگەی شتێکدا بمری کە خۆی لە بنەتادا ڕاڤەیەکە لە هەقیقەت. هەقیقەتێك کە لێرەدا بە واتای پەیوەستداربوون بە نیشتمانێك، ئایدیۆلۆژییەکی سیاسی، یا زۆر بەسانایی بە زۆرملێی سەرباز بوون، بەلآی لاوبوون. ئەم چرکەساتانە کە بە واتای قاڵبیی وشە بە "بەڵگەنامەیی" زانراون (و ئەمانە تەنیا چرکەساتەکانی فیلم نین کە بەو واتایە "بەڵگەنامەیی" پێ دەوترێ" سنوری پشتڕاستی بە بەڵگە و نەزیلەو شیعر تێکەوە دەپێچنو لە بنەتادا بە حکومەتی لێبڕاوی ڕاڤە مل دەدەن.

هەر فیلمێکی بەڵگەنامەیی خودان شێوازە و مێتۆدێکی دەربڕینی تایبەت بە خۆیەتی. لە خۆیدا دەربڕین لێڕوانینێکە بۆ ژیان. هەم لەلایەن رەژیدەکەیو هەم لەلایەن هەرکام لە بەرامبەرانی (خوێنەر ـ بیسەر). دیکۆمێنتارێك لە بارەی منالێك کە لە سەرەتای رەزبەرەوە دەچێتە قوتابخانە، باسلێکردنی سالآنی چوونە قوتابخانە و تەکووزپەسندیی ئێمەیە. باسلێکردنی پەسندی فرمانی مامۆستا و هاوپێناوبوونی زانینو دەسەڵات بۆ ئێمەیە. شێواز و مێتۆدی دەربڕین لە بەر ئەم هۆیە هەن کە ئەو شتەی نیچە بە بەرجەوەن ناودێری کرد، هەرامەیەکی یەکتا نیە. کەتوار لە بەر ئەوە رەتەندەیە کە دەتوانێ بە هەزاران هەزار بیچم ڕاڤە بکرێ. فرانژۆ بەجوانی گوتبووی:"کەتوار، کەتوار بەرتەك دەداتەوە".[٥١] فیلمی بەڵگەنامەیی چەشنی بەرهەمێکی هونەری، وەکو شتێکی دروستکراوی زەینو دەستەبژێرکردن و جیاکاری، لە گەوهەری خۆیدا دەسکردە. هەمدیس ئەفراندنە و نەك تۆماری کەتوار. لەم ڕوەوە کلۆگە دەیگوت:"بە تەواوی ئەگەری ئەوە هەیە کە کەتوار وەکو ئەفسانەیەکی مێژوویی بناسێنین.کەتوار شێرەپەڕۆینەیە. خەڵك لەگەڵی چەشنی چارەنوس بەرەوڕوو دەبن، وەلێ چارەنووسیان نیە،بەڵکو بەروبوومی کاری نەوە مرۆییەکانە کە بەردەوام شتێکی یەکسەر جیاوازیان لەو دەخواست و هێشتا لێی دەخوازن. هەمیشە، کەتوار بەشێوەیەکی هاوکات هەم راستەقینەیە و هەم راستەقینە نیە".[٥٢]

سینەما قاببەندییە، کەتوارێك لە رەوتدا. بەشێکی هەڵبژاردە لە کەتوار کە هەموو کەتوار لەخۆ ناگرێ. ئەوەی دوربین تۆماری دەکا نەك جیهانی راستەقینە، بەڵکو "جیهانی راستەقینەی هەقیقەتی زاڵ"ە. بە زمانێکی ئاشناتر "کەتوار ئایدیۆلۆژیی زاڵ"ە. هونەر

(51) .G.RoyLevin, op. cit, P.121, P.128.
(52) .A.Kluge, op. cit, P.6.

دەتوانێ لەم بەلاّی هەمدیسنوێنیی هەرامەی راستەقینە هەڵبێت، ئەگەر وەها کە ئەرەستۆ ئامۆژگاریی دەکرد بەردەوام دەبێ سەرنج لە "ئەوەی کە دەبێ هەبێ" بدا. لەم دۆخەدا مرۆڤان، هەڵکەوتەکانو هەمبەرێتییەکانی بەرهەمی هونەری چەندقات زیندوتر لەمرۆڤانی راستەقینە، هەڵکەوتەکانو هەمبەرێتییە راستەقینەکان دەبن. ژان لوك گدار لە بارەی سێ کەسیەتیی سەرەکیی فیلمی دڵکێشی خۆی (بەناوی)**تاقمی جیا** گوتویەتی کە ئەمانە مرۆڤانی راستەقینەن، کتومت راستەقینەن. لەبەرانبەردا ئەم دنیایە کە لەگەڵ کەتوار یەکانگیر نابێت.دنیا فیلمنایەکی چەوتە و ژیان فیلمێکە کە خراپ دروست کراوە.[٥٣]

## (٥)

ئێستریند بێرگ لەیادنووسێك بۆ **کایەیەکی خولیا** نووسی:" لەم **کایەی خولیایەدا** وەکو کایەی پێشو، دانەر تێکۆشاوە تا بیچمگەلی لۆژیکیی دابڕاو لە یەکدی، بەلاّم بەئاشکرا خولیایەك بگرێتە بەر. هەمووشتان دەتوانن رووبدەن، هەرشتێك دەلوێ و شیمانکراوە. کاتو شوێن بوونیان نیە، لە سەر بەستێنێکی بێرەنگی کەتوار، خەیاڵ لە خۆی گوزەر دەکا و شتێکی تازە دەچنێ. شتێکی دروستکراو لە بیرەوەرییەکان،ئەزموونەکان،خەیاڵگەلی لەزنجیر رزگاربوو، خاڵگەلی پووچو داهێنانەکان".[٥٤]ئەم بەهێزترین بیچمی دەربڕینی زەین باوەڕی (subjectivism) نکۆڵیی دنیای دەرەکیو بەرتەکدانەوەی کاتو شوێن بوو. لە پاش ئەو هەموو بەدحاڵیبونە لەمەڕ کەتوار و هەقیقەت، ئیدی لۆژیکی خولیا پێویست بوو تا متمانەی خەیاڵپەروەریی هونەری زیندوو بێتەوە.

بە نکۆڵیی جیهانی دەرەکیو ماتریالی، واتای تاقانە لە ئاخێوی هونەریشدا کە رەخساو و تەرخانی ریالیزم بوو، بە ناونیشانی یەکێك لە واتاکانی لواو دەهاتە گۆڕێ. واتای تاقانەی جیهان کە دەرەوایەوە، لەگەڵ خۆیشیدا ناسکاری دیکارتیشی برد، واتە گریمانیبوونی خودی ژناسیاو و بەردەوام بەئاگا، تەواو و نەگۆڕ. خودی هەزار پارچە، شوناسی یەکتای نیە. کتو مت وەکو کەتوار و جیهانێکە کە لەواندا دەژی. سەردەمێك هاتە پێشەوە کە مرۆڤێك جارێکی دیکە وەکو **شا لیر** بپرسێ:" من کێم؟ کەسێك پەیدا نابێ کە بە من بڵێ من کێم؟". شوناسی داهێنەرانە، شوناسی جڤاکی، شوناسێکی درۆزنانە کە ئاوەزباوەڕان،

(53) .J.Collet, jean Luc Godart, Paris, 1970, PP.26-27.
(54) .A.strindberg, sixplays, trans.Esprigge, New York, 1955, P.193.



پۆزەتیڤیستەکان، ریالیستەکانو ناتۆرالیستەکان دروستیان کردبوو، وەلاچوو تا بێ شوناسیی راستەقینەی مرۆڤی مودێڕن ئاشکرا بکرێ. پەڕاوگی ناسینەوەی داهێنەران کە هەمان داکۆکی لە شوناسی "مرۆڤی هۆشمەند"و "مرۆڤی دانا" بوو، بە نکۆڵیی کات،شوێن و جیهانی"راستەقینە" لە **کایەیەکی خولیای** ئێستریندبێرگ هاتە کۆتایی. هەنووکە،ئەمە هونەری مودێڕن بوو کە هەنگاوی دواتر هەڵگرێو نیشان بدا کە شوناسگەلی داهێنەرانە تەنیا بە کاری "برێك کەسان" دێن، بەلاّم رۆشنگەری چ خاڵێك نین. ئاخاوتەی نیچە زانرا کە جیهان چ واتایەکی نیە و ئێمە بەردەوام لە تەك واتاگەلی داهێنەرانە و ویستی هێز بەرەوڕووین. هیچ شتێك پڕ راز و رەمزتر لە جیهانی سەمەرەخولقێن و مەتەڵئاسایەك کە لەودا دەژین نیە. گریمانی سادەگەرایانەی نۆژەنکردنەوەی،رۆنراوی گریمانێکی پووچترە: ئەمە کە جیهانمان ناسیوە. ئەزموونی بێواتایی ـ کە نرخێکی گران لە پێناویدا درا ـ نەك تەنیا نیشانی دەدا کە جیهان واتایەکی نیە، بەڵکو بۆ هونەر رۆڵێکی تازەی دادەنا. نیچە لە پێشگوتاری **لەدایکبوونی تراژێدی** (ڕوولە واگنێر) نووسیبووی کە هونەر "کردەی متافیزیکیی پەتی"یە. هەنووکە هونەرمەند لە خۆی دەپرسێ: بۆچی ئەم کردەیە بۆ نۆژەنکردنەوەی شتێك کە برێك کەس ناوی کەتواریان لێناوە، کەم بکەینەوە؟ ئەم کارە تەنیا لە یەك دۆخدا واتای هەیە، ئەمە کە بمانەوێ کەتواری خۆمان سەرتر لە کەتواری هەر کەسێکی دی بهێنینە گۆڕێو پێی بێژین لەبەر ئەوەی من جیهان بەم جۆرە دەبینم، تۆش دەبێ وەهای ببینی.

# نیارڤان*

## ١

فیلمی **فانیو ئەلکساندێر** سازکراوی ئینگمار بێرگمان بەراییەکی هەیە کە بە وێنەیەك لە تەماشاخانەیەکی بچووکی پەڕاوگی، بووکەڵەکانی ئەلکساندێر، دەست پێدەکا. پەردەکان لادەچن و ئێمە لەنێوەڕاستی سەکۆدا کە بەچەند مۆمێك رووناك کراوەتەوە، روومەتی کوڕە هەرزەکارەکە و دەستەکانی دەبینین.ئەو، دووبووکەڵە لە رووبەڕووی یەکدی دادەنێو پاشان سەیریان دەکا. لەگەڵ مۆسیقای شومان و جووڵەی میچەکان، بووکەڵەکانی کاتژمێر دێن، کە یەکێك لەوان مەرگە و داسێکی درێژ بە دوی خۆیدا ڕادەکێشێ. بەبۆچوونی کوڕە هەرزەکارەکە ـ کە ئێستە لەژێر مێزێکی گەورە وەشێراوە ـ پەیکەری ژنێك لەگۆشەی ژوورەکە جووڵەجووڵ دەکا و پاشان مەرگ، مەرگی راستەقینە، لە پشت گژوگیای ڕازێنەرانە لێی واق وڕ بمێنێ. کوڕە هەرزەکارەکە لەم کەش و هەوایەدایە کە داپیرەی دێتە ژوورەوە و بە دەنگەوازێکی هەم میهرەبان، هەم کەمێك پڕگازەندە دەپرسێ: "ئەلکساندێر، تۆ لەو ژێر مێزەدا چی دەکەی؟". لە پاش ئەم هەموە دیمەنی یەکەمی فیلم لەگەڵ وێنەیەك لە تەماشاخانەی راستەقینە دەست پێدەکا. سەرەتا هەوڵی شانۆ و پاشان نواندنێکی شانۆیی دەبینین کە ئەلکساندێر و بنەماڵەکەی لەودا بەشدارنو جێژنی لە دایکبوونی عیسا مەسیحیان گرتووە. باوکە، ئەسکار ئەکدال، کە بەڕێوەبەری تەماشاخانەو نیارڤانەکەیەتی، لەکۆتایی کایەکەدا بۆ هاوکارەکانی دواندەرییەك بە بۆنەی لە دایکبوونی مەسیح و ساڵی نوێ پێشکەش دەکا، بێ ئەوەی کە بزانێ ئەمە دوایین ساڵی ژیانی ئەوە کە دەست پێدەکا:

دۆستان، ئەمە بیست و دووساڵێکە کە من بەڕێوەبەری شانۆی شارمو تازە ئێستە دەمەوێ دواندەرییەکتان پێشکەش بکەم. راستیتان دەوێ من دواندەرێکی باش نیم، بە پێچەوانەی باوکم کە پێشتر لێرەدا کاری دەکرد و چ دواندەرێك بوو! بەهرەی من، واتە تاقانە بەهرەی من، هەر لەم دنیا بچووکەدا پشکوتووە... لە نێوان ئەم دێکۆرە پەڕاوگیانە و ئەم تەماشاخانە، من چەندە و بە چ بارتەقایەك کەسانێك کە لەم دنیا بچووکەدا کار دەکەن خۆشم دەوێن. لەدەرەوەی ئەم دنیایەدا، جیهانێکی گەورە هەیە و دنیای ئێمە جار و بار تاودانەوەی دەکا و

* بازیگر، هنرپیشە/ ئەکتەر.



دەبێتە هۆی ئەوە کە تا باشتر بیناسین، یا... ئێمە بۆ کەسانێك کە هەنگاو دەنێتە ئەم دنیایەوە هەل دەڕەخسێنین تا بۆ چەندساتێك، تەنانەت چرکەساتە ئێجگار کورتەکان، ئەو جیهانە توخسو توندوتیژ و بێبەزەییەی دەرەوە فەرامۆش دەکەن. شانۆی ئێمە هۆبەی تەکووزمەندی، رێسا، ئاگایی و... ئەڤینە.

ئەم گوتانە دوا ئاخاوتەی بێرگمانە، هونەرمەندێك کە تەمەنێکی لە سینەما و شانۆ بە سەر برد تا لەم فیلمەدا، کە لە یەك واتادا دوایین کاری گەورەی ئەو لە سینەما دایە، هەڵێنجانی خۆیشی لە هونەری نیارڤانیو هەم لە جیهانی دەق دێنێتە ئاراوە. قسەی ئەمشەوی ئێمەش لەبارەی هەمبەری نیارڤان لەگەڵ جیهانی بەرهەمدایە. ئێمە دەمانەوێ بزانین کە پێگە و ئەرکی هونەرپیشە یا نیارڤان لە دنیای دەقدا ـ لە دنیای بچووك ـ کامەیە. لە گوتەکانی ئۆسکا ئەکدال، یا ئینگمار بێرگمان، سێخاڵی نێوەندی بەدی دەکەین. یەکەم: هونەرمەندی نیارڤان دنیای بەرهەم دەخولقێنێ کە تاودانەوەی جیهانی ژیانی ڕۆژانەیە. دووەم: چوونە نێو ئەم دنیایە ـ لانیکەم جاروبار ـ دەبێتە هۆی ئەوە کە تا جیهانی راستەقینە، هۆڤی و بێبەزەیی باشتر بناسین. سێهەم: پەیامنامەیەك لەئەستۆی هونەرمەندە، ئەرکی سەرشانی دروستکردنی چێژی نواندن، فەرامۆشیی رەنجەکانو بەڵاکانە تەنانەت بۆ چرکەساتگەلی کورت. رەنگە بتوانین دوایین خاڵ وەها راڤە بکەین کە مەسەلەکە لە سەر مەوداگرتن لە رەنجە مرۆییەکانە، تا لە دوورەوە هەرە مەزنایەتیو هەمە لایەنیی باشتر تێبگەین. ئەم خاڵانە بەدەربڕینێکی دیکە لەگرنگترین بەرهەمگەلی فەلسەفی کە تا هەنووکە لەبارەی هونەرەوە نوسراوەن، واتە پەرتوکی **پۆیەتیکی** ئەرەستۆ هاتون. لەبەرئەوەی کە بابەتی کتێبەکەی ئەرەستۆ هونەری نواندنو بە تایبەتی تراژێدیو کۆمێدیی یونانیيە، خاڵگەلێ کە دەیانخاتەڕوو یاریدەیەکی نایاب لە باسەکەی ئێمەدا ئەژمار دەکرێ. یەکێك لە گرنگترینی ئەم خاڵانە چەمکی "جیهانی دەق"ە.

وەرن لە هەڵکەوتێکی ئایدیالییەوە دەست پێبکەین. گریمان کە ئێمە ئەم بەختەمان بۆ رەخساوە کە فیلمی **فانیو ئەلکساندێر** بە تەواوی لە سەر پەردەی سینەما ببینین. ئەم چەند سەدهەزار نیگارەی کە بە خێراییەکی نەگۆڕ لە بەرانبەر تیشکو لێنزی دوربین تێدەپەڕن و دەکەونە سەر پەردەی سپی، ساویرگەلی زۆر لە زەینی ئێمەدا چێ دەکەن: ساویری بزاوتی مرۆڤانو شتان، ساویری بوونی بێبگاریی وێنە، ساویری یەکانگیریی دەنگەکانو وێنەکانو لە هەموو گرنگتر ساویری ئارایی لە جیهانی بەرهەمدا. دواخەیاڵکرد ئەم وێنایەیە کە دنیایەکی دی بەڕووماندا دەکرێتەوە و هەنگاو لە نێوی دەهاوین، دنیایەك کە لەم پاش نێوەڕۆ زستانییەی کە ئەلکساندێر بە

تەماشاخانەی پەڕاوگیی خۆی سەرقاڵ بووە دەست پێدەکا وبەو دیمەنە جوانەیکۆتایی دەگات کە کوڕە هەرزەکارەکە سەری لە کۆشی داپیرەی دلۆڤانی ناوە تاکو ئەو (داپیرە) شانۆی خولیای ئێستریندبێرگ بخوێنێتەوە:" هەموو شتان لواو و یەکسانن. نە کات هەیە و نە شوێن. لە بەستێنێکی بێڕەنگ لە کەتوار،خەیاڵ لە خۆی دەگوزەرێو شتێکی تازە دەچنێ". مەسەلەکە ئەمەیە: ئایا ئێمە توانیومانە لە دنیای بەرهەمدا بارگە دانێین؟ ئایا بەختی ئەوەمان بۆ رەخساوە کە لە جیهانی ژیانی رۆژانەی خۆمان جیابینەوە و پێ بنێینە دنیایەکی خەیاڵییەوە؟ ئایا ئەو دنیایە بە گوتەی مارتین هایدگێر، بۆتە هێلانە، ماڵ، یا خۆ نیشتمانی هەمدیس وەدەستهاتوی ئێمەیە؟

ڕێداریی ئێمە بۆ ئاسۆی دنیای بەرهەم لەگەڵ هەڵکەوتی هایدنناسانەی دیاری دەکرێ، هەڵکەوتێك کە بە دیالکتیکی بوونی بەرهەم ناودێری دەکەین: بەرهەم لە لایەکەوە بە جیهانی ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤان، واتە بە دنیای وەك دەوترێ راستەقینە ـ یا بە گوتەی ئۆسکار ئەکدال بە "جیهانی گەورە" ـ پەیوەست بووە، نیشانی دەدا و تاودانەوەی دەکات و لە لایەکی دیکەوە لەم جیهانی ژیانی ڕۆژانە جیایەو خودان یاساگەلی تایبەتی هایدنی خۆیەتی. ئەم دیالکتیکە بەم گوڕ و تینەوە، لە چرکەساتی یەکەمی ئەفراندن بەدواوە، پەیتاپەیتا لە بەردەم ئافرێنەری بەرهەمیشدایە. رەنگە لە بەر ئەمە بێ کە هەرکات ئەو تێبکۆشێ تا لە ئەفراندنی دنیای دەقدا، جیهانی راستەقینە بە تەواوی لاسایی بکاتەوە، بۆڕ دەخوا و بەرهەمێکی بێبایەخ سازدەکا. نموونە بەناوبانگەکەی، رێبازی ناتۆرالیزمی ئەدەبی لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمە، کە پێشڕەوەکانی جیا لە بەرەنجامگەلی کۆمەڵایەتیو سیاسیی رادیکاڵ کە دەستڕاگەیشتنیان کردبوویە ئامانجی خۆیان، بەهۆی ئایدیالی لاساییگەریی تەواوی کەتوار و جیهان، تەنیا مەرگی ناوادەی هونەری خۆیان ڕاگەیاندبوو. لێرەدا لەگەڵ چەمکی گرنگ و تێکچڕژاوی "لاساییگەری" بەرەوڕوو دەبین، کە لە چەقی باسگەلی تیۆریکی ئەرەستۆ دایە. مەبەستی ئەرەستۆ ـ کە پەیتاپەیتا لاساییگەری یا دەمەلاسکێ یا بە زمانی یونانی لە mimesis دەدوا ـ نۆژەنکردنەوەی کتومتو تەواوی کردەکان، گوتەکان و رووداوگەلی دنیای دەرەکی نەبوو، بەڵکو بەو گرێکوێرەیەکی چەندقات تێکچڕژاوتری لەبەرچاو بوو. کاتێك کە ئەو دەیگوت کە لە تراژێدیدا کردەوەی کەسان سەرتر لە رەفتاری راستەقینە دێتەنواندن، بە ئاشکرا جیاوازیی نێوان کردەی نواندنگەریو کردەوەی راستەقینەی خەڵکی لە ژیانی راستەقینە لەبەرچاو گرتبوو.[١]

(١) ارسطو، **فن شعر**، برگردان، ع. زرین کوب، تهران، ١٣٦٨، ص ٢٦.



ئەو کەسەی کە وەها تێهزرێت، ئیدی ناتوانێ بەرهەمێکی هونەری بە لاساییکردنەوەیەکی تەواو و کتومتی جیهانی راستەقینە بزانێت. لە جێیەکی دیکەی پەرتوکی **پۆیەتیك** دا ئەرەستۆ دەڵێ کە جیاوازیی گرنگی شیعر لەگەڵ مێژوو لەوە دایە کە لە مێژوودا ئەوەی کە ڕوویداوە جێی هێماکردن یا باسە و لە شیعر یا هونەردا ئەوەی کە دەیتوانی ڕوو بدا، یا ئەوەی کە دەبێ ڕوو بدا باس دەکرێ. ئەرەستۆ لەم خاڵەوە وەها بەرەنجامگیری دەکات کە لە ئاخێوی شاعیرانەدا لە کاروباری هەمەکیو لە ئاخێوی مێژوییدا لە هەرامەی تایبەتی باس دەکرێ. هەر بۆیە شیعر چەندقات فەلسەفیتر لە مێژوویە.[٢] سەرنجدان لە گوتەی سەرەوە بە ئاسانی نیشان دەدات کە ئەرەستۆ مەسەلەیەکی دیکەشی بە شێوەیەکی پەنانەکی خستۆتەڕوو، مەسەلەیەك کە لە باسەکەی ئێمەدا لایەنێکی نێوەندیی هەیە: لە هونەردا ئایدیالو هەڵکەوتگەلی ئایدیال گرنگییان هەیە. رۆشنە کە دۆخی ئایدیالی لەرێگەی لاساییگەری پەتیی رووداوەکانو کردەکانی دنیای دەرەکی وەدەست نایەت، چونکە گەر وەها بێ، ئیدی نموونەی سەرتر یا ئایدیالی لە گۆڕێدا نەدەبوو.

مەسەلەی سەرەوە لە تاوتۆیی نیارڤانیدا ئێجگار گرنگە. نیارڤان هونەرمەندە، واتە دنیایەکی تازە دەخولڤێنێ کە لە هەمان کاتی بەستراوەیی بە جیهانی راستەقینە لێی جیا دەبێتەوە و زۆرێك لە شتان کە بوونیان نیە ـ بەڵام دەتوانن یا دەبێ هەبن ـ دەنوێنێ. نیارڤان تەنیا لەبەرئەوەی کە لە کردەکانو گوتەکانی خۆیدا لە دنیایەکی دیکە دەدوێ، دەتوانێ هەندە لە جیهانی راستەقینە مەودا بگرێ کە ئیدی بە لایەوە هیچ دژوار نەبێ تا بەشێوەیەکی رەخنەگرانە لەگەڵ چەمکی کەتوار و لەگەڵ پێکناکۆکەکانی نێوەکیی جیهانی راستەقینە بەرەوڕوو بێت. دیسان بەم هۆیە، هونەرپیشە دەتوانێ بەستێنی پەیدابوونی لێکدانەوەگەلی فرەچەشنو تەنانەت دژبەر بخولڤێنێ، تەنانەت لە توانایدایە کارێك بکات کە هیچ بەرامبەر (بیسەر ـ خوێنەر)ێك یا تەماشاوانێك لە نۆڕینی ئەو کردانەو بیستنی ئەو گوتانە بە ئاماژەپێکراوێکی لێبڕاو و بنەتایی بگات. بایەخو مەزنایەتی کاری نیارڤان لەوە دایە کە دەتوانێ کارێك بکات کە هەر کام لە تەماشاوانان لە سەر بنەمای زانراوەکان، جیهانبینی، تامەزرۆییەکانو ویستەکانی ئاگا و نائاگای خۆیدا ڕاڤەیەکی کەسیو وێدەچێ تازە لە کردەکان، گوتەکانو هەڵکەوتەکان ساز بکات. بەم چەشنە بۆ هەر ئاماژەپێکەرێك چەندین

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشو، ٤٧-٤٨.

ئاماژەپێکراوی جیاواز و فرەچەشن دروست دەکرێ. بە دەربڕینی دی نیارڤان نیشانەسازە، کتومت وەکو نووسەر و هەر هونەرمەندێکی دی. ئەو توخمێکی دیاریمەند لە بەرهەمدا نیە، بەڵکو ئاسۆی ئاماژەکانی بەرهەم دیاری دەکا، کارایان دەکا، دەیان گۆڕێت.

کاتێك کە زاڵبوونی بێ ئەملاو ئەولای کەتوار وەها دەچێتە ژێر پرسیار، هەم هونەرمەند (چ دانەری بەرهەم، چ نیارڤان)، هەم بەرامبەر (تەماشاوانی بەرهەم) ئەو تاقانە پەرتوکە ژێدەرەی خۆیان لە کیس دەدەن. ئەوان ئیدی پێوانەیەکی ئەرخەیانگەریان لە بەردەستدا نابێ کە بە یاریدەی بتوانن ڕاستی یا درۆی ئەم یا ئەو خاڵە تایبەتەی کە لە بەرهەمدا هاتۆتە گۆڕێ، تاقی بکەنەوە. لێرەوە، هونەرمەند و بەرامبەر (بیسەر - خوێنەر) سەرەتا تێدەگەن کە ئەو پێوانە ئەرخەیانگەرەی خۆیان بەرەنجامی گرێبەستێك بووە و درك پێکردنی ئەرکی کەتوار و هەقیقەتی جیهانی دەرەکی، خۆی زادەی راڤەکانو بەتایبەت بەروبوومی ئەرکی توخمگەلی زمانیو میتافۆریك بووە. لە هەنگاوی دواتر هەم هونەرمەند و هەم بەرامبەر (بیسەر - خوێنەر)(هەر کام بە جۆرێكو بە ئامرازێك) وەدوی دۆزینەوەی پێوانەگەلی دیکە دەکەون. فریدریش نیچە کە لە سەر لەگۆڕنەبوونی هەقیقەتێکی بەرهەست پێداگری دەکرد، باشتر لە هەر فەیلەسوفێکی دی نیشانیدا کە ویستی دەستڕاگەیشتن بە هەقیقەت نەك تەنیا شتێکی لواو نیە، بەڵکو لە خۆیدا بەیانگەر، بیچمدەر و گوڕبەخشی ویستێکی دیکە، واتە ویستی هێزە.[٣] ئەو نیارڤانەی کە ئاگاداری ئەم خاڵە بووبێتەوە کە خۆی بەیانگەری هەقیقەتێکی سپیتا، دەرەکیو بنەتایی نیە، ئاسانتر دەتوانێ لەرێگەی ئەم مەوداگرتنی رەخنەکارانە لەگەڵ "هەقیقەت" شتێکی تازە بخولقێنێ کە بە ڕووی ڕاڤەگەلی جۆراوجۆر ئاوەڵا بێت. ئەو بە سەرهەڵدانی لێکدانەوەگەلی نوێو ڕاڤەگەلی جوانکارانە هەل دەڕەخسێنێ. نیارڤانێك کە لاساییگەری لە کەتوار تاقانە چاوساخو باشقەی تیۆریك و کردەکی کاری خۆی نەزانێ، سەرکەوتن وەدەست دێنێ تا "هەقیقەتە فرەفاقەکان" بخولقێنێو ئەمە گرنگترین کارێکە کە نیارڤانێك دەتوانێ ئەنجامی بدا، چونکە لەم دۆخەدا ئەو شتێکی تازە بە سەر جیهانی دەقدا زێدە دەکا، شتێك کە دەکرێ بە "هۆکاری مرۆیی"، واتە "توخمی نیشانەساز" ناودێری بکەین. لەم دۆخەدا - و تەنیا لەم دۆخەدا - یە کە نیارڤان ویستی هێز دەدرکێنێو ئاشکرای دەکا.

(٣) بڕواننە وتاری "ویستی هەقیقەت لە نیگای نیچە" لە:ب. احمدی، **کتاب تردید**، تهران، ١٣٧٤، صص ١٤٢-١٦٧.



## (٢)

لە نێو توخمگەلی پێکهاتەیی بەرهەمێکی شانۆیی - بۆ نموونە فیلمێکی سینەمایی - هۆکارانێکی جیاواز بە "هۆکارگەلی مرۆیی" ناودێر دەکەین. یەکێك لە گرنگترینی ئەوانە لە ئاستی "چیرۆکی" (diegetic) دێتە گۆڕێ و تێکڕای ئەو خاڵانەیە کە لە سەر پەردەی سینەما دەبینرێن یا هاوکات لەگەڵ وینەکان دەبیسرێنو هەواڵ لە هەنتەشی مرۆڤ دەدەن، وەکو خانوەکان، ئامراز، تێکڕای شتانێك کە بەروبوومی کاری رەنێوهانەرانەی مرۆڤن، دەنگە مرۆییەکانو ئاوازە مۆسیقاییەکان. لە ئاستی بەرامبەری بەرهەم، ئەم چەمکە مرۆیییە بە بیچمێکی چەندقات بەرینتر لە گۆڕێدایە: زەینی مرۆڤێك - واتە بەرامبەر - ە کە واتا بە هەموو شتێك دەدا، بۆ هەر ئاماژەپێکەرێك ئاماژەپێکراوێك ساز دەکا و یا ئاماژەپێکراوێکی دروستکراو پەسند دەکا و بە کاری دێنێ. عارف و نووسەری سویسیی سەدەی پێشو هانری فرێدریك ئامیل گوتبووی:"هەر بەرجەوەنێك هەڵکەوتێکی رۆحە". بەرامبەری (بیسەر - خوێنەر) بەرهەمی هونەری تەنانەت لە توخمگەلی سروشتی کە لەواندا لە هەنتەشی مرۆڤ هیچ هەواڵێك نیە، دەتوانێ هەڵکەوتێك بخولقێنێ کە لە مەزنایەتییەکان یا کەمایەسییەکانی رۆحی مرۆڤ هەواڵ دەدا.

جیا لەم توخمە کەم تا زۆر تەکووز و رێسامەندکراوە، توخمێکی مرۆیی دیکە هەیە کە ئاسان ناتوانی وەکو نیشانە یا کۆماگێك لە نیشانەکانی بیناسیتو دیاریی بکەیت. دژوارییی کارەکە لەمەڕ ئەم توخمە لەمەش زیاترە، چونکە خۆی "نیشانە ساز"ە، واتە رەخسێنەری کۆماگێك لە ئاماژەگەلی تازەیە. ئەمە توخمی تایبەتو یەکتای ئارایی دەسبەجێی ویست، وارسکەو یادەوەرییە مرۆییەکانە و هەربۆیەش بە تێکڕاییو بەشێوەیەکی لێبڕاوانە و تەواو هەمدیس ناسینەوەی نیە. دەکرێ ببینی کە ئەم توخمە مرۆییەی دەربڕین دەتوانێ لە یەك ساتدا نەك تەنیا بۆ تەماشاوانانی فرەچەشن، بەڵکو تەنانەت بۆ یەك تەماشاوانیش کۆماگێك لە ئاماژەکان بخولقێنێ و سەرهەڵدانی واتاگەلی تازە لواو بکات. ئەم توخمە، نیارڤانە.کاتێك رۆبێر برسۆن دەڵێ کە جیاوازیی نێوان نیارڤان لەگەڵ توخمێکی سروشتی وەکو درەختێك جیاوازییەکی هایدنناسانەیەو درێژەی دەداتیو دەڵێ کە :"ئەوانە بە دوو دنیای جیاواز پەیوەستن، یەك درەخت لە شانۆدا درەختێکی راستەقینە واخۆنواندن دەکات"[٤]، لە راستیدا

(4) .R.Bresson, Notrle cinematogaphe, Paris, 1974,p.15.

دەیەوێ ئەم خاڵە بێنێتە پێشێ کە لە دیدی ئەوەوە نیارڤان واخۆنواندنی مرۆڤ یا کەسێتییەکی شانۆیی نیە و کارەکەی لە لاساییگەری لە کارەکانی مرۆڤ کورت نابێتەوە. نیارڤان خۆی وەها کە دەردەکەوێ مرۆڤێکی کامڵە و توانایی ئەوەی هەیە کە دنیایەك لە واتاکان بخولقێنێو دۆزینەوەی ژمارەیەك لەو واتایانە هەندە دژوار بێت (هۆیەکی بوونی توخمگەلی نائاگای دەرونی ئەو) کە ڕێگە بۆ هێنانە گۆڕی ڕاڤەگەلی ئێجگار جیاواز خۆش ببێ. نیارڤان لە پەیکەری قاڵبەکان، ڕەمزەکانو سەرباشقە هونەریو جڤاکییەکان کار دەکا، بەڵام لەبەرئەوەی کە لە خودی کەسێکدا ـ تاکایەتییەکی پەتی ـ یە و وزەی زەینیی بە یادەوەرییەکان، پاڵنەرگەلی سەراسای کۆدەمار و هەستبەر و دەرونی پەیوەستە، پەیڕەوی ڕێساگەلی نائاگایی خۆیەتی، دەتوانێ زۆرێك لە قاڵبە زاڵەکان، پێوانەکان، سەرباشقەکانو ڕەمزەکان تێك بشکێنێ، یا بیانگۆڕێتو بارتەقای شوێندانەرییان کەم یا زۆر بکات. هەر قەڵافەت بەخۆگرتنێك، هەرجووڵەیەکی خۆویستانە یا نەویستانەی جەستە و ڕوومەتی نیارڤان ئافرێنەری دنیایەك لە کەرەستەگەلی ڕاڤەیی‌یە. دەنگی نیارڤان، جوانی یا سیفەتگەلی جەستەیی ئەو و هێزەکانی دیکە و توانا جەستەییو ڕۆحیی ئەو کە بە هیچ شێوەیەك قەتیسماوی فێرکارییە هونەرییەکان و جەستەی کارناسانەنابن، خۆیان دەتوانن ڕەژیدەی ئاماژەگەلی تازەبن. ئەم ئەگەرانە کە نیارڤان دەیخولقێنێ، بە سەرنجدان لە ڕووبەڕوویی‌و هاوپێناویی نیارڤانانی فرەچەشن لە یەك بەرهەمدا، چەندقات زیاتر دەبێت. بەم چەشنە، ڕۆنانگەلی تێکچڕژاو بیچم دەگرن کە چۆن لەگەڵ کاری داهێنەرانەی بەرامبەر (بیسەر ـ خوێنەر) هاوپێناو بن، جیهانێکی ناکۆتا لە ئەگەرەکان دەئافرێنن.

هەر کات جیهانێك لە ئەگەرە زۆرەکان بڕەخسێ، وەها کە بتوانی لەنێوان ئەم ئەگەرانەدا بڕێك هەڵبژێریو هەندێکیش بەرتەك بدەیتەوە، هەر کات ئەگەری هەڵبژاردن لەنێوان ئالتەرناتیڤە جیاوازەکان لەسایەی ڕاڤەوە بەرهەڤ بێت، ئێمە لەگەڵ ڕەهەندی سەرەکیی ئازادی بەرەوڕوودەبین.نیارڤان بەئەفراندنی گرنگترین ئەگەرەکانی راڤەی هۆکارەکانی جیهانی بەرهەم، هەواڵی ئازادیی دەستەبژێر کردن، واتە گەوهەری ئازادیی مرۆیی دەگەیەنێ. نیارڤان توخمێك لە بەرهەمی هونەرییە کە بە ڕواڵەت بەرتەسكو کۆتکراوی ڕۆڵ یا پێرسۆناژە و وەها دەنوێنێ کە دەبێ ملکەچی ڕێنوێنی و ویستەکانی دانەر، دەرهێنەر، ئامادەکار و وێدەچێ کەسانێکی دیکەش بمێنێتەوە.بەڵام،بەکردەوە نیارڤان لە هاتنەدیی دەوری خۆیدا دەبێتە هەواڵ هێنەری سەرەکیی ئازادیی مرۆڤ. توانایەکی وەشێراو لە کاری نیارڤانیدا هەیە کە هەرکە لەگەڵ درك



پێکردنی تەماشاوان لە ئازادی (بۆ نموونە لە ئازادیی‌یە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکان بەڵام نەك تەنیا لەمانەدا) یەکانگیر دەبێ، بەرەنجامگەلێ وەباردێنێ کە لە باسی ئەرەستۆ لە پاڵاوتنی گیانی بەرامبەر (بیسەر ـ خوێنەر)ـ کە لە دیدی فەیلەسوف ئەرك و پەیامنامەی سەرەکیی بەرهەمی هونەری‌یەـ هاتووە.

بەمجۆرە کاری نیارڤان لەگەڵ کاری تەماشاوانیش پێکبەستراو دەبێت: گوزەری خەڵکان لە گۆڕەپانی پڕ لە بەفر کە لە دەسپێکی **فانیو ئەلکساندێر** لەچاوی ئەلکساندێرەوە دەیبینین، دەبێتە هۆی ئەوە کە ئەو شوێنە ئیدی گۆڕەپانێك، واتە شوێنێکی تایبەت نەمێنێتەوە. گۆڕەپانانی بێ‌ئەژمارە بۆ تەماشاوانانی زۆر و زەوەند. هەر کەس کاتی تەماشای فیلم، بە تایبەت لەبەر هاوپێناوی لەگەڵ توخمەکانو هۆکارگەلی مرۆیی بەرهەم، دنیایەکی تایبەت بە خۆی دروست دەکا. ڕەنگە بتوانین بێژین کە هەرکەس لە دنیای تایبەتی خۆی، لە هەر فیلمێکدا هەواڵ وەردەگرێ. سینەما نەك لە یەك جیهان بەڵکو لە دنیاکان، نەك لە کەتوارێك بەڵکو لە کەتوارگەلی بێ‌ئەژمار هەواڵ دێنێ. بۆ سینەماگەر و تەماشاوان هەقیقەت شتێك نیە جگە لە سیستمی ڕێککەوتنگەلی سینەمایی. سینەماگەر و تەماشاوان ـ دوو ئاراستەی پێوەندی ـ بە ئاسانی دەبینن کە ئەو سیستمی ڕێککەوتنانە لە گۆڕانهاتون. لەم ڕووەوەیە کە هەردووك دەتوانن لەم خاڵە تێبگەن کە کەتواری ڕووداوەکانی ژیانی ڕۆژانەش شتێکی دەرەکیو ئوبژکتیڤ نیە، بەڵکو شتێکە کە ئێمە خۆمان سازی دەکەینو ژیانی پێ دەبەخشین.لەنێوان نیارڤان و هۆکارەکانی دیکەی فیلم جیاوازییەکی گەورە هەیە، ئێمە هۆکارگەلی دیکە نیشانەدانان دەکەینو هەموو شتەکانیان بە پێی پێناسەکانو ڕێککەوتنەکان دەناسین، وەلێ نیارڤان لەم چوارچێوەیە پێ دەهاوێتە دەرێو خۆی دەبێتە نیشانەساز و لەبەرئەوەی کە مرۆڤێکی دیکەیە، ئەگەری ئەوەمان بۆ نارەخسێنێ کە بە تەواوی بیناسین. نیارڤان ـ وەکو هەر مرۆڤێك ـ دەتوانێ هەرساتێك بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو، کارێك بکات کە لەوەی پێشتر ئێمە ئەوەمان لە قاڵبی تەسکی یەك پێناسەدا پەستاندبوو، شەرمەزار بین. وردبوونەوە لە کاری نیارڤان دەتوانێ وامان لێ بکات کە لە بنەڕەتڕا لە هەر چەشنە "پێناسە"یەك وەڕس بین. لەوەش گرنگتر، نیارڤان کامڵتر لە هەر هۆکارێکی دیکە وێنای ژیان لە دنیای ئایدیالی ـ یا لانیکەم لە جیهانێکی باشتر لەمە ـ دەخاتە نێو جەرگەی دنیای بەرهەمەوە. هەواڵ لە ویستی هێزدەدا و لەم ڕێڕەوەدا لە ئازادیی مرۆڤ دەدوێ.

سینەما لە دەسپێکی سەدەیەکدا هاتە دنیاوە کە لەودا کۆمەڵ بەسەر تاك دا زاڵ بوو. سینەما چەندقات لەنێو خەڵکانێك کە لە کۆتی سەرەڕۆییدا دەژیان بیچمی گرت، پەسند کرا و بوو بە گرنگترین هونەری سەدە. وەها ڕوویدا، چونکە هەلی ئەوەی دەڕەخساند کە هەرکەس لە تاریکی و خەڵوەتی هەر هۆڵێکدا، لەسەر هەر ئەسکەملێك، دنیای تایبەت و یەکتای خۆی بخۆڵقێنێ. چونکە ئەگەری ئەوەی بۆ تاك دەڕەخساند تا بە تامەزرۆییەکان و ئارەزوە شاراوەکانی دەستی رابگات و ئازادانە بۆ خۆی دەریان ببڕێ و دووپاتیان بکاتەوە. هونەر ئەگەر گۆڕانکارییەك دروست بکا و گەڵاڵەیەك بڕەخسێنێ، ناتوانێ ئەم کارە جگە لە ڕێگەی زێدەترکردنی ئازادیی بەرامبەر( بیسەرـ خوێنەر)ی بەرهەمی هونەری ئەنجام بدات. لەنێوان دنیای بەرهەم لەگەڵ ئازادیی مرۆیی پێوەندییەکی نەپساوە هەیە. هونەر بە تاکەکەسێك ئیزن دەدا تا هەقیقەت وەها کە دەیەوێ، وەها کە پێی وایە دروستە، بخولقێنێ و نەچێتەژێرباری هەقیقەتە داسەپاوکان، واتە ئەو درۆیانەی کە ناوی هەقیقەتیان لێ ناون. هونەر ئەگەری ئەوە دەڕەخسێنێ تا هەر هونەرمەندێك و هەر بەرامبەرێك (بیسەرـ خوێنەر) لە ئەشکەنجە و ژانێك کە مرۆڤانی سادە لە ژیانی رۆژانەیاندا بەرگەی دەگرن، هەقیقەتی بنەتایی و شاراوەی رەنجی مرۆیی تێبگا و وێنەی بکێشێتەوە و ئەو هەموە هیی خۆی بزانێت. لێرەدایە کە دەوری نیارڤان زەق دەبێتەوە، هەرکە بتوانین جیهانی فیلم وەها دروست بکەین کە دنیایەکی لێوڕێژ لە پارادۆکس و دژیەکەکان بنوێنێ، تەماشاوانمان گۆڕیوە. هەرکەس لە هەمبەر وەدەرکەوتنی پارادۆکسەکان هەستیارە، چونکە لە نێویاندا دەژی و دەزانێ کە لەنێوان نایەکانگیری و هێز پێوەندییەکی دێرێن هەیە. فۆرمولی ئێمە سادەیە: دنیایەك هەیە کە ئێمە پێمان وایە راستەقینەیە، بەڵام دادپەروەرانەی نازانین. بە ئامرازی سینەما دنیایەك سازدەکەین کە چەندقات راستەقینەتر لە دنیای یەکەمە، نەك لەبەر ئەوەی کە وێنەیەکی درۆزنانە لە دادپەروەری دروست دەکا، بە پێچەوانەوە، چونکە وردتر باسی دژیەکەکان دەکا و لەواندا لە ئارەزوەکان، پەژارەکان، خەفەتەکان، داراییەکان و نەدارییەکان، سازکردنەکان و تێکشکانەکان و... زیاتر دەتوانی ئاسەوارێك پەیدا بکەیت. کاتێك جیهانی فیلم لە پێش چاوی تەماشاوان ڕادەخەین، هەریەك لەوان لە ڕێگەی ئەزموونەکانی خۆی فێر دەبێ تا جیهانی تایبەت بە خۆی ساز بکات. کەسێك کە ئەگەری رەخساندن و داهێنان، ئەگەری گۆڕین و داخوازی شتێکی تازەی ئەزموون کردبێ، ئەمەگ و برەوداریی ئازادی زیاتر دەناسێت. وەها کەسێك رازێکی دێرین دەدۆزێتەوە، کە لەهەمان کاتدا دەربڕینێك لە هەرە پێویستیی هونەریشە: پێوەندییەك هەیە لە نێوان هەقیقەتێك کە دروستی دەکەم و جیهانێك کە پەسندی ناکەم.



## (٣)

نیارڤان بەردەوام دەربڕی تاکەکەس، پلەوپایەی ئەو، مەسەلەکانی ژیانی مادی و فیکریی ئەو نەبووە. دەتوانین مێژوی هونەرگەلی شانۆیی لە گۆشەی پێگەی نیارڤان لە جیهانی بەرهەمی هونەری و پلە و پایەی تاکەیەتی لەودا، بەسێ دەورەی سەرەکی دابەش بکەین.لە دەورەی یەکەمدا کە بە " سەردەمی کلاسیك" ناودێر دەکەین، نیارڤان نوێنەری تاك و دەربڕی تایبەتمەندیگەلی مرۆیی نەبوو، بەڵکو کاروباری ئێجگار هەمەکیتر و ئەبستراکتر واتە گرێکوێرە رەوشتی و فەلسەفییەکانی ئاشکرا دەکرد. لە دەورەی دوەم کە بە" سەردەمی مودێڕن"ناودێری دەکەین، نیارڤان دەربڕی ناسکار، کەسێك، مرۆڤێکی دانا و ژناسیاو سەرپشك دەزانرا. ئەمە دەورەی باوەڕ بە " ئاگایی رەژیدە" بوو. لە دەورەی سێهەمدا، کە بە "سەردەمی پۆست مودێرن" ناودێری دەکەین و هەنوکە لەودا بەسەر دەبەین. نیارڤان نوێنەر یا دەربڕی کەسێك دەزانرێت کە بارودۆخێکی هەرۆڵی لە هەمبەر هەڵکەوتی تاکەکەسی، توانایيگەلی ئەپستمیك، سەقامگیریی باوەڕەکان و زانراوەکان و لەوەش گرنگتر لە دروستیی بۆچوونەکان و ویستەکانی خۆی بە گومان بووە. بە زمانی هێگلی ئەمە دەورەی " ئاگایی ناشاد"ە.

نموونەی باش بۆ رۆشنگەریی سەردەمی سەرەتا، هونەری شانۆی یونانە. لەم هونەرەدا کەسیەتیی شانۆیی بەیانگەری سیفەتگەلی نموونەیی، یا هەمەکی، یاخدەی هاوبەشی مرۆیی بوو. لەم روەوە، نیارڤان مرۆڤێکی تایبەتی نەدەناساند، بەڵکو دەرخەری" هەڵکەوتە مرۆییەکان "بوو و ئەوانەی بە دەربڕینێکی ئێجگار هەمەکی و ئەبستراکت دەنواند. ئانتیگۆنە لە تراژێدیی سوفۆکلیس یا **ایفی ژنی** لە شانۆی ئۆرپپید تا ئەوەندە وەکو کەسیەتیەکی مرۆیی پەسند دەکران کە دەیانتوانی لە هەڵکەوتگەلی جۆربەجۆر و لە بەرکەوت لەگەڵ کەسیەتییەکان دەربڕی یاساگەلی هەمەکیی رەوشتی و ئەپستمیك بن. لەم باسەدا، چەمکی " یاسا" ـ یا بە گوتەی یونانیان Dikeـ گرنگە، چونکە دژبەرایەتیی ئەم یاسایانە چەندقات گرنگتر لە دژبەرایەتیی ویستە چلێسانەکانی کەسەکان بوو. دژبەرایەتیی یاساکان لە شانۆدا کردە و دەربڕینی نیارڤان دەناسرایەوە، بەڵام بانتر لەوان هەڵدەکشا.

ناسینی کت ومتی دنیای نێواخنیی ئانتیگۆنە وەکو ژنێکی لاو و مەسەلە دەرونی و سۆزدارانەکانی ئەو گرنگییەکی ئەوتۆی نەبوو، هەرکەس کە لە جێی ئەو کەوتبایە وەها

هەڵکەوتێکەوە بەناچار بەربژێرێکی هەڵدەبژارد کە لە بەردەمیدا بوو. بڕیاری ئەو بەرلەوەی کە لە رووی ئەڤینداریییەوە بەبرا، یا نەفرەت لە کرئۆن بێت، هەڵبژاردنێکی ئاگایانە لە ئەرکی یاساکان و دژبەرایەتییەکانیان بوو. ئانتیگۆنە بە نرخی ژیانی ویستی کە یاسای ئاسمانی جێبەجێ بکرێت. ئەو لە هەمان کاتدا کە ئاگاداری دژبەرایەتیی یاسای ئاسمانی لەگەڵ یاسای زەمینی بوو، فرمانە سپیتاکانی سەرتر لە فرمانی دەسەڵاتی زەمینی دەزانی، لە راستیدا تراژێدیی سوفۆکلیس دەربڕینی دژبەرایەتیی یاساکان بوو و نیشانی دەدا کە هەرکام لەم دوو یاسا ئاسمانی یا زەمینیـیە گەر بباتەوە، بنەواشە رەوشتییەکان و هەڵێنجانگەلی تازە لە دادپەروەری و ژیانی کۆمەڵایەتی زاڵ دەبن. بە گوتەی ژاك دێریدا جیاوازیی نێوان" دوو بەرنامەی هایدنی جیاواز"، واتە دوو نەخشەی یەکسەر لێکجیا بۆ ژین بردنە سەر لە جیهان بوو و لەبەر ئەم هۆیەش بوو کە ئانتیگۆن و کرئۆن لە مشت ومڕی خۆیاندا دەیانتوانی خاوەن ماف بن [٥]

کاتێك کە هیراکلیتۆس فەیلەسوفی یونانی دەیگوت کە " کەسیەتیی مرۆڤ چارەنووس(daimon)ی ئەوە"[٦] لە راستیدا لە جۆرێك پێرستبەندیی دانایی دەدوا ، لەوە کە هەمووومان لە چنگی دایمۆندا تووشین. دایمۆن خودان گەوهەری خوایییە، وەلێ خوا نیە، نێوبژیوان یا ڕایەڵی مرۆڤ و خوایە، بەیانگەری بەشی خوایی مرۆڤە، بەشی هەرمانی مرندە.* ئەگەر هەر مرۆڤێك دایمۆنێکی لەبەر دەستدا بێت، ئەم خاڵەش هەڵبەت لەمەڕ نیارڤانیش وەڕاست دەگەڕێ. خاڵی جێی سەرنج دەرخستنی دایمۆن دەبێ و نەك تاکایەتی. لە شانۆگەلی یونانیدا کەسیەتیی تاکەکەسی، بەواتایەك کە ئێمە ئەمڕۆکە دەیناسین، لەبەرئەمە گرنگ نەبوو کە هەر نیارڤانێك دەبێ تەنیا دایمۆنی کەسیەتی، واتە چارەنووسی ئەو یا بە دەربڕینی تێکچڕژاوتر، بەڵام کت و متتر" کەسایەتیی کەسیەتی"ی ئەوی دەردەخست.کەوابوو دەتوانین بێژین لەم شانۆیانەدا" کەسیەتی چ پێوەندییەکی لەگەڵ تایبەتمەندییە تاکەکەسییەکانەوە نیە، بەڵکو زیاتر پێوەندیی بە تایبەتمەندیگەلی نموونەیەکە کە لە هەڵکەوتە گشتییەکانی مرۆییدا، کە لە کۆگای گێڕانەوەگەلی ئوستورەیی وەرگیراون، بە بیچمێکی ئاشکرا و پڕگوڕوتین

(6) . Heraclitus , frag ments , trans . t.m.robinson , university of Toronto press, 1987, p.69. herocit , fragments, trans. F.rossille, paris , 1994, p.51

* هەر بوونەوەرێك دەمرێ و مەرگی بەسەرا دەسەپێ. (و)



دێنەگۆڕێ. کەسیەتییەکانی شانۆنامەکانی ئەو (سوفۆکلیس)* نە نموونەیەکی چەشنین، نە وێنەیەك لە تاکەکەسان، بەڵکو نموونەگەلێکن لە مرۆڤی هەمەکی کە رۆحێکی گەورەی هەیە و لەگەڵ مەسەلەی ئێجگار دژواری هەڵبژاردنی رەوشتی یا رەنجی ناعەقڵانی رووڵەڕوویە. لە تراژێدیی سوفۆکلیسیدا لەو یەکتاییە دیاریکەرەی کەسانێك وەکو هاملێت یا لیر هەواڵێك نیە.لە بەرانبەردا، لە تراژێدیدا ئەم مەسەلەیە دەکەوێتە بەر کەندوکۆڵ کە کاتێك بنەڕەتیترین بایەخەکان و توانایییەکانی وەها کەسیەتییەك دەخرێتە بەر تاقیکارییەوە چ پێش دێ". [٧]

هەنتەشی یەکلاکەرەوە، هەواڵدەر و زۆرجاران دەوری پێشگۆی هاوچڕان لە شانۆی یونانی کەوناراش(بەو چەشنەی کە نیچە لە **لەدایکبوونی تراژێدی** دا وەبیری هێناوەتەوە)نیشاندەری ئەم ئاراستە لێدەربازنەبوو،حاشاهەڵنەگر و چارەنوس ئاسای بڕیاری کەسیەتییەکان بوو. هاوچڕان کە هەڵبەت خودان تایبەتمەندیی کەسیەتی و تاکەکەسی نەبوون، لە ڕاستیدا هەواڵی رووبەڕووبوونەوەی یاساکانیان دەدا. هۆی ئەمە کە لە شانۆ یونانییەکاندا نیارڤانان ناچار دەبوون تا لە دەمامك( ماسك)کەڵك وەرگرن،هەر ئەم هەوڵدانە بۆ لەنێوبردنی تاکەیەتی و تایبەتمەندیگەلی مرۆیی بوو. تەنانەت لە زۆرخاڵدا نیارڤانان ناچاردەبوون راهێنانی درێژخایەن و ماندوکەر ئەنجام بدەن تا ئاوازی دەنگی خۆیان وەها بگۆڕن کە خودان هیچ تایبەتمەندییەکی تاکەکەسی نەبێ. بیچمی ئایدیالیی هەنتەشی نیارڤان نزیکبوونەوەی ئەو لە نموونەیەکی سەرەکی بوو کە تەنانەت پسپۆڕانی کاری نواندنیش نەتوانن شتێکی تایبەت و خدەیەکی تاکەکەس لەودا لێك هاوێر بکەن. لە کاری نیارڤاندا تەنانەت ئاشکراترین بیچمەکانی سەرهەڵدانی وارسکەکان و خوەکان، خاڵگەلی وەکو توورەبوون، دڵسۆزی، هۆگری و ئەڤین، رکێشە سێکسییەکان و هتد، دەبایە لەهەر چەشنە مۆر و تایبەتمەندی سڕابایەوە.لەم دۆخەدا نیارڤان ناچارنەبوو تا شتێك لەئاخنەی خۆیەوە بەمایە دابنێ و تێبکۆشێ تا لانیکەم دەرکەوتگەلێ لەئاخنە و دەرونی کەسێتی ئاشکرابکات.ئەو دەبایە بەپاراستنی مەودا لە دەورگێڕان، بەدەر لە هەستەکەسییەکانی خۆی، رێساکانی ڕاپەڕاندبا.ئەم رێسایانە ئێجگار دژوار شیانی گۆڕان بوون و رەمزگەلی شانۆیی گوایە یەك جار و بۆ هەمیشە دیاری دەکرا، ڕاپەڕاندنی جێی پەسند و پێشێلکردنی بنەواشەکانی نەلواو یا ئێجگار دزێو بوو.

* تێبنی لە نووسەرە.(و)

(٧) چ. سیگال ، **سوفوکلس** ترجمەی خ. دیهیمی ، تهران، ١٣٧٥، ص ٢٩.

بە سەودای ڕەواندنەوەی تاکایەتی و دەربڕینی هەڵکەوتی دژبەرایەتیی هەمەکی بوو کە شیعر بنچینەی کاری نواندنی یونانی دەهاتە ئەژمار. بەکارهێنانی پەخشان لە تراژێدی دیاردەیەکە کە گرێدراوی ڕۆژگاری نوێیە و لە شانۆی کەوناردا هیچ مێژینەیەکی نەبوو.[8] شیعر لەگەڵ کێش و ئاوازی خۆی لەزمانی گوتاری دووردەکەوێتەوە، لەگەڵ خەدی ناسیاوی سڕەوەی خۆی هەرچییەك کە شیانی پێشبینی بێت وەلادەنێ و بە گوتەکان و تەنانەت کردەکان لایەنی چارەنوس ئاسا دەبەخشێ.هەڵبەت لە تراژێدییەکانی پاش ڕێنسانسیش شیعر جاروبار بە تەنیایی( ڕاسین) و جاروبار لەپاڵ پەخشان( شکسپیر) بەکار دەهات، وەلێ لەم خاڵانەدا توخمگەلی بێئەژماری دیکە لەکاردابوون تا تەماشاوان لە خەدی تاکەکەسی و تایبەتی کردەی کەسیەتیی شانۆیی و نیارڤان ئاگادار ببێ و شیعری شانۆییش لەو خەدە بێگانە و دوورە دەستە مەودای دەگرت. لە شانۆی تازەدا ئاخاوتەی شاعیرانە لە باشار لەگەڵ ویستی کەسیەتییەکان جۆرێك وزەی هەموارکەرە،تا بەردەوام  جیا لە ئاگایی و ویستی ئەوان بکەوینەوە یادی ئاراستەی چارەنوس ئاسای هایدنی مرۆڤیش. دەتوانین لەگەڵ ئێزراپاند هاودەنگ بین کە لە شانۆکانی سەردەمی نوێدا شیعر تەنیا متمانە و برەوی ئەدەبی هەیە، نەك شانۆیی.[9] بێجگە ئاخاوتەی شاعیرانە کە تەنانەت لە سادەترین گفتوگۆکانی شانۆیی کەوناراش بەکار دەهات، شێوازەکان و ئامرازێکی دیکەش دەستڕاگەیشتوو بوون کە سەرنجی تەماشاوان لە خەدی تاکەکەسی و تایبەتی کردە و گوتاری نیارڤان دوور بکاتەوە و دۆخی ئەبستراکت و هەمەکی بخولقێنێ. ئێمە مخابن لەبارەی بەکارهێنانی مۆسیقا لە شانۆگەلی یونانی کەونارا شتێکی ئەوتۆ نازانین. لە دەقگەلێ کە زۆرکەمن هێما بۆ پێگەی مۆسیقا لە شانۆی یونان کراوە و ئەمە بۆ بەرەنجامگیری بەس نیە. لە بەرانبەردا، لە برێك شێوازی شانۆیی ئاگادارین، کە لە پەسندی فرمانی سەرەکیی ئێمەش بەکار دێن و یەکێك لەم شێوازانە Agonە. لەنێو شانۆدا هەندێ وەستان ڕوویان دەدا تا کەسیەتییە سەرەکییەکان  بە بەکارهێنانی زمانێکی بەرزەدەماخ ، کە لێوڕێژ لە ڕەوانبێژیی شیعری، خوازەکان و میتافۆرەکان بوو، ڕای خۆیان لەبارەی هەڵکەوتە تایبەتییەکانی شانۆیی دەربڕن.[10] "ئاگون" کە ڕەگاژۆی لە دادبینییەکان و داکۆکی لە دادگا مەدەنییەکاندا کردبوو، هەم ئەگەری بۆ دانەری دەق دەڕەخساند تا هونەری

(8) . G.Steiner, the death of tragedy, London, 1974, p.8.
(9) . N.Stock, the life of ezra pound, London, 1974, p.69.
(10) . J.DE Romilly, la tragide grecque, paris, 1982, p.39.



ئاخاوتەیی و هێزی دەربڕینی شاعیرانەی خۆی نیشان بدا و هەم بەشێوەیەکی باڵادەستانە ڕوانگەیەکی دەخستەڕوو کە بانتر لە دیدی شیمانەیی کەسیەتی و لەبەرەنجامدا نیارڤان هەڵدەکشا. بەم کارەوە تەماشاوان لەجێی سەرنجدان لە کێشە تاکەکەسییەکان و ئاریشە دەروونییەکانی کەسیەتییەکان، ئاگاداری خاڵگەلی هەمەکی و ڕەوشتی دەبوو. هەڵبەت لە تراژێدیی نوێشدا ئەم تاکبێژییانە مانەوە، بەڵام ئەرکێکی یەکسەر پێچەوانەیان پەیدا کرد.لێرەدا ئێمە لە هەڵکەوتە هەستیارەکاندا بەیاریدەی تاکبێژیی نیارڤان لە ڕوانگەی تاکەکەسیی کەسیەتی ئاگادار دەبینەوە، سەرترین نموونە دەکرێ لە تاکبێژییەکانی شانۆکانی شکسپیر بەدی بکەیت. لە فیلمی **بەڵای ئانا** بەرهەمی بێرگمان نموونەیەك لە بەکارهێنانی" ئاگۆن" لە سینەمادا بەدی دەکرێ. لەم فیلمەدا ڕەوتی چیرۆکی زۆر جار دەپچڕێ تا ئێمە لە ڕوانگەی نیارڤان (و نەك کەسیەتی) لە دەوری خۆمان و ئەوانیدی و هەروەها لە دیدی ئەو لە بارەی لۆژیکی فیلم ئاگادار بین. لە ڕاستیدا، ماکس فۆن سیدۆ و بیبی ئاندرسۆن، لیوئولمان و ئۆرلاند یوزفسۆن لە نێو فیلمەکەدا" لە دەوری خۆیان" دەردەکەون و دیدی کەسیی خۆیان دەردەبڕن.

## (٤)

لە سەردەمێکدا کە ئێمە بە ڕۆژگاری بیچمگیریی نیارڤانیی نوێ یا مودێرن ناودێری دەکەین، دۆخەکە یەکسەر گۆڕا. بەر لە هەر شتێك دەبێ ڕوون بکەمەوە کە ئەم زاراوەی مودێرنە دەتوانێ بەدحاڵیبوونی لێ بکەوێتەوە، چونکە لەوەیدا کە من بە شانۆی مودێرن ناوم لێناوە شانۆی سەدەی حەڤدەهەمی فەرانسەش جێی دەبێتەوە و لەڕاستیدا یەکێك لە سەرترین نموونەکانیەتی، لە کاتێکدا کە ئەم شانۆیە لە پەرتوکەکان و وانەنامەکانی مێژوی هونەرە شانۆییەکان و مێژوی ئەدەبیاتدا بە" شانۆی کلاسیك" ناودێری دەکەن. وەلێ لام وایە ئەم ناولێنانە – لانیکەم لەم قۆناخەی باسەکەدا- گرفتێکی گەورە دروست ناکات. ڕۆژگاری مودێرن سەرەتا بنچینەیەکی ماتریالیی هەبوو کە ئەوەش سەرهەڵدانی بۆرژوازی و گەشەی حەشیمەتی شارنشین و زۆر خاڵگەلی دیکە کە من بە ئەنقەست بە سەر هەموویاندا بازدەدەم، چونکە ئەوەی لە قسەکانی ئێمەدا گرنگە دەرکەوتگەلی فیکری، باوەڕدارانە و ئایدیۆلۆژیکە، کە لانیکەم لە ژمارەیەك لە گرنگترین خاڵەکاندا، ژیان و فراژووبوونی سەربەخۆ و تایبەتی

خۆیان هەبووە. لە زەقترینی ئەم دەرکەوتانە یەکێکیان برەوپەیداکردنی باوەڕ بە ئەرکی وزەی ئاوەزی مرۆڤ بوو. دەرکەوتێکی دیکە ئەمە بوو کە دەکرێ یاساگەلی هەرەپێویست بۆ بردنە پێشی ژیانی رۆژانە لەم ژیانەوە بەرەنجامگیری بکەیت. لە راستیدا دەتوانین بێژین کە ئەم دوانە بەیەکەوە بەستراونەتەوە.ئەگەر ئاوەزی مرۆیی ئامرازێکی پوخت بۆ شیکاری،بەیانکاری و ناسینی دژوارییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و هەروەها ناسینی زانستی لە سروشت و مێژو بێت، کەوابوو بە یاریدەی ئەم وزەیە دەکرێ رێساگەلی راست و دروستی ژیانی جڤاکی پەیدا بکەیت و لەم دۆخەدا هەست بە پێویستییەکی ئەوتۆ بەگەڕانەوە بۆ لێکدانەوەی رێساکان و یاساگەلێ کە لە کتێبە پیرۆزەکاندا هاتون، ناکەین. ئەم لێڕوانینە تازەیە کە بایەخی زۆر بە مرۆڤ و ئاوەزی مرۆیی و یاساکانی سازکراوی مرۆڤ دەدا، روانگەیەکی" دنیایی"(secular) ە کە جیا لە ناسینی یاساکان و دیاردە سروشتیەکان بۆ ناسینی دیاردەگەلی مرۆیی بایەخی زۆر دادەنێ و بە شێوەیەکی ڕوو لە زیادبوون درك پێکردنی دەرون و وزەی ژناسای مرۆیی، واتە توانایی ناسینی کەوشەنەکان و سنورەکانی دانایی مرۆیی دەخاتە رۆژەڤی کاری زانایان و فەیلەسوفانەوە. بەمجۆرە، رەوتێکی فەلسەفی گەشەی کرد کە لە جەختی دیکارت لەسەر گرنگیی ناسکار، واتە وزەوگوڕی ناسێنەری بکەر و سەرپشك کە بە مەبەستی ناسینی دنیای ئۆبژکتیڤ لە هەمبەریدا لێڕوانینێکی زانستی هەیە، تا تێکۆشانی لاك و هیوم بۆ وردبینکردنی سنورەکانی دانایی مرۆڤ و سەرەنجام تا باسی بلیمەت ئاسای کانت لە بارەی قەڵەمڕەوی ناسینی مرۆیی لە یەکەمین رەخنەکاریی ئەو واتە پەرتوکی **هەڵسەنگاندنی ئاوەزی پەتی**، چووە پێشێ.

ئەگەر مرۆڤ وەها پایە بڵیند بناسرێتو وزەی زەینیو عەقڵیی خۆی بۆ چوونە سەر رێگای بەختەوەری بەسو پوخت بزانرێت، کەوابوو ئەو خۆی بابەتێکی گرنگ لە فەلسەفەدا، رەوشتو هەوەها لە هونەر دەبێت. بەم چەشنە بوو کە لە سەردەمی مودێڕندا ناسینی مرۆڤ، دۆزینەوەی وزە راستەقینە زەینییەکانو پاڵنەرەکانی کردەگەلی تاکەکەسیو کۆمەڵایەتیی ئەو، لە چەقی هەر باسێکی شێلگیرانە جێی گرتو لە کاری تەکووزداری بەخشین بە ژینی جڤاکیی ئەو،ئازادییە تاکەکەسییە مرۆییەکانو رەخساندنی ئاسانکاریگەلێ بۆ پشکوتنی ئەم ئازادییانە و توانا مرۆییەکان بووبە بنەواشە و بنەڕەتی کارەکە. لێرەوە بەرابەریی یاساییو سیاسیی هەموو تاکەکەسەکان جیا لە پەیوەستدارییان بە چینەکان، تۆێژە کۆمەڵایەتییەکانو جیا لە پەیوەستدارییان بە رەگەز یا نژاد، ملکەچییان بە باوەڕگەلی تایبەتی یا ئاینزایەکی



تایبەت، دێتە گۆڕێ. رۆژگاری مودێڕن بە مرۆڤگەرایی، ئاوەز باوەڕی و باوەڕێکی خەوش هەڵنەگر بە هەرەپێویستیی مافگەلی روونو ئاشکرا و دەستەبەرکراوی تاکەکەس بیچمی گرت. هەمووئەوانە لەبیچمگەلی دەربڕینی هونەری باندۆریان دانا. نواندنی مودێڕن بەم چەشنە بوو بەم تاکگەراییو ئاوەز باوەڕییە.[11] لێرەدا مرۆڤ وەها کە هەیە، وەکو تاکێك، لە هێزە ڕۆحییەکانو لاوازییەکانی، لە رەهەندگەلی جۆراوجۆری بووندارانە و دەربڕینی، بە تایبەت لە ژیانی نێواخنیو کەسیەتی پەسندی خۆی هاتەگۆڕێ. تەنانەت لە نواندنگەلێ کە هێزە بانسروشتییەکانو میتافیزیکی لە کاردانو چارەنوس بەرواڵەت خودان هەمان وزەی یەکلاکەرەوەی ڕووداوەکانە، هەمدیس کەسایەتیی مرۆڤان وەکو وزەیەکی دیکەو بە پشکی خۆی شوێندانەر دێتە ئاراوە: رەنگە نموونەی باڵا گوتەی جۆرج گیفۆرد، راهیبێك خەڵکی ئسکێس، بێت کە لەساڵی **١٥٩٣** لە پەرتوکێك بە ناوی **گوتارێك لەبارەی جادوگەرانوجادوگەری** وەهای نوسیبوو:"هێزی ئەهریمەنی لە دڵی مرۆڤدا جێی خۆی خۆش کردوە". گیفۆرد هێزێکی میتافیزیکی کە لە شانۆگەرییەکانی رێنسانسو بۆ نموونە لە بەرهەمەکانی شکسپیر ئێجگار گرنگو نێوەندیـیە، خستە پاڵ "مرۆڤ"، واتە بوونەوەرێك کە تازە دەهاتەگۆڕێو لە بەرانبەر هێزگەلی بان سروشتی قووت دەبوویەوە.[12]

قارەمانی شانۆی مودێڕن دەلوێ گەمژەیی بکات (شا لیر)، تووشی دڕدۆنگی ببێ، (هاملێت)، دیلی درۆ و دەلەسە و کەڵکەڵە ببێ،(ئۆتللۆ)،تەنانەت بە باندۆر وەرگرتن لە هێزە ئەهریمەنییەکان رێگەی دزێوی هەڵبژێرێو دەست بداتە تاوان، (مەکبێس)، وەلێ لە هەر دۆخێکدا مرۆییـیە و ئاگا و سەرپشك کە تەنیا دەوری بەیانگەری چارەنوسی شومو حاشاهەڵنەگری لە ئەستو نیە.بروتوس لە **جولیوس قەیسەر** دا بە واتایەکی ئەمڕۆیی "مرۆڤێکی سیاسی"یە. هەڵبژێرانی ئەو نەچەندان بەگوێرەی چارەنوسێکی نەگبەت بەڵکو بە پێی ویستو ئاگایی کۆمەڵایەتیو دەروەستیی سیاسیـیە.[13] تەنانەت لە جێیەکدا کە

(١١) یەکێك لە گرنگترین دەقگەلێ! کە لەمبارەوە نوسراوە وتاری گیۆرك لۆکاچ "میتافیزیکی تراژێدی"ە:
G.Lukacs, soul and Form, trans.A.Bostock, London, 1971, PP.152-175.

(12) .sarah Beckwith, “The Power of devile and the hearts of men”, in: Ares and N.wheale, shakespear, In the changing cuririclum, London, 1991, P.143.

(١٣) هەمبەری شکسپیر لەگەڵ ئەدەبیاتی لاتین تێکچڕژاوتر لە هەمبەری ئەو لەگەڵ ئەدەبیاتی یونانە. بەڵام ئەم خاڵە لە داوەریی سەرەوە لە مەڕ جولیوس قەیسەر جیاوازییەکی ئەوتۆی نیە. لەمبارەوە بڕواننە: C. and M.Maetindale, shakespear and the Uses of Antiguity London, 1990, PP. 121-165.

چارەنوس دێتە گۆڕێ، دیسان ئێمە لەگەڵ هەمان خاڵی ئاشنای شانۆی کلاسیك بەرەوڕووین. سەرنج لە نموونەی مەکبێس کە لەودا هێزی چارەنوس لە ڕێگەی ئاخێوی جادوگەران گرنگییەکی هەرەمەزنی هەیە، بدەین: ڕاستە کە مەکبێس دیلی چارەنوسێکە کە ژنانی جادوگەریش هەر لە سەرەتای شانۆوە بەویان ڕاگەیاندوە، بەڵام کاتێك لە چنگی چارەنوسی شوم زیندانی دەکرێ، هەمدیس بەیانگەریی ڕووت نیە، بەڵکو مرۆڤێکی سەرپشك و ئاگا ڕەفتار دەکا، واتە ترسەکان، دڵەڕاوکێکانو ئەشکەنجەی ویژدانەکانی مرۆڤێکی هەیە. "توخمی مرۆیی لە شانۆی **مەکبێس** دا هیچ کەمییەکی لەو توخمە بان سروشتییانە نیە و بە ڕاستی لێرەدا دەکرێ ببینی کە "هێزی ئەهریمەنی لە دڵی مرۆڤدا جێی خۆش کردوە". بە دەربڕینی باشتر، ئەم هێزە لە دڵی هەندێ لە مرۆڤان بوونی هەیە. لەم ڕووەوەیە کە دەبینین ئەو بڕیاری چارەنوسە کە جادوگەران هەڵیان کڕاند ناتوانێ ببێتە سەمەدی بەنکۆ لە قەوماندنی تاواندا و تۆزقاڵێك لە بەشەرەفیی ڕەوەشتیی ئەو کەم ناکاتەوە، بەڵام مەکبێس لەخشتە دەبا. بەنکۆ لەمەڕ بەشەرەفیی خۆی ناکەوێتە دڕدۆنگییەوە، چرکەساتێك کەڵکەڵەی هێز و پاشایەتی ئەو فریو نادا. بەڵام لە چارەنوسی مەکبێس دەترسێ، چونکە لەگەڵ لاوازییە ڕەوشتییەکانی هەڤاڵەکەی ئاشنایە: "ئەگەر ڕاست بێ، وێدەچێ، سەرتر لە سوپاسالاریی کۆدۆر، لە(ناخی) تۆدا ئارەزوی تاجو تەخت هەڵگرێنێ. بەڵام، چ سەیرە! تۆ بڵێی کاربەدەستانی تاریکی ڕاستیگەلێکمان لەلا بدرکێنن تاکو بە خەسارماندا بەرن. بە ڕاستگۆییە بێنرخەکان دڵمان دەڕفێنن تاکو هەڵماندێرن".[١٤] مەکبێسو بەنکۆ دوو مرۆڤن کە یەکێکیان وەدوی دزێوی دەگەڕێو ئەویدی بە گەوهەری نەجیبو مرۆیی خۆی وەفادار دەمێنێتەوە. بانتر لە بڕیاری چارەنوس ئەوان ئەگەری هەڵبژێرانیان هەیە و بەم پێیە دوو مرۆڤی مودێڕنن. بەنکۆ کە دەزانێ هەقیقەت دەبیستێ، بەڵام ملی ڕاناکێشێ و بە شتێکی دیکە ـ ڕەوشتی کەسی ـ وەفادار دەمێنێتەوە، ئەو کە ڕاستگۆییەکان بە "بێنرخ" ناودەنێو هەقیقەت بەرەخسێنەری خەسار دەزانێ، نەك تەنیا لە کەسیەتییە کلاسیکیەکان جیایە، بەڵکو لە کەسیەتییە "مودێڕن"ەکانی شکسپیرو شانۆی ڕێنێسانسیش چەندقات بانتر دەکشێو دەتوانین بڵێین کە نموونەیەك لە کەسیەتیگەلی ئەمڕۆییە، کە لە درێژەدا لەگەڵی ئاشنا دەبین. بەڵێ، لە بەرئەوەی کەسیەتییەکانی شکسپیر مرۆڤن، لە کەم و کووڕیی مرۆیی لە ئازاردانو خودان هێزە

(١٤) و. شکسپیر، **مکبث**، برگردان د. آشوری، تهران، ١٣٧١، ص ٢٠.



مرۆییەکانن، نیارڤانی ڕۆڵی مەکبێس دەتوانێ ـ هەڵبەت نەچەندان ئاسان ـ لەو بوونەوەرێکی شیانی بەزەییهاتنەوە بخولقێنێ، کە هاودڵیو سۆزی تەماشاوانی لێ بکەوێتەوە، یا بە پێچەوانەوە تاوانبارێکی نەفرەتلێکراو بناسێنێو زەقی بکاتەوە.[١٥] لە بەرانبەر وەها کەسیەتییەکی مودێڕن، کەسیەتییەکانی شانۆی کلاسیك هەن، کەسانێك وەکو ئەلکترا، ئۆدیپ، ئۆرست، ئانتیگۆنە، کرئۆنو ئاگامێمنون کە بەیانگەرانی چارەنوسن و جەختکردن لەسەر تاکایەتییان بێ واتایە. لە حاڵێکدا کە ئاندرۆماك، فدر، ایفیژنی تراژێدییە یونانییەکان دیلی چارەنوسن، هەرکام لەم کەسیەتییانە لە شانۆکانی ڕاسیندا بانتر لە هەر بڕیارێکی چارەنوس، مرۆڤێك، ژنێکە، دەکرێ ئەو بناسیو لەبارەیەوە داوەری بکەیتو تەنیا بە داوەری لەبارەی متمانەو برەوداریی ڕەوشتیی کردەکانی قەناعەت نەکەی. هەرچەند ڕاسین خۆی لە پێشگوتارێك بۆ **ایفیژنی** دەنوسێ کە لاساییگەری لە شانۆ یونانییەکانی بۆیە هەڵبژاردوە کە خۆی لەوانەوە نزیك دەزانێو بە زمانێك کە دواتر گۆتەش بە کاری برد کە "ئاوەز و هەستی هۆمیرۆس و ئورپیپید هەروا لە پشتی سەدەکانەوە لە ئێمەوە نزیکن"،[١٦] بەڵام هەڵوەستەیەکی کورت لە سەر شانۆکانی ئەو و بۆ نموونە هەر ئەم ایفیژنییە نیشان دەدا کە بە پێچەوانەی شانۆ کلاسیکییەکان مرۆڤانی شانۆی ڕاسین لە دەرەوەی فرمانی چارەنوس وەکو مرۆڤانی سەرپشك هەڵسوکەوت دەکەن، هەستو ئاوەزێکی تایبەت بە خۆیان هەیە و لەسەر کۆڵەکەی دەرەوەستییە لێکدانەوەیییەکان ڕەفتار دەکەنو نەك لەسەر بنەمای ڕێساگەلی ڕەوشتی. ڕاسین خۆیشی لە درێژەی هەمان پێشگوتاردا لە دژواریگەلێ کە دانەدوویی و لاسایی لە یونانیان دژوار دەکا دواوە و هەر بۆ نموونە واق وڕماویی تەماشاوانی ئەمڕۆیی لە ڕودانی پەرجوەکان بە هۆیەك بۆ گۆڕاندنی تانو پۆی شانۆی یونانی دەزانێ.[١٧]

لە شانۆی ڕێنێسانس تا نواندنەکانی ئیبسنو تەنانەت شانۆی ڕیالیستیو ناتۆرالیستی (و لەمبارەوە هەندێ ناو وەبیر دێنەوە کە بە سەدەی ئێمەشەوە پەیوەستن: یوجین ئونیل، تێنسی ویلیامز و...) ئەم تێڕوانینە مودێڕنە مرۆڤی لە چەقی سەرنج و بابەتی سەرەکیی کاری

(١٥) لە بارەی ئەمڕۆییبوونی شانۆی شکسپیر بڕواننە پەرتوکێك کە زیاتر لە سی ساڵ لەوە و پێش نوسراوە و هێشتا نوێو دڵکێشە:

J.Kott, Shakespeare our contemporary, transm B,Taborski, London, 1965

(16) G.steiner, The Death of Tragedy, London. 1974, p.76.

(17) ibid, p.82.

هونەرو لە بەرەنجامدا کاری نیارڤان دانابوو. نیارڤانی باش بە کەسێك دەزانرا کە بە باشترین‌و کامڵترین بیچم بەیانگەری تەواوەتی مرۆیی کەسیەتی بێت. نیارڤان دەوری دەرەخساند و هەندێجار سەردەکەوت کە فرەفاقێتی بخولڤێنێ. لە کاری نیارڤانی مودێرندا پەیتاپەیتا جۆرێك هاوشێوەیی لەگەڵ کەسیەتیی شانۆیی دەهاتەگۆڕێ، کە هەڵبەت بەردەوام دەستڕاگەیشتو و شیانی سەلماندن نەبوو و مەرج نەبوو هەموو جارێ بەرەنجامگەلی درەوشاوەی لێبکەوێتەوە، وەلێ هەم لە ئاخێوی رەخنەکارانە و جوانیناسانە و هەم لە گۆترە بێژییەکانی خەڵکیدا دەکەوتە بەر باس و گەڕاندنەوەی بۆ ژێدەر. پۆل ئێسکافێلد بەمجۆرە لەگەڵ پرۆسپرۆ، لارنس ئەلیویە لەگەڵ هاملێت هاویەك و هاوجووت گریمان دەکران. لەوەگرنگتر ئەمە کە بە پەیڕەوی لە گۆتەو شیلێر، نیارڤانی باش بە کەسێك دەزانرا کە ئەگەری هاوزات گریمانکاری لەنێوان دەور و تەماشاوان بخولڤێنێ. ئەوان لە وتارێکی بەناوبانگدا نووسیبویان: "نیارڤان لە تەماشاوان چاوەڕوانی هەیە کە کت‌ومت لە کردەوە و هەڵس‌وکەوتی ئەودا هاوپشك ببێ، هەر بەو چەشنە لە بارودۆخێکدا کە ئەو راستەوخۆ لەگەڵیدا بەرەورِوویە، وەها لەگەڵی هاوپشك ببێ کە رەنجە رۆحی‌و جەستەییەکانی ئەو هەست بکا و لە نیگەرانییەکانی ئەودا هەمباز ببێ‌و خووخدە کەسییەکانی خۆی لە بەرانبەر خووخدە کەسییەکانی ئەو لە یاد بسڕێتەوە".[(١٨)] یەکانگیر لەگەڵ ئەم بنەواشە سپیتایەی بەیانگەری و هاوزات گریمانکاری، پسپۆڕییەکانی نیارڤانیش دەهاتنە ئاراوە و خاڵێکی گرنگتریش بیچمی دەگرت، ئەمە کە فێرکردنی نیارڤان دەبێ بە پێی ئەم رێسایانە بیچم بگرێ. ئەم فێرکردنە بەنێو شانۆشدا تێدەپەڕی‌و سیستمی نیارڤانی کە بە ناوی ئستانیسلافسکی ناوبانگی دەرکردوە لە سینەمای ئامریکادا باندۆری دانا. ئەم هەمبەری نێوان نیارڤانی شانۆ و سینەما بە سود و قازانجی هونەری تازە بنیاتنراوی سینەما نەبوو و بە نرخی چاوپۆشی لە توانایی‌یەکانی راگەیێنی سینەما بیچمی گرت.

**(٥)**

سەردەمی سێهەممان لە باسکردن لە شوێنگەی نیارڤان لە دروستکردنی جیهانی بەرهەم، بە سەردەمی پۆست مودێڕن ناو لێناوە. لەم سەردەمەدا دەزانرێت کە باشقەی مودێڕن کەم‌و کووڕیی زۆر و زەوەندی هەیە. لە بەرانبەر ئەو ئیمانە بە مرۆڤ و ئەرخەیانی لە

(١٨) وەرگیراو لە: م. اسلین، **برتولت برشت**، برگردان ح. ملکی، تهران، ١٣٧٤، ص ٢١.



رەژیدەگەرییەکانی ئاوەزی ئەو و باوەڕی لە رادەبەدەر بە زانستی مرۆڤ و بە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی، خاڵگەلی دیکە کە دەتوانین بە "خاڵگەلی پووچەڵ کەرەوە" ناودێریان بکەین، قووت دەبنەوە. هەنوکە، دنیا رۆشن‌و رێساگەلی بیچمدەری سادەو کەم تا زۆر ئاشکرا نین. بەرەنجامگەلی نەرێنی هەژمارێك لە دەسکەوتەکانی رۆژگاری مودێڕن نەك تەنیا ئاشکراکراون و هاتوونەتە گۆڕێ، بەڵکو لەبەرچاوی زۆرێك لە هزرینگەران‌و خەڵکی ئاسایی بەرەنجامی راستەوخۆ و لێبڕاوی ئەو باشقەیە دەزانرێت. جیا لە زۆرێك لە دەسکەوتە مادی‌و مەعنەوی، جیا لە هێز و دەسەڵاتی دڵکێشبوونی باشقەی مودێڕن‌و جیا لە بنەواشەگەلێ کە ئەم جڤاکی مودێڕنە خولڤاندی، هەمدیس رەنێوهانینی کرد و سەرەنجام خۆیشی لە سەری رۆنرا (بنەواشەگەلێ کە هێشتاش بە بیچمگەل‌و پلە جۆربەجۆرەکان کاراییان هەیە: وەکو بنەواشەی بەرابەریی شارۆڤەندی، حکومەتی دێموکراتیك، پشت ئەستور بە نوێنەرایەتی، دەستەبەری هەژمارێك لە گرنگترین مافەکانی مرۆیی‌و...) دیسان مەسەلەکان‌و دژواریگەلێك بۆ مرۆڤ هاتۆتە پێشێ کە هەمەلایەنی و کارایی ئەم بنەواشانەش دەباتە ژێر پرسیارەوە. ئاشۆویتس، گولاگ، هیرۆشیما، جەنگی ڤیتنام و کارەساتەکانی بۆسنی نیشانیان داوە کە چۆن‌و بە چ جۆرێ لەجەرگەی ژیاری مودێڕن توندوتیژترین،هۆڤانەترین و نابەرپرسانەترین سیاسەتەکان و کردەکان بیچمیان گرتوە.

لەم رۆژگارەدا بێباوەڕی بە ئاوەزی مودێڕن کە لانیکەم هەژمارێك لە بەرەنجامەکان و دەسکەوتەکانی عەقڵ‌و زانستی مودێڕن دەخاتە ژێر پرسیار، مرۆڤ لەو پێگە بڵێندەوە کەوتۆتە خوارەوە. بانگەشەی باوەڕ بە ئاوەزی مرۆیی کە بڕیار بوو هەرچەشنە سەروەریی ئوستورەکان‌و گۆترەبێژییەکان تێك بشکێنێ، چەوت بووە و بانگەشەکار خۆی بووە بە رەژیدەی ئوستورەیەکی تازە، یا لانیکەم نەیتوانیوە لە کاری خۆیدا لە برێك لەو دیتە ئوستورەییە کە پلاری لێ دەگرتن هەڵبێت. خاڵی گرنگ ئەوەیە کە لە بەرانبەر تێزی مودێڕنیتە، ئانتی تێزی پۆست مودێڕن بیچمی نەگرتوە. وەها نیە کە لە جێی ناسکاری فرەشتزانی سەرپشك، بێباوەڕیی پەتی بە ناسکار رەخسابێ. وەها نیە کە لەجێی باوەڕ بە ئاوەزی مرۆڤ و پەسندی مافەمرۆییەکان بۆ رۆژگاری باوەڕە ئوستورەییەکان گەڕابینەوە. وەها نیە کە لە بەرانبەر گەڵاڵەی مودێڕنیتە گەڵاڵەیەکی تازە قووت بوویێتەوە. نەخێر،ئەم رۆژگاری پۆست مودێڕن وەك بڵێی رۆژانی رەخنەکاریی مودێڕنیتەیە، خودئاگاییەتی‌و رۆشنگەری هەرۆڵییەکان، وەڕەسییەکان و بێ هیواییەکانی مرۆڤی مودێڕنە. سەردەمی سێهەمی جێی باس‌و خواسی

ئێمە سەردەمێکە کە لەودا پێگەی مرۆڤ دیاریکراو نیە.هەڵبەت ئەمە رۆژگارێك نیە کە لەودا مرۆڤ تەنیا دەربڕی چارەنوسێکی رۆژی بەریٚ وحاشاهەڵنەگر ئەژمار بکرێت، وەلیٚ رۆژگاری باوەڕ بە توانستە بڵیند هەڵکشاوەکانی عەقڵی مرۆڤیش نیە. سەردەمی سەرنجدان لە کەمایەسییەکانی وەها تێڕوانینگەلیٚ، واتە پەسند و قبووڵی بێتوانایی‌و تێهزرین لە هۆیەکانیەتی. سەردەمی سەروەریی دڕدۆنگی لە بایەخگەلێکە کە بە شێوەیەکی نارەخنەکارانە بە دروست گریمان دەکران. رۆژانی بە گومانی و رێژەینواڕییە. رۆژگاری باس لەمەڕ بەرەنجامگەلی پێنەگەیشتویە، نە خەیاڵکرد هۆنینەوە لەمەڕ ترۆپکی پێگەیشتن.

مرۆڤ تاقانە گیانەوەرێکە کە جیهانێکی دیکە ساز دەکا، شتێك دەنوێنیٚ، کاری هونەری دەکات، واتە وێنایەکی دیکە، جیهانێکی ئایدیالی، لە مێشکیدا ڕاوڕایەڵ دەکاو دیسان تەنیا گیانەوەرێکە کە شەرمەزاری کاری خۆی دەبێت. کەسێك کە دەتوانیٚ سروشت بە خزمەتکار و کۆیلەی خۆی نەزانیٚ، دەتوانیٚ قسان بکا و لە رێگەی دیکەوە نیشان بدات کە لە چ تێدەهزرێت، چ دەخوازیٚ‌و چی ناویٚ. نیارڤانی ئەمڕۆ رێگەیەك بێجگە دەربڕینی ئەم هەموەی نیە، ئەو دەبیٚ شەرمەزاری‌و بێتوانایی، هەستی دەروەستبوون، پشتگوێخستنی ویستەکان‌و دڕدۆنگی‌و گومانگەرییەکان دەربڕیٚ.ئەو ئیدی بەیانگەری رێساگەلی رەوشتی نیە و بەرەوڕووبوونەوەی لێڕوانینە رەوشتییەکان نیشان نادات. ئەو ئیدی بەیانگەری تاکایەتی،پێشکەوتن،ویست‌و عەقڵ نیە. ئەو هەڵکەوتی مرۆڤی دۆشداماو نیشان دەدا و هەر ئەمە بەواتای دۆشداماوی لە نیشاندان و لە بەیانگەرییە. نیارڤان چیدی بەیانگەر نیە، خودی بیٚبڕیاری، گومان‌و لە بەرەنجامدا گەوهەری هەڵکەوتە لواوەکانە. نیارڤان دەتوانیٚ رێگەگەلی بیٚئەژمار نیشان بدات. ئیدی ملکەچی یەکێك لە رێگەکان نیە. لەم نواندنی بێتواناییانە بیچم بە شتێکی تازە دەدا: نواندنی رێگەگەلی بیٚئەژمار. لە بەرەنجامدا ئیدی ئەرمانەر نیە.

شانۆکانی سامۆئێل بێکت وەها نیارڤانێك دەخوازن. کەسێك کە بڕیارە شتێك لە دەرون و نێواخنی کەسیەتی بنوێنیٚ، کەسێك کە رێساگەلی رەوشتی ناخاتە بەردەمان و شتێك سەرتر لە شتێکی دیکە ئاشکرا ناکات‌و وەدەری ناخات، کەسێك کە هیراکی‌ساز نیە،نیشانەسازە. پەیتاپەیتا ئەگەر و کەرەستەی تازە و لەبەرەنجامدا ئاماژەگەلی نویٚ دەئافرێنیٚ. لە جەرگەی نائۆمێدیی دۆخی ئێستا شتێکی دیکە دەئافرێنیٚ کە نازانم دەکریٚ بە ئۆمێدی ناودێر بکەیت یان نا. شتێکی دیکە کە هەرکە لە بیٚبگاریی رێژەمەندیی کاروبارەکانەوە ئاخێز دەکا، رەنگە



رێخۆشکەر بێت. شتێك کە لە خۆیدا دەربڕینی ئازادی‌یە: ئازادیی هەڵبژاردنی نیشانەکان، ئازادیی هەڵبژاردنی واتاکان. هیچ واتایەك یەك جار و بۆ هەمیشە ساز ناکریٚ. شتێکی برەودار بیچم ناگریٚ، بەڵام لەم ناسەقامگیرییەی کاروبارەکان ئەگەر و کەرەستە تازەکان لە دایك دەبن، بە هەمان شێوە کە هایدگێر بە هێما بۆ شیعرێك لە هۆلدرلین گوتبووی کە رۆژگاری نویٚ هەم مەترسی ساز دەکا و هەم کلیلی رزگاریدەر دەڕەخسێنیٚ.

هەروەك لەمەڕ شانۆی بێکتەوە هات، سینەمای ئەمڕۆش لە ژمارەیەك لە گرنگترین ئەزموونگەلیٚ کە بیچمگرتنی سینەما وەکو هونەرێکی سەربەخۆی لیٚکەوتۆتەوە، دژی دەروونناسیی کەسیەتییەکانە. ئەو هەمووو پێداچەقاندنەی رۆبێر بێرسۆن لەمەڕ هەرەپێویستیی وەلانانی دەروونناسی وەیادبێننەوە. ئەو دەنوسیٚ کە مەبەستی ئەو دەروونناسییەیە کە تەنیا شتانێك دەدۆزێتەوە کە خۆی دەتوانیٚ روونیان بکاتەوە.[١٩] لە راستیدا ئەو دەڵیٚ کە ئیدی پاڵنەرە وەشێراوەکان لە قووڵایی ویژدانی نائاگای مرۆڤ گرنگیی نیە. چونکە مەسەلەکە یا رازی سەرەکی نەك لەو ویژدانەدا بەڵکو لە جێیەکی دیکەدا وەشێراوە. "من" نەناسراوە و لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی دەروونناسیدایە. دوربینی سینەماتوگراف ئەم "منی ناماقووڵ"ە تۆمار دەکا[٢٠] و نەك ئەو کەسەی کە سەرەنجام شیانی ناسین دەبێت. لەم روەوەیە کە نیارڤان بە گوتەی بێرسۆن دەبێتە هاوشێوەی "مۆدێل" لە ڕۆڵی خۆی مەودا دەگریٚ تا لە جێیەکی دیکە، لە نێواخنەوە لەگەڵیدا هاویەك ببیٚ. ئەو ناتوانیٚ دەربڕی دەرون بێت، چونکە دەبیٚ بتوانیٚ لە پلەو پایەیەکی دیکەدا بەیانگەری ئازادیی رۆح بێت. لایەنی پێشڕەوی رەخنەکاریی بێرسۆن لە رەوتی کار لەگەڵ هونەر پیشە و لە سینەمایەکدا کە ئەو بە "شانۆی بە فیلم کراو" ناودێری دەکا، لە هەرەپێویستیی دەستڕاگەیشتن بە تواناکان، زمان‌و مێتۆدی دەربڕین راگەیێنێکی تازە وەشێراوە، راگەیێنێك کە بۆ هەمیشە لە شانۆ جیابوویێتەوە. کاتێك ئەو دەنوسیٚ کە نیارڤان پێویستیی بەوە دەبێت کە لەخۆی دەربچیٚ، تا خۆی لەویدیدا بەدی بکاتەوە و هەر بۆیە ناتونیٚ چیدی بۆ لای خۆی بگەڕێتەوە و بە ڕاستی نە خۆیەتی نە ئەویدی، جۆرێکی دیکە لە کار لەگەڵ نیارڤان کە تایبەت بە هونەری سینەما یا ئەو گوتەنی سینەماتوگراف بێت،دەیهێنایە گۆڕیٚ، جۆرێك کە لە نەریتی نیارڤانیی شانۆی مودێرن جیا دەبێتەوە[٢١] نیارڤانی سینەما یا

(19) Bresson, op. cit, p.83.
(20) .ibid, p.86.
(21) . ibid, pp.52-53.

"مۆدێل" بە ڕواڵەت بەشێوەیەکی میکانیکی کار دەکات، وەلێ لە نێواخنەوە ئازاد و دەربڕی گۆڕانەکانی گیانە. مۆدێل نابێ جێی کەسێکی دی و تەنانەت خۆی کایە بکا[22] ئەو بە بێ لێکدانەوەی دەور، بە بێ نیشانە ڕێککەوتەییەکان کار دەکا تا لە هەناوییەوە شتێکی تازە بزێت. ڕێگەیەك کە بێرسۆن بۆ کاری مۆدێل پێشنیاریکردوە ( بنەواشەگەلی خەوش هەڵنەگری کار لەگەڵ نیارڤانی تازەکار، کار لەگەڵ هەر نیارڤانێك تەنیا لە یەك فیلمدا، بەکارهێنانی مێتۆدگەلێ کە دەورگێڕان دەکەنە هاوشێوەی کارێکی میکانیکی،کورتبڕیلەکردەکان و گوتەکان،دووری لەهەرجۆرەبەرکەوتێکی دەروونناسانەو...) هەموو نیشان دەدەن کە ئەو تا چ ئاستێك لە هەڵێنجانی مودێڕن دوور کەوتۆتەوە و لەوەی بە هەڵێنجانی پۆست مودێڕن ناودێرم کردوە نزیکە. کاری بێرسۆن نموونەیەکی باڵایە لە سەلماندنی دابڕان لە نیارڤانی بە نەریتی شانۆیی و هەرە پێویستیی ئەم دابڕانە لە دەستڕاگەیشتن بە زمانی تایبەتی سینەماتوگراف. وەلێ ئەمە تەنیا دەربڕینی یەکێك لە ئەزموونەکان لە دروستکردنی فیلمە و هەرچەند لە گرنگترین و پڕبایەخترین ئەزمونەکان دێتە ئەژمار هەمدیس تاقانە بیچمی دروست و باشقەی تەواو و قایلکەر نیە. وەیادتان دەخەمەوە کە هونەر قەڵەمڕەوێکە کە زیاتر لە هەر پانتاییەکی دیکە لەودا فرەفاقێتی واتا پەیدا دەکا. هیچ ئەزموونێکی سەرکەوتو لە هونەردا نیە کە بتوانێ "تاقانە ئەزموونی دروست" ناودێر بکرێت.

## (٦)

هەنوکە سەرقاڵی پلارتێگرتنێکی لواو لە دابەشکاریی سیانی کە تا ئێستە بابەتی باسی ئێمە بوو، دەبم. بە پێی ئەم ڕەخنەیە دابەشکاریی سەرەوە کت ومت نیە و ڕەنگە باشتر بێ کە لە دابەشکارییەکی دووفاقی بدوێین کە لەودا دەورەکانی دووەم و سێهەم کە کەوتبوونە بەرباس پێکبەستراو بن و دوولایەنی جیاوازی سەرباشقەیەکی نیارڤانی ساز بکەن. بنەڕەتی بەڵگەهێنانەوە لە پەسندکردنی ڕەخنەدا دەتوانێ ئەمە بێ کە قۆناخەکانی یەکەم و دووەم لە دابەشکاریی مندا بیچمی گشتی، هەمەکی و سەرباشقەئاسای نیارڤانی ڕۆشن دەکەنەوە. لەحاڵێکدا قۆناخی سێهەم وەها نیە وخاڵێك کە من بە نێوەندیی لە قەڵەمم دەدا لە راستیدا تەنیا یەکێك لە بیچمگەلی هەبوو و هەنوکەیی نیارڤانییە و بەهیچ شێوەیەك بیچمی تاك یا

(22) . ibid, p.67.



تەنانەت زاڵیش نایەتە ئەژمار. داکۆکیکاری وەها ڕەخنەیەك دەڵێت کە ڕەنگە بتوانی لە قۆناخی دووەمدا، واتە لە دەورەی مۆدێڕنیشدا خاڵگەلێ لە کاری هونەرە شانۆییەکان بەدی بکەیت کە هێشتا نیارڤانی لەسەر بنچینەی جەخت لەسەر ڕووبەڕووبوونەوەی یاساکانو دەربڕینی بەرکەوت لەگەڵ بنەواشەگەلی ئەبستراکتیو هەموانی بیچم بگرێ، وەلێ ئەم هەڵاتن لە شیکاریی تاکەکەسو جیایی لە بەیانگەریو نواندنی نێواخن یا دەرونی مرۆڤ، لە نواندنی مودێڕندا خاڵێکە تەریك کەوتو و ناوێزە و ڕێسای هەمەکیی نیارڤانی هەمان سەرباشقە (paradigm) یا نموونەیەکە کە لێی دوام. لە لایەکی دیکەوە سەرباشقەی نیارڤانیی سەردەمی سەرەتا یەکانگیر لەگەڵ هەڵێنجانە زاڵە فیکریو فەلسەفییەکانی ئەو ڕۆژگارە، هەڵاتن لە تاکایەتیو دەربڕینی ڕوبەڕوویی یاساکان بوو و سەرباشقەی نیارڤانیی سەردەمی دووەم (جیا لە ناوێزەکان) برەوداریی ناسکار، زەینی مرۆڤ و بایەخی تاکایەتی بوو. ڕەخنەکار دەتوانێ بڵێت کە لە سەردەمی پۆست مودێڕندا ـ بە پێچەوانەی هەردووك قۆناخی پێشوتر ـ سەرباشقە بوونی نیەو نموونەیەکی هەمەکی کە زۆربەی نیارڤانان ناچاربن ڕەچاوی بکەن بیچمی نەگرتوە. نموونەگەلێ کە من لەمبارەوە هێنامەوە "هەمەلایەنی"و "هەمەکێتی"ی نموونەکانی دوو خاڵی پێشوویان نیە. لێرەدا من لە گرنگترین دەسکەوتەکانی هونەرە شانۆییەکان نموونەم هێنایەوە. بەڵام ئەمانە لە راستیدا ناوێزەنو کارەکە لە زۆرترین بەشی ڕەنێوهانینی بەرهەمە شانۆییەکان بە پێچەوانەی ئەم نموونانە پێشڤەدەچێ. جیا لە هونەرمەندانێك کە من لە سێهەمین قۆناخ لە دابەشکاریی خۆم لێیان دوام، واتە سامۆئێل بێکتو ڕۆبێر بێرسۆن، ئێجگار هونەرمەندانی دیکەش هەن کە لە بەرهەمەکانیاندا نە ئەو چەمکە هەمەکییەی پۆست مودێڕن بەدی دەکرێو نە لە ڕێساگەلی نیارڤانیی پێوەندیدار بە لەرزۆکیی تاکایەتی، نە لە نارۆشنیی هەڵکەوت و ڕۆژداگەڕانی دیتەی لێبڕاوانە شوێنەوارێك هەیە.

لام وایە لە وەها ڕەخنەیەکدا کرۆکێك لەهەقیقەت وەشێراوە.وەلێ حەز دەکەم جەخت لەسەر دوو خاڵ بکەم کە وێدەچێ وڵامێك بۆ ئەم پلارتێگرتنەش ئەژمار بکرێن: ١)ـ لە سەردەمی سێهەم کە مەبەستی باسەکەی ئێمەیە، واتە ڕۆژگاری پۆست مودێڕن لە بنەڕەت را ئەگەری دروستکردنی سەرباشقە لە هیچ بوارێکی کاری فەرهەنگیو فیکری بوونی نیە. هەر بەو جۆرەی کە پۆل فیرابێند لەمەڕ کاری زانستی گوتویەتی (و هەڵبەت ئەو، ئەم خاڵەی بەسەر کۆی مێژو گشتگیر کرد، وەلێ دەکرێ هەر لەم گشتگیرکردنی تیۆریکی ئەو بە دڵنیاییەکی زیاترەوە لەمەڕ ئەم ڕۆژگارەوە بەرەنجامێکی هەمەکی وەدەست بێنی کە) ئەستونی دەربڕینی ئەپستمیكو

زانستی له سەر "فرەفاقێتی"یە و ناکرێ یەکێك له سەرباشقەکان بە تاقانە خاڵێکی راستو دروست ناودێر بکەیتو سەرباقی بە ناتۆرەی "نازانستی" لە بازنەی باسەکە دەرهاوێژیە دەرێ. هەمدیس بەم شێوەیە دەبینین کە ئاخێوی رێژەییئنۆڕ لە فەلسەفەی ئەمڕۆدا لەدژایەتی لەگەڵ باوەڕە عەقلانییەکان لە نەلواوبوونی پتەوبوونی تیۆریك و کردەکیی سەرباشقەیەك دواوە و بنچینەی لەسەر فرەفاقێتی داناوە. دیسان دەتوانین لە باسگەلی هێرمێنۆتیکی مودێرن بدوێین و هەروەها لە دەسکەوتەکانی تیۆریکی رێبازی وەرگرتنی دەق باس بکەین کە بە گەلاڵەی رێژەییمەندیی راڤەکان رێگەی گوزەر لە باوەڕ بۆ نموونەیەکی شیاویان ئاوەڵا کردوە. هەموو ئەمانە لەگەڵ خەدی بنیاتیی رۆژگاری ئێمەش یەکانگیرە کە کۆڵەکەی لەسەر هەرۆڵیی وەبارهاتوی بیچمگیری و هەمدیسرەنێوهانینی پەیتاپەیتای جیاکارییەکان، جیاوازییەکان، پارادۆکس و ناکۆکییەکان رۆنراوە. کەوابوو دەورەی سێهەم کە من هێمای بۆ دەکەم و هەردووك دەورەی پێشو جیاوازییەك هەیە کە ناکرێ و نابێ نکۆڵیی لێ بکەیت. ٢) لە باسی سەردەمی سێهەم ـ وەکو هەر سەردەمێکی دیکەی مێژوی هونەرـ هێندەبەسە گرنگترین بزاوتی جوانیناسانە بدۆزینەوە، واتە ئەو بزاوتەی کە تازەگەری و گۆڕان لە باوەڕەکان، چەقبەستەکان، مێتۆدەکان و تیۆرییەکان لواو دەکا. رۆشنە کە جگە لەوە، بزاوتەکانی دیکەش لەبەر هۆگەلی جۆاوجۆر و بە سەمەدگەلی جیاواز هەن، وەلێ ئێمە ئەو بزاوتە لە چەقی سەرنجی خۆمان دادەنێین کە گۆڕان لە( گشت)ی لێ بکەوێتەوە. بەدەربڕینێکی باشتر تێدەکۆشین تا ئەو بەریانە سەرەکی و یەکلاکەرەوەیە پەیدا بکەین کە هەرکات بڕیار بێ راگەیێنیێك وەکو ڕاگەینێکی هونەری بمێنێتەوە خۆدزینەوە لە باندۆرپەسندیی ناکرێوبەناچار پەیتاپەیتاسەرنجی لێ دەداو بۆ گریمان و لەپێشدانانەکانی دەگەڕێتەوە.من ئەم" قۆناخی سێهەم"ەم بەسەرنجدان لەوشتەی خۆم بە شکۆمەندترین ئەزموونە هونەرییەکان دەیناسم بەرەنجامگیری کردوە و باکیشم نیە کە ئەم ئەزموونانە یەکتا یا تەنانەت زاڵ نەبن، چونکە خەدی سەرەکیی رۆژگاری پۆست مودێرن ئەمەیە کە هەر ئەزموونێك و سەرباشقەیەکی یەکتا و لێبڕاو لەبرەو بخات. دیاریکردن و درکی پێگەی نیارڤان لە داهێنان و دروستکردنی جیهانی بەرهەم لەهەردووك قۆناخی مودێرن و پۆست مودێرن ئاسان نیە و دژواری لێرەوە دێت کە دەبێ پەیتا پەیتا دیالکتیکی بەسترانەوە و جیاییيان بدۆزرێتەوە. وردبوونەوە لە ئەزموونە شکۆمەندە هونەرییەکان کاری تێگەیشتن لەم دیالکتیکە ئاسانتر دەکات. دوایین رۆمانی جیمزجۆیس **Finnagans wake**بێننە بەرچاوتان، رۆمانێکە هەم مودێرن و هەم پۆست مودێرن، لەهەمان کاتدا تەشقی تواناییەکانی دەربڕینی ئەدەبیی



مودێرن نیشان دەدا، کەمایەسییەکانیشی زەق دەکاتەوە، هەم سەرباشقەی مودێڕنیزمە و هەم نەلواو بوونی سەرباشقە لە رۆژگاری ئێمە دەسەلمێنێ.

هەنوکە دەتوانم بناخەی باسەکە کورت بکەمەوە، نیارڤان توخمێکی مرۆیی لە جیهانی دەقدا سازدەکا و لەم روەوە پێڕەوی درك پێکردنی رۆژگارەکەی لە واتای مرۆڤە. ئەو لە هەرکام لە سێ سەرباشقەکانی جێی مەبەستی ئێمە لە گەوهەری خۆیاندا کارێکی یەکسان ئەنجام دەدا: پێگەی مرۆڤ لە جیهانی بەرهەم بەپێی پێڕستبەندیی دانایی سەردەم دیاری دەکا. لە هەمان کاتدا کە دەبێ ملکەچی رێساکان بێت، هەمدیس لە هەر دەورەیەك لە کارەکە پێچەوانەکەی ئەنجام دەدا، واتە رێساکان تێك دەشکێنێ. پەیتا پەیتا ئەگەری راڤەگەلی تازە دەخولقێنێ. نیارڤان نەك یەك جیهانی دەق بەڵکو دنیاکانی دەق سازدەکا. ئەو بۆ هەرکام لە تەماشاوانان دنیایەکی تایبەت دەئافرێنێ و لەودا بەردەوام ئەگەر و کەرەستەی تازە دەخولقێنێ.کەوابوو ئەو دەبێت بە دەربڕینی ئازادیی تەماشاوانان، پێویستی و هەرەپێویستی دەخاتە ڕوو.کت و مت لەبەرئەمە کاری ئێوەی نیارڤان لە کاری ئێمەی نووسەرەوە نزیکە. ئێمە جیهانی بەرهەم دەخولقێنین و بێ ئەوەی بزانین یا بمانەوێ دەبینە ئامرازی ئاخێو. ئاخێوی شانۆیی بۆ ئێوە خەت و نیشان دەکێشێ و لۆژیکی ئاماژە زمانی و خوازەییيەکانی ئاخێو بۆ ئێمە دەڕەخسێنێ. ئەم لۆژیکە هەم ئێمە لەکار وەردەدا و هەم چوارچێوەمان بۆ دادەنێ. هەردووکمان لەگەڵ یەك دیالکتیکدا بەرەوڕووین، لۆژیکی پەسندکردنی رێککەوتنەکان کە بەکردەوە رێگەیەك جگە لە شکاندنیان و هەوڵدان بۆ سازکردنی رێککەوتنگەلی تازە ناهێڵێتەوە. لەم روەوەیە کە کارمان بەردەوام پێشبینی هەڵنەگرە،بانترلەنیازیئێمە هەڵدەکشێ،بە سەمەدگەلی شاراوە و نائاگای ئێمە دەبەسترێتەوە، زۆر جاران بەرهەڤی سەرسووڕمانمان دەکا، پەیتاپەیتا بۆ ئەوانیدی واتاگەلی تازە سازدەکا و لەوان دەخوازێ تا بە بیچم دان بە راڤەکانیان لە بانهەڵکشانی واتاکاندا بەشداری بکەن. نیارڤان و نوسەر ـ تا ڕادەیەك بە شێوە نەناسیاو و نائاساییەکان ـ هەواڵ لە ئازادیی نیشانەسازی دەهێنن، پێگەی مرۆڤ لە جیهانی بەرهەم دیاری دەکەن، باس و روونکردنەوە دەکەن، هەمدیس گۆڕانکاری دەکەن و دەبنە رێخۆشکەری ئازادیی واتاسازی. ئەوان بەردەوام دەربڕی سەرهەڵدانی کەسێکی دیکەن. پەیتاپەیتا مرۆڤێکی تازە لە هەناویانەوە سەروەدەردێنێ و دەڵێ: دەکرێ بە شێوەیەکی دیکە ژیان بکەیت، بە بیچمێکی دیکە تێهزریت، بە جۆرێکی تازە لێکدانەوە بکەیت، شتێکی تازە بخوازی.

## پرسیارانی ناکۆتا

**(١)**

پێگە و بایەخی فیلمەکانی ئینگمار بێرگمان لە سینەمای مودێڕن دەتوان لەگەڵ پلە و پایەی بەرهەمە سازکراوەکانی ئارنۆڵد شۆئێنبێرگ لە مۆسیقای مودێڕن بەراورد بکەیت.

دوو هونەرمەند لە باشترین بەرهەمەکانیاندا، لە هەر چەشنە بیچمێکی دەربڕینی نەریتی دابڕان، چەند دەیە، پەیتا پەیتا، مێتۆدگەلی تازەیان تاقی کردەوە، زۆر جاران گەلێك ڕێسایان داڕشت و خۆیان لێیان تێپەڕین. بەشێوەیەکی جێی پەسن توانییان جیهانی نێوەکی و زەیینی خۆیان لە جەرگەی بیچمگەلی پێشتر نەناسراو، ئاشکرا بکەن. بەرهەمەکانی شۆئێنبێرگ ڕێگەیەکیان خۆش کرد تا مۆسیقا وەکو هونەر چیدی نەتوانێ لەوەوە بگەڕێتەوە.بێرگمانیش لە تەشقی کارەکەیدا، لە سینەما هونەرێکی یەکسەرتازەی خوڵقاند. دابڕانێکی وەها لێبڕاوانە لە نەریتەکان و بیچمەکانی دەربڕینی پێشوو، لە مێژووی هونەردا کەمتر پێشینەی هەیە.لەلایەکی دیکەوە نیوسەدە مەودای نێوان ئەزموونەکانی شۆئێنبێرگ و بێرگمان گۆیای پشکوتنی وەدرەنگ کەوتوی سینەمای مودێڕنە.

**(٢)**

سەردەمی سەرهەڵدانی مودێڕنیزمی هونەری دەیەی ١٨٩٠ دەزانن. ئەم" ڕێبازی گشتیی دەربڕین"بەگوتەی مارسێل دوشان بە مانای ئاگایی هەرشتێکی تازە لە هەڵکەوتی تازەی لە جیهان بوو. ڕێبازەکان، شێوازەکان و ئەزمونگەلی فرەچەشن لە ژێر ناونیشانی هەمەکیی مودێرنیزم گردبوونەوە. وەك بڵێی" مودێڕنیست" سیفەتیك بوو گۆیای مانگاریی بەرهەم. ترس، دڵەڕاوکێ و دۆش داماویی دوو نەوە کە جەنگێکی جیهانی و لێکەوتەکانی وەپشت سەرنابوو و جەنگێکی دیکە و داهاتویەکی ڕەشیان لەبەردەمدا دەدی، لە جەرگەی ڕێساکانی مودێڕنیزم دەهاتە دەربڕین. لەبەرهەمەکانی جۆیس، کافکا، وۆلف، براك، پیکاسۆ، شۆئێنبیرگ، ڤێبرن، بێرگ و ... دەتوانی زایەڵەی ناڵە نائومێدەکان ببیسی کە هەروا گێڕەرەوەی وەیشومە و نەگبەتی ڕۆژگاری ئێمەشە.



سینەما لەهەمان دەیەی ١٨٩٠ سەری هەڵدا، بەڵام تەنیا لە مێژودا ناسنامەکەی هاوزادی مودێڕنیزم بوو. کاتێك کە خەریکبوو بە دژوارییەوە خۆی بە فەرمی بناسێنێ و دەیهەویست یەکەمین توخمگەلی زمانی تایبەت و جیهانی خۆی بدۆزێتەوە، پێشڕەوانی مودێرنیزمی هونەری لە لقەکانی دیکەی دەربڕینی هونەریدا لە لوتکەکان تێدەپەڕین.بایەخی ئەزموونە درەوشاوەکان، بەڵام بەهەرحاڵ بەرتەسك و گوزەریاوی مودێڕنیزم لە سینەمای دەیەی ١٩٢٠ ( واتە بەرهەمەکانی سورریالیستەکان، ئێکسپێرسیۆنیستەکان، پێشڕەوانی سینەمای فەرەنسا، نوێپەیجۆرانی سینەمای سۆڤیەت و...) ئەوە لەجێی خۆی،بەڵام" زمانی سینەما" لەجێیەکی دیکەدا بیچمی گرت: لەپانتایی سەنعەتی فەرهەنگی و هونەری هەموان پەسند. هونەرەکانی دی، هەرکام و بەجۆرێك لەجۆرەکان لە تاقیکارییەیە تازەکەیان بە بێدەنگی گەیشتن. لە کانتاتەکانی ئانتۆن ڤێبرێن تا بێدەنگیی ڕەهای جان کیج ڕێگەیەك نەبوو و لە تابلۆ ئەبستراکتەکانی واسیلی کاندینسکی تا پەڕەمووچی تاك ڕەنگی مارك ڕۆتکۆ و بارنێت نیومەن و لە ئەزموونەکانی نواندنی زورگە و ئێشترنهایم تا سەکۆی سامۆئێل بێکت کە نوقمی تاریکی بوو. زوو، چیرۆکبێژان ڕۆمانیان جێهێڵا و شەوی درێژی دابلین جۆیس دەستی پێکرد.

بەڵام سینەما لەم تامەزرۆیی‌یە بە خامۆشی لەگەڵ هونەرانی دیکە نەکەوت. بە یاریدەی دوو درکی هەستەکیی مرۆڤ و شەش سیستمی نیشانەناسی کارێکی کرد کە هونەرانی دیکە توانا و وێدەچێ تامەزرۆیی ئەنجامدانیان نەبوو. سینەما تاقانە هونەری ئەم سەدەیە بوو کە بە هێز و تامسارییەوە ناونیشانی کلاسیکی لە کۆڵ کرد. هونەرەکانی دیکە چونکە دەیانهەویست شتێکی تازە ئەزموون بکەن خەدی پێوەندیکاریی خۆیان لە کیس دا و چونکە لە بەرامبەر(خوێنەر ـ بیسەر) تێدەهزرین ئیدی تازەنەبوون. سینەما، ئەگەر نەك هەمیشە، لە زۆر لاوە شتە تازەکانی خۆی لەگەڵ ملیۆنان کەس ئەزموون کرد، باش یا خراپ وەها بوو.

سینەمای مودێڕنیش لە ڕێوە هات. بەڵام، درنگ، کاتێك کە دەفتەری مودێڕنیزم چەند دەیە پێشتر داخرابوو. کاتێك کە سەرباشقەی سینەمای کلاسیکی هالیوود کامڵ بوو و لە بەردەمیدا ڕێگەیەکی دیکەی نەبوو، یا پەیدای نەدەکرد. کۆرۆساوا بە **ڕاشۆمون** بنچینەی گێڕانەوەی هەڵتەکاند، ئالێن رنە بە **ساڵی ڕابردو لە مارین باد** هەڕەتی کرد بە قارەمانی فیلم، بە **پێرسۆنای** بێرگمان شاراوەگەری بوو بە بنەمای کار و بە ئێستاکێر تارکۆفسکی سپیتایی هەقیقەتی تێکەوە پێچا. هەڵبەت، هەر بەو چەشنەی هێشتاش ڕۆمانگەلی پڕفرۆش چاپ دەکرێن، سینەمای نەزیلەبێژیش هەیە، هەر بەو چەشنەی کە بەستەی بازاری دەچڕێن،

فیلمگەلی هەمووان پەسندیش دروست دەکرێن، هەر بەو چەشنەی کە نیگاری ریکلامیو پڕوپاگەندەیی هەیە، سینەمای دەروەست و سیاسیش کاری خۆی دەکا، بەڵام لەم هەرایەدا، تاقیکاریی شتانی تازە و خودئاگایی مێژویی، واتە درك پێکردن بە هەڵکەوتی راستەقینەی دەربڕینی جوانیناسانەی هەمبەرێتییە مرۆییەکان، بە سینەمای مودێڕن سپێردراوە و کتومت لێرەدایە کە بەرهەمەکانی ئینگمار بێرگمان دەدرۆشێنەوە.

## (٣)

لایەنگرانی تێڕوانینی دانەر لە سەلماندنی کارەکەیان دژوارە بتوانن نموونەیەك باشتر لە بێرگمان پەیدا بکەن.رەمزەکانی تایبەتی دانەر لە تێکڕای بەرهەمەکانیدا بەکارهاتوون. "جیهانی دانەر" مۆر و نیشانی فەزای تێکڕای بەرهەمەکانی ئەوە. خۆی چەندقات لە نیاز و مەبەستەکەی لە سازکردنی ئەم فیلمە و ئەو سکانسە دواوە و ژیاننامەکەی بە راشکاویو راستگۆییەکی دەگمەن نوسیویەتی. لەوە گرنگتر پەرتوکێکی لە ژێر ناوی **وێنە** لە باسلێکردنو ڕاڤەی کەسیی خۆی لە بەرهەمەکانیدا بڵاوکردۆتەوە، کە وەکو تێکڕای پەرتوکگەلی لەم چەشنە، لە چەند لایەنێکەوە بە کاردێت و لە چەند لایەنێکیشەوە گومڕاکەرە و ئەگەری رەخسانی بەرامبەری (خوێنەر ـ بیسەر) بەرهەمەکانی ئەو لە ئەفراندنی ئاسۆی کەسیی چاوەڕوانییەکانو خەیاڵکردەکانی خۆی بەرتەسك دەکاتەوە. لەراستیدا، بە ناسینی دنیای زەینیو مەسەلە تاکەکەسییەکان، نێواخنی و دەروونناسانەکانی دانەر ناتوانی پەی بە ئاماژەکانی بەرهەمەکانی ببەیو ناکرێ بەم هەموەوە واتاگەلی یەکتا و لێبڕاو وێنا بکەیت. بە زانینی ئامانجەکانو نیازەکانی سینەماگەر، رەنگە چەندلایەنێکی سەراسا لە بەرهەمەکانی بزانرێن، بەڵام هەم ئەم ئاقارانە دەتوانی لەرێگەی وردبوونەوە لە بەرهەمەکان و بەتایبەت لە رێگەی وردبوونەوە لە هەمبەرێتیگەلی نێواندەقیی بەرهەمەکان بناسیت و هەم بەسەرنجدان لە زەینی دانەر، بە هەرحاڵ، هەرگیز لە توانایدا نابێت تەواوەتی واتایی بەرهەمەکان رۆشن بکاتەوە. ئەو کەسەی کە بڕوای بە وەها تەواوەتێك هەبێ، یا بیهەوێ ئەزموون بکات کە ئایا گەیشتن بەوە دەلوێ یان نا، رێگەیەکی نیە جگەلەوەی لە خودی بەرهەمەکانەوە دەست پێبکا.

ئەم خاڵە نابێ بە نکۆڵی یا دروستی یا گرنگیی دیدگەی دانەر بزانی، تەنیا دەسەلمێنێ کە بە دەستڕاگەیشتن بەم تیۆرییە ئێمە تازە هەنگاوی یەکەممان ناوە، واتە دانەری بەرهەممان



ناسیوە، نەك بە واتای ناسینی شتێك لە جیهانی زەینیی خۆیدا، بەڵکو بە واتای سادەی ناسنامەیی. چونکە لانیکەم لەمەڕ ژمارەیەك لە بەرهەمە سینەماییەکان، بە تایبەت لەمەڕ فیلمەکانی سینەمای کلاسیکی ئامریکا، ئەم ڕایە، کە رەنگە سواو و سادەو ساکار بێت، بەهیچ شێوەیەك ساکار نیە. بەڵێ، بە ناسینی کەسێك بە ناونیشانی دانەر تازەبەتازە کێشەیەکی سەرەکی دێتە بەردەمی ئێمە. دانەر بەرهەمی ئافراندوە، وەکو شاعیرێك کە شیعرێکی چڕیوە و نیگارکێشێك کە تابلۆیەکی کێشاوەتەوە. وەلێ چۆن دەکرێ واتای ئەو شیعرە، یا واتای ئەو تابلۆی نیگارکێشییە لە ئامانجگەلی زەینی، نەخشەکانو نیازەکانی دانەر قەتیس بکەیتەوە؟ بۆ درك کردنی واتای فیلمێك، یا تەنانەت سکانسو دیمەنێك لە فیلمێك، ئێمە ناچارین کە بانتر لە چوارچێوەی تەنگی نیازە راگەیەندراوەکان، یا گریمانی (لە پاڵدراو) تێپەڕین. ئێمە لەم خاڵانەدا خۆمان دەست بە راڤەگەری دەکەین. هەر بەو چەشنەی کە بۆ تێگەیشتن لە گوتەکانی دانەر لەبارەی ئامانجەکانو نیازەکانیشی بە ناچار راڤە دەکەین. ئەم هاویەکبوونی تێگەیشتن لەگەڵ راڤە، خاڵێکی هەمەکی، بەڵام لەمەڕ سینەمای مودێڕن بە شێوەیەکی رۆشنتر و گۆیاتر ڕاست دەنوێنێ، چونکە سروشتی بونیادیو گەوهەری فیلمە مودێڕنەکان لێڵیو تەمتومانە. ناڕۆشنیی واتایی فیلمگەلێ وەکو **شەرم** و **هەروەك لە ئاوێنەدا** بەباشی نیشان دەدا کە ئێمە لە پەسندی دووریی بێرگمان لە بەرهەمەکانیدا و کەسیبوونەوەی ئەم بەرهەمانە بۆ بەرامبەر (خوێنەر ـ بیسەر) چارە و لێدەربازبوونێك نیە.

## (٤)

لەنێو فیلمەکانی بێرگماندا **پێرسۆنا** نموونەیەکی تەواوە. سەرنموونەی سینەمای مودێڕنە. تا ڕادەیەك لە سەرتاسەری فیلمدا بێجگە لەگەڵ دوو نیارڤان سەروکارمان نیە، مەگەر لە جێیەك پزیشکێك و لە جێیەك هەنتەشی مێرد لە بیرەوەرییەك و هەڵبەت کوڕە هەرزەکارێك کە رەنگە هونەرمەند خۆی بێت، کە دنیا دەدۆزێتەوە و ناتوانێ بیناسێ و تێدەکۆشێ تا درکی پێ بکات. دوو نیارڤانەکە دوو ژنی لاون، هەو بەتەنیا لە دورگەیەکی پەرت. لەم دوانەدا یەکێك بە شێوەیەکی خۆویست بێدەنگیی لێکردوە و ئەویدی پەرستیاریەتی، تیمارگەر، نیگەران، هەندێجار دۆست و هەندێجار دوژمنیەتی. هەندێجار لەو نزیکە و بڕێك جار لەو دوور. بنچینەی گێڕانەوە بە باڵادەستیی وێنەکان هەڵچنراوەو وێنەکان لێڵن.ئەوەیگریمان

دەکەین،ئەوەی ئاسۆیوەرگرتنی ئێمە دەخولقێنێ،تاکبێژییە دوورودرێژەکان(هەمان )پەرستیارە. بەگێڕانەوەگەلێ کە لە ئەڤینو ژیانی سێکسیی خۆی دەدوێ، هێماگەلێ کە بە منداڵیی خۆی دەکا و پێویستیی بە هاودەمی، هاوخدەیی، بەمشوریو بێزار بوون لەوەی کە نەبادا لەقاو بدرێ.

**پێرسۆنا** فیلمێکە لەپەسنی سینەما. دەستپێکو ئاکامی هێمایەکە بۆ سینەما. منداڵێك کە بە دەزگایەکی شانۆییەوە سەرگەرمە و دەست بە سەر پەردەیەکی سپیدا دەکێشێ تا شتێك لە جیهان "هەست بکات". فیلمێك کە دەسوتێ، چرکەساتگەلێ لە فیلمێکی کۆنی سازکراوی خودی بێرگمان کە هێمایەك بۆ تەمەنی ڕۆیشتوی ئەوە و دەنگی دەرهێنەر خۆی و سەرەنجام وێنەی ئەو کە فیلم هەڵگرەوەی گەورەی ئەو، سون نیکۆیست، کاردەکەن. فیلمەکە بەردەوام گەڕانەوەیە بۆ باسلێکردنی ڕێسای وێنە. بە چۆنایەتیی بیچمگرتنی بیرۆکەکانی فیلمسازیو هەڵبەت بە پێویستیی بەسوێ بە داهێنەری، تا دنیا وەکو ئەو کوڕە منداڵە واتا بکەینەوە. دنیای خۆسوتاندنەکانی ئیمانداری بودابیو جیهانی ئاشۆویتس.

کێیە کە نەزانێ، **پێرسۆنا** دوابەدوای دوو دەیە ئەزموونی پڕ گیانەڵای سینەمایی پێك هاتوە. لەم کامڵترین بەرهەمی سینەمای مودێڕن، لە بەراورد لەگەڵ بەرهەمەکانی دیکەی بێرگمان، نیشانە وێنەییەکان ئاگایانەتر، ئازادانەتر و کتومتو وردتر کەم بوونەتەوە، تا ئەو جێیەی کە بەشێوەیەکی پەرجوئاسا ئاگایانەتر شتێك هێما بە شتێکی دی ناکا و ڕێگە بۆ ئێمە نەدەمایەوە تا لە وێنەگەلی دورگەیەکی تەریك کەوتو، کەناراوی بەردینو دەریا ساردەکەی، پەنا وەبەر ئاخاوتن بەرین. ئاخاوتەیەك کە لەو فیلمە کۆنەدا لە پیواردا بوو و لێرەشدا هەرچەند ئامادەیە، ڕێخۆشکەری واتاگەلی دڵنیاکەر نیە. هەموشتێك لەنێوان ڕاست و درۆ دەگوزەرێ. هەرکات باوەڕ بێنین کە ئەوەی دەیبینین ڕاستە،پشکی درۆ لەودا زەق دەبێتەوە. ئەم ژوورە بەتاڵانەی کە لە هەر ڕازاندنەوەیەك بەدەرن، ئەم ڕەوەزانە لەهەر خدەیەکی تاکمەند و کەسی، لە هەر تایبەتمەندی و خدەی دیداری بێبەشن. توندوتیژییەك کە لەسەر بەکگراوەندی دیوارێکی ڕووتەڵە رووددا، میهرەبانیو هۆگرییەك کە لە هەموو جێیەك وەکو یادەوەرییەکی تەماوی، ڕەواونەتەوە، جەختێك لەسەر دیمەنە ئێجگار نزیکەکان دەکرێت تا شتێك بێجگە نارۆشنیی خواپێداوی ڕۆخساری مرۆڤ نەمێنێتەوە، هەموان کارێك دەکەن تا تەماشاوان، زوو، ئاگابڕاو و تاڕادەیەك خەواڵوو، بەسترانەوەی بە کەتوار لەکیس بدا و قبووڵ بکات کە لێرەدا دڕدۆنگییە کە حکومەت دەکا.چیدیسنورێکی ڕۆشن لەنێوان خولیاکانو



ڕووداوەکان نامێنێ. ڕووداوە "ڕاستەقینە"کان بە هەمان بارتەقا دەبنە هاوشێوەی مۆتەکە کە وێنەی ڕوومەتی منداڵێکی ترساو لە گێتۆ دا، کاتێك خۆی بە دەستەوە داوە و لەگەڵ توندوتیژیی نازییەکانو جیهانی مودێڕن بەرەوڕوو بووە و ئیدی پەنایەکی نیەو نازانێ بۆچیو چۆن دەمرێو بۆچی ڕقیان لێی دەبێتەوە و بۆچی ناکرێ بژیێ.

بەرەوڕوویی مرۆیی، زیاتر بە تەڵەکەی وێنە/ دژە وێنە وەدەردەکەوێ، بەڵام نەك بە شێوەی باوی نیگا/ دژەنیگا. دوربین کە هەنتەشی لێبڕاوانەی خۆی ڕادەگەیەنێو هیچ ناشارێتەوە کە ڕەژیدەی هەقیقەت ئەم چرکەساتەی ئەوە، لە پشتی کەسیەتیی یەکەم، ڕوخساری کەسیەتیی دووەم تۆمار دەکا، تا بەخێرایی دیمەنی ڕوولەڕوو یا دژەدیمەنی پشتی کەسیەتیی دووەمو ڕوومەتی کەسیەتیی یەکەم ئاشکرا دەکا. بەم چەشنە مەودایەك پەیدا دەبێ، هەم لە نێوان ئەوانو هەم لەنێوان هەریەك لەوان لەگەڵ ئێمە، واتە تەماشاوانان. بە سەرسووڕمانەوە لەسەر پەردە دەبینین کە مەودایەکی لێدەربازنەبوو لەنێودەچێ، لە دوو، یەك ساز دەکرێ. ڕوومەتێك، دەمامکێك کە نیوەی ئەم مرۆڤەیە و نیوەی ئەو مرۆڤەی دی. سیمای نەلواو بوونی ڕەهای داوەری.

لە **پێرسۆنا** دا شەیدایی بێرگمان بە دیمەنە ئێجگار نزیکەکان، بە سیمای قەبە، کاری خۆی دەکا. سەرەنجام یەك ڕوومەت دەمێنێتەوە، لە یەك ساتدا هەم سروشتیو هەم ناسروشتی، هەم شیانی پەسند و ئەم جێی پەسند نەکردن. هەرچەند ئەم ڕوومەتە لە دوو ژن دروست کراوە، بەڵام ئیدی ڕەگەزێتیی نیە، ڕەنگە بیناسین بەڵام سارد و نەناسراو دەمێنێتەوە، نیگای، کە هەم شاراوەگەرە و هەم ئاشکراکەر، ئەمە دەڵێ کە لە هەر پێوەندییەکی مرۆیی هیوابڕاوە، وەلێ خۆی کامڵترین پێوەندییەکان، هاویەکبوون دەنوێنێ. بێتوانایی لە نواندنگەرییە، لە هەمان کاتی وەدەرخستندا. گەیشتۆتە دەمامکێك، بەڵام مرۆییە. مرۆڤ بە واتای نەلواوبوونی دابینکردنی ویستەکان و لە ڕاپەڕاندنی ئەرکی سەرشانی. ئەم وێنەیە کامڵترین سیمبۆلی هونەری مودێڕنە. بە شێوەیەکی پێکناکۆکئاسا وەهایە، چونکە هونەری مودێڕن بڕیارنەبوو کە سیمبۆلێك ساز بکات.

**(٥)**

نیارڤانان لە سینەمای بێرگماندا دەورناگێڕن، هونەرپیشەو نیارڤان نین، لانیکەم بەواتای ئاساییو ناسراو و ئاشنای "کایەکردن لە سینەمادا". ئەوان بە واتای منالێك کە یاری دەکا،

وەکو جیهانی هیراکلیتۆس، نیارڤانن. بێرگمان، لە کاتی نووسینی فیلمنامەکان، بەئاشکرا، لەوان، لە تاکایەتیو تایبەتمەندییە سەراساکانیان، تێدەهزری و تان و پۆ،تا ڕادەیەك، لەسەر بنەمای هەنتەشی ئەوان بیچمی دەگرت. بە بێهاریەت ئاندرسێن، فیکری هاوارەکانو ورتەورتەکان بیچمی نەدەگرت. بە بێ جەستەی لەڕ و هەستیاریی زێدەڕۆیانەی ئەو، فیلمەکەی نەلواو دەبوو و بەبێ دەستە لاوازەکانی کە لەهەمان یەکەمین وێنەوە لە ئازارە جەستەییو بێدارییە گیانەڵاکانی شەوانەی دەدوێ و لەسەر لاپەڕەیەك لە پەڕاوگی بیرەوەرییەکانی ڕۆژانی نزیکی مەرگی خۆی دەنوسێ، هەمان پەڕاوگ کە لاپەڕەیەکی دیکە لەو فیلمە وەکو چەندساتێك لە بەهەشت دێنێتە کۆتایی، بیرەوەری یا چیرۆکێکی خەیاڵی لە سەیران لە ڕۆژێکی ساماڵ لە مێرگو ئۆخژنی نزیکایەتی لەگەڵ ئەوانیدی. وە... مەرگ کە لە نیوەڕێگای فیلمەکەدا دەیگاتێ (هەژێنەرترین مەرگ کە سینەما بەخۆوە دیویەتی)، ژیانی دۆزەخیی پێشو و یادەوەرییە پڕ لە خولیا و بەهەشتێك پێکەوە گرێ دەدا،تا نیارڤانێکی مەزن هەمووشتێك لەدەوری تەوەری ژیان و یادەکان و داخوازەکانی مرۆڤێك بیچم بدات. نیارڤانێك چرکەساتەکانی ژیانی نێواخنی خۆی ئاشکرا دەکا، ئەو کە ڕۆژێك لاو بوو و **جوانخاس**، وەکو مونیکا لە لمەکانی کەناراو دادەنیشت و پێدەکەنی و بەیانی زوو لە تەنیشت ئاوی دورگەیەکی بچوك دەستی بە ژیان دەکرد. ژنێك کە ئیدی ئێستا لە ژیاندا نەماوە و لەگەڵ زۆرێك لە هونەرپیشەکانی بێرگمان لە هێڵی ئاسۆدا دوابەدوای ئەو تارماییەکی ڕەنگ ڕەش ڕێی دەکرد کە کەرەمتویەکی دابوو بەشانیا. **بەرکەوت** سرودی پەسنکردنی نەنە ئاندرسۆنە، **سۆناتای پاییزی** ڕێزدانانە بۆ ئینگریدبێرگمان، لە **بێدەنگی دا** هەموو شتان لە راژەی هونەرنوێنیی وڕکەری ئینگریدتولین دەسوڕێنەوە، **مۆری حەوتەم** لەگەڵ نیگای ماکس فۆن سیدۆ هاوجووت بووە، نیگایەك هەم لە ڕووی بەزەیی هاتنەوە بە مرۆڤانی گول، تاعون لێدراو، تەنیا بەڵالێدراو و هەم لەڕووی ئەڤینەوە بۆ شتێك کە لەکیس دەچێ: ژیان. **پێرسۆنا** بە بێ لیوئولمان، شەوارەی، هەستی جەستەیی ئەو بە پێویستیی بە ئەویدی واتای هەبوو؟ سینەمای بێرگمان فێرمان دەکا کە بە نیارڤان،وەك مرۆڤ، نەك وەکو ئامراز، بەڵکو وەك ئامانج بڕوانین.

**(٦)**

بێرگمان بەردەوام لە هەژاریی وێنە تێدەهزرێ. تێدەکۆشێ تا نەك لە توخمگەلی وێنەیی، بەڵکو لە تێکڕای نیشانەکانی دیکەش کەم بکاتەوە. دەنگەکان تا ئەو جێیەی کەم دەبنەوە کە



تەنانەت یەك دەنگ، باندۆری هەژێنەر پەیدا بکات. دەنگێك، تاك واتای کتومتی خۆی پەیدا دەکا. تارکۆفسکی جارێکیان لە باندۆری دەنگی شەپۆلانی روبار لە **تیریژی زستانی** دواوە، کاتێك پیاوێکی هیوابڕاو و هەراسان لە مەترسیی جەنگ خۆی دەکوژێ. ڤوودی ئالێن جارێکیان گوتبووی لەگەڵ زمانی سویدی ئاشنایەتی نیە، بەڵام بە دیتنی بەرهەمەکانی بێرگمانو بە هۆی ئەوانەوە باوەڕی بە یەك خاڵ هێناوە: "ئەمە زمانی جیهانیی ئەڤینە". بێرگمان لە بەرئەوەی کە هەندێجار نیشانەگەلی ئاخاوتەییو دەنگی لە ئەرکی نیشانە مۆسیقاییەکان نزیك دەکاتەوە، دەتوانێ کارێکی گەورەتریش ئەنجام بدات: ئەو نیشانە وێنەییەکان، لە تەکووزمونديی شتان تا تیشك پڕژاندن، لە ڕەنگەکان تا گۆشەنیگاکان و تەنانەت ئاوازی مۆنتاژی دیمەنەکانی بە سیستمێکی مۆسیقایی گەیاند. بەراوردی نێوان بێرگمان و شۆئێنبێرگ، کە نوسراوەکەم بەوە دەست پێکرد، بەرلەوەی کە وەبیرهێنەری، هاوشێوەییەکان لە مێتۆد و کاری دوو هونەرمەندی مودێرنیست بێت، لە جۆرێك لێکچونی نێوەکیو گەوهەریی نێوان بەرهەمەکانیان دەدوێ.

**(٧)**

گەڵاڵەی چیرۆکیی فیلمەکانی بێرگمان سادەیە. لە دوتوێی ئاخاوتەیەك، لە لابەلای چەند دێڕێکدا، دەتوانی هەقایەتێك بگێڕیتەوە. سوارچاکێك لە جەنگو سەرزەمینی سپیتا دەگەڕێتەوە و شەترەنج لەگەڵ مەرگ دەکا و دەدۆڕێ و لەم جەنگەدا تێك دەشکێ. ژنێك دەمرێو خوشکەکانی و خزمەتکاری وەفادار و ئەڤینداری، ئەو دەخەنەوە یاد. بەڵام لە فیلمەکاندا، ئەم هێڵە سەرەکی‌یەی هەقایەتەکان، نەزیلە ساکارەکان، کە زیاتر لە تەنگژەی هەمبەری دوو یا چەند مرۆڤ دەدوێنو لە بنەتادا تەنگژەی نێوەکیی رۆحی مرۆڤێك دەگرنەخۆیانو دەبنە هاوشێوەی رازێکی **سەربەمۆر**. لایەنێکی شاراوە، نەگوتراو، تەنانەت تێنەهزریو، بەڵام هەستپێکراو بەدی دەکەن، ئاخاوتەیەك کە لە راشکاوی هەڵدێت، چونکە ڕاشکاوی بە کوشندەی واتای ناخ لە قەڵەم دەدا. رازی هەڵاتنی کەسیەتییەکانی بێرگمان بۆ دورگەیەك کە لەودا دەبێ بە تەنیایی خۆیان خوو بگرن، لێرەدایە: لە کەم کردنەوەی پێوەندییەکان، لە گۆشەگیری، لە دابڕان لە دنیا و پەنا بردن بە پاراستنی شەپۆلان، کەسێك نابێت کە تێبکۆشێ تا لە تۆ تێبگات. هەندێ پێوەندی کە چەندان تێکچڕژاو نین، لانیکەم

لەگەڵ پێشکەوتنی گێڕانەوە زۆرێك لە لایەنەکان ئاشکرا دەکەن‌و هەمدیس، هەروا قوفڵ لە دەم دراوە. کەوابوو سەرچاوەی رازەکان لە کوێدایە؟

## (٨)

تارکۆفسکی، خۆی، لە بێ‌خزمانی هەڵوەدای بەرهەمەکانی دەچوو. شتانێکی دەپرسی کە لە ئاخێوی ئاشنای فەیلەسوفان بەرسڤێکیان نیە. بێرسۆن ئیمانداره، هەرچەند جیهان لێوڕێژ لە خراپەکارییەکانی مرۆڤ دەزانێ، بەڵام باوەڕی بە ناخی بێ‌گوناهی کەسێك وەکو موشت و تەنانەت باخەڵبڕێ، مرۆڤکوژێ، گوناهکارێ هەیە. ئەمەیە کە لە بەخشندەیی خوا دەدوێ، چونکە ئەو دەبەخشێ‌و لە هەمان ساتدا، درەوشانەوەی بێ‌گوناهی و گەوهەری شاراوەی ئیمان دەبینێ‌و چاوپۆشی لە گوناهی ناچارانە دەکات. ئەم دوو سینەماگەرە خوایەکیان هەیە کە ئەگەر هیچکەسیش باوەڕی پێی نەبێ، بەلای ئەوانەوە وەکو یادێکی سپیتا لە سەرچاوەی شتە باشەکان ئاشکرایە. بەڵام بێرگمان هاوشێوەی ئەو دووانە نیە. نازانێ‌و دەنگەوازی ڕاپۆرتەکانی بەردەوام پرسیارگەرانەیە. وەکو گومانکارێك لەو دنیا مودێڕنە پەیتاپەیتا دەپرسێ، پەیجۆر دەکا. نە ئیمانی دێرینی هەیەو نە باوەڕی ئەمرۆیی بە زانست‌و ئاوەزی مرۆیی. سەر لێشواویی خۆی‌و ئەوانیدی بە هاوجووت دەزانێ‌و سەر چاوەی شتانی چاك نابینێ. نازانێ، گومانی هەیە، پەیتاپەیتا لە بێدەنگیی خوا دەپرسێ. لە کوێیی؟ چۆن لە بەرانبەر جیهانی بێ‌سۆز و بێ‌بەزەیی خامۆشی؟

دنیا وازی لە بڵێندی هێناوە و لە مرۆڤانی تەنیا کەڵەکە بووە. لە هەر وێنەیەکدا کە بێرگمان دروستی کردووە، هەمو شتێك نیگا بەرەو هەنتەشی مرۆڤ رێبەرایەتی دەکا. لە نیگای یەکەمدا ئەم رکێشبوونی نیگا بەرەو ئارایی یا پیواری مرۆڤ، یا راز و رەمزی هەمبەرێتیگەلی مرۆیی، کە خدەو هەوێنی هەمیشەیی بەرهەمەکانی ئەوە، یەکانگیریی نیە. رەنگە بوونی ئەم پارادۆکسە، زەینی تەماشاوان‌و رەخنەگری بەردەوام بە لاڕێدا بردوە، بەرەو گەلاڵەی دەروونناسی. بەڵام رازی بەرهەمەکانی بێرگمان، نەك لە بێ‌بگاریی دەرونیی مرۆڤێك (هەمبەری خودئاگایی لەگەڵ ناخودئاگایی)، بەڵکو لە پێوەندیی دوو یا چەند مرۆڤ وەشێراوە. رەنگە بتوانین بێژین لە هەمبەری نێوان کۆنەست‌و خودئاگایی تاکەکەسی هەر کام لە مرۆڤاندا. بەم چەشنە بێرگمان لە سنورو بنەتای دەروونناسی راوەستاوە. بۆ فام کردنی



کارەکانی ئەو، دەبێ لە دەروونناسی‌و تەنانەت لە دەرونشیکاریی بانترهەڵکشاو لە پانتایی رازئاسای ناخی دەروەستی مرۆڤ، دەروەست بە پێوەندییەکانی لەگەڵ کۆمەڵ، وردبینەوە. ئەگەر وێنەی منالێك لە گێتۆی وەرشۆ دەبێتە قوفڵ و کلیلی **پێرسۆنا**، لەم رووەوەیە کە ئەمە جگە بە وەبیرهێنانەوەی باری گوناهەکانی کۆمەڵێك مرۆڤی مودێڕن ناکرێتەوە.

هەر ئەم گوناهە بەکۆمەڵە، کە هەموکەس کە بەشێوەیەکی تایبەت بەخۆی نەیقەوماندوە، مەحکوم دەکا، رازئاسایی هەمبەرێتیگەلی مرۆیی دەردەخات‌و دوو لایەنی دیکە، یا دوو هەوێنی دیکە دەخاتە ڕوو: چارەنوس‌و دۆش‌داماوی. یەکەمیان جۆرێك خدەی تراژیك بە بەرهەمەکانی بێرگمان دەبەخشێ. مرۆڤەکانی دلێر نین، خودان مەزنایەتی رۆح نین کە بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ چارەنوسی مسۆگەر لێ‌دەربازنەبوو دەنوێنێ. رەوەزە سەختەکان، وەکو گۆڕەپانی تراژیدیی یونانی،دەربڕینێك، یا رەنگە سیمبۆلێك، لە چارەنوسی مرۆڤن، وەکو مەرگی رەشپۆشی **مۆری حەوتەم**، یا دەریایەکی تاریکی پڕ لە تەرمەکانی مرۆڤان لە (فیلمی) **شەرم** دا. کەمتر هونەرمەندێك بە قەد بێرگمان لە هەرەسی ئایدیالەکانی مودێڕنیتە، بە بێتوانایی ئاوەزیانی مرۆیی‌و کەمایەسیی داناییەکانی ئەو وەها بێ‌بگار و بێ‌چاوپۆشی ڕوانیویەتی. ئەوە کە ناهێڵێ تەنانەت بۆ ساتێك قورسایی گوناهانی مودێڕنی خۆمان فەرامۆش بکەین و پەیتاپەیتا وەبیرمان دەخاتەوە کە بێدەنگی فەرمانڕەوایە و دەنگێك نابیستین و لە تەنیشتمان مرۆڤان، هاوپێناو لەگەڵیدا ئێمەش تووشی ئەشکەنجەیەکی گەورە هاتوین کە لە دۆزەخی دینەکانیش ترسناکترە.

هێزێکی بانتر لە ڕاوڕایەڵەکان،هاوکێشەکان، لۆژیك‌ودرك پێکردنی عەقڵانیی مرۆڤ لە گۆڕێدایە کە چارەنوسێکی شووم نوساوە بە تەوێڵییەوە و لەوە بەدواوە ئیدی دەورێکی وەئەستۆ نەگرتوە. هەوێنی دووهەم کە پێکبەستراوی ماخولیای مودێڕنە و وەکو بەرەنجامی لۆژیکیی خاڵی یەکەم ئاشکرا دەبێ، بەردەوام رەخنەگرانی کەڵکەڵە کردوە تا بەرهەمەکانی بێرگمان وەکو راگەیەندراوەگەلی فەلسەفی بنرخێنن. بۆ ئەم کارەی ئەوان سەرەتا دەبایە دڵنیابان کە لە واتای بەرهەمەکانی سینەماگەر تێگەیشتون‌و دۆزیویانەتەوە. بەڵام کێ دەتوانێ بانگەشە بکا پەی بە واتای بەرهەمانێك بردوە کە تەمتومان گەوهەرەکەیانە؟ بەڵام ناتوانی سوچ لە کاری داهێنەرانی واتا بگریت. هەرکام لە ئێمە لە ئەزموونگەلی هونەریی خۆماندا داهێنەرین.وەلێ،کەسانێك واتاگەلی خۆڕەخساویان بە واتاگەلی ئەرخەیانگەر ناساندوە.ئەم

ئەرخەیانی‌یە مودێڕنە، کە تەمەنی لە لێواری گۆڕە، لەدژایەتی لەگەڵ ورەی سەرکێشی بەرهەمەکانی بێرگمان دەکەوێتە ململانێ.

## (٩)

ئەزموونی کورت، بەڵام درەوشاوەی سینەمای ئێکسپرسیۆنیست لە دەیەی ١٩٢٠سینەمای ئەوروپای باکوریی گۆڕی. تەنانەت مامۆستایەك وەکو کارێل تیۆدۆر درایر کە هەمبازی رێگەی ئێکسپرسیۆنیستەکان نەبوو، لەم باندۆرە نەیتوانی خۆی دوور بگرێت.هێزی هەژێنەری فیلمەکانی بێرگمانیش دەبێ لە جەرگەی هەمان ئەزموونداپەیجۆر بکەیت.جیا لەمە، بێرگمان بەردەوام، قوتابیی دڵکێش‌و وەفاداری ئێستریندبێرگ بووە، نوسەرێك کە باندۆری قووڵی لەسەر پێشەنگانی شانۆی ئێکسپرسیۆنیست هەبوو. بێرگمان زۆرێك لە بەرهەمەکانی ئەوی لەسەر سەکۆی شانۆ دەرهێنەری کرد و رەچەڵەکی برێك لەگرنگترین فیلمەکانی هەر ئەم بەرهەمانەن. **فانی و ئەلکساندێر** بە گوتەیەکی ئێستریندبێرگ دێتە کۆتایی کە سەروەریی خەیاڵ بەسەر کەتوار نیشان دەدا.سپیتایی کەتوار یەکەمین هەرامەیەکی سپیتا بوو کە لە سینەمای بێرگماندا تیك شکا. خاڵێکی دیکە کە لە باشترین قوتابیانی ئێستریندبێرگ، واتە ئێکسپرسیۆنیستەکان، فێربوو "کەتواری گۆڕاو"بوو. کەتوار تەنیاو تەنیا هەودای رووداوگەلێ لە "جیهانی کەتوار" نیە، رێچکەیەکی ئۆبژەکتیڤ نیە، بەڵکو خەیاڵکردی ناسینی، واتە هەر راڤەیەك لەو، هەڵکەوتێکی بووندارانە نیە. لەم رووەوە، گێڕانەوە لە کارەکانی بێرگمان هیچکات بە شێوەی کلاسیك دەربڕی رووداوگەلی هاوشێوە نیە، بەڵکو بەردەوام، لە هەر دیمەنێکدا، ئاوێتەیەکە لە رووداو و هزر. یادەوەرییەکانی دووری ئیزاك بۆرگ لە **تووە فەرەنگییەکێویلەکان** زیندو دەبنەوە، دەبنە خاوەن "کەتوار". ئەم خوازەیەی مێتۆدی دەربڕین کە دەڵێن:"دەبنە خاوەن کەتوار"، تەنیا بێتوانایی ئێمە لە باوەڕ بە کەتواری پێشینیان نیشان دەدا. ئەگەر سارا بەهەمان بارتەقا لاو، شاد و خۆشحاڵ و جێی پەسند چەندین دەیە لە پاش "کەتوار" لە تەنیشت ئیزاکی بەسالاچوو دادەنیشێ، لەم رووەوەیە کە لە جیێەکی دیکەدا، کاتێك کە ئیزاك لە ئوتۆمبێلدا دالغەی دەڕوا، جیهانی دەوروبەری وەها کت‌و پڕ و هەژێنەر تاریك دەبێ. ئەگەر سنورێکی دەسکرد کە ئێمە خۆمان لەنێوان خەیاڵ و ڕووداو کێشاومانە لە **پێرسۆنا** و زۆرێك لە بەرهەمەکانی دیکەی بێرگماندا وەها



ئاسان دەڕەوێتەوە. هەمدیس هۆیەکەی هەمان تاریکی‌یە کە کت و پڕ وێنەکە دادەپۆشێ. ئەمە لەگەڵ دڕدۆنگیی دژواری کەسییەتییەکان هاوپێناو دەبێ، کوڕێکی لاو بێتوانا لە وتووێژ لەگەڵ باوکی ئیدی تێ ناگا کە بۆچی خوا بێدەنگ بووە، قەشەیەکی نێونج ساڵو نەخۆش لە کونجکۆڵی لەبارەی هۆی بێ‌ئیمانیی خەڵك، پەی بە ریشەی دڕۆنگی لە دڵی خۆی دەبات.

ئیدی ئێمە، تەماشاوانانی دنیای ئینگمار بێرگمان نازانین کە لە کام جیهاندا دەژین، جیهانی ئەزموونگەلی ژیانی رۆژانە و "کەتواری فرەفاق"، واتە دنیایەك کە لەگەڵ دەورگەلی جیاواز کە ئێمە لەواندا یاری دەکەین بیچم دەگرێ، یا جیهانی خەیاڵی، دنیای گریمانخەیاڵەکان، وێنە زەینییەکان‌و بە شێوەیەك لە شێوەکان ئایدیالی؟

## (١٠)

تەنیا لە **پێرسۆنا** دا نیە کە ئێمە لە هەموو شتێك مەودا دەگرین، تا شایەتی بیچمگیریی فیلم بین. هەر فیلمێکی بێرگمان بەڵگەنامەیەکە لە بارەی بیچمگیری بەرهەمێکی سینەمایی. لە هەر فیلمێکی ئەودا، پەیام لە بەستێنەکانی ئاماژەکەر، بیچمەکانی ڕایەڵگەری‌و جەخت لەسەر رەمزەکان مەودا دەگرێ. هەڵبەت دەتوانی چەند لایەنێك لە "ژیاننامەیەکی خۆنوس" لە زۆرێك لە فیلمەکاندا و لەم دیدەوە لە گرنگترینی هەموویان **فانی‌و ئەلکساندێر** بەدی بکەیت، وەلی ناتوانی ئەم فیلمەو سەرباقی "ئەرکێك لە پەیام" بزانی کە چڕبوونەوەی لەسەر نێردەر بێت. هەر بەم بیچمە، بەرهەمەکانی بێرگمان بە خولیای گۆڕاندنی تەماشاوان دروست نەکراون. هەرچەند زۆرێك لە ئێمە لەپاش هاتنە کۆتایی فیلمەکانی (بێرگمان)وەکو مرۆڤێکی تازە لە سینەما دێینە دەرەوە.هەرشتێك کە سینەمای بێرگمان دەیخولقێنێ "لێکەوتەیی"ە، پەراوێزێکە لەسەر دەق، پەیوەستێکە لەسەر واتا، مەگەر یەك شت: شتێکمان دیوەو بیستوە کە لە هیچ رێگەیەکی دیکەوە نەدەزانرا،مەگەر لە رێگەی سینەماوە. ئەم "قسانە"مان، ئەگەر لە پەرتوکێك خوێندبایەوە، رۆمانێکی دووپاتە، یا دەقێکی فەلسەفی، بەڵام بێ‌رۆح، دەبوون، ئەگەر لە بەرنامەیەکی رادیۆیی بیستبامان، دواندەرییگەلی دوور ودرێژ بوون لەبارەی تەنیایی مرۆڤ... وەلێ لێرەدا کە لە سەر پەردەی زیوینی سینەما دەردەکەون، هەڵکەوتێکی تازە، نێواخنی، رازئاسا، شاراوەگەر و لێڵ پەیدا دەکەن. کاکێشانێك لە واتاکان. لێرەدایە کە هەزاران هەزار پرسیاری تازە سەروەدەر دێنن‌و لەم نێوەدا هەزاران بەڵام.

ئێمە لامان وایە کە هەرکە وشەیەك دێنینە سەر زمان، واتاکەی ئامادە ناکرێت. وەکو جنۆکەیەك کە لە شوشەیەکدا بە شاراوەیی مابوویەوە و بە فرمانی ئێمە،ئاغای بەتوانای ئامادە دەبێ. وەلێ هەر ئاماژەپێکراوێك یا هەر "خاڵێکی راڤەیی" بە ئاماژەپێکراوێکی تازە و خاڵێکی نوێ بەستراوەتەوە، واتای هەر نیشانەیەك خۆی نیشانەیەکی تازەیە و هەرکە لە نیشانە ورد بینەوە، واتاکەی وەدرنگ دەکەوێ. واتا بەم پێیە هەرگیز ئامادە نابێت. سینەمای کلاسیك تەنیا بە متمانەی "خووە فیکرییەکانی ئێمە"پشت ئەستور بە توانا هەستەکییە دیداری و بیستاریی ئێمە، خەیاڵکردی تێگەیشتنی واتای دەخولقاند. رەمزگەلێکی ساز دەکرد کە بەپێی رێککەوتنێك دەبایە تاك واتایی بوایە و ئێمەهەمان واتامان دووپات دەکردەوە.بەڵام هەمان سینەماش بۆ تەماشاوانانی بێ ئەژماری خۆی،بەدەر لە هەژمار واتای دروست دەکرد و برەوداریی تاك واتاییبوونی نیشانەکانی دەچوە ژێر پرسیار. سینەمای مودێڕن، لە وەها خەیاڵکردسازییەك دەستی هەڵگرتوە.ئەوەی دەیبینین، واتایەکی ئامادە و بەرهەڤ نیە. تەماشاوان واتا دەخولقێنیو ئاگایە لەوەی کە ئەوشتەی دروستی دەکا پێوەرێکی ئەرخەیانی و بەڵگەیەکی لێبڕاوانەی نیە.سینەمای مودێرن بیچمی هوشیارانەی نکۆڵیی ئەرخەیانیيە. بەرهەمەکانی بێرگمان نموونەگەلی کامڵ لەم نکۆڵیی "متافیزیکی ئارایی"یە دێنە ئەژمار.تەنانەت لە یەکەمین بەرهەمەکانیدا کە هێشتا سێبەری هۆگریی سینەماگەر بە دەربڕینی کلاسیك لەواندا بەدی دەکرا، ئەم ئارەزوی بێئەژماریی راڤەکان، لە رێگەی بێئەژماریی پرسیاران،بنەمای کارەکە بوو.

## (١١)

سالآنێکە کە خامۆشە. لە پاش خولّقاندنی چلو سێ فیلم، سەرەنجام بێدەنگیی هەڵبژارد. وەکو ئیلیزابێت فۆگلێر لە **پێرسۆنا** کە لە نیوەرێگای پێشکەش کردنی ئەلکترا راوەستا، رووی بەرەو ئێمە وەرگێڕا و لەچاوەکانیدا ترسێکی گەورە وەشێرابوو و ناباوەڕی و پرسیارانی ناکۆتا...



## سەرما

ئازادی لە دایك دەبێ، شەوانە لەهەر کوێ بێ، لە کونە دیوارێکەوە، لە گوزەری با سەهۆڵبەستوەکاندا.

ئەستێران ترش و سەوزن لە هاویندا، زستان بە دەستی ئێمە لێورێژییان دەکات لە لاوێتیی پوختکراو.

رنەشار(١)

رێگەیەکی دیکەش بۆ چوونە ژوورەوە بە دنیای بەرهەمی هونەری هەیە. وەکو هەمان رێگا کە بۆ ماڵ و ژووری ئارەزوەکان دەڕۆیشت. ڕووبەڕوویان بوو، بە مەودایەکی کورت، لە گژوگیای خۆڕسك. ئەوەی لە چاوی ئێمەوە کورت مەودا بوو، رێچکەی سەفەرێکی درێژ و بێ سەرەنجام، کە ئەنجامی بەشێوەیەکی دیکە واتا دەکردەوە. وەهای دەکرد چونکە ناوچەی قەدەغەکراو لە دەرەوەی کاتدا جێی گرتبوو. دەبێ ماوەیەکی نائاشکرا و بە گوتەی ئێستاکێر/تارکۆفسکی تەمەنێك ئەم رێگەیەت گرتبایەبەر، یا بگەیت بە ژوورێك کە لەودا تێرێژی خولیای خۆرنشین، بارانێکی بێوادە لە بنمیچیەوە بباریێ و لەوێدا... سەرمات ببێ.

وا بڕیار بوو بە ئارەزوەکانت بگەی، وەلێ تەنیا سەرمات دەبێ.

مرۆڤان سەرمایان دەبێ، چونکە بۆ ژیان لەسەر رووی زەوی سەرما مەرجێکی هەرەپێویستە، چونکە هەر وێنایەکی ئەوان لە ئاسمان لەگەڵ سەرما هاویەکە چونکە خانوەکان لەرێچکەی بایەکاندا دروست دەکەن، تا شتێك لە سەرما بپارێزن. بەردەوام کونجێکی پەستاوتو لە هەر خانوویەکدا دەتوانێ بەدی بکەیت کە بە ساردی مابێتەوە. تارکۆفسکی لە یەکێك لە دوایین رۆژانی ژیانیدا نووسیی کە ئەلەندێك، بە پێخواسی لەسەر خاکی شێدار و گژوگیا ڕێی کردوە، چونکە خوازیاری پێوەندی بووە لەگەڵ سەرمای زەوی. ماروشکا، دایکە خنجیلەی میهرەبان و بەخشندە کە دەخولقێنێ و دەڕسکێنێ، جوانە،خامۆشە، بە لەپی دەستانی باسکەکانی دەورکێنێ، چونکە سەرمای بووە. هەرکە باران دەبارێ، نیوەشەوان کە لە خەو ڕادەچەنن، کە دەخەون، کە سەیری یەکدی دەکەن لە پۆستاڵی سەربازیی باوك کە پەنا دەگرن،

(١) رنەشار "مەنزڵگەی دوورە دەستەکانی ئیمە" لە:**کرکرەکانی کشیدەی چاك چاك**، ترجمەی ف. ناجی، تهران، ١٣٥٩.

دەنگی منالێك كە لە هۆتێلێك لەو سەری دنیاوە دەبیسن، كاتێك كە بانگی ناوەكەیان دەكا،سەرمایان دەبێ. كە بەفر دەبارێ، لەو ڕێگە درێژەدا، لە خانویەكدا كە ڕوو لە سەرما ئاوەڵایە، كاتێك كە لە مۆتەكەكانیان دەرگایەك بۆ زریان دەكرێتەوە، كاتێك كە خولیاكانیاندا لەسەر ڕووی زەوین، لە تەنیشت چاڵاوی ماڵ، یا لە قووڵایی چاڵاو، یا خەوتو لەئاوی جۆگەلەیەك، یا لە روانین بۆ رووبارێك كە خەریكە تێدەپەڕێ، یا دانیشتو لە سەر بەفر لە پاڵ سەگێك، هەمیشە و لە هەموو حاڵێكدا، سەرمایان دەبێ. كوڕە هەرزەكارەكە قاچە قوڕاوییەكانی لە شیپانەی دەرگاكەدا زۆر بە ئەدەبەوە پاك دەكاتەوە، كە لە خانویەكدا كە هیی ئەو نیە، لە تەنیشت ئاگری سۆبەی داریندا دادەنیشێ، هاوپێناو لەگەڵ مۆسیقای جادویی پورسێل، وێنەیەك لە كیژەلاوێك لە تەنیشت ئاگر دەبینێ كە خەمبار دانیشتوە، بە پێچەوانەی ئەو رۆژەی بە لێوی خوێناوی لە نێو بەفرەكاندا ڕێی دەكرد شاد بوو، پێدەكەنێ، دەنگی گوشرانی بەفرەكانی دەبیست. تۆش دەیبیسی و لەگەڵ ئەوەش كە لە تەنیشت ئاگردای، سەرمات دەبێ.

دنیای كافكا جیهانی بۆنە ناخۆشەكانە. جیهانی بەڕێوەبەرایەتییە كۆنەكان، فایلەكان و بۆنی نم، بۆنی شێ، بۆنی پەڕاوگە رزیوەكانی فایلە خاك لێ نیشتوەكان، بۆنی ریزی ناوەكان و ژمارەكان و نیشانەگەلی رێككەوتەیی لە دایكبوون و مەرگ و بەختەوەری و بەدبەختی. دنیای پروست جیهانی زبری و نەرمییەكانە، هەستێكی ئیرۆتیك، هەستێك لە وركانی دنیا. جیهانی جۆیس دنیای دەنگەكانە، ئاوازەكان، هاوارەكان، ورتە ورتەكانی خۆشەویستی، دزێوگەری، بەدخوازی. دنیای قەشە بێرسۆن جیهانی سەرمایە، لە تەنیشت ئاگری سۆبەی دارین دادەنیشێ و ژانی تاقەت پڕوكێنی جەستەیی" لەگەڵ بنكڕی تامێك لە ئەڤین بە مەسیح و ئەڤین بە دنیایەكی دیكە" هەست دەكا. دنیای قەشە بێرگمان لەرزینەكانە، پەیتا پەیتا دەناڵێ:" سەرسام بووە، سەرسام بووە ...". دنیای تاركۆفسكی دەكرێ تەنیا لە ڕێگەیەكی هەستەكییەوە بە" سارد"، ناودێر بكەیت. بۆ ئاشنایی لەگەڵ ئەم مرۆڤانە، ئەم ئاسمانە، ئەم خانوانە،جادە نماوییەكان، فەزای نۆقاران، گوڵەبەردینەكان و شتانی نوقمبوو، لە پێچ و مۆرەكان، تا رۆخسارانی كۆن، بۆ ئاشنایی لەگەڵ ئەم دنیایەی ئاو، باران،بەفر و سەهۆڵ و لەگەڵ سەرمای ناكۆتا، وەلێ نەك ترس ورۆژێنیان، تەنیا دەبێ لە ڕێگەی" درك پێكردنی هەستەكی" بڕۆیت.



یەك ڕێگا بۆ درك پێكردنی بەرهەمی هونەری، بیركردنەوە لە ڕێككەوتنەكانە. كام رەمز لێرەدا بەكارهاتوە؟ كامە تازەیی لەوێدا جێی خۆش كردوە؟... سەرەنجام" فۆرم"ی بەرهەم كامەیە؟ پێكهاتەكەی چیە؟ ڕێگەی دیكە ئەمەیە كە وەدوی پەیامی بەرهەم بگەڕێین؟ بپرسین:" چی هەیە كە بڵێ؟" یا :" چ شتێك، بۆ كێ، لە چ بارودۆخێكدا دەیڵێ؟". ڕێگاكانی دیكەش هەن، كەهەركام لە ئێمە بە پێی تەمەن و ساڵ، تامەزرۆیی یا سڵەمینەوە، دانایی، یا ئەڤین ئەزموونمان كردوە. بەڵام ڕێگایەكی دیكەش بۆ چوونە ژورەوە بە دنیای بەرهەمی هونەری هەیە.

ئەمەیان ڕێگەی " درك پێكردنی هەستەكی"ی بەرهەمە. ئەگەر بكرێ پێكهاتە و فۆرمی هەر بەرهەمێك تاوتوێ بكەیت، بێ خەیاڵی بایەخ و بێ بایەخیی، ئەگەر هەر رەنێوهانینیك پەیامێك بۆ گرۆیەك لە چینێك، یا ریزبەندێك لە ئیماندارانی پیشەگەری هەبێ،... ئەم درك پێكردنە هەستەكییەی بەرهەم بە هەر بەرهەمێك پەیدا ناكرێ، لە هەر جێیەكدا دانانیشێ، هەمیشە و لە هەر دۆخێكدا پێك نایەت، تەنانەت جاروبار بەرهەمێكی یەكتا، رۆژێك بە شێوەیەكی هەستەكی فام دەكرێ و رۆژێكیش ناكرێ. هیچیشی لەگەڵ ناكرێ. ڕێگەی هەڵاتنیشمان نیە. هەر چەندەیش بە شێوەیەكی عەقڵانی دڵنیاكراین كە دەبێ بەرهەم بناسین، یا فام بكەین یا... هەمدیس هەموومان، رۆژێك لە بەرانبەر جادو، دەركەوت و دڵكێشبوونی بەرهەمێك خۆمان بەدەستەوە داوە و قبووڵمان كردوە كە ئەمەیان " هەست" پێدەكەین و ئەم هەستە ئاشكرایی رازێكە بۆ ئێمە كە نایەتە دەربڕین. كڵاورۆژنەی چوونە نێو دنیای بەرهەمێك، بارگەدانان لەو دنیایە و لێی تێهزرین بەردەوام هەستكردنە. ئەگەر ئەو بایە ساردە پەڕچینەكان دەلەرزێنێ و مێزەكە لە فەزای كراوەشدا تێكەوە دەپێچێ، ئەگەر ئێستاكێر لەسەر گژوگیای كێویلە دەنگی سازێكی نەناسراو دەبیسێ، ئەگەر كوڕەهەرزەكارەكە لەكۆتایی دنیادا وەها شادمان هاوار دەكا كە لەگەڵ دنیا هاوجووت بووە و واتاكەی تێدەگەین، لەم روەوە كە هەستی دەكەین، نەك ئەوەی كە بەیاریدەی ئاوەز قەناعەتمان كردبێ كە قسەكە لە جێی خۆیەتی یا لە پێكهاتەی بەرهەمدا بە باشی جێ كەوتبێ، یا پەیامێكە بۆ بەختەوەریی ئێمە و ئەوانیدی.

دەبێ هەست بە دنیای ئاندری تاركۆفسكی بكەی. ئەم هەستە لەگەڵ پەسنی سەرما هاوپێناوە. دەربڕین و وێنەی لەقاڵبدراو نەرم نەرم بەرتەك دەداتەوە كە بە پێی ئەوە ئەڤین، گەرما و خۆشبەختییە. وەك بڵێی هەر هەمبەرێكی مرۆیی و چارەنوسی مرۆیی، لەگەڵ

سەرما پێوەندییان هەیە. تەنانەت ئەگەر "سەرمای نێواخن"ی تارکۆفسکی ( و ئەم زاراوەیە هیی دستۆفسکی‌یە، خزم، هاوپێناو و هەڤاڵی ئەو) هەستت پێ‌کردبێ و پێداویستییەکەی بە سەرما و نیگای بۆ ساردبوون و گێڕانەوەی لە ساردی لەگەڵ ئەو پێوەندی بگری. ئەوکات تێدەگەی بۆچی ماروشکا لە تەنیشت پەنجەرەوە قولپی گریان دەیگرت. بۆچی لە خولیای مرۆڤاندا بەردەوام باران دەبارێ، بۆچی پیاوێکی تەنیا، لەسەروبەندی چوونە نێو ژووری ئارەزوەکان شیعرێکی دەخوێندەوە. بۆچی ئەو شیعری باوکی خۆش دەویست و دووپاتی دەکردەوە:

"ئەمرۆ هاتی/ کۆتایی ڕۆژێکی مۆن /باران دەبارێ/ لقەکان و بەرجەوەن لە سەهۆڵبەستنی تنۆکەکان".

شیعر لە دنیای تارکۆفسکی بانگهێشتنامەی درك پێکردنی هەستەکی‌یە.

دەڵێن شیعر، نامۆکردنی دنیای ئاشنایە. لە هەنگاوی یەکەمدا نامۆیی وشەکان، ڕێزمان و سینتاکسی ڕێکەوەندەکانە. دەڵێن شیعر نامۆ بوونە.بەڵام ئامانج ناتوانێ ئەم بێگانەیی‌یە، ئەم تاراوگەییە،ئەم کۆچبەرییە بێ. تارکۆفسکی شاعیرێکی لە تاراوگەدا وەدووی تیشکی مۆمێك ناردبوو. شاعیرێکی دیکەی کردبوو بە ڕێنوێنی مامۆستایەتی و نووسەرێتی. شاعیرێکی بچوکی بۆ کانییەك ناردبوو، تا لە سەرمای کارتێکەریدا مەلە بکا و لە سەرمای زەریای بیرەوەرییەکان تەنیا کاتێك دوا بوو کە... فیزیکزانێك بووبێتە شاعیر.(!!)

شیعر نامۆیی لە دنیای ژیانی ڕۆژانە بۆ ئەمە دەخوازێ کە ئێمە لەگەڵ جیهانێکی دیکە ئاشنا بکات. تا لەوێدا ساز بکەین، نیشتەجێ بین ، تێهزرین. ئەمەیە رازی خانوو لە جیهانی تارکۆفسکیدا.

خانوویەك کە دوایین پەناگەی ئێستاکێر بوو، لە پەنجەرەکانیەوە بایەکی سارد بۆ نێوەوە دەشنا، دەکرا لە شیپانەیدا ئاگرکەوتنەوە لە ئەنبارەکەیدا بدەیتە پاڵ قیامەت، خانوویەك کە کریس لە فەزاوە بۆی دەگەڕاوە و لە یادەوەریی شاعیردا لە توسکانی ئامادە دەکرا. لە تەنیشت ئەسپە سپی و ژنانێکی بەڵالێدراو. خانوویەك کە پیاوێك بۆ بردنە سەری بەڵێنی سپیتای خۆی دەیسوتێنێ.

خانوو هەستی پێ دەکرێ و ئامرازی هەستەکی‌یە، چونکە پەناگەی ئێمەیە، تاقانە گۆشەی تەناهی ئێمە، گردکەرەوەی بیرەوەرییەکانمان. هەموو لایان وایە خانوو ئێمە لە سەرما دەپارێزێ، بەڵام خانوو لەگەڵ سەرما دۆستە، هەمیشە شتێك لە بیرەوەریی خانوو بە هەستێك



لە سەرما ئاوێتە دەبێ، خانوو پاراستنی سەرمایە و هەر خانوویەك چەند سوچێکی ساردی هەیە کە تۆ ڕادەوەستێنێ تا بیربکەویتەوە.

فەیلەسوفێك، مارتین هایدگێر، لە گوتارێکی کورتدا لە ژێر ناوی" بیناکردنی بارگەدانانی تێهزرین"، خانووی منداڵیی خۆی وەیاد دێنیتەوە:" هایدن بیناکردن، ئەگەر ڕەخساندن ـ بۆـ بارگەدانانە. دروستکردن، هایدنی خۆی بە بیناکردنی ئەو شوێنانەی کە فەزاکانیان هاوبەشە، پەیدا دەکا. تەنیا ئەگەر ئێمە توانایی بارگەدانمان هەبێ، دەتوانین کار ساز بکەین. لێگەڕێن بۆ ساتێك تێهزرین لە کەوێڵێکی گوندی لە دارستانی ڕەش، کە دووسەد ساڵ پێشتر بە خەیاڵی "نیشتەجێبوون"ی گوندنشینان دروست کراوە و ئێستاش هەیە. لێرەدا، خۆبژێویی هێزی ئەگەر ڕەخساندن بۆ زەوی‌و ئاسمان، هەرامەی سپیتا و مرندەکان، دێتەنێو یەکتاییەکی سادەوە، بە شتانێك کە خانوویان بەرهەڤ کردەوە و جۆرە هێزێکیان پێ بەخشیوە.ئەمە هێزە کە کێڵگەیەکی لە لوتکەی کوێستان لەگەڵ ئاسمانێکی باخێز، بە بەرزاخێکی پڕنشێو بەرەو باشور، لە نێو مێرغوزارانێك کە ڕێگەیان ڕوو لە کانی‌یە، جێ‌کردۆتەوە. کەوێڵێکی بەو بەخشیوە کە بە سانایی نشێوییەکەی بەرگەی کێشی بەفرەکان بگرێ‌و پێشڤە دەچێ تا پارێزێك بێت بۆ پەنجەرەکان، لە بۆران و زریانی بەفری شەوانی زستان. ئەم هێزە کونجی پەرستگای لە یاد نەکردوە، لە پشت مێزی گەورە، یا لە ژوورەکانیدا، جێیەکی ڕەخساندوە بۆ نزاگۆیی منالان. هەر لەم ژوورانەدا منالان دێنە دنیاوە و هەمدیس لەمانەدا، "دەرختی مەرگ" (ئەمە ناوێکە کە لە تابوتیان ناوە: Totenbaum) جێ دەگرێ. بەم چەشنە، بۆ نەوە پشتاوپشتەکان لە ژێر بنمیچێکدا خدەی سەفەری ئەوان لە هێڵێ هەرەتدا نیگار دەکرێ. هونەرێك کە لە بارگەدانان پێکهاتبێ، هەروا لە ئامراز و چوارچێوەکانی چەشنی شتان سود وەردەگرێ‌و خانوی گوندی ساز دەکا".(٢)

(2) M.Heidegger, “Batir penser”, Essais et conferences, trans. A.P reau, Paris, 1973, PP. 191-192.

# بایەخی جیهان

**(١)**

جیهان ئەو بایەخەی نیە کە پێمان وابوو هەیەتی.
نیچە، **ویستی هێز**، بڕگەی سی‌و دوو[١]

لە دۆزەخی "سێن رمی" ئازاد دەبێ. بەڵام نەك لە دۆزەخی خۆی. شەمەندەفەر هەرکە دەگاتە "ئۆڤێر ـ سور ـ ئەواز"، رۆژێك لەنیوەی مانگی مای ١٨٩٠، تەنیا یەك ناو لەسەر وێنە نەخش دەبەستێ، بە بێ هیچ نڤیسیارێکی دی. شەستو حەوت ڕۆژ دواتر کەسێك کە ئارامو دوور لە هەر تەڵەکەیەکی شانۆیی دەمرێ، چ جیاوازیگەلێکی هەیە لەگەڵ نیگارکێشی سەدەی ڕابردوو هەروەها لەگەڵ ئەو کەسەی کە پێمان وایە وۆنسان وانگۆك بوو، واتە لەگەڵ وێنەیەك کە بە پێی درك پێکردنێکی کۆنی ڕۆمانتیکخوازان کێشاویانەتەوە: پیاوێك بە هاڵاوێك لە ڕەنج، شێتیو بلیمەتی ژیا و لەگەڵ ئەم هەموەدا بەرهەمانێکی هونەریی خولقاند. جیاوازیی کاری مۆریس پیالا لەگەڵ ئەوانیدی لێرەوە ڕۆشن دەبێتەوە: بە لای ئەوەوە لە نێوان ژیان وهونەر مەودا کەوتوە و سەرچاوەی هونەر لە جێیەکی دیکەیە.

وانگۆکی پیالا ئەو "خۆشەویستەی شێت"ی ئارێتۆیە و نەك ئەو وێنەیەی ڕۆمانە پڕفرۆشو فیلمەکانی مینلی، ئالتمەن و ئەوانیدی. مرۆڤێکی سینەمایی‌یە کە لەگەڵ تیۆ، ئەیۆ، دوکتورگاشە و کچەکەی مارگرێت (بەدەر لە گوناهی گۆتە؟) لە مێرگدا فراوینە دەخوا، کازەی دزێو دەکا، لە زێواری دەریاچەدا ڕێ دەکا و خۆی لە ئاوێ وەردەدا، یا لێدەگەڕێ تا جوانی بە لاڕێیدا ببا (کامە ڕێ؟) بە ماڵە* پاتۆرێك ڕەنگی شین (و نەك زەردی لە دڵاشیرینی) لە پەڕەمووچ دەئاڵێنێ و لە پەردەی دەدا. ساتێك لە تەمەنی دنیا.

(1) F.Nietzsche, The will to power, teans. W.kaufmann, New York, 1968, P.22.

* ئامرازێك یا کەرەستەیەك لە نیگارکێشاندا. (و)



وۆنسان بۆ تیۆی نوسیبوو: "ئەم ئۆڤۆرە لە بەهەشت دەچێ". لە ئۆڤۆردا کێ بوو کە کەلیسای شەششەدساڵەی نیگار کێشا و کەوێڵە گوندییەکان، کێڵگەکان، گوندنشینانو خاتو گاشە: "دەشێ کیژەکە دوازدە ساڵان بێ. ئەوم لە دۆخی ژەنینی پیانۆ کێشاوەتەوە؟. لە فیلمی پیالادا نە ئۆڤۆر لە بەهەشت دەچێو نە مارگرێتی دوازدە ساڵان. بە تایبەت لەوێدا کە لەگەڵ وۆنسان هەڵدێو ئەو لە پەژارە تاراو و هەستی ئازادیو خولیای گەڕانەوە، هەموویان تێکڕا لە شەمەندەفەرێکی کۆن کە بۆ ئۆڤۆر دەگەڕێتەوە.

ئەمڕۆ لە گۆڕستانی ئۆڤۆردا دوو برا لە خاکدا نووستون، لە فیلمەکەدا یەك جار لە تەنیشت گۆڕستان تێدەپەڕینو لە کێڵگەدا ڕادەوەستین. لەوێدا وۆنسانە و ئەڤین لەگەڵ مارگرێت، وانگۆك نیگارکێشی ناوداری مێژوی هونەرە و ئێجگار کاتژمێر کار. کام وانگۆك چەندین کاتژمێر لەگەڵ (خاتو)"کەتی" بەڕێدا دەچێ؟ لەگەڵ جوانی بەدناو؟ سەرخۆش لە هەرزەگەری؟ کامیان لە ناکاو تەنیایی دنیا دەدۆزێتەوە؟ مرۆڤێکی سادە، سەرشێت یا تەواو شێت، یا بلیمەت؟ یەکەمیانە کە لە مەیخانەیەك لە پاریسدا سەما دەکا، لەگەڵ کەتی و لەگەڵ مارگرێت، واتە بە چێژ و بێگوناهی‌یەوە. کامە چێژ؟ کامە بێگوناهی؟ سەمایان نمایشێکی سەربازی‌یە، هەواڵێکە لە جیهانێك کە نەك چەندان لە پاش مەرگی نیگارکێش، جەنگێکی جیهانیو مەرگێکی جیهانی فێر دەبێ. ئەو شێتە ئاشنایەی ئێمە کە هێشتا هیچ بڕیار نیە بلیمەت بێت، ئایا بەڕاستی هۆگری ژیانە؟ بەڵام ژیان، ئەو سێ پایەو چەرمویی پەردە و ڕەنگەکانە. فیلم کە بەنواندنی تەنیای ئەو لە بەرانبەر پەردەدا قووت دەبێتەوە، ژیان لە شیعر لێوڕێژ دەبێتو... تیرێژ لە جیهانێکی دیکەوە دەپرژێ.

پیالا نیگارکێش بوو. تەمەنی لە سی ساڵ کەمتر بوو کە ناوبانگی دەرکرد. لەگەڵ رۆسیلنی بوو کە ڕێگەی خۆی پەیدا کرد. لەم ڕێگایەدا هەندە دروست نەچوە پێشێ.لەگەڵ **وانگۆك** دروست ڕێ ڕۆیشتن فێر بوو. پیاوێکی تێك ڕماو (ژاك دوترون/ وانگۆك ) هەم چرپاری گۆرانی‌یە هەرزەکانی ساڵانی شەستە، هەم هونەرپیشەی فیلمە خراپەکان، هەم وانگۆکی ئەفسانەکانەو هەم وانگۆکی پیالا، پیاوێکی سینەمایی، ناڕاستەقینە بەڵام لە زۆرترین ئاستدا ناڕاستەقنیە. ئەم شارۆچکەیە، ئۆڤۆر، ئەم شەمەندەفەرە، ئەو پەردە کەمتەرخەمە، ئەم هۆتێلە هەرزانەو ئەم شوشە شەرابانە کە لەسەر ئەو مێزانە ریز بووە، ئیدی هیی ئەو دنیایە نیە، بەڵکو بە جیهانێکی دیکەوە پەیوەستن. ڕەنگی ئەو جیهانە شینی تۆخە، دیمەنەکانی دوور ودرێژ و لەودا بێدەنگی سەرکەوتویە، کە دەنگەکانو ئاخاوتەکان ڕێ بە شوێنێك نابەن.

مەرگی بە هیچ شێوەیەك شانۆیی نیە. بە ئارامی دێتە نێو قابەوە. لە بن درەخت دادەنیشێ‌و بە دەست دڵی دەگوشێ. ئەو کات لە ژوورێکی نیوەتاریکی هۆتێلدا پەیدای دەکەینەوە. لە نوێن کەوتو. کوڕە هەرزەکارەکە دەپرسێ: "شتێك دەخۆی؟"و هەرکە کوڕە هەرزەکارەکە دەڕوا کار لە کار دەترازێ. لە دۆزەخ رزگار دەبێ. لە نێوان ئوقرەی دەستەکان کە بە سەر پەردەدا دەیکێشێ‌و ئەو ئەفسانەیەی کە لە پێکهێنەری پەردەکان دروستکراون (شێتی، رەنگ، خۆر، تامەزرۆیی، وێنە) چ پێوەندییەك بەدی دەکەیت؟ دنیایە کە تا ئاستی یەك فیلم بەرزهەڵکشاوە. رۆژێك پێمان وابوو کە جیهان بایەخێکی هەیە. ئەو رۆژە بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو، ئەمرۆش نیەتی، هەرگیز ناشی بێت. بەڵام وانگۆك جیهانی هەندە پڕبایەخ زانی کە چرکەساتێك لێی لەسەر تابلۆکەی نەخشاند. هەنوکە، پیالا زانیویەتی کە جیهان بایەخێکی ئەوتۆی نیە، کەوابوو تەنیا وۆنسان لە سەرقاڵیی کاردا نیشان دەدا و هیچ شتێك لە پەردەکانی (لانیکەم بە ناوی دانسقەی پربەهای ژیان) دەرناخات. تەنانەت وێنەگەلی کێڵگەکان (وەبیر خەری وانگۆك، ئەو بلیمەتە) ئەم خاڵە روونتر نیشان دەدەن کە رۆژێك دنیامان بە خەیاڵی بایەخێکی خەیاڵکردئاسا نیگار دەکرد، هەنوکە جیهانمان لە ئاستی وێنە تێپەڕاندوە.

**(٢)**

جیهان ئەو بایەخەی نیە کە پێمان وابوو هەیەتی.

نیگارکێش، فۆن هۆفێر، چەندین کاتژمێر خەت دەکێشێ، بە خەڵووز لە سەرپەردەی سپی، یا لەسەر کارتۆن، لەسەر پەڕاوگێك. شتێك لە جەستەی ژن، ماریان، کە لە بەرچاوی ئێمەش تەنیا هەندێ هێڵ هەن و قەبارەکەی بە تاڵ لە فەزادا. ژن ئازار دەبینێ لە چەندین کاتژمێر لە یەك دۆخی راوەستان، یا چەمانەوە، یا لە خۆیدا گرمۆڵە بوون. بێزارە لە بوون لە هەڵکەوتێکی ناسروشتی، بەو خەیاڵەی کە پاژەکانی جەستەی قەبارەیەکی نەناسراو وەکو یەکەمین سەمەد لە زەینی نیگارکێش ـ و بە یاریدەی دەستەکانی بە پەڕەمووچ ـ بجولێنێ. ژن ئازار دەچێژێ، چونکە جوانە و جوانییەکەی کەم کراوەتەوە لە قەبارەیەکی فەزایی بۆ تۆمار لە "شاکارێکی گومناو". ئازار دەبینێ، چونکە پیاوە جوانەکەی نابینێ‌و لە جێیەکی دیکەوە پەیجۆری دەکا، رەنگە لە زەینی خۆیدا. ژن لە ئامرازبوون بێزدەکاتەوەو پیاوی بێتوانا لە ئەفراندنی جوانی ئازار دەچێژێ. ئەو مەشق دەکا، سەرەتا لە دەفتەری گەڵاڵەکان، پاشان لەسەر رووپەڕێکی بەرین لە پەڕەمووچەکان، مقەباکان‌و



پەڕاوەکان.دەنگی توخسی خەڵووز و پەڕاو، وەستانی روانینی دوربین لە بۆ دەستانێك کە هێڵەکان دەئافرێنن... کاتژمێران تێدەپەڕن‌و فیلمی دوور و درێژی ژاك ریوك سەرەنجام کات دەوەستێنێ.

"تێکرای فیلمەکان لە بارەی شانۆن".ریوت وەها تێدەهزرێ کە( پیکۆلی)و( بئار) بۆ چەندین کاتژمێران لەم مەودا و نامۆیی‌یە دەخاتە رووبەڕووی یەك. بە پێی یاسایەکی شانۆیە کە ماریان لە ناکاو تێبینی هەنتەشی تەماشاوانێك دەکا، لیز بە کراسێکی ئاوەڵدامەن لە سەر پلیکانەکان دانیشتوەو هێدی هێدی لەو دەڕوانێ، بە روانینێك کە دەبێ هیچ هەستێك ـ بە تایبەت ئیرەیی ـ ئاشکرا نەکات. ریوت هەرکە لە رێساگەلی شانۆ تێدەهزرێ، ئەو(نیگارەی) مێژی نانی ئێوارەیە ساز دەکا، شەوانە لە کەژێکی ئازاد و ئەو پێوەندییە بە رواڵەت سادانە، بەڵام لە راستیدا ئێجگار تێکچڕژاو.

فیلمەکەی ریوت جوانە، بەڵام ئازاردەریش هەیە. سەرەتا وای بۆچووم کە ئازاردەر نیگارەکانی بێرنارد دوفۆرە کە کارەکانی ئەوم لا خۆش نیە (راست بڵێم لێیان بێزارم). بەڵام ئێستە زانیومە کە هۆیەکی دیکەش لە گۆڕێدایە کە ئەمجارەیان لە سینەماگەری لە دڵاشیرینم دوور کەوتومەتەوە. لە چیرۆکی‌بالزاك شتێکی ئەوتۆ لە فیلمدا نەماوەتەوە، مەگەر بیرێك، هەوێنێك کە بۆ رۆژگاری بالزاك و تەنانەت بەر لەو دەگەڕێتەوە. بیرۆکەیەکی کۆن، هەزارجار لاسایی کراوە، هەزار جار گوتراوە: هونەرمەند تێدەکۆشێ تا بە یاریدەی نیگارکێشانەوە پەی بە ڕازی نێواخنی‌و مەعنەویی "مۆدێل"ی خۆی ببا. شتێك لە رۆحی ئەو دەدۆزێتەوە، هەرمانیی بەرهەمەکەی بەم دیناوە لێبڕاو دەکات. سەرەنجام لە پاش دژواریگەلی زۆر و زەوەند وەها دەکا، سەردەکەوێ. ئەو لەسەر پەردەیەکی ناتەواو کە رۆڵی مۆدێلێکی دیکەیە (وێنەی لیز کە گوایە نیگارکێش هێشتا حەزی لێیەتی، رەنگە چونکە حەزیشی لێ نەبووبێ نەیتوانیوە کارەکەی تەواو بکا، رەنگە لەبەرئەوەی خۆشی ویستوە،نەیتوانیوە) وێنەیەکی تازە دەکێشێتەوە. ئەمجارەیان لە مۆدێلی تازە، ماریان. ئەم پێویستییە بە گریمانی هاوپێناویی ئەڤین‌و نواندنگەری هەندە زۆرداره کە لیز بەرگە ناگرێ‌و زمانی نارەزایەتی هەڵدەبڕێ‌و ئێمەش وێکڕا گومان دەکەن کە نەخاسمە نیگارکێش‌و مۆدێلی تازە دڵ لە گرەوی یەکدی بن.

ئەم بیرۆکەی دیناوی نێواخنی مەعنەویی مۆدێل، لەگەڵ هونەری رۆژگاری ئێمە(و هەڵبەت لەگەڵ هونەری سینەماش) یەکانگیر نیە. مودێرنیزمی ریوت لەگەڵ ئەم دەربڕینە فیکرییە کلاسیکە یەکانگیر نیە. زمانی مودێرنی فیلم بەرگەی ئەم کلاسیسیزمە کۆنە دووبارەیە ناگرێ، ئەمرۆ هیچ نیگارکێش یا هونەرمەندێك (ئەگەر نیگارکێش یا هونەرمەندی ئەمرۆ بێت) عەوداڵی

پەیدا کردنو دۆزینەوەی رۆحی مۆدێلی خۆی نیه. ریۆتیش نیه. بەڵام فۆن هۆفێر و دوفۆرن. خاڵی گرنگ لێرەدایه: ئیدی نە نیگارکێشان لە بیرۆکەوە دەست پێدەکا و نە سینەما. ئەمڕۆ زمانو مێتۆدی دەربڕین لە خۆیان تێدەهزرن و نەك لە هەمبەرە نێوەکییەکان.پێکناکۆکێك لەجەرگەی فیلمی ریۆتدا وەشێراوە کە ئازاردەرە.ناتوانی کۆن بیر بکەیتەوە و زمانێکی نوێ بەکار بێنی، هەر بەو چەشنەی کە ناتوانی بە زمانی کۆن گەر بتەوێ نوێهزریو بیت.

ئەم جەختە لە سەر بایەخی نێواخنی مەعنەویی مودێل لە کوێوە هاتوە؟ کە لە رۆحی ئەو ژنەدا، رازێکی سەربەمۆر وەشێراوە کە دەبێ لە پشتەسەری خەتو خاڵەکانی جەستەی جوانی تەنانەت بە ئەشکەنجەدانی بدۆزییەوە؟ بەڵام نیچە (و هەڵبەت مارکی دوساد) وانەیەکی گەورەتریان بە ئێمە داوە: وێنەیەك کە ئەمڕۆ بەرهەڤ دەکەین بۆ بایەخ پەیدا کردن یا بایەخ دانەری نیه. دوفور هەرگیز نەیزانی (و ریوتیش کە دەیزانی لەم فیلمەدا لە بیری چوەوە) کە هونەر هەوڵدان بۆ پەیدا کردنی بایەخگەلی شاراوە نیه. تەنانەت کردەیەك لە رووی دەروەستبوون، واتە خولْقاندنی بایەخگەلی تازەش نیه، چونکە لەنێوان دنیاو بایەخەکان هیچ هەمبەرێك ڕایەڵ نیه. هونەر لە بایەخگەلێ دەدوێ کە زەمینیو تەنانەت تازەش نیه و تیریێژ لە جیهانێکی دیکەوە دەپڕژێ.

## (۳)

جیهان ئەو بایەخەی نیه کە پێمان وابوو هەیەتی.

سێن کلومب موسیقازانێك بوو نەچەندان بەناوبانگ، کە تەنانەت کەس ناوە بچوکەکەی لە یاد نیەو لە رۆژگاری خۆیدا "موسیو سێن کلومب"ناوی دەهێنرا. پیاوێکی تەنیابووو نێواخنگەرا کە دوور لە شار و دیوەخان دەژیا. ژەنیاری "باس دو ڤیول"، سازێك لە نێوان ڤیولاو ڤیولونسێل، بوو. لە ژەنینی ئەم سازەدا هاوتای نەبوو و دەنگی خەماویی ساز و درینگەکانی هاوپێناو دەبوو لەگەڵ دەنگی هەناسەکانو تەنانەت خشەخشی کراسی ژەنیار. شتێك لە ژیان دەسبەجێ دروست دەکرا، لە چرکە ساتێکی بەڕاستی دووپات نەکراوە. شاگردی سێن کلومب، مارێن مارە، دەرگای دیوەخانی لوئیی چواردەیەمی بۆ کرایەوە، سەرەتا بوو بە شاگرد و لە خزمەتی لوئی و پاشان وەکو ژەنیاری فەرمیو لە بەناوبانگترین ئاوازدانەرانی سەردەم. ئەو ئۆپێراکانو ئێجگار کۆپلەی بۆ ئۆرکسترای سازە ژێدارەکان دروست کرد و چەند کۆپلەیەکیش لە بەرهەمەکانی مامۆستای یەکەمی سێن کلۆمب ـ کە چیدی لە ژیاندا نەمابوو ـ گردی کردەوەو بڵاوی کردەوە.



سێن کلۆمبی فیلمی ئالێن کۆرنۆ نەزیلەیەکی تاڵی هەیە، وەگێراو لە رۆمانی پاسکال کینیارە. هونەرمەند هاوسەری لاوی لە دەست دەدا. مەرگ بەسەر ئەڤینێکی سەوداسەر سەردەکەوێ. پیاوەکە دەمێنێتەوە و دوو کیژۆڵەکەی. دڵمردو و بێزار لە چارەنوسێك کە لەگەڵ هۆگری بە کەسێك هاوساز نیە، پەنا وەبەر کەوێڵێکی دارستانی دەبا، بە تۆزێك نانو مەیو دەنگی سازی لە دڵاشیرین. کچانی نەك چەندان دوور لەو لە خانویەکی گوندی لەگەڵ پەرستیارێك کات بەڕێ دەکەن. بەڵام کات بۆ پیاوەکە بە جۆرێکی دیکە تێدەپەڕێ. گیانی ئەو ئیدی لە گرەوی کاتدا نیە، بەڵام جەستەی لە گوڕ دەکەوێ.

ڕۆژێك پیاوێکی لاوچاك، مارێن مارە، بە دیداری هونەرمەندی خوێنتاڵ دەچێ، لەگەڵ ڕاسپاردەیەك لە ئاشنایی کە بەهرەکەی لە ژەنینی باس دوڤیول و دڵسپاردنی بە موسیقای پەسن کردوە. سێن کلۆمب سەرەتا گوێ بە لاو چاك نادا و لێدەگەڕێ تا ئەو کۆپلەیەك بژەنێ. لەمە بە دواوە، هونەرمەند شاگردێکی لە دنیادا هەیەو گەورەکچەکەی ئەو دڵدارێك. سێن کلۆمب، شەوانو ڕۆژانی هەروا لە کەوێڵدا بەسەر دەبا،لەتەنیاییدا، لەپشت دەرگای داخراودا.کۆپلەگەلێ ساز دەکا،جوانترینیان "فرمێسکەکان"ە. بڕێ جار هاوسەری کۆچکردوی دەبینێ کە لەو سەری مێزەکەوە دانیشتوە و بە میهرەبانی لەو دەڕوانێو گوێ بە دەنگی ساز رادەدێرێ. هەرکات خەڵوەت دەشکێ، شاگرد دەیگاتێ، بە ئارەزووی فێربوونی وردەکارییەکانو پیشەگەرییەکانی مامۆستا. تەنانەت بە شاراوەیی، وەکو دزێك لە ژێر کەوێڵی دارستان خۆی دەشارێتەوە تاکو پەی بە رازەکان بەرێت.

هەرکە سالآنێك پاشتر مارێن مارە مامۆستای گەورە، شای ژەنیارانی دیوەخان، یادی مامۆستا دەکاتەوە، لە دڵیدا دەزانێ کە "ئان" بێك لە ئامۆژیار فێر نەبووە، بە هالآوێك لە ڕێز و ئەڤین و ئیرەیی لەو تێدەهزرێ. هەنووکە، کچە گەورەی سێن کلۆمب خۆکوژی کردوە، چونکە مارێن مارە وازی لێهێناوە و لەگەڵ کیژە بچووکەکەی هەڵاتوە. ئەمیان لەگەڵ ئەوە، لە دیوەخانو لە ژیانی بێنرخی ڕۆژانە. شەوێك شاگرد دیسان بە پەنانی لە کەوێڵی مامۆستاکەی نزیك دەبێتەوە تا دەنگی سازی ئەو ببیسێ. قامك لە دەرگا دەسوێ، بە داوای لێبوردن و ئارەزوی هاودڵی. پیرەمێرد درگاکە دەکاتەوە...

لە پاش مەرگی سێن کلۆمب، مارێن مارە سالآنێك لە دنیادا دەژییو هەرکە کاتی کۆتایی دێت، جارێکی دیکە مامۆستاکەی لەو شەوەدا دەبینێ. دوو پیاو لە ڕووبەڕووی یەکدی دانیشتونو "فرمێسکان" دەژەنن. تاڵ، بە بارتەقای ژیان.

کچە گەورەکەی سێن کلۆمب هەتا لاوە و خوازیاری چێژی جەستەیە، جوان نیە. هەرکە نەخۆش دەکەوێ و لە پێ‌دەکەوێ، تازە جوان دەبێتەوە. ئەو کاتەی کە لە دڵبەری ساڵانی دوور کەیفخۆشی‌و لاوێتی دەخوازێ تا بێتە دیداری‌و هەمدیس کۆپلەیەك بژەنێ کە رۆژگارێك بە بانگەشەی ئەڤین دروستی کردبوو:"ژنی خولیابین". ناونێشانێکی تەنزئاسا کە شتێك لە هەقیقەتی لەگەڵدایە. ژنەکە گوێی بە مۆسیقا رادەدێرا. ژنێکی دیکەش، دایکەکەشی گوێی لێ دەگرت، ئەویش لە لاوێتیدا مردبوو. دڵبەری کۆن کە جێی دەهێڵێ‌و دەڕوا، ژنەکە خۆی دەکوژێ. بەمجۆرە فیلمەکە پەسنی وەیادهێنانەوەی ئەڤینە. ژیان تەنیا لە بیرەوەریدا جوانە. یادی ئەم جوانی‌یە تەنیا لە مۆسیقاوە دەرەخسێ‌و سینەما دەکێشێتە دواوە تا سازی کۆن هەرچی دەیهەوێ بیهێنێتە کۆتایی. یورس ساوال، بە سازێکی کۆنەوە، یادگاری سێسەدساڵ پێشتر دەژەنێ‌و "ئەڤین وەیاد دەخاتەوە". بە یاریدەی ژێیەکانی ساز و ئارشەکەی کە تەمەنی بەسەر چوو دەهێنێتەوە.

سێن کلۆمب هەرکە تەنیا دەبوو جیهانی تەنیا لە بیرەوەریدا بەدی دەکردەوە. بۆ ژنێك کە هەندە بە گیان خۆشی دەویست، دەیژەنی‌و ژنەکەی پەیدا دەکرد. هونەرمەند هەرەتی دەشکاند. کاتێ کە تەنیابوو لە رۆژگاری خۆی دادەبڕا، لە "سەدەی گەورە"، لە رۆژگاری پاسکال و راسین، لە ئاوەزباوەڕی‌و هەرای سەردەم. دنیا ئەو بایەخەی نیە کە لە خەیاڵی ئێمەدا دەبێ هەیبێ. ئەگەر عەودالی بایەخین، دەبینین کە ئەم بایەخە زەمینیەی نیەو پەیوەستە بە خەیاڵی ئێمەوە. گەوهەری هونەر "خەیاڵبازی"یەتی. لە بایەخگەلی زەمینی و کاتی دنیایی جیابوونەوە، لە چرکەساتی ئەفراندندا نەخواستنی شتێك لە جیهان، نە ئارەزویەك، نە تامەزرۆییەك ... بەڵکو شتێك بە گیان خواستن کە هیی ئەم دنیایە نەبێ، یا چیدی هیی ئەم دنیایە نەبێ. چونکە ژنێك کە خۆشت دەویست مردوە.

هەرەتی زەمینی کە بە ڕێساگەلی چەندێتی بەیانکراوە ناتوانێ لەو هونەرمەندەوە بێت. هونەرمەند لە هەرەت  تازەیی دەخوازێ. ئەگەر تەنیایی مەرجی ئەفراندن بێ، تامەزرۆیی بە دیتنی شتێکی تازە (تامەزرۆیی پێکبەستراو بە چێژ) گەوهەرەکەیەتی. جێیەك لە فیلمدا، لە بوولێڵەی بەیاندا دەبیسین: ئەلەندانی جیهان تێکڕا تازەن. تێکڕا تازەن. هەرکامیان تازەن. هەر ڕۆژ تازەیی بە تۆ لە چێژ و بیرەوەریی شتێکی نوێ شتێکی سپیتا دەبەخشێ. هونەر لەگەڵ بایەخگەلی زەمینی هەمبەری نیە، ڕێگەی بەرەو هەرامەی سپیتایە.

هامرا:

لاپەڕەیەك لە رۆمانی **ئەلەندی جیهان** لە نووسینی پاسکال کینیار



مسیو سێن کلۆمب رەخساوە تازەکانی خۆی لە پەڕاوگێك بە بەرگی چەرمین دەنووسی. نەیدەویست لە چاپیان بدا و لە بەردەم داوەریی خەڵکدا دایان بنێ. دەیگوت کە ئەم بەرهەمانە ساکارسازییەکن کە لە ئان‌وساتدا پێك دێن‌و بە کاری چرکەسات دێن‌و نەك زیاتر و بە هەرحاڵ کارانێکی کامڵ نین. رۆژانێك کە کەیف خۆش دەبوو و هەلێك دەرەخسا، بە خولیاکان‌و ئیلهامەکانی خۆی دڵی خۆش دەکرد. هاوین کە ئێجگار گەرم بوو، کەوش‌و کراس دادەکەنێ‌و بە ئارامی خۆی لە ئاوی ساردی رووبار دەدا. قامکەکانی لە گوێیەکانی دەئاخنی‌و گەردنی نەوی دەکردو دەم‌و چاوی لە ئاودا نوقم دەکرد.

ڕۆژێکیان لە شەپۆلەکانی دەڕوانی. وای بۆچوو کە نوقمە لە بێ‌بگاریی ئاوی رووبار، کە هەر شتێکی ئازیزی ئەم دنیایەی لەکیس داوە: سازەکانی، گوڵان، شیرینییەکان، کۆپلەگەلی نووسراو، روومەتەکان، کاسە و کوچەڵەی کانزایی و شەرابەکان. ڕاچڵەکی، کەوتەوە یادی "چامەو درێخ"، رەخساوی شەوێك کە هاوسەرەکەی ئەوی تەنیا جێهێشتبوو و خرابوویە ئامێزی مەرگەوە، ئێجگار تینوەتی تینی بۆ هێنا. پڕی دایە لقێك، لە رووبار هاتە دەرێ‌و گەڕایەوە بۆ کەوێڵکەی. لە نێو پووش‌و پەڵاشەکاندا بۆ شوشە شەرابەکەی گەڕا. پاشان لە دنیای خۆی ڕۆچوو، قوژبنێکی پەیدا کرد کە بەردەوام لەوێدا دەیژەنی، دڵنیا لە نەبوونی گوێی ئەغیار. جێگەیەك کە دەیتوانی هەر راهێنانێك کە بە هەرچەشن کە بیەوێ، بەبێ ترس لە داوەریی مرۆڤان بەرێتە پێشێ. شوشەکەی لەسەر قوماشێکی مۆر دانا کە مێزەکەی داپۆشیبوو.سازەکەی لە سەر مێز بوو و پارچە شیرینییەکی هەنگوینی لەگەڵێدا. کەوابوو "چامەو درێخ" دەستی کرد بە ژەنین.

هیچ پێویستیەکی بەوە نەبوو کە لە پەڕاوگی نۆتەکان بڕوانێ. دەستەکانی ڕێگەی خۆیان پەیدا دەکرد و ساز و ئارشەیان دەسوڕاند. وەگریان کەوت. ئاواز کە ساز دەبوو، لە تەنیشت دەرکەوە ژنێکی رەنگ پەڕیو ڕاوەستا بوو، بە بزەیەکی میهرەبان لەوی دەڕوانی‌و بە قامك هێمایەکی دەدا بە واتای بێدەنگ‌و ئارەزوی درێژەدان بە مۆسیقا. ژنەکە بە بێدەنگی هەنگاوی دەناو لە نێوان سازەکانی موسیو سێن کلۆمب تێپەڕی. لە سەر سندوق دانیشت کە لە گۆشەیەکدا بوو لە نزیك مێز و شوشە. دانیشت‌و گوێ بە مۆسیقا ڕادێرا. هاوسەرەکەی بوو. فرمێسکەکانی پیاوەکە ڕێگەی خۆیان پەیدا کرد...".[2]

(2) P.Quignaed, Tous les matins du monde, Paris, 1991.

## ناو

له‌ جڤاكی ئه‌مرۆدا كردار(فعل) په‌یتاپه‌یتا كه‌م بایه‌ختر ده‌بێ و ناو بایه‌خی زیاتر په‌یدا ده‌كا، ره‌نگه‌ له‌ به‌رئه‌وه‌ی كه‌ له‌ ژیانی ڕۆژانه‌"كران" له‌ بره‌و ده‌كه‌وێ و"به‌روبوومی بنه‌تایی" گرنگتر له‌ قه‌ڵه‌م ده‌درێ.

ئیریك رۆمێر

**(١)**

جولێت به‌ ورته‌ ورته‌وه‌ ده‌ڵێ: "ئه‌ی رۆمیۆ، رۆمیۆ! بۆچی تۆ رۆمیۆی؟... ته‌نیا ناوت دوژمنی منه‌... ئاخ، با ناوێكی دیكه‌ت هه‌بێ. له‌ یه‌ك ناودا چی هه‌یه‌؟ ئه‌وه‌ی گوڵی سور ناوی ده‌به‌ین، هه‌ر ناوێك به‌رامه‌یه‌كی دڵنشینی هه‌یه‌ و ڕۆمیۆش ئه‌گه‌ر رۆمیۆش ناوی نه‌هێنین، هه‌مان ترۆپكی له‌ دلاٚشیرین هیی ئه‌وه‌، كه‌ به‌ بێ ئه‌وه‌ش ناویی هه‌یه‌. رۆمیۆ، واز له‌ ناوت بێنه‌و له‌ جێی ئه‌و ناوه‌ كه‌ به‌شێك له‌ تۆ نیه‌، تێكڕای من یه‌كسه‌ر بكه‌ هیی خۆت".[1] شكسپیر باوه‌ڕی هزرینگه‌رانی رۆژگاری رێنسانس دووپات ده‌كاته‌وه‌: شتێك له‌ ناودا شاراوه‌ نیه‌، ناوی شته‌كان جیاوازییه‌كی ئه‌وتۆ له‌ كه‌تواره‌كه‌یان پێك ناهێنێ. سه‌رچاوه‌ی ئه‌م باوه‌ڕه‌ له‌ به‌رهه‌مه‌كه‌كانی سوفیسته‌كانو گومانكارانی یونانی وه‌شێراو بوو، له‌ لۆژیكی ره‌واقییه‌كانیش دووپات كرابوویه‌وه‌: ناو هیچ نیه‌، مه‌گه‌ر په‌یمانێكی پێشتر په‌سندكراو له‌ نێوان خه‌ڵكان. هه‌مبه‌رێكی نێوه‌كی‌و چیه‌تیی نێوان ناوه‌كانو شته‌كان ناتوانی به‌دی بكه‌یت.

نیشانه‌ناسی‌و زمانناسیی تازه‌، به‌تایبه‌ت له‌ پاش بڵاوبوونه‌وه‌ی په‌رتوكی سۆسێر له‌ هه‌بوونی هه‌رچه‌شنه‌ هاوشێوه‌یی‌یه‌كی سروشتی‌و چیه‌تیی نێوان نیشانه‌و دنیای به‌رهه‌ست نكۆڵییان كردوه‌. به‌ پێی رێكه‌وتنێكی زمانی به‌ شتێك "په‌رتوك" ده‌ڵێنو له‌ نێوان په‌یڤی "په‌رتوك" (ئاماژه‌پێكه‌ر) و وێنه‌یه‌ك كه‌ بیستنی ئه‌م په‌یڤه‌ كه‌ له‌ زه‌ینی ئێمه‌ نه‌خش

(1) W.Shakespeare, Romeo and Juliet, in: The complet works, eds .s. wells and G.Taylor, oxford University Press, 1986, P.388.



ده‌به‌ستێ (ئاماژه‌پێكراو)و په‌رتوكێكی راسته‌قینه‌ له‌ دنیای راسته‌قینه‌دا هیچ چه‌شنه‌ پێوه‌ندییه‌كی خودێتیانه‌ بوونی نیه‌. به‌ پێی رێكه‌وتنێكی دیكه‌ ده‌توانی په‌رتوك به‌ Book ناو به‌ریت یا Livre یا... پێوه‌ندیی په‌یڤ و واتا نیشانه‌ناسانه‌یه‌، نه‌ك راسته‌قینه‌. نیشانه‌ وه‌كو پێوه‌ندیی ئاماژه‌پێكه‌ر و ئاماژه‌پێكراو ره‌ژیده‌ی جیهانێكه‌ به‌ده‌ر له‌ دیاریكارییه‌كانی جیهانی به‌رهه‌ست‌و هه‌بوو. كاری نیشانه‌ناس به‌م چه‌شنه‌ له‌ هه‌نگاوی یه‌كه‌مدا دۆزینه‌وه‌ی رێككه‌وتنگه‌لێكه‌ كه‌ ره‌مزه‌كان له‌سه‌ری بنیات نراون. سورریالیسته‌كان كه‌ دڵ له‌گه‌روی كایه‌كانو گێچه‌ڵ نانه‌وه‌ زمانییه‌كان بوون، وێنه‌یه‌ك له‌ سۆبه‌یان ده‌كێشایه‌وه‌ و قه‌ڵه‌م دارین پێ ده‌وت‌و به‌م ناو لێنانه‌وه‌ له‌ زمانی رێككه‌وته‌یی‌و ئاشنا دوور ده‌كه‌وتنه‌وه‌، به‌و سه‌ودایه‌ی كه‌ زمانی خه‌یاڵ‌وخولیا بخولقێنن. ئه‌وان كارێكی گرنگتر له‌مه‌شیان ده‌كرد،هاوسه‌نگی نێوان هاوچه‌شنیی به‌رجه‌سته‌یی‌و ناهاوچه‌شنیی زمانییان وێران كرد.[2] ئه‌وان به‌ مێتۆدی خۆیان به‌ ئێمه‌یان نیشاندا كه‌ هه‌ر ده‌زگایه‌كی نیشانه‌یی ره‌ژیده‌ی زمانێكی سه‌ربه‌خۆ له‌ كه‌تواره‌. كه‌وابوو ده‌كرێ له‌سه‌ر كۆڵه‌كه‌ی ئه‌م ناهاوچه‌شنیی نیشانه‌و كه‌تواره‌ بێژین كه‌ هه‌ر فیلمێك وه‌كو ده‌زگایه‌ك له‌ هه‌مبه‌رێتیگه‌لی نێوه‌كیی نیشانه‌كان خودان ئه‌م سه‌ر به‌خۆییه‌.

**(٢)**

له‌ به‌رانبه‌ر ئه‌م تیۆرییه‌ كه‌ هه‌ر نیشانه‌یه‌ك به‌ به‌روبوومی رێككه‌وتنێكی تایبه‌ت ده‌زانێ، تیۆریی ئه‌فلاتون هه‌یه‌. ئه‌و له‌ وتووێژی **كراتیلۆس** له‌ زمانی سوكراته‌وه‌ ده‌ڵێ كه‌ ناوه‌كان وه‌بارهاتوی سروشتی شته‌كانو دركی هه‌مبه‌ری نێوه‌كیی ناوه‌كانو شتان ئاسان نیه‌و له‌م روه‌وه‌ ناولێنان له‌ شتان كاری هه‌موو كه‌سێك نیه‌. سوكرات له‌گه‌ڵ هێرمۆگنس باس ده‌كا كه‌ ده‌ڵێ :"تا هه‌نووكه‌ هیچ كه‌س نه‌یتوانیوه‌ من به‌ قه‌ناعه‌ت بێنێ كه‌ دروستیی واتای هه‌ر وشه‌یه‌ك جگه‌ له‌ رێككه‌وتنو گرێبه‌ست هۆیه‌كی دیكه‌ی هه‌یه‌. به‌ باوه‌ڕی من هه‌ر ناوێك كه‌ ده‌درێته‌ پاڵ شتێك ناوێكی دروسته‌... هیچ شتێك ناوی خۆی له‌ سروشته‌وه‌ وه‌رنه‌گرتوه‌، به‌ڵكو ژێده‌ری ناوه‌كان رێككه‌وتنو هاوته‌بایی یا خووی كه‌سانێكه‌ كه‌ وشه‌كان به‌ كار

(٢) له‌مباره‌وه‌ بڕواننه‌ پاتۆری سێیه‌م: م. فوكو، **این یك چپق نیست**، ترجمه‌ی م. حقیقی، تهران، ١٣٧٥، صص ٣٨-٤١.

دێنن".[٣] بەڵام بە بۆچوونی سوکرات "یاسادانەر ئەگەر بیهەوێ وشەیەکی دروست ساز بکا، دەبێ هەندێ تایبەتمەندیی سروشتیی وشەکان لە دەنگەکانو کەرتەدەنگەکان بنەجێ بکا و لەم کارەدا لە سیمای سەرەکیی وشەی راستەقینە پەیڕەوی بکا و هەموو وشەکان بە لاسایی لەو بیرۆکەیە ساز بکات".[٤]، واتە بیرۆکەی وشە لە دەنگە زمانییەکاندا تاوبداتەوە. سوکراتی ئەفلاتون باوەڕی بە بوونی پێوەندییەکی پڕ لە ڕاز و رەمز لەنێوان ناوی هەر شتێك و گەوهەرەکەی هەیە، کە زانینی بەستراوەتەوە بە دیناوێکی مەعنەویو کاری هەر کەسێك نیە. ئەم تیۆرییە نەك تەنیا لە دیدی زمانناسانی ئەمڕۆیی بەرتەکدراوەیە، بەڵکو لە هەمان جیهانی کەوناراش ئێجگار نەیارانی هەبوو. بە ئاشکرا ڕای ئەفلاتون لەگەڵ نموونەگەلی نارۆشن کە لە **کراتیلۆس** دا هێناویەتی، ناسەلمێنرێ.

بەوردبوونەوە لە ناونیشانی بەرهەمە هونەرییەکان لە نیگای یەکەمدا، وەها دەنوێنێ کە ڕای ئەفلاتون لانیکەم لە هەندی خاڵی تایبەتدا بە تەواوی چەوت نیە. بەردەوام پێمان وایە کە پێوەندییەکی گەوهەری لەنێوان ناوی بەرهەم و خۆی بوونی هەیە. ئێمە ناونیشان بە دەربڕی خدەی سەرەکیی بەرهەم دەناسین. ناوی بەرهەم زۆرجار ناتوانی بە نیشانەو زناکێك بزانیت کە تەنیاو تەنیا لەسەر بنەمای ڕێککەوتن، لەسەر بەرهەم دانراوە و ناکرێ بێژین هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی واتاکەی هیچ جۆرە بەروبوومێکی بە دواوە نایەت. تێکۆشان بۆ دۆزینەوەی هەمبەری ناوی بەرهەم لەگەڵ واتاگەلی گریمانکراوی دانەدوی بڕیاری ئەفلاتون لە خاڵێکی تایبەتدایە. دۆزینەوەی ئەم خاڵە هەمان دڵکێشیی هەیە کە دۆزینەوەی ناوە تایبەتییەکان بۆ منالان هەیەتی. ئەوانیش بێئاگا لە نەیاریی خۆیان لەگەڵ لۆژیکی رەواقییان، بەردەوام عەودالی دۆزینەوەی لۆژیکی شاراوەی ناوەکان دەبن. هیچ منداڵێك نیە کە رۆژێك لە رۆژان نەیپرسیبێ :

"بە ڕاستی! واتای ناوەکەی من چیە؟"

کارایی تیۆریی ئەفلاتون تەنیا لە پانتایی جوانیناسی قەتیس نابێتەوە،بەڵام لەم نووسینەدا، من لەخاڵگەلی بەکارهێنانی دیکەی (وەکو ناولێنانی ڕێبازە فیکرییەکان، بیردۆزە زانستیییەکان، کاڵابەرخۆرییەکان، قوتابخانەکان، فرۆشگاکانو...) چاوپۆشی دەکەم. لەم

(٣) افلاطون، **دوره آثار**، ترجمەی م. لطفی، تهران، ١٣٦٧، ج، ص ٧٣٤.

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشو، ص ٧٤٣.



خالانەدا لەملاو لەولا نموونەکەلی گۆیا لە هەمبەری ناوەکانو شتەکان دەتوانی بەدی بکەیت. لە زۆر لاوە بنەمای بازارگەرمی بۆ کاڵاکان، لە کاتی هەڵبژاردنی ناو بۆی، رەنگدانەوەی بەکارهێنانی لە زەینی کڕیارە.

## (٣)

تیۆرییەکی باو، ناونیشانی بەرهەمە هونەرییەکان بەیانگەری خدە یا واتای گەوهەرییان دەزانێ. لەم دۆخەدا ناوی بەرهەمی هونەری وەکو پەیامێك دەزانرێت کە لە جەرگەی نیشانەگەلی زماناسانە خرابێتەڕوو. هەڵبەت لە زۆر خاڵدا دۆزینەوەی رەمزی ئەم خاڵەش پەیوەستە بە ناسینی پێشینیی ڕێسایەکەوە. هێنانی دوو ناوی تایبەت لە ناونیشانی بەرهەمێك دەتوانێ دەربڕی پێوەندییەکی ئەڤینداران بێت (رۆمیۆ و جۆلێت، تریستانو ئیزۆلدە) یا پێوەندییەکی تەواوکەر (ژولو ژیم، تێلماو لۆییز، لۆرێلو هاردی، فانیو ئەلکساندێر). ئەم مرۆڤانە بە بێ یەکدی کامڵ نەدەبوون، وەك بڵێی ئەرکێکی سەرشان بەشێوەیەکی هاوبەش لە ئەستۆیان بوو. جار و بار دۆزینەوەی رەمز دژاورە و بڕێجار ئاسان. ناوی کۆمپیوتەرێك کە لە **کەشتیی ئاسمانیی ئۆدیسەی٢٠٠١** یاخی دەبێ، HALە، سێ پیت کە بەر لە پیتە بەناوبانگەکانی IBM دێن. ئەی.تی. کورتکراوەی Territorial Extraیە، بە واتای بوونەوەرێکی بان زەمینی. هەندێجار دەتوانی دۆزینەوەکان بکەیت بە کازە. لە مانگی مای ٦٨ پۆستێرێك "برایانی مارکس"ی نیشان دەدا: گروچو، هارچو، چیکۆ و... کارێل.

لە گریمانگەلاڵەی بەناوبانگی یاکۆبسێن ورد بینەوە. ناونیشانی فیلم لە جێی پەیامێك، نێردەرێکی هەیە کە زیاتر دەرهێنەرە، یا نووسەری فیلمنامەو جاروبار بەرهەڤکارە (راوێژکارانی ئەو). زۆرجاران پیش دێ کە بەرهەڤکار بە سەرنجدان لە خاڵگەلێ بێجگە لە دەقی فیلم (شیمانی فرۆشی زیاتر، سانسۆر و..) ناوەکە دەستنیشان دەکا.ناوی زۆرێك لە بەرهەمە بەناوبانگەکانی سینەما ئاوەها دیاری کراون. لە ئەدەبیاتیشدا هەڵەچنانو تەنانەت وەشانگەرانیش ناونیشانی بەرهەمە ئەدەبییەکانیان هەڵبژاردوە. ناوی ڕۆمانی **هێڵنج** ی سارتر لە لایەن وەشانگەرەکەی واتە گالیمار دیاری کراوە و ئەگینا ئێمە ئەمڕۆ ناوی ئەم بەرهەمەمان "ماخولیان" دەنا کە ناوی دڵخوازی نووسەرەکەی بوو. وەرگری پەیامی ناو

لەمەڕ ناونیشانی فیلمەکان تەماشاوانانن کە دەبێ لە ناو "ڕەمزدۆزی" بکەن. وەك بلێی بەر لە هەر شتێك ئەوان دەبێ لە ڕێگەی ناوەوە بۆ تەماشای فیلمەکە بکێشرێن. زۆرجاران لەسەر بنەمای بۆچوونو گومانوێژی، زەوق و چەشەی ئەوانە کە ناوێك هەڵدەبژێردرێ یا ڕەت دەکرێتەوە.

پەیام لە جەرگەی ڕەمزگەلی تایبەت، واتە نیشانەگەلی زمانی (و بڕێ جار پاچەڤە) دەخرێتە ڕوو. زۆرجاران ئەم پەیامە لە پاچەڤە بۆ زمانێکی دیکە جیاوازی تێدەکەوێ. فیلمی **پەیجۆرکەران** ی جان فۆرد لە فەرەنسا دا بە دوو ناونیشانی گاڵتەجاڕانەی"زیندانیی بیابان"و "دەزگیرانی بیابان" پێشکەش کرا و لە ئێراندا بە ناوێك کە لانیکەم لەوە گاڵتەجاڕانەتر نیە:"لەپەیجۆری خوشکدا". ناوی فیلم لەسەر بنەمای ئاشنایی وەرگر لەگەڵ ڕمزەکانو بەستێنی ئاماژەکان واتا پەیدا دەکا. ناونیشانی فیلمی **هیچکاك بەنیشانەی کوشتن تێبگە**، کاتێك واتای دەبێ کە بەرانبەر لەپێشان بزانێ کە لە ویلایەتەیەکگرتوەکاندا، لە دەزگاکانی تەلەفۆندا هەم لە ژمارەکان کەڵك وەردەگیرێو هەم لە پیتەکانی ئەلف و بێ و لە لایەکی دیکەوەM بە murder ەو ئەم وشەیە بە واتای کوشتنەوە گرێ دەدا. بە دەربڕینی باشتر، ئەم ناونیشانە تەنیا لە زمانی ئینگلیزیدا بەکارهێنانی هەیە. هەربۆیە، ئەم فیلمەیان لە وڵاتانی دیکە بە ناونیشانی جیاوازەوە نواندوە. (لە ئێراندا بە ناوی "پلیکانەی پێنجەم" کە بە سەرنجدان لە گرێی سەرەکیی گێڕانەوە ناوێکی گونجاوە، بەڵام دەکرا بە ناونیشانی "م" بە نیشانەی مەرگ تێبگە"ش پاچەڤە بکرێ).

ناوی فیلمەکەی هیچکاك خاڵێکی ناوێزە نیە. زۆرێك لە فیلمەکان لە پاچەڤە کردن نایەن. لایەنگرانی تیۆریی هەمەکیی لە پاچەڤەنەهاتویی دەتوانن لەمبارەوە نموونەگەلی زۆر و زەوەند لە پەسندی بڕیاری خۆیان پەیدا بکەن. جاروباریش لە پاچەڤەدا لەگەڵ خاڵگەلی لێڵ و ناڕوون بەرەوڕوو دەبین. خاڵێکی دڵکێش وەرگێڕانی ناوی فیلمی وێندرێس (واتە) **ئاڵمانی بێرلین** بە"بەهەشت لە ئاسمانی بێرلین"ە. بە گوتەی سینەماگەر خۆی ناونیشانی فیلم"ناوێکی پڕتەمتومانو وەبیرخەری هایکۆیە". من ئەمەم بە سەرنجدان لە واتای کۆنی ئاڵمانی Der Himmel بە "بەهەشت لە ئاسمانی بێرلین" پاچەڤە کرد و پێم وایە هێشتاش ئەم ناونیشانە چەندقات جوانتر لە ئاسمانی بێرلین دێتە بەرچاو، بەڵام بە سەرنجدان لە دەقی فیلمنامەی وێندرس، ئیدی دەتوانی دڵنیا بیت کە مەبەستی ئەو لە Himmel "ئاسمان"بوو، واتە هاوواتای باوتری وشەکە.



بەرکەوتی ئێمە لەگەڵ پەیام لە ناونیشان ڕیزبەندکردن و ئانوسی فیلم و هەروەها لە پوستێرەکاندا، نووسینەکانی پەراوێزی وێنەکان لە جامخانەی سینەماکاندا،ریکلامەکانو ستونی بەرنامەکانی سینەماکان لە ڕۆژنامەکانە. پەیام کاتێك فام دەکرێ کە فیلمەکەمان دیتبێ. هەرچەند لەمەڕ هەژمارێك لە فیلمەکان، دەتوانین تەنانەت بەرلە تەماشایان، لەسەر بنەمای ناونیشان، شتێکی لێ هەڵکرێنین کە چەوتیش دەرنەچێ. کەمتر کەسێك هەیە کە لە ناونیشانی **سامانسا** یا لە ناوی فیلمی داگلاس سیرك واتە **نوسراو لەسەر با** هەوێنی لەکیسچووی بەختەوەری، رابردنی سەردەمێکی خۆش، یا تێکشکانێك لە پێوەندیی مرۆییو ئەڤینداارانە نەدۆزێتەوە.

هەمبەری ناو و بەرامبەر {بیسەر-خوێنەر} چەندقات تێکچڕژاوتر لەوەیە کە بەرهەڤکارانی سینەما بۆی چوون. ئێمە هەست بە ناوی فیلمەکان دەکەین، لە پلەوپایەی شتێکی عەقڵانی نایاناسینو تاوتوێیان ناکەین:" خوویان پێوە دەگرین... ناوەکان هەنتەش دەڕەخسێنن.ڕەنگە لەبەرئەوەی کە کورتترین ڕێگای ڕاگەیاندنی دڵتەنگی یا پێداویستین... ناوەکان چۆنایەتییەکی شیعرئاسایان هەیە... بڕیار نیە بخوێنرێنەوە، بڕیار نیە "فام بکرێن" ناوەکان هەست کەردەیین. بە چاوانی نوقاو، بێباك لەوەی واتایەکی تایبەت نەخشین دەکەن. "ئان"مان لە ڕۆژی تووڕەیی" وەبیردێتەوە کە لە تەنیاییدا بە ورتەورت گوتی:"مارتین"، چرکەساتێك دواتر مارتین لەوێ بوو. نامانەوێ بزانین کە ژن جادوی کردوە یان نا، دەزانین کە بۆ ئەو کەسەی کە درکاندویەتی واتایەکی دیکەی هەبوو: جێگرەوەیەك بۆ ژیانی داخراوی هەر ڕۆژێك. واتای سینەما لەم ساتانەی تەنیاییدا دروست دەبێ".[٥]

## (٤)

تیۆرییەك کە ناونیشانی فیلم بە دەربڕی خدە،دۆخ، یا هەوێنی فیلم دەزانێ، ئەرکی پەیام بۆ "بەیانگەری" دادەبەزێنێ. هەڵبەت خاڵگەلو نموونەگەلی زۆر دەتوانی بەدی بکەیت کە لەگەڵ ئەم ڕایەدا کۆك بن. **ئامارکۆرد** بە واتای "وەیاد هێنانەوە" لەسەر خدەی سەرەکیی فیلمی فلینی، واتە ڕوانین بۆ رابردو جەخت دەکاتەوە. ناونیشانی فیلمی **سامورایی** لە دەرهێنانی ملۆییل، بکوژێکی بەکرێگیراو لە تەنیاییودڵمردویی وەکو کەسێك دەناسێنێ کە

(٥) ص. یزدانیان، "واژە هایی از خاطرە"، **فیلم**، شمارە ١١٦، آذر ١٣٧٠، صص ١٧-١٨.

واز لە ژیان دێنێ، چونکە چیدی شایانی دڵ پێخۆش کردنی نازانێ. دەیان نمونەی دیکەش دەتوانی بەدی بکەیت. بەڵام خاڵانێکی نەیار هەندە زۆرە کە دردۆنگی لە لۆژیکی بەیانگەری پاساودار دەکەوتنوێن بکات. **هەشتونیو** هێمایەك بۆ هەژماری فیلمە کورتو درێژەکانی فلینییە و کاری بەسەر هەوێنو دۆخی فیلمێك کە بەم ناوەوە دیتومانە نیە. **ئوگستۆمۆنۆگاتاری** یا "نەزیلەی مانگی رەویو لەپاش باران" هێمایەکە کە بۆ ژێدەری ئەدەبیی چیرۆکی فیلمی میزۆگوشی و پێوەندیی راستەوخۆی لەگەڵ نێوەرۆکی فیلمەکەوە نیە. **راشومون** یادێکە لە دەروازەی کۆنی راشو، کە ئێستا وێران بووە و لە سکانسی ورکەری بنەتایی فیلمی کورۆساوا نۆژەن کراوەتەوە. لەم نموونانەدا ناوی فیلمەکان رێخۆشکەری راڤەنو نەك ئاوەڵاکەری وەسفەو باسو خواس. تەنیا بە راڤەیەك لە هەڵکەوتی میتافیزیکی فیلم ناونیشانی جادە بە دروستی دێتە ناسین. هەندێجاریش ناوی فیلم، وەکو نموونەیەکی زێدەرۆیانەی ئەم سەربەخۆیی لە بەیانگەری، دەتوانێ دۆخ یا تەنانەت تایبەتمەندیگەلی تکنیکی دیاری بکات. **سور ی کیشلۆفسکی** وەکو یەکێك لە فیلمەکانی کۆمکاری سیانیی سێ رەنگی ئاڵای فەرەنسایە، ناوێکی ناچارانە بوو، کە لە پاش شینو سپی هات، بەڵام ئەو هەموو جوانییە سورکارەی فیلمەکەشی لێکەوتەوە. لە زەمینەی پوستێر، تا رادیو و چەتری کافتریای بچوك، لە رەنگی (ئۆتومبێلی) جیپی ئۆگۆست، سفرەی سەرمێزی خانوی والێتینو جلی خەوتن لە یەکەمین ساتەکاندا، تا مۆبلەکانی هۆڵی شانۆ و رەنگی بلیتی کەشتی. لەمەڕ هەڵبژاردنی ناونیشانی هەمەکیی سیانی، واتە سێ رەنگیش رێگەی راڤەکان لە بەردەمدا ئاوەڵایە: ناونیشانی هەمەکیی وەبیرخەری رەنگەکانی ئاڵای شۆڕشێکن کە پێمان وایە مافەکانی مرۆڤی مودێرنی بنەجێ کرد. هەنوکە دەمانەوێ ببینین پێگەو مافی مرۆڤی ئەمرۆش بە راستی چین. من لە بەرینبوونەوەی ئەم ناونیشانە هەمەکییە فام یا راڤەیەکی یەکسەر تاکەکەسیم هەیە: شین دۆزەخە، سپی بەرزەخ و سور بەهەشت. لە کۆتایی شیندا مرۆڤان لە تەنیاییو بەڵایان بەرەڵڵا دەکەین، کاتێك تەنانەت ئەڤینیش رێخۆشکەر یا دەستەبەرێك بۆ بەختەوەری نیە، هەرچەند ئاخاوتەیەکی سپیتا وەبیرمان دەخاتەوە کە ئەگەر ئەڤینمان نەبێ مردویەکینو بەس. لە سپی دا ئەڤین بە شێوەیەکی لێڵ پەیدا دەکەینەوە. رەنگە لەسەرەوەی نیگایەکەوە کە خۆی لە رۆژنەی خانەیەکی زیندان تێدەپەرێ، پیاوێك بتوانێ ئەو رکێشە سەمەرەخولقێنە بکاتە هەستێکی قوولتر. لە سوردا ئەڤین، ژیانو مانەوەیە. نەك تەنیا ئەڤینی دوو مرۆڤ کە لە تەواوی ماوەی فیلمەکە وەکو پزیسك لە تەنیشت یەکدییەوە



تێدەپەڕنو بێ‌ئاگا لە ناسینو تێگەیشتنی ئەو، ئارامیی خەیاڵو ئاسودەیی گیان لە هەستکردن بەوەی کە ئەویدی هەیە: ئەمجارەیان لەچاوانی دادوەری پیر کە بێژەری هەواڵەکان،هەواڵەکەی پێ دەڵێ: "دوو کەس ماونەتەوە، دوو شارۆڤەندی سویسران، ئۆگۆست برۆنۆی دادوەر و مۆدێلی لاو و خوێندکاری زانکۆی ژنێڤ، والنتین دوسۆ". ئەگەر **سیانی** بە رزگاربوونی کەسیەتییەکانی لە چرنوکی مەرگو زریان تەواو دەبێت، هۆیەکەی ئەمەیە کە (دانتی)ش سیانی‌یەکەی بە روناکیو ئەڤین هێنابوویە کۆتایی، کاتێك کە بەهەشت بۆ دنیای ئێمە دەگەڕایەوە.

**(٥)**

روانگەیەکی دیکە لەمەڕ ناوی فیلم هەیە کە لە تیۆرییەك کە پێشتر لەو دوام، وردتر، کاملتر، لە نموونەی سیانیی کیشلۆفسکی نزیکترە. بە پێی ئەم تیۆرییەیە، ناونیشانی فیلم نەك ناتۆرەیەك (روونکردنەوەیەك لەبارەی ئەوەی لە کاڵادا پەیدا دەکرێ) بەڵکو پاژێکی پێکهاتەیی لە فیلم (بە تایبەت پێکهاتەی گێرانەوەیی)ە. ناو، لێرەدا توخمێکە یاریدەدەری بەرامبەر (بیسەر ـ خوێنەر) تا ئاسۆی ئاماژەکانی بەرهەم تێبگات. بە ناو و لە رێگەی ناوەوەیە کە بەرامبەر (بیسەر ـ خوێنەر)بە قەڵەمڕەوی هەڵبژێرانو ئەگەرەکانی راڤە بیچم دەدا. ناو بەجۆرە بایەخێکی بەرابەر لەگەڵ توخمگەلی گێرانەوەیی فیلم پەیدادەکا، توخمگەلی وەك کەسیەتی سازی، هەڵبژێرانی تانوپۆ، هەڵکەوتی رێژەیی هەوێنەکان و پەیدا کردنی توخمی زاڵ. تەنانەت ناولێنانی فیلمێك بە ناوی کەسیەتیی سەرەکیی یا شوێنێکی تایبەت، یا هەمبەرێتیگەلی تایبەت (دۆخگەلی پێوەندییەکانی نێوان کەسیەتییەکانو...) دەتوانێ هەڵکەوتی گێرانەوەیی فیلم بگۆڕێت.

ناوەکان،هەندێجار رۆڵی رۆشنگەری هەمبەرێتیگەلی نێواندەقییان هەیە.سام **جارێکی دی ئەم کۆپلەیە بژەنە**، ناونیشانێکە کە بەر لە دیتنی فیلمێك کە ڤوودی ئالێن فیلمنامەکەی نووسیوە، بە **کازابلانکای کۆرتیز** گرێ دەدا. **هاناو خوشکەکانی** ی ڤوودی ئالێن هێمایەکی زراڤە بە هەرسێ خوشکی چیخۆف. **لەناکاو بالتازار** کە "فەزای ئینجیلی"ی فیلمی بێرسۆن رۆشن دەکاتەوە، هێمایەکە بۆ **کتێبی پیرۆز** لە فیلمێك کە پێشهاتەکانی لە فەرەنسای ئەمڕۆ تێدەپەڕێ.

ناونیشانی فیلم دەتوانێ رۆشنگەری هەڵکەوتی کۆمەڵایەتی و مێژوویی بەرهەم بێت. **ئەوروپای ٥١ی** روسیلنی بیرەوەرییەکان، دڵەڕاوکێکان، رەنجەکان، تەنیاییەکانو شێتیی ئەوروپای لە پاش جەنگ زەق دەکاتەوە. ناونیشانی **برنجی تاڵ** یا **دزانی دووچەرخە** (پاسکیل) بە سانایی، وەبیرهێنەری هەوێنی کۆمەڵایەتیی فیلمەکان هەن. بەڵام، هەروا ئەم ناوانە بەرلەوەی کە رۆشنگەری نێوەرۆکی فیلم بن، خۆیان رەژیدەی ڕاڤەیەکی تایبەت لە فیلمن. ڕاسپێراوانی سانسۆر بە پێی بۆزەنیی پۆلیسیی خۆیان بەردەوام سەرنجیان لەم خاڵە دەدا.هەر لەبەر ئەمەبوو کە سانسۆری فەرەنسا فیلمی دسیکای کرد بە **دزی دووچەرخە** و فیلمی گداری کرد بە **ژنێکی شوودار**. بڕیار نەبوو زۆرێك لە بێکاران، دزانی دووچەرخە بن و تێکڕای ژنانی شوودار وەکو کەسیەتیی گدار رەفتار بکەن.

**(٦)**

ئەگەر ناونیشانی فیلم یەکێك لە هۆکارەکانی ڕاڤەی تەماشاوان بزانین، ئەوکات لە دەوری خوازەکانی دەربڕین لە ناونیشان ئاگادار دەبینەوە. **نوستالگیا** بەرلەوەی کە هێمایەك بە هەڵکەوتی زەینیو دەرونیی کەسیەتیی سەرەکیی فیلمی تارکۆفسکی بێت، ناونیشانێکی میتافۆریکە کە واتایەکی قووڵتری هەیە: خەمی تاراوگە تەنیا دڵتەنگیی یەك روس دوور لە خانوو و نیشتمانی خۆی نیە، بەڵکو پەژارەی وەبارهاتوی دوورکەوتنەوەی مرۆڤی ئەمڕۆ لە رەهەندی مەعنەویی ژیانی مرۆڤە. **پێرسۆنا** وەکو دەمامکێك کە روومەت دەشارێتەوە، رۆشنگەری هەمبەرێتیگەلی دوو ژنی لاو لە فیلمی بێرگمانە و واتایەکی بانتر لەمەی هەیە: پەنانکاریی بوونی مرۆڤ لە هەمبەرێتیگەلی کۆمەڵایەتی.ناونیشانی **خۆرهەڵاتن** وەکو دواین نماکانی شاکاری مۆرنائۆ رۆشنگەری بێداریی ئەڤینە کە لەگەڵ دەروەستبوونی رەوشتی هاوهەنگاو دەبێت. ئۆمبێرتۆئێکۆ نووسیویەتی: "ناونیشانی هەر بەرهەمێك مەخابن کلیلی ڕاڤەیەتی. رێگەیەکی ڕاکردن لە راڤەگەلی پێشنیارکراوی ناونیشانی **سوور** و **ڕەش** و **شەڕ** و **ئاشتی** پەیدا ناکەین".[٦] ناو وەکو هەر پاژێکی پێکهاتەی دیکەی بەرهەم، سەربەخۆ لە نیازی دانەرە و بەر لە پاژەکانی دیکە دەورێك لە ئاراستەدان بە ڕاڤەی بەرامبەر (بیسەر ـ خوێنەر)پەیدا دەکا.

(6) U.Eco, Apostille au “New de la rose”, trans.M.Bouzaher, Paris, 1987, P.7



**(٧)**

لایەنی میتافۆریکی ناونیشانی فیلم، کاتێك کە فیلم بە ناوێکی تایبەت ناودێر دەکرێ، هێز پەیدا دەکات. "پوتمکین" ئیدی ناوی گەلەکەشتییەکیجەنگی نیە کە بە رێزدانان بۆ خانێکی دیوەخانی کاترین(قەیسەری رووسیای قەیسەری) ناوی لێنرابێ. بەلای هەر تەماشاوانێکەوە، تەنانەت نەیارانی ئایدیۆلۆژیی فیلمساز، ئەم وشەیە یەکسانە لەگەڵ ڕاپەڕین بەدژی ستەم." ئاتالانت" کەشتییەکی بچووك نیە کە لە کاناڵێکدا وەستابێ، بەیانگەری جادوی ئەڤینە. گرترۆد، موشت و ئۆفی ریست واتاگەلی تازەی تراژیك لە رۆژگاری نوێن. کابیریای فلینی هەر بەم ناوەوە لە **شێخی چەرمووگ** هەنتەشی هەبوو، بە هەمان بارتەقا دڵپاك و لە دڵاشیرین. برێك جار تەنانەت ناوێکی تایبەت لە ناونیشانی فیلمێکدا نەك دەربڕی ژیانێك، بەڵکو فەرهەنگێکە. بۆ نموونە، ناونیشانی جەنجاڵیی سیبربرگ(واتە) **هیتلر فیلمێك لەبارەی ئاڵمان** دەبێتە هۆی ئەوە کە تەنانەت ئەگەر فیلمەکەیان نەدیبێ، تێدەگەن کەسێك وێراویەتی و هەمبەری نێوان نازیزم و فەرهەنگی ئاڵمانییەکانی خستۆتەبەرباس کە بە دەنگی دیمۆکراتیك هێنایانە سەرکار تا توندوتیژی و جەنگ و ئۆردوگاکان ساز بکات. نموونەیەکی دی، **فیلمی مەسیحی مزگێنیدراو**، دروستکراوی روسلینییە کە دەربڕینی ئایدیال و چاوەڕوانیی" رزگاریدەر"ە. فیلمێك لە باسلێکردنی سەرهەڵدانی رزگاریدەر کە زیاتر کاری بەسەر مسیانیزمی رێبازی یەهودەوە هەیە تا لەگەڵ پێغەمبەری مەسیحیەکان. **سینەما پارادیزۆ** وێنەی بەهەشتە لە هونەر. بەم بەراوردە دەتوانی **نیگایئۆلیس** ی ئانجلۆ پۆلۆس بە "سینەما ئینفرنۆ" ناودێر بکەیت، سینەمای دۆزەخ، کە دواین پاری لەسارایڤۆی گەمارۆدراوی وێران و تەم و مژاوی تێپەڕ دەبێ، لە ئەنجومەنی سینەمایی بچوك کە بڕیارە ونبوونی ئۆلیس لەودا هەمدیس پەیدا بکرێ: فیلمێکی کۆن لە سینەمای یونان.

ناوی شاران لەناونیشانێکی فیلمەکان زیاتر لە هەر ناوێکی تایبەتیی دیکە خدەی میتافۆریکیان هەیە.سەردەمانێك ژیانی رۆژانەی بەرلین بابەتی فیلمی روتمان بوو، **بێرلین سەمفۆنیای شاری گەورە** و ئەمڕۆ فریشتان لەم شارەدا دەگەڕین و ئەڤیندار دەبن. رۆم کە شارێکی ئاوەڵا و بێ بەرەڤان بوو، چەندساڵێك دواتر بوو بە گەواهیدەری تەشقی بەلای ژیانی بێکاران و سەرەنجام بوو بە ناونیشانی فیلمێك لە سینەماگەرێکی گەورە. فلینی لەگەڵ رۆژگاری لە کیسچوی تازەلاویی خۆی دەدوا و شەوان لە رێستۆرانەکانی کۆڵانە هەژارنشینەکان دادەنیشت و یادکردن لەوی بە نیگارگەلی دیواریی چادرگەیی چواند کە لە رەوتی هەوای تازە

دەرەوێتەوە.پاریسی جادوگەر و گەڕەکەکانی،دەروازەکان،باخەکان، شەقامەکان و رۆخی ڕووبارەکەی، لەوێدا کە لە فیلمی **کلێر** لەخەودایە، تا رۆژێك کە بە بەڵێنی ریوت بە ئێمەوە پەیوەست دەبێ، لە سینەما جیانەکراوەیە. لە چێژەکانی گەشت لە پاریس یەکێکیان هەم پەیدا کردنی ئەو شوێنانەیە کە کلێر بیبێرسۆن، ریوت، بێرتۆ و ئەوانیدی لەواندا فیلمیان هەڵگرتۆتەوە: دەروازەی لی لا مەبەستمە،دارستانی بۆلۆنی، مۆنمارتێر و پیگال. ئەگەر جەخت لەسەر ناوی شاران دەکەم لەم روەوەیە کە مۆدێڕنیتە لەگەڵ شاری گەورە گرێدراوە. لێرەدایە کە کارەساتی مرۆڤی هاوچەرخ دەناسییەوە.

هەنوکە کە لە کۆتایی وتارەکە نزیك دەبینەوە وێنەگەلێ لە شارێکی گەورە و دوورەدەست دەخەمەوە یاد. شارێك کە لە ئێمە چوار دەیە دوور بۆتەوە و ئیدی بوونی نیە، مەگەر لە شریتی فیلمەکان: بە کۆڵانەکانی لە بارانی شەوانە، بە تابلۆی سەردەرگای کافتریاکانی کە بە گلۆپەنێونە رەنگینەکان رۆشن کراون، بە شەقامان و پاسەکان و مرۆڤ بەخێرایی لە هەموویان تێدەپەڕن، لەگەڵ ئەوباخانەی کە کۆلارەی منالاّن بەسەر ئاسمانیان دەفڕن، بەقوتابخانەکان، بەڕێوەبەرایەتیەکان و دوکەڵکێشی کارخانەکانی. پیرەمێرد دەڵێ:" سەیرکە تۆکیۆ چەندە گەورەیە" و پیرەژن وڵام دەداتەوە:" بەڵێ، پێم وایە ئەگەر کەسێك لەم شارەدا بزر ببێ، دەبێ سەرباقیی تەمەنی وەدوی رێگە بگەڕێ و هەمدیس پەیدای ناکاتەوە".

تۆکیۆ چیرۆکەکەی، بە ئێوارەی، بە ژنێك کە لەودا دەژیێ، وەکو گوزەری وەرزەکانە،لەسەرەتای بەهار تا پاش نیوەڕۆیەك لە پاییز، یا بە وشەگەلی سادە وەکو" بەیانی باش" دەچێ. تۆکیۆیەك لەوە، کە نیشانەگەلێ لە گوزەری تەمەن و لە کیسچونەکانی پێیە و خۆی نیشانێکە لە هەوێنی سەرەکیی بەرهەمەکانی ئەو: تەنیایی. ناوە جادوییەکانی فیلمەکانی ئێزو، رێنوێنی ناسین نین، چرکەساتێکن لەوان: رەژیدەی ئاقاری رێبازی ئەوانن.

.



## نە بەراییەك هەیە نە کۆتاییەك ....

### (١)

ئەگەر لە نێوەڕاستی دەیەی ١٩٥٠ لەسەر بنەمای هاوشێوەییگەلی رووکەشیی رۆمانەکانی میشیل بێرتۆر، ناتالی ساروت، کلۆدسیمۆن، ئالێن رۆب گری‌یە، کلۆد ئۆلیە، ژان ریکاردۆ و رۆبێر پنیژە، یان لە ژێر ناونیشانی هەمەکیی" رۆمانی نوێ" لە دەور یەك کۆ دەکردەوە، ئێستە کە چل ساڵ لەو رۆژانە دوور کەوتوینەتەوە ئەم کارە ئیدی نالوێ. رۆب گری‌یە لەهەمان سەرەتاوە پرسیبووی:" ئاخر نووسین چ واتایەکی بۆ ئێمە هەیە، ئەگەر بڕیار بێت کە هەموومان یەك جۆر بنووسین؟"[1] سالاّنێك دواتر، سیمون گوتی:" تەنیا یەك شت، لە نێوانماندا هاوبەش بوو، لانیکەم من هەست دەکەم کە تەنیا ئەمەیان بوو: بیرۆکەی بەرتەك دەرەوە، قبووڵ نەکردن".[2] لە ساڵی نەوەدوسێ، ساروتی نەوەد و سێ ساڵە، نووسەری **کاربردەی گوتار**، کارێکی تاقانە لە ئەدەبی هاوچەرخ، حسێبی خۆی لە کۆمەڵ جیاکردەوە و گوتی کە بەردەوام لە خدەی سەربەخۆی بەرهەمەکانی تێهزریوە و لەگەڵێدا ژیاوە.[3] دوو ساڵ بەر لەوەش لە پاییز دا، بۆتۆر لە کۆلێژی هونەری ژنێڤ گلەیی کردبوو کە لەبەر ناونیشانی هەمەکیی" رۆمانی نوێ"، بەردەوام رەخنەکاران بە کەمتەر خەمی لەلایەنی تاقانەی رۆمانەکانی، بێ سەرنج و بێ گوێدان( بەسەریاندا) بازیان داوە.

" رۆمانی نوێ" نە رێبازێکی ئەدەبی بوو و نە بزاڤێکی فیکریی تایبەت کە توخمەکانی لەهەر بارێکەوە یەکانگیریی نێوەکی بن. هەرکام لە نووسەرانێك کە ناویان لە ژێر سەردێڕی هەمەکیی " رۆمانی نوێ" هاتوە لە رێچکەیەکی تایبەت بە خۆیان رێیان کردوە و هەڵێنجانێکی یەکسەر تایبەت و کەسییان لە چالاکیی ئەدەبی، تیۆریی ئەدەبی و تەنانەت لە چەمکگەلی گرنگی وەکو کەتوار و زمان لە مێشکدا هەبووە. مەودای نێوان شێوازەکان یا مێتۆدەکانی دەربڕینیان، چەند قات زیاترە لەوەی کە بتوانی پشتگوێی بخەیت. سەردەمی

(1) Revue de paris , septembre 1961, p.111.

(2) La nouvelle critique, 105, p.42.

(3) Le monde, 26 fevrier, 1993.

نووسین لە بارەی" رۆمانی نوێ" وەکو ڕێبازێك یا بزاڤێکی ئەدەبی تێپەڕیوە و وادێتە بەرچاو کە سەرەنجام نووسین لەبارەی ئەو تازەگەرییانەی کە لە رۆمانەکانی هەرکام لەم نووسەرانە بەدی دەکرێ، دەستی پێکردوە،مەسەلەکە زیاتر لەسەر وەدیادهێنانەوەی هەڵکەوتێکی مێژوییەو بیرەوەریی بە گژدا چوونەوەی تاقمێك نووسەری لاو و بە تەمەن( کە کەم تا زۆر گومناو بوون) لەگەڵ شێوەگەلی بێڕۆح، قاڵبدراو و هەموان پەسندی رۆماننووسی،زیندو دەبێتەوە. ئەم بەگژدا چوونە یەکێك لە روخسارە هاوبەشەکانی نووسەرانی" رۆمانی نوێ" و رازی توانای تازەگەریی هەرکام لەوان بوو. بەڵام هەر هەڵکەوتێکی مێژویی هەرکە دێتە کۆتایی، جیاوازیی نێوان توخمگەلی بیچمدەری ئاشکراتر دەبن و هاوشێوەییان رەنگیان دەبزرکێ. لە کۆتاییدا رۆشن دەبێتەوە کە لێکچوونەکانی نقیسیار لە ڕێبازێك یا بزاڤێکی ئەدەبی راستەقینە نیە. وەك بڵێی تا ئێستا خەڵکی خۆیان لەخشتە دەبرد و هاوسانی یەکانیان تەنیا لە خەیاڵی خۆیاندا ئامادە دەکرد. هونەرمەندی راستەقینە هیی ڕێباز و قوتابخانەیەك نیە و چ باشتر کە تەنانەت بناخەدارێژی ڕێبازێکی تازەش نەبێ،واتەکارەکەی لاسایی‌نەکراوە بمێنێتەوە.نووسەر تەنیاوتەریو لە بەرانبەر مەترسییەکانی زمان رادەوەستێ. تەنیایی ئەو، واتە هەمان مێتۆدی تایبەت و روانگەی تاقانەی، مەرجی ژیانی ئەوە.

## (٢)

لە روانینی یەکەمدا کاری نووسەرانێك کە سەر بە ڕێبازی" رۆمانی نوێ" بوون، چەندان "نوێ" و تازە نانوێنێ. ئایا بە بەراورد لەگەڵ رۆمانەکانی نووسەرانی مودێرنیستی نیوەی یەکەمی سەدەیەك کە خۆشبەختانە خەریکە کۆتایی پێ دێ

(نووسەرانێك وەکو جۆیس، کافکا، موزیل، وۆلف، بروخ، پروست، بیلی)، بەرهەمەکانی سیمۆن، بوتور، ساروت و ئەوانیدی تازەیە؟ ئاگایی تیۆریکی هەرکام لە" رۆمانی نوێ" نووسان لە ئەدەبیات، جەختیان لەسەر " نەریتی فلۆبێر" و بێزارییان لە رۆمانی دەروونناسانە و قاڵبی ریالیستی و کۆنی دەربڕینی ئەدەبی بووە هۆی ئەوە کە هەرکامێکیان لە ڕێگەیەك و بە شێوەیەکی تایبەت بە خۆیان رۆماننووسی بەرەو ڕێساگەلی نیشانەناسیی دیداری بەرنەپێش، بەڵام ئەمەش کارێکی تازە نەبوو.هەندە بەسە وەسفی پروست لە بەردەکانی نوێژخانەیەکی کۆن یا ریشاڵی پێستەی دارەمارێك لە دەستی فرانسواز وەیاد بێنینەوە. سیمۆن، رۆب گرییە،



ساروت و بوتور خۆیان لە بارەی زمانی ئەدەبی ئێجگاریان نووسی و چەندقات جەختیان کرد کە زمان ئامرازی یەکلاکەرەوە و بە شێوەیەك لە شێوەکان ئامانجی ئەدەبیاتە، وەلێ ئەم دۆزینەوەیەش تازە نەبوو. لە پاش ئەزموونی جۆیس لە رۆماننووسی و بە تایبەت ئەزموونی لە **Finnegans wake** و دوابەدوای ئەوە بەرهەمەکانی فۆرمالیستە رووسییەکان لە قەڵەمڕەوی تیۆریی ئەدەبی و رەخنەکاری، ئەمەش فەرموودەیەکی دووپاتەیە." رۆمانی نوێ"نووسان لۆژیکی زمانیان ڕماند، بەڵام نەك بە قازانجی شیعر بەڵکو هەروا لە پەیکەری ڕێساگەلی سینتاکسیی و ئەو خوازانەی کە ئاخێو لە پەخشاندا قەتیس دەکەنەوە، وەلێ بێکت وبەرلەو کافکا ئەم کارەیان بردبوویە پێشێ. بە ئەرخەیانی **گەڵاڵەی گۆڕاندن** ی بوتور و **جادەی فلاندێر** ی سیمۆن لەگەڵ گەڵاڵەی رۆمانی نەریتی یەکانگێر نیە، بەڵام لەپاش **خاتو داڵقوو** و **بەرەو فانۆسی دەریایی**، ئیدی گەڵاڵەی رۆمانی نەریتی ئەوەندە لەبرەوکەوتوە کە تەنانەت جەنگان لەگەڵیشی بەفیڕۆدانی کاتی نووسەر دەینواند.

ئەوانەی کە" رۆمانی نوێ" یان بە "نوێ" ناونا، لەبەراورد لەگەڵ رۆمانە فەرەنسییەکانی پاش جەنگی دووەمی جیهانی، واتە لەبەرانبەر گیان سەختیی نەریتی رۆمانووسی بە شێوەی ژید، ژیونو، ژیرۆدو و مۆنتێرلان وەهایان ناولێنا بوو. ئەوەی لە چاوی رەژیدەرانی ناتۆرە دوورمایەوە بەراوردی" رۆمانی نوێ" لەگەڵ **بووارۆ وۆپکۆشە** و رۆمانەکانی هێنری جیمز بوو. ئەوان لە خۆیان نەپرسی کە لەپاش بەرهەمگەلی تیۆری و وێژەیی ژۆرژ باتای و موریس بلانشۆ نووسین لەبارەی مودێرنیزم یا نووسینی رۆمانی مودێرن بە چ واتایەکە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەبێ بێژین کە" رۆمانە نوێییەکان" لەبەر هۆیەکی دیکە شایانی ناونیشانی" نوێ" ن. ئێمە ئەوانە بە چێژێکی کەم وێنەوە دەخوێنینەوە و بەردەوام شتێکی تازە لەواندا دەدۆزینەوە. ئەم تازەیی‌یە بەر لە هەر شتێك دەبێ لە دوو رووکاری دیکە و گرنگتر لە کاری نووسەرانی باسەکەمان پەیدا بکەیت. رووکارێك کە بەهیچ شێوەیەك ڕۆاڵەتی نیە، کەم رەنگ نابێ و بە شێوەیەکی دەستکرد و بە پێی نەخشەیەکی پێشوتر تێهزراو یا باشتر بێژین دانەهێنراوە. وەك بڵێی هەرەپێویستییەك ئەوی لێکەوتبێتەوە. ئەم رووکارە هاوبەشە، سەربەخۆیی رۆمان لە کەسیەتی سازی و لەنێوچوونی پشت بەستنی گێڕانەوە بە کەسیەتییە. شتێکە کە " رۆمانی نوێ" نووسان بە " لە کەسایەتی خستن"ی رۆمان ناودێریان کرد.

## (٣)

رۆب گریيە چەندین جار گوتویەتی کە لە نووسینی رۆماندا نە عەودالّی ئەفراندنی کەسیەتییەکانە و نە عەودالّی گێڕانەوەی هەقایەتی مرۆڤان. لە نەریتی رۆماننوسیدا fabulaیا چیرۆك بە کەسیەتییەکانەوە بەستراوەتەوە. چونکە رۆمان لە رۆژگاری سەرهەلّدان و پێگرتنی برەوداریی کەسیەتیی مودێڕن بیچمی گرتوە. پێشتر، لە بیچمگەلی سادەی ئەدەبی، کەسیەتی یا کەمڕەنگ بوو و یا تەنانەت نائامادە. ڤیلادیمیر پرۆپ و ئاندرەیولّس نیشانیان داوە کە نەزیلە فۆلکلۆریك و بیچمەسادەکانی لەنێوان دەورە تایبەتەکان( کە کەسیەتییەکان لەواندا خەست و خۆلّ دەکرێنەوە) و پێکهاتەی ئەبستراکتی چیرۆك هەمبەرێکی راستەوخۆ بوونی هەبوو. لەم روەوە گێڕەرەوەی نەزیلەکۆنەکان پێویستیی بەشیکردنەوەی تایبەتمەندیگەلی کەسی و دەرونیی کەسیەتییەکانی گێڕانەوەی خۆی نەدەبوو. بەلّام لە رۆماننوسیدا کەسیەتییەکان توخمی نێوەندی دێنەبەرچاو. وەك بلّێی هەتاکو گێڕانەوە پێشەوەتر دەچێ، ئێمە مرۆڤێك یان مرۆڤانێك باشتر دەناسین و لە بەرانبەردا یەکێك لە کارامەییەکانی وەستایانێك وەکو جین ئاستین وتۆلستۆی پەیداکردن و بەکار بەستنی ئەم هەمبەرە دووسەرەیە بوو. ئەوان بە خولّقاندنی ئیلیزابێت، ئێما، پیێەر و ناتاشا واتە بە وێنەکردنی هەرکام لەوان وەکو تاك رۆخسارانی تەواو و بێ کەمایەسی، هەر لە سەرەتای چیرۆکێك کە باسیان دەکرد، هاودلّیی بەرامبەر (بیسەرـ خوێنەر) لەگەلّ ئەوانی دەوروژاند و لە رێگەی ئەم هاودلّییەوە گێڕانەوەیان دەبردە پێشێ و دەبوونە هۆی رکێش و کێشەکێشی ئەوان.

کاری" رۆمانی نوێ" نووسان ئەمەبوو کە لە رێگەیەك بەدەر لە مێتۆدی گێڕەرەوان بیچمگەلی سادەی ئەدەبی، کەسیەتی لە گرنگی بخەن. ئەوان یەکانگیر لەگەلّ ئاوابوونی تاکایەتی لە رۆژگاری" مودێڕنیتەی پاشین" بەلّام نەك تەنیا لەبەرئەم هۆیە، کەسیەتیی نێوەندییان" بێ کەسایەتی" کرد.ئەم چەشنە لە پێشڕەویی رزگاری لەگێچەلّی کەسیەتییەکان بێ مێژینە بوو. تەنانەت لە رۆمانەکانی کافکادا( و نەك کورتە چیرۆکەکانی) کە لەواندا لە شیکاریی دەروناسانەی کەسیەتییەکان هەوالّێك نیە و بەڕوالّەت وەها دەنوێنێ کە مرۆڤان تا ئاستی پیتەکانی ئەلف و بێ نزم بوونەتەوە و شوناسی سەربەخۆیان لە کیس داوە، هەمدیس لۆژیکی گێڕانەوە گیان دەکاتەوە بەر کەسیەتییەکان. ناسینی بەرە بەرەیی ژۆزێف k یا گرگۆر زامزا (**تەشك گۆڕان** لەم دیدەوە هاوشێوەی رۆمانەکانە) رۆحی رۆمانەکانی ئەون. ئەم خالّە



لەمەڕ رۆمانەکانی جۆیسیش وەڕاست دەگەڕێ. بەئاسانی دەتوانی ببینی کە ئیستێفنی **وێنەی هونەرمەند لەتافی لاویدا** و ئێستیفێنی **یولیسس** بە چ وردییەکەوە نیگارکراون، هەلّبەت نەك بە میتۆدی نەریتیی رۆماننوسیی ریالیست یا ناتۆرالیست، بەلّکو بەشێوەیەکی تازە و چەندقات زیندوتر. ئێمە خوێنەران، کەسیەتییەکانی جۆیس دەناسین، لە رێگەیەکی تازە و کاریگەر لەگەلّ جیهانبینی، فەرهەنگ، باوەڕەکان، رابردوو، شێوەی ژیان و بەرە ڕووبوونەوەیان لەگەلّ وارسکەکان و ویستەکانیان ئاشنا دەبین. تەنانەت لە یەکانگیریی نێواخنیی ئەوان لەتەك کەسیەتییە ئوستورەییەکانیش دەتوانین ژیانی هزرینئاسای مرۆڤی مودێڕن هەمدیس پەیدابکەینەوە.کاتێك کە ئیستیفێن پەیتاپەیتا زیاتر لە تێلماك لە داستانی شیعریی هۆمیرۆس دەچێ و دەوری کوڕێك پەیدا دەکا کە لە پەیجۆری باوکی خۆیەتی، یا مولی بلۆم لە تاکبێژیی **کۆتایی یولیسس** دەگۆڕێت بۆ پنەلۆپە هاوسەری ئەفسانەیی، هەمدیس کەسیەتییەکانی جۆیس خدەی تاکەکەسیی خۆیان لە کیس نادەن و هەروا بە دنیای مودێڕن و مودێڕنیتە کە تاکایەتی کردوە بە بنیاتی ناسین، بەستراوە دەمێنیتەوە. گەڕانەوە بۆ ئوستورەکان( کت ومت وەکو دەورێك کە لە شێعرەکانی ئیلیۆت و (ئێزرا) پاند هەیەتی) هەلّاتن لە مودێرنیتە نیە، بە پێچەوانەوە، رۆحی ژیانی مودێڕن زەق دەکاتەوە. هەر ئەوەند کە لەپاش خوێندنەوەی بەشی بنەتایی و درەوشاوەی **یولیسس**، واتە تاکبێژیی مولی بلۆم، پنەلوپە ئیدی نەك یەك کەس بەلّکو تێکڕای ژنانی دنیای مودێڕن دەزانرێت، ژنانێك چاولەرێگای پیاوانی سەربەگێچەلّ و قارەمانی خۆیانن، کە لە مالّەوە دانیشتون، کە بابەتی ویستی سێکسیی پیاوانن، بەو واتایەیە کە لە کەسیەتیی مرۆڤ ( بەواتای باو و ئاسایی و فەرمیداری) دوور کەوتوینەتەوە و لە رێگەیەك بێجگە لە مێتۆدگەلی ئاشنای سیمبۆلیستی،" هەرامەیەکی هەمەکی"مان رەخساندوە. ئەم هەلّاتن لە سیمبۆلگەرایی و تامەزرۆیی بە هەرامەی هەمەکی، میراتی جۆیس بۆ نووسەرانی" رۆمانی نوێ" بوو. ئەمان لە پاش ئەزموونگەلێ لە یەکەمین بەرهەمەکانی خۆیان، سەرەنجام هەرامەی هەمەکیشیان وەلا نا و فێربوون کە بەبێ پشت بەستن بە کەسیەتییەکانیش بتوانن بدوێن.

مرۆڤانی رۆمانی سیمۆن(واتە)**جادەی فلاندێر**" بێ کەسایەتی" ن، نەك بە واتای پڕ لە سوکایەتی کە لەم وشە فارسییە(هەروەها کوردیش) [*]دێتە زەینەوە،بەلّکو بە واتایەکی دیکە.

* تێبینی لە وەرگێڕە.

ئەوان تەنانەت بە واتایەکی جۆیسی" ئارایی‌یەکی ئەبستراکت" یشیان پەیدانەکردووە، بەڵکو زۆر سادە لە ژێرناوی بژیوانی پێشکەوتنی گێڕانەوە وەلا نراون. ساڵانێك بەر لە ئێستا ساروت ئامانجی خۆی لە کاری رۆماننووسی رۆشن کردبوویەوە: سڕینەوەی کەسیەتی یا بە گوتەی خۆی depersonalisation[4]. ئەم" کەسیەتی سڕینەوە"یە لە رۆمانی مودێرندا پێشینەی هەیە، بەڵام لە نووسینەکانی ساروت خدەو هێزێکی تازەتری پەیدا کردوە. لە رۆمانە مودێرنەکاندا کەسیەتی پاتۆری ئۆرگانیکی پەڕانپەڕ نیە، لەو جیایە، لێی بێگانەیە. ئەم نامۆیی‌یە دەتوانێ لە جۆری ڕوانین لە دنیا ( **نامۆی کامۆ**) یا لە بێزاری لە دووپاتەیی‌بوونی نەفرەت وروژێنی گوزەرانی ژیان (**هێڵنج** ی سارتر، **کوندەبوی کوێر** ی هیدایەت) بەدی دەکرێ. وەلێ جێگەیەك بە تەواوی شیانی ناسینەوەیە کە لە رەهەندی هایدنناسانە جێ بگرێ. بەو ڕۆمانانەی کە بۆ نموونە ناوم هێنان باڵادەستیی هەنتەش لەم رەهەندەدا هەستپێکراو و ئەگەر پەیتاپەیتا لە "دنیای ئەوانیدی"(دنیای بستەباڵاکان) یاد دەکرێ، سەبارەت بەوەیە کە تایبەتمەندیو لایەنی تاقانەی رەهەندی هایدنناسانەبوونی "کەسیەتی" هەمدیس دەناسرێو قەدری دەزانرێت. رەنگە بەهێزترین بیچمی ئاشکراگەریی کەسیەتی لەرێگەی شیتەڵکردنی هەمبەرێتیگەلی دووسەرەی ئەو لەگەڵ پەڕانپەڕی ژیانی کارێك بێت کە پروست لەمەڕ چیرۆك گێڕەوەی شاکارەکەی خۆی ئەنجامی‌دا. ئەم ئەزموونانە بەکار هاتن تا "رۆمانی نوێ" نووسان رێگەیەکی تازە پەیدا بکەن. لەبەر ئەم ئەزموونە سەرکەوتوانە بوو کە نووسەرێك وەکو ساروت سەرەنجام توانی دنیای دەرەوە، یا بە دەربڕینی باشتر هەمبەرێتیەکان لەنێوان کەسیەتی‌و پەڕانپەڕی ژیانی بێ‌بایەخ دەکا. هەنووکە "کەسیەتی" چونکە بەسترانەوە و ڕایەڵێکی بۆ "دنیای دەرەوە" نیە، بەو واتایەی کە مودێڕنیتە هێناویەتە گۆڕێ "بوونی نیە" و "کەسیەتی نیە". ناسکارێك نیە کە بیهەوێ بەرناسێك بناسێت یا لەودا دەسکاری بکات.

"ناسکار" بەمجۆرە وەلادەنرێ. "رۆمانی نوێ"نووسان بەناچار تەنانەت لەو رۆمانانەی کە تەنیا هەمبەری نێوان ناسکار و شتانیان لە بەرچاو دەگرت جیا دەبوونەوە. لەم رووەوە رۆمانێك وەك **هێڵنج** ی سارتر کە هەوێنی نێوەندیی پێوەندیی زەینی بوو لەگەڵ شتانی دەوروبەری و دۆزینەوەی ئەمە کە وەها پێوەندییەك "پەرێشان کەر"ە، چیدی بەکار نەدەهات. هەنوکە پێویست بوو رۆمانێك بنوسرێت کە ئیدی شتەکان ژیانی سەربەخۆی خۆیان پەیدا بکەن‌و

(4) N.Sarraute , l ere du supcon , paris , 1956.p.44



زەینەکان لە هەمدیسنوێنی و بەیانگەریی شتەکان دەست هەڵگرن. کەوا بوو ساروت و باقی "رۆمانی نوێ"نووسان دەست بەکار بوون. ئەوان جەختکردن لەسەر هەمبەری تاکەکەس‌و پەڕانپەڕ ڕوویان وەگێڕا. یەکەمین مەسەلە لە یەکەمین لاپەڕەی هێڵنج ئەمە بوو: "دەبێ بێژین کە من ئەم مێزە، شەقام، خەڵك، کیسەی توتنەکەم چۆن دەبینم، چونکە کت‌ومت هەر ئەمانەن کە گۆڕاون. دەبێ بەرزاخ و چیەتیی ئەم گۆڕانە بە وردی دیاری بکەیت".[٥] ساروت و ئەوانیدی نەیان دەویست بزانن کە لە دیدی کەسیەتییەکەوە شتان چۆن دەردەکەون‌و یا ئەو چۆن بەرزاخ‌و چیەتیی گۆڕانی شتان دیاری دەکات. ئەوان دەیانەویست لە شتەکان سەربەخۆ لە زەینەکان وردبنەوە. ئیدی باوەڕیان نەدەکرد کە دەبێ شتەکان تەنیا لە هەمبەر لەگەڵ مرۆڤان واتە ناسکارە فەلسەفییەکان بناسیت. ئەوان تێگەیشتن کە گەیشتن بە "خودی شتەکان" ئەم ئارەزوی فەلسەفەی نوێ و دیاردەناسیی هۆسرێلی کاتێك دەلوێ کە لە خێری ناسکاربوون بگوزەرێین. خاڵێك کە لە ١٩٢٧ فەیلەسوفێکی ئاڵمانی (کە چەند ساڵێك شاگردیی هۆسرێلی کردبوو) ئەوەی کردبوو بە یەکێك لە باسگەلی سەرەکیی پەرتوکەکەی، بێ ئەوەی کە لە "لەنێو ئەوانیدیدا بوون" بگوزەرێ. ئەو نیشانیدابوو کە دەکرێ هایدن ـ لە ـ جیهان لە رێگەیەك بەدەر لە هەمبەری دیکارتیی ناسکار ـ (بەرناس) یش بناسیت.

دەرەوە" بەم جۆرە دەخرێتەلاوە. مشت‌ومڕ لەگەڵ نووسەرانی "رۆمانی نوێ" ئاراستەیەکی سیاسیی هەبوو کە بە "دەروەستبوونی نووسەر" و ئەم قسانە گرێ دەدرا، وەلێ گرنگیەکی نابەجێ کە سارتر بۆ ئەم ئاراستە سیاسییە دای دەنا دەبووە لەمپەری رۆشن بوونەوەی لایەنێکی گرنگتری ناتەبایی ڕا و بۆچوونەکان. بەلای سارترەوە کە چیدی نووسەری رۆمانی **هێڵنج** یش نەبوو، کار لە دیاریکردنی تەکووزی شتان لە رێگەی زەینەوە تێپەڕیبوو، ئیدی ئەو باوەڕی هەبوو کە دنیای دەرەوە واتای جڤاکی هەیەو کلیلی ناسینی دنیای نێوەکی، یا زەین، یا رەهەندی هایدنناسانەی ژیانی کەسیەتییەکانە. لەحاڵێکدا کە بەلای ساروت، بوتور، سیمۆن‌و باقی "رۆمانی نوێ"نووسان وەها بڕیارێك بە هەمان بارتەقا چەوت دەهاتە بەرچاو کە بڕیاری دیاریکردنی بەرزاخ‌و چیەتیی گۆڕانی شتان بە زەینی مرۆڤ. کەوابوو تەنانەت نەدەکرا رۆژگاری نووسینی **هێڵنج** یش وەیاد سارتر بخەیتەوە. ئەگەر نامۆیی لەگەڵ پەڕانپەڕ و لە

(5) J.P. Sartre, Lanausee, Paris, 1938, (1968), p.13.

بڕواننە پاچەڤەی فارسی: ژ. پ. سارتر، **تهوع**، ترجمەی ١. علم، ویرایش دوم، تهران، ١٣٦٥، ص ٦٥.

خۆنامۆبوون تەنیاو تەنیا بەروبوومی شێوەی مەتریالیی رابواردنی تەمەن بێت، ئەو کات توێژینەوەگەلی کۆمەڵناسانە، یا سیاسی، یا مێژویی بە کاری ناسینی هۆی نامۆیی دێت و ئیدی هیچ ئاشکرا نیە کە چ پێداویستییەك بە رۆماننوسی دەمێنێتەوە. لە لایەکی دیکەوە، بە سانایی دەتوانی ببینی کە وەها مێتۆدگەل و شیکاریگەلێ (کە رەگاژۆیان کە لە بڕیاری **ئایدیۆلۆژیی ئاڵمانی** ی مارکس و ئینگڵس هەیە کە ژیانی کۆمەڵایەتیی یەکلاکەرەوەی ئاگایی مرۆڤانە) ناتوانن تێکڕای ئاراستەگەلی جوانیناسانەی بەرهەمی هونەری ئاشکرا بکەن. خەیاڵکردی ناسینی هەمبەری نێوەکیی توخمگەلی رۆمانەکانی جین ئاستین لە رێگەی درك پێکردنی شێوە گشتگیرکردنی رەنێوهانینی هەمبەری نێوەکیی توخمەکانی ساروتو سیمۆن لە

رێگەی تاوتوێ، یا گریمان درك پێکردنی ژیانی کۆمەڵایەتیی فەرەنسای پاش جەنگ، یا رووداوگەلی مێژویی (وەکو شەڕی نێوخۆیی ئیسپانیا یا جەنگی دووەمی جیهانی) پووچەڵە. کەسیەتی سڕینەوە جۆرێك دەرپەڕین لە مێژویە، تا بوونەوەرێکی بانمێژویی (بە واتایەکی تەواو تازەی "شتێکی" بانمێژویی) لە دایك بێت. بەم دووری‌یە لە کەسیەتی دووری لە مێژو دێتەپێش و ئەمەنیگایەکی نوێ بۆ هەرەت دەخوازێ. لە بەر ئەم نیگا نوێ‌یە بۆ هەرەتە کە گێڕانەوە رەوتی "ماقووڵ"، ئاسایی‌و ئاشنایی لەکیس دەدا.لۆژیکی ئەم کەسیەتی سڕینەوەیەی ڕۆمان لە هاتنەدیی لە"رۆمانە نوێیەکان" بە گۆڕانکاریی تەواوی چەمکی تانو پۆ (بە زمانی فۆرمالیستەکان sujet) دەگات.رۆمانی بەسەرهات لە نووسینی سیمۆن باسی بێتوانایی لە باسلێکردنە، گێڕانەوەی نەلواوی گێڕانەوەگەریی‌یە. لۆژیکی "بڕگەبەندی" کە سیمۆن لە لیۆشتراوس فێری بوو، کتوکت لە بەرئەم هۆیە ویست یا هەوڵدان بۆ رزگاربوون لە گەلاڵەو کۆتو بەندەکانی کەسیەتی سازی هاتەگۆڕێ.

ئەم نکۆڵییەی کەسیەتی تەنیاوتەنیا بە سەودای پەیداکردنی شێوە تازەکان لە چیرۆکبێژی کە لە بەرانبەر رێچکەی کەسیەتی سازیی رۆمانەکۆنەکان ریزەکانی رێك دەخا، نەهاتۆتە ئاراوە، بەڵکو بە بانگەشەیەکی چەندقات گرنگتر پشت ئەستورە: لە رۆمانە کۆنەکانیشدا "کەسیەتییەکان دەگۆڕان بۆ شتەکان"[٦]، واتە لەوانیشدا لۆژیکی لە خۆنامۆبوون و بوونەشمەك تەنانەت لە جەرگەی گێڕانەوەگەریدا کارا بوو. تەنیا ئەم بەرەنجامو ئەو لۆژیکە شاراوە دەمایەوە. بەڵام لە "رۆمانی نوێ"دا بە نکۆڵی لە کەسیەتی سازی و بە لەنێوچوونی یەکێك

(6) B.PINGAUD, “Lecole du refuse”, Esprit, juillet 1958.



لە دواین بازنەکانی پێوەندی لەگەڵ "هەڵکەوتە کۆمەڵایەتیو مێژویی" رێگەیەکی نوێ ئاوەڵابوو، تا رازی ئەو لۆژیکی "بوونە شمەك"ە ئاشکرا ببێ."رۆماننووسی نوێ" ئەم خاڵە دەدرکێنێ، نەك شاردنەوەی.بۆ نووسەری کۆن شتان لەخۆوە دڵکێشو جێی سەرنج نەبوون. برەوداریيەکیان ئەگەر هەبوو، لەوێدا بوو کە "تاودانەوەی هەڵکەوتی گیان" بێنە ئەژمار. وەکو تێکڕای بەرجەوەنەکان کە بە بۆچوونی ئامیل "هەڵکەوتی گیان" بوون. لەبەرئەوەی کە هەر بەرجەوەنێك ئاوەها نەبوو، هیچ بەرجەوەنێك هەڵکەوتێکی تاقانە ئەژمار نەدەکرا و سەربەخۆ لە زەینی مرۆڤ بایەخی نەبوو. بەلای فلۆبێر و رۆماننووسی مودێڕن، بە پێچەوانەوە، شتان بوونە خودان دڵکێشبوونەکان و ئیدی نەك باشقەیەك بۆ مرۆڤ بەڵکو "ئاراییەك بۆ خۆ" دەزانران. وەلێ شتان جیا لەم ئارایی‌یە بۆ خودی بانگەشەکراو هەروا بە کات و هەرەتەوە بەستراوە مانەوە و کات "کاتی مرۆیی" بوو. بەڵام لە رۆمانەکانی ساروت، بوتور و سیمۆن "جیهانی کامڵ و رەهای شتان" بیچمی گرت، شتان بە بێ‌کاتو بە بێ‌مێژو.دەزانم کە بانگەشەیەکی گەورەیە، بەڵام دەبێ بێژین کە "کاتی نامرۆیی" سەری دەرێنا. کاتێکی ئوستورەیی. بەم چەشنە ئەدەبیات بە رێگەیەکدا چوو کە پێشتر ئاوەزی فەلسەفی هەنگاوی لێنابوو: دەربازبوون لە باوەڕ بە ناسکار و ئیمان بە زەینو وزەی ناسینی بکەرو ناسێنەر. ساختەکاریی کۆن ئاشکرا بوو و کەوتە لاوە. ئیدی وەکو کۆن نەبوو کە بە ڕاستی کەسیەتییەکان بگۆڕێن بە شتەکان، بەڵام وەها بنوێنرێ کە گوایە شتان کەسیەتییان پەیدا کردوە. رۆماننووسی نوێ پەسندی کرد کە لە دنیای رۆماندا خۆ بە واتایەکی دیاردەناسانە بە خودی شتان و بە زمانێکی مرۆیی دەکات. بەم جۆرە دەتوانی گوتەی بەناوبانگی بوتور فام بکەیت کە: "نووسینی رۆمان تەنیا رۆنانی گشتکۆیەك لە کردە مرۆییەکان نیە، بەڵکو رۆنانی گشتۆیەك لە شتەکانە".[٧] چەند ساڵ لەوەو پێش مۆریس مێرلۆپۆنتی فەیلەسوفی دیاردەناس لە پەسنی بوتور و سیمۆن نووسیبووی کە ئەوان نەك تەنیا بە ئاراستەی پەتیی زمان گەیشتون، بەڵکو شتان وەها کە بۆ خۆیان ئارایی‌یان هەن، ناسیویانن و لە زماندا گۆیان کردون.[٨]

(7) M.Butor, Repertoire, vol.2,Paris, 1964, p.52.

(8) M.Merleau –ponty, “cingue notes sur claude simon”, in: Meditaions, 4, 1961, p.8.

## (٤)

نكۆڵی له كەسیەتی واتە نكۆڵی لە رۆمانی دەروونناسانە. سینەما هاوكات لەگەڵ "رۆمانی نوێ" دەروونناسی وەلانا. رۆبێر بێرسۆن گرنگترین (و دلێرانەترین) كاری كرد. ئەو سینەمایەكی بە بێ "نیارڤان" ی خولڨاند، تا دەروونناسی بخاتە لاوە. ئەو بە گەلاڵەی چەمكی "مۆدێل" لە جێی نیارڤانێك كە كارەكەی نواندنی تەڵەكە هەرزە دەروونناسانەكان بێت، رێگەیەكی نوێی دەست پێكرد. ئەمە رازی هۆگریی "رۆمانی نوێ"نووسان بە كاری بێرسۆنە. ژان ماری لۆكلزیوش لە بەراییەكی كورت بۆ چاپی نوێی **یادنوسگەلیٚ لەبۆ سینەماتۆگرافی** بێرسۆن ئەم خاڵەی ڕوون كردۆتەوە.[(٩)] دەیەی **١٩٦٠** تەشقی باندۆردانانی سینەمای بێرسۆن و دەسپێكی سەرنجی رووناكبیران لە "رۆمانی نوێ"یە. لەم دەیەدا سینەمای مودێڕن " (كە درنگ گەیشتبویەجێ، بەڵام زۆردار و كامڵ دەهاتە بەرچاو) تێهەڵكێشی رۆمانی نوێ بوو. فیلمی **ساڵی رابردو لە مارین باد** بەرهەمی ئالێن رنە كە لە سەر بنەمای فیلمنانەی روب‌گرییە سازكرا،باشترین نموونەیە لە هەڵاتن لە كەسیەتیسازیو دەروونناسیو لە هەنگاوی دواتر لە گەلاڵەوچیرۆك. بەناوبانگە كە تەنانەت لەمەڕ گرنگترین خاڵی گەلاڵەی فیلم لە نێوان ئالێن رنە و روب‌گرییە هاوڕایی بوونی نیە. بە بۆچوونی رنە بەڕاستی ساڵی رابردو لە مارین باد پێوەندییەك لەنێوان ژن (كە ئەمڕۆ هەمووشتێكی فەرامۆش كردوە)و پیاو (كە تێدەكۆشێ تا بەوی ببەڵێنێ كە ساڵی رابردو پێكەوە لە مارین باد پێوەندییەكیان هەبوو) هەبوو. بەڵام بە بۆچوونی روب‌گرییە ئەمڕۆ هەمو شتێك لە زەینی ژندا تێپەڕ دەبێو تەنانەت بوونی پیاویش لە دنیای ئەمڕۆشدا ساویرێكە و بەس. واتە كۆڵەگەی سەرەكیی فیلم تەنانەت لە رەوتی ئەفراندنیدا لەسەر زاڵبوونی لیلیو تەمتومان بووە. لێڵییەك كە بەر لە هەر شتێك زادەی "بێ كەسیەتیی" فیلمو گێڕانەوەی فیلمنامەیە. رۆلان بارت نووسیویەتی:"ئەگەر بەشێك لە ئەدەبیاتی هاوچەرخ هێرش دەكاتە سەر كەسیەتی، نەك بۆ وێران كردنی (كە بە هەرحاڵ كارێكی نەلواوە) بەڵكو بۆ لە كەسیەتی خستنیەتی".[(١٠)]

لام وایە كە ئەزموونی "رۆمانی نوێ"، بە باشی نیشان دەدا كە ئەم وێران كردنەی كەسیەتی لە رێگەی "كەسیەتی سڕینەوە" دەلوێ و وەلانانی هەمبەری نێوان ناسكار و پەڕانپەری ژیانی لە جەرگەی رۆماندا، تەنانەت لە چاوی بارت، ئەم هۆشمەندترین داكۆكیی "رۆمانی نوێ" و هەڵكەوتوترین رەخنەگری ئەدەبییەی رۆژگاری ئێمەش بە وەشێراو مابوویەوە.

---

(9) J.M.G.Le clezio, “Preface”, in: R.Bresson, Notes sur cinemato graphe, Paris, 1995 PP.7-12.
(10) R.Barthes, Laventure semiologigue, Paris, p.190.



## (٥)

شارل بودلێر لە كاتژمێر پێنج،بەرەبەیانی پێنج شەممە **١٣**ی مارسی **١٨٥٦** لەخەو راچەنی، بە هەراوزەنای بەرپێكەوتنی ئەسكەمل لە پێی ژێن دوڤال، خولیای سەرسووڕهێنەر "و كەمێك گاڵتەجاڕانە" كە شاعیر دەیدی، ناتەواو هێشتەوە. بودلێر بەخێرایی خولیاكەی نووسی و بۆ هەڤاڵەكەی شارل ئاسێلینۆ ناردی. ئەم "چیرۆكە بڕوا بەدەر"ە (بە شێوەی نەزیلەكانی ئێدگار ئالێن پو كە دڵبەندی شاعیر بوو) لە نیگای یەكەمدا بابەتی توێژینەوەی، بەڵام لە راستیدا، رۆمانێكە لە نووسینی میشل بوتور. كەتوار لە پاش خوێندنەوەی **چیرۆكی لەبڕوابەدەر** كامەیە؟ خولیای بودلێر لانیكەم لە چەند لایەكەوە بەروبوومی دنیای ژیانی رۆژانەی بوو و گرێدراوی ئاسۆی فەرهەنگیی زەینی ئەو. ئەم جیهانەو باندۆر دانەریی، بەڵام لە راڤەدا و هەروەها لە گێڕانەوەی ڕاستەو ڕاستی خولیایەكیش بێبایەخە. خاڵی سەرەكیی نەك كەتوار بەڵكو خولیایە، نەك باسلێكردنی شاعیر لە خولیا بەڵكو خۆیەتی. هەر بەو چەشنەی كە ریكۆر نیشانی داوە لە دەرونشیكاریی فرۆیدیشدا ناتوانی بەرەنجامەكانی راڤە لەگۆشەی ڕاستو چەوتییان تاوتوێ بكەیت. دروستی یا كەتوار لە وزەكەی لە دروستكردنی خودئاگایی ئەو كەسەی كە بە نەخۆش ناوی لێدەنرێ وەشێراوە. كەتوار لە وردبوونەوە لە خاڵگەلی تایبەت دەناسرێ نەك لە هەقیقەتێكی هەمەكی. هەر رۆمانێك هاوشێوەی خولیایەكی تایبەتە كە دنیای خۆی دەخولڨێنێ. تەنانەت چ پێویستییەكی بەوە نیە كە ئێمە بە" دنیای راستەقینەی رۆمان" ناودێری بكەین.

**منداڵی** ناوی پەرتوكێكە لە نوسینی ناتالی ساروت. ئایا باسلێكردنی ساڵانی منداڵیی مرۆڤێكە؟ ئایا ژیاننامەیەكی خۆنووسە، ئایا پەیامنێری كەتوارگەلێ كە چەندین دەیەیە كە لە زەینی ژنێكی بەساڵاچوو لە باڵاخانەكەیدا لە پاریس" لە بیچم كەوتوون"؟ لێرەدا " لە بیچم كەوتن" وشەیەكی چەندان گونجاو نیە. شتێك كە لە بیچم دەكەوێ پێشتر دەبێ خودان بیچمێك بێت، لە حاڵێكدا كە ئێمە بە لە كیس دانی بیچم، بانتر لە رابردو و ئەمڕۆ، رووبەڕووین. رەنگە باشترین مێتۆدی خوێندنەوەی **منداڵی** لەیادكردنی ئاراستەی" راستەقینە" یا " ژیاننامەیی"(ئەو پەرتوكە) بێت. واتە هەوڵدان بۆ ئەمە كە هەمووشت وەكو "سیستمی چیرۆك" بناسین و لە كەتوار تێپەڕین. كلۆد سیمۆن لە گفتۆگۆیەكدا وەبیرهێنەری ئامۆژگاریی دۆستی فەیلەسوفی خۆی كۆستا ئاكسلۆس بووە كە دەبێ بەردەوام، لە هەموو دۆخێكدا،

وشەی " کەتوار" لە جووت کەوانەدا دابنێین.خاڵی گرنگ لە هونەردا ئاماژەپێکراوە،چەمکی زەینی‌یە. خەیاڵ شێوەگەلیٚ، وێنەگەلیٚ. خاڵی بیٚبایەخ واتادارە، واتە گەڕانەوە بۆ کەتوارگەلی بەرهەست.[11] بەڵام یەك "کەتوار" هەروەها باڵادەست دەمێنێتەوە و لەمە کە بتوانین لە جووت کەوانەکەی جێی بکەینەوە، ڕوو وەردەگێڕیٚ. ئەم کەتوارە شتێکە کە بەردەوام بە ئامرازی کاری ڕۆماننوس دەمێنێتەوە: زمان. نیگارکێش پێی وایە کە شتێك لە کەتواری جیهان وەکو ڕەنگ و هێڵ بە فرمانی ئەوە، ڕۆژێك تێدەگا کە ملکەچی هەردووك بووە. ئاوازدانەر پێی وایە کە لەسەر تەکووزمەندیی هاونشینی و جێنشینی دەنگەکان کە کەتوارگەلی ماتریالین حکومەت دەکات، ڕۆژێك لە ڕۆژان تێدەگا کە خۆی پێڕەوی تەکووزمەندیگەلی سەراسا بووە. شاعیر و نووسەریش ڕۆژێك لە ڕۆژان تێدەگەن کە زمان ئەوانی پابەندی کەتواری خۆی کردوە. لەنێوان ژیان و مەرگ ساروت لە مێرمناڵێك دەدویٚ کەحەز دەکات یاری بە وشەکان بکات. کوڕەمناڵەکە لە وشەیەکەوە بۆ وشەیەکی دیکە بازدەدا، نەك لە وشەیەکەوە بۆ واتایەك. ئەو بەرێگای پەخشاندا دەڕوا، نەك ڕێگەی شیعر. دەنگە زمانییەکان پەیدا دەکا نەك هاوواتاکان و میتافۆرەکان. کاربردەی ڕۆمان نیشان دەدات کە ڕۆمان هەر چۆنێك بێت لە شیعر جیایە.

## (٦)

Recit یا ڕاپۆرت بە واتای باسلێکردنی ڕووداوەکانە، بەڵام ڕووداوگەلیٚ لە ئاخێودا، واتە لە زماندا. هەر ڕاپۆرتێك لە هەمان کاتدا گێڕانەوەیەکە لە گێڕانەوەگەری. گێڕانەوەیەك لە دەرەوەی زمان (پێشهاتێك لەسەروی زمانەوە، هەمان شت کە لە فەلسەفەی پاش سێنت تۆماس "کەتواری ڕووت"ی فەلسەفییان پیٚدەوت) چونکە دێتەنێو جەرگەی زمانەوە، واتە دەگێڕدرێتەوە، بایەخێکی تازە پەیدا دەکا. ڕووداوێکی تاقانە دەبێت بە ڕووداوێکی هەمەکی. ڕاپۆرت وەکو ڕووداوێکی زمانی لە خۆیشی ڕاپۆرت دەدا. ئیدی هەندە گرنگ نیە کە تا چ ئاستێك بە شێوەیەکی ورد و کتومت وەفادارانە لە جیهانی ڕاستەقینە یا دنیای زەین هەواڵ دێنیٚ. خاڵی سەرەکیی سروشتی زماناسانەیە و لێرەوە ئاماژەگەلی دەقیو "دنیای دەق"ە. هەر چیرۆك یا ڕاپۆرتێکی گێڕانەوەیی، هەڵبەت ئاماژەی بۆ جیهانە، بەڵام ئەم خاڵە بە

(11) L.Dallenbach , claud siman,paris, 1988, pp.165-166.



خێرایی‌یەکی لە بڕوابەدەر لە گرنگی دەکەویٚ، چونکە خاڵی سەرەکی لە جێیەکی دیکە دایە. خاڵی سەرەکی زمانە کە جیهان قبووڵ ناکا و جیهانێکی دیکە دەڕەخسێنیٚ.  کیژەلاوێك هاتەنێو لوژی ئوپێراوە و لەسەر ئەسکەملەکە دانیشت: سونیا بە چرپەچرپ گوتی: "ناتاشا، قژەکانت!" پاسەوانێك بە ئەدەبو بە پەلە لە بەرانبەری چاوی خانمانەوە هەستا و دەرگای لوژی کردەوە. دەنگی مۆسیقا بەرزتر دەهاتە بەرگویٚ. لە چوارچێوەی دەرکەی ئاوەڵا، ڕیزی لوژە ڕۆشنەکان دەبینرا و خانمەکان بە باسكو شانو باڵی ڕووتیانو، هەیوان کە لەودا جلو بەرگی فەرمیو پڕ زەنا دەدرەوشا. خانمێك کە بۆ لوژی دواوەتر دەڕۆیشت بە نیگایەکی ژنانەی پڕئیرەیی چاوی بڕیٖیە ناتاشا. پەردەکە هێشتا هەڵنەکێشرابوو، ئورۆتوریان ژەنی. ناتاشا کە جلەکانی ڕێك دەکرد لەگەڵ سونیا هاتە نێو لوژەوە، دانیشتو سەیری لوژە روناکەکانی بەردەمی کرد. ئەوکات هەستێك کە ماوەیەکی زۆر لەوەپێش تاقیی نەکردبوویەوە، وەبارهاتو لە سەدان نیگای واقوڕماو لە گەردنو باسکە ڕووتەکانە، لە ناکاو بە شێوەیەکی نیانو توخس ئەوی لە خۆ دەگرت، بەم چەشنە بە هەودایەك لە یادەکان، ئارەزوەکانو هەژانەکان گەمارۆدرا کە هاوپێناو لەگەڵ ئەو هەستە هروژمیان هێنا..."[12]

تۆلستۆی دوو پەرەگرافی دیکەش لە وەسفی ئەم ساتە دێنێتەوە. ئەمە تەنیا یەك چرکەساتە. تەواوەتێکی ڕەها لە "یەك سات"دا. لە ڕۆمانەکەدا، ڕستەکان وەدوی یەکدی دێن تا تەواوەتێك دەربڕین، کەوابوو هاوکاتی لە نێودەچیٚو بە دوایەکداهاتن بیچم دەگریٚ. لە مۆسیقادا ناتوانی هاوکاتی وەلابخەی، ئەگینا بە دوایەکدا هاتن هەیە. لە نیگارکێشانیشدا هاوکاتی بنچینەی کارەکەیە، مەگەر ئەوەی وەکو سێزان بمانەویٚ بە ویستی خۆمان بە لاوەی بنێین. ئایا دەتوانین بێژین کە لە وەسفی ئەدەبیشدا هاوکاتی کە هەر لە سەرەتاوە کۆڵەکەی کارەکە بووە، دەشیٚ وەلا بنریٚ؟ ئایا ئەم کارە دەلویٚ؟ دەبینین کە تۆلستۆی وەهای کردوە، هەر کەسێکی دیکەش کە لەگەڵ هەودای نیشانەگەلی زمانی سەروکاری هەیە وەها دەکا، بەڵام بەنرخی لەکیس دانی هەمان یەکتایی و لایەنی تاقانە ڕووداو. بە وەسفی ڕۆمان، ئەم تێکشکێنەرەی ڕوووداو و چرکەسات تێك دەشکیٚ. سەردەمانێك مۆنترلان گوتبووی: "کاتێك کە سەرقاڵی خوێندنەوەی ڕۆمانێکم دەگەمە وەسفێك، لاپەڕەی پەرتوکەکە هەڵدەدەمەوە". بەڵام ڕۆمانەکانی خۆیشی لەم وەسفانەیان تێدایە تەنانەت نووسینەکانی کەسانێك کە لەو

(12) L.Tolstoy, war and peace, trans L. and A. Maud, Chicago, 1977, P.316.

کارامەتر بوون، کەسانێك وەکو کافکا، گرترود ئێستاین‌و بۆرخێس. ئەمانە تێکڕا ئێجگار تێکۆشان تاکو باسلێگەری نەکەن، بەڵام هەموویان راپۆرتیان داوە و هەر راپۆرتێك بە ناچار ـ تەنانەت لە قاڵبی گوزارەیەکی ئێجگار کورت ـ هەمدیس وەسفی‌یە. "رۆمانی نوێ"نووسانیش وەسف دەکەن‌و ناتوانن لەم کەوشەنە لێ‌دەرباز نەبووە دەربازبن. هێژامەندیی ئەوان لەمەدایە کە بە سەوداسەریی دروستکردنی کەسیەتی یا باشتر بێژین بەخەیاڵی سودگرتنەوە وەسفی کەسیەتی ناکەن.

وشە لە سروشتی خۆیدا پشت ئەستورە بە مەودا. بە دوایەکداهاتنی وشەکان جیاکاری لەگەڵ دنیای راستەقینەو ئاماژە پێکەرەکان دەخولقێنێ. کەوابوو بۆچی لە جێی تێگەیشتن لەم جیاکاریی‌یەو پەسندکردنی، خۆمان بە نۆژەنکردنەوە سەرگەرم بکەین؟ جیاکاری پەسندبکەین‌و مل بۆ یاسای زمان کەچ بکەین. سەفەر لە رۆمانی **گۆڕاندن** ی بوتور گواستنەوە لە شوێندا نیە.شەمەندەفەر مەودای شارێك لەگەڵ شارێکی دیکە ناپێوێ. ئەمە سەفەرێکە لە درێژایی رستەکان کە پێڕەوی هاوتەریبیی رێساگەلی زماناسانەیە. لەم رێچکەیەدا، بەریانە سۆزداری ـ دەرونی‌یەکانیش بۆ زمان دەگوێزرێنەوە. باشتر بڵێم، هەمو شتانێك دەبنە ملکەچی زمان، بەر لە هەر شتێك ملکەچی "ئازادیی ئیرەیی و روژێنی وشەکان." سیمۆن لە پێشگوتاری کورتی **جەبباری نابینا** (جەببار لە بەرانبەر ئەستێرەی ئۆریۆن) نووسیویەتی کە لە هەر دەقێکی ئەدەبیدا هەر وشەیەك "چوار رێیانی واتاکانە". ئەو لە دواندەریی ستۆکهۆڵم (بە بۆنەی وەرگرتنی خەڵاتی نوبێڵ) لە زاری رەخنەکاری فۆرمالیستی روس ڤیکتۆر شکلۆفسکی دەڵێ کە کاری نووسەر بەخشینی درك پێکردنێکی هەستەکیی تازەیە بە وشەکان. وشەی "سارد" بۆ نموونە، لە بەکاربردنی رۆژانەیدا درك پێکردنێکی هەستەکی لە ئێمەدا دەورژێنێ، یا هەواڵێك لەو دەدات بە دەستەوە. رۆماننووس، وەکو شاعیر ناچار دەبێ تا لەم وشەیە فامێکی هەستەکیی تازە بدا بە دەستەوە. ئەمجارە سەرمامان نابێ، لە سەرما تێدەگەین.

با بگەڕێینەوە بۆ پێناسەی récit: گێڕانەوە لە گێڕانەوەگەری. ئەمە پێناسەیەکیشە بۆ رۆمانی مودێرن. رۆلان بارت لە دەسپێکی کارەکەی نووسیبووی کە رۆمان ئیدی "بۆتە گرێ‌کوێرەیەك بۆ خۆی". لە رۆمانی تازەدا "خودئاگایی" بە بیچمی ئارەزوی چیرۆك گێڕەوەی پروست، واتە "نووسینی رۆمانێك لەبارەی رۆماننووسی" دەردەکەوێ. لێرەدا مەسەلەی سەرەکی وەها دێتەگۆڕێ، ئەگەر یا نەلواو بوونی نووسین. ئەگەری دەربڕین لە لایەن خوازەکانی دەربڕین دیاری دەکرێن‌و هەر بۆیە رۆڵ‌و دەوری کلیلی پەیدا دەکەن. ئەگەر بەردەوام لە ئەگەری



دەربڕین تێهزرین، خوازەکان وەکو ئامراز و بەشێوەیەکی پێکناکۆکئاسا چەشنی بەربەستێکی پتەو پێشمان پێ‌دەگرن. ئێمە لێیان سود وەردەگرین، وەلێ ناتوانین لە کۆتیان خۆ دەرباز بکەین. بەوانەوە واتاکان دەخولقێنین، بەڵام ئەوان هەزار واتای دیکە دەخولقێنن. کلۆدسیمۆن دەڵێ کە رۆمان بەردەوام لە وێنەوە دەست پێدەکا (نموونەکەی رۆمانی **سرودەکانی سەپانی ی** خۆی)، بەڵام بە میتافۆرەوە دەچێتە پێشێ.(١٣) خوازەکانی دەربڕین دەبنە هۆی ئەوە کە دەق بە چەشنێکی دانەدوو و لە چارەنەهاتو ببێ بە ئامرازی ئەفراندنی هەڵە. هەندێ‌جار دەق بە سەرنجدان لە رەچەڵەکناسیی وشەی text بە تەونی تێك تەنراو چوێنراوە. بەڵام هەموو دەقەکان لە پارچەی تەقەڵ وردو خۆش نەخش ناچن. دەقگەلێکیش هەن کە هاوشێوەی تۆپەڵەی لێك ئاڵاون.لە دنیای رازئاسای ئوستورەکاندا ئۆدیپ دەبایە سەرەداوەکانیانی پەیدا کردبا. لە دنیای بەدەر لە ئەفسانەکان، کاری ئێمە دەبێتە پەیدا کردنی پشێوییەکان. بەڵام نە ترس لەم هەزار قوژبنە و نە ترس لەم ئاژاوە و پشێویی‌یە کە "لۆژیکی بیچمە هەندسییەکان" پێك دێنێ. ئەم شتانە خۆیان دەگەنە جێ، چونکە بە گوتەی پیکاسۆ "هەر جۆرێکی دیکە کە بڕوانیت تازەیی‌یەکان لەدەست دەدەی". لە "رۆمانە نوێیەکان"دا شتان بە شێوەیەکی کوبیستی هەن، وەکو وەسفی گۆڕەپانی سێن مارکۆی و هەروەها لە رۆمانەکانی سیمۆندا. هەندێ جار شتان لە تازەیی نیگارکێشانی ئەبستراکت نزیکترن، وەکو وەسفی پوستێرێك لە **سیانی‌یەکان** ی سیمۆن، یا وەسفی چەند چرکەساتێك لە فیلمێکی سینەمایی لەم رۆمانەدا. ساروت سەردەمانێك دەیگوت کە لەبەر هۆگریی بە بێدەنگیی وشەکان،لەگەڵ سینەما کە لەودا وێنەکان دەدوێن نێوانی خۆش نیە.بەڵام تەنانەت ئەویش پەسندی دەکرد کە کارەکەی بەردەوام لە "وێنەگەلی خامۆش" دەستی پێکردوە.وەك بڵێی بۆ دروستکردنی"جیهانی دەق" رێگەیەك جگە لە نیشانە دیداری‌یەکان نیە و لێرەوەش وەکو قەڵەمڕەوی نەریتی فەلسەفیی ئەپستمۆلۆژی تێگەیشتن‌و دیتنیش دەبنە هاوشانی یەکدی.

هەر نیشانەیەکی دیداری هەواڵی شوێنێکمان دەداتێ."لە سەرەتاوە شوێن هەبوو"، کلۆد ئولیە لە **هاوینی هیندی** دا وەهای گوتوە. شوێن بەلای ئەوەوە ئاوەڵایی‌یە. بە جۆرێك کە هەرکەس بتوانێ رەهەندێکی تاکەکەسی لەودا بەدی بکات. بەڵام لە چاوی روبگری‌یەوە ئەم گەڕانەوە بۆ تاکایەتی، چەمکی نامرۆیی سنورداریێتی تێدەگا و گلی دەداتەوە. لە **هەزارقوژبن**

---

(13) Dallenbach, op, cit, p.168.

و **خانوی ژوانگە**، دوو ڕۆمانی ڕۆبگرییە، شوێن سەربەخۆ لە مرۆڤانو بەدەر لە راڤەو نیازی مرۆڤان بوونی هەیە. لە **سالّی رابردو لە مارینباد** هۆتێلی باروك تۆزقالێك یاریدەی ژنەکە ناکات تا شتێك لە رابردوی خۆی بێنێتەوەیاد. شوێن بەلای بوتورەوە زیندانە.هەلاّتن لە فەزا(خانو و شار)بنچینەی ڕۆمانەکانی ئەوە... لە L'emploi du temp (بەهەردووك واتای بارتەقای کات و کاربردەی کات) هەلاّتن لە شاری ئینگلیزیی بلستۆن، ئامانج و گەلاّڵەی بنیاتیيە. شەمەندەفەر لە ڕۆمانی **گۆڕاندن** ئامرازی هەلاّتنە. یەکێك لە یەکەمین کارەکانی بوتور(واتە) برەوداریی شوێن" وەسفێکە" لە شارەدوورەکان: ئێستانبولّ و سالونێك. ڕۆمانەکە زیاتر وەسفێکە لە شوێن بەو چەشنە کە هەیە: نەبزوت و بەدەر لە گۆڕانکاری، نەك بەو چەشنەی کە ڕۆماننوسان ڕۆژگارێك لە تاسەیدا دەسوتان: دەربڕینی هەڵکەوتی ڕۆح. گۆڕەپان لە **گۆڕەپانی کلۆدسیمۆن** دا تەنیا وێنەیەکە بێلایەن و کەمتەرخەم لە فەزا. مێژو بە یاریدەی فەزا نازانرێت. ئەگەر شتێك لە بەسەرهات یا مێژوش دەست بکەوێت داهێنەرانەیە. سیمۆن شار وەکو دەق نیگار دەکا: پێکهاتەیەکی تێکچڕژاو کە لە ئاماژەپێکەرەکان بیچمی گرتوە. ڕێگەکانی شارەکانی سیمۆن و بوتور ناگەنە هیچ جێیەك. گۆڕەپانەکان، ڕێگوزارەکان و باخەگشتییەکان لە شارگەلی کەونارای نێژراوی ژێرخاك دەچن. شوێنێکی گرنگ بۆ" ڕۆمانی نوێ"نووسان شارۆچکە کەناراوییەکانن: پلاژەکانی مەلە، بەتالّ لە مرۆڤان. لەم کەناراوانەدا هەمووشتێك لەئاستدایە. دەریا ئاستێکە کە تیشك تاو دەداتەوە و قوولاّیی نیە. هەموو شتێك لە هاوئاستیی ئاو و خاك یا دەریا و بەردەکەناراوییەکان دەدوێ. مەودایەك بوونی نیە. شوێن بە بەرینایی لە راستەڕێی ئاسۆدا هەم تازەیە و هەم کۆنە. خانوو لە " ڕۆمانە نوێیەکان" دا تاودانەوەی ژیانی مەعنەویی مرۆڤان نیە و سەربەخۆ لەوان بوونی هەیە. خانوو بەلای بالّزاك ( و تەنانەت پروست و جۆیس) تاودانەوە بوو. بەلاّم بەلای سیمۆن و ڕۆب گرییە تەنیا شوێنە. هەربەم سانایییە. شوناسی نیە و شوناس نابەخشێ. ئەمە ڕووی جیاکارییيە کە لەنێوان " ڕۆمانی نوێ" لەگەلّ ڕۆمانی مودێرن و هەروەها لەگەلّ سینەمای مودێرن. بەلاّم ئەم جیاکارییيە کەمتر لە هاوشێوەییەکانیان برەو و متمانەی هەیە و هاوشێوەیی لە تێپەڕین لەکات دەزانرێت، لە سەفەردا، نیگای موسافیری **گۆڕاندن** هیچ نیە مەگەر پەتی. جۆرە گەیشتنێکە بە خودی شتان، یا لانیکەم دەربڕینی تامەزرۆیی ئەم دەستراگەیشتنەیە. وەکو نیگای لئۆپۆلدبلۆم،کە بەوەوە سەفەری دەریایی ئۆلیس دەبێت بە پیاسەی بلۆم لە دابلین، رازی ڕۆمانی مودێرن گۆڕانی شوێنە. ئەو کەسەی کە ڕێدەکا پەیتاپەیتا بەرجەوەن دەگۆڕێت و



گۆشەکان گوهارتو دەکا. پەیتا پەیتا قاپوکەکانی سەرەمرەی بەرجەوەنی دیداری تێك دەشکێنێ. رەنگە بتوانین بێژین کە هەر ڕێگوزارێك بە واتایەکی سینەمایی وێنەکان مۆنتاژ دەکا. هەر شەقامگەڕێك، هەر ڕێبوارێکی پیادە، هەر دەرگیلێکی پیاسەکەر لە شاردا، ئاگا یا نائاگا، عەودالّی شتێکە و پیوار لە شوێن ئەزموون دەکا. شوێنی Aچرکەساتێکی دوای ئەوە ئیدی شوێن نیە، کاتێکی لە کیسچوو و ونبوویە. هەرکە کات لە دەست دەچێ، چونکە بەردەوامێتییەك لە کار دا نیە، هەموو شتێك پاتۆرپاتۆر بێ دەسپێك و بێ ئاکام ئاشکرا دەبێ، دەتوانی لە گوزارەیەکدا، کردەیەك وەسف بکەیت کە دەست پێدەکا و دەگاتە کۆتایی. بەلاّم لە جیهانی  دەقی ڕۆمانی نوێدا نە بەراییەك هەیە و نەکۆتاییەك. کرداری دروست بۆ دەربڕینی یادەوەری( و بۆ ڕۆمان) کردارێکی بێلایەنە. زمانی ڕۆمان واتاداری نیە. موسافیری" ڕۆمانی نوێ" لە شوێن و لە فەزای خەیالّی و تەنانەت لە هەرەتدا سەفەر ناکا، ئەو ڕێ دەکا، لە " جیهانی رەهای شتان".

## کوکتوی شاعیر

نیگارێك لە ژان مارە چاپ بووە کە بەهالاوێك لە پەژارە و ترس لە گۆڕی بەتاڵی هەڤاڵی دڵبەندی ژان کوکتو دەڕوانێ. چەند خولەك پاشتر تابوت لەوێ دەهاوێن. ژان‌مارە لە کۆتایی **بەسەرهاتی ژیانم** دا نووسیویەتی کە نەیدەویستو نەیدەتوانی بۆ پیاوێك کە ئەوەند خۆیشی دەویست بگری، چونکە لە وەسیەتنامەی ئۆرفە لەوی بیستبوو: "بۆ شاعیر کە ناگرین... ئەو تەنیا خۆی دەخاتە مردنەوە... ئەتوار لەخۆ دەنوێنێ".

بە شیعر ئەتوارنواندن و سەبارەت بە مەرگ ژیان خۆشویستن، جێماوەی سالآنی منالیی کوکتو بوون. ئەمانە"مەسەلە سەرەکییەکان"ی ئەو مانەوە، لە سالآنی نێوەڕاستی لاوێتی کە خۆی شایەتی جەنگی ١٤-١٩١٨ بوو تا یازدەی ئۆکتۆبەری **١٩٦٣**. سنوری مەرگو ژین، چوون بۆ جیهانی مردوانو لەوێوە گەڕانەوە، ئەگەر یا کەتواری ژیانی پاش مەرگ، عارێفانەترینو بێگومان شاعیرانەترین چەمکێك بوو کە ئەو لە بەرهەمەکانیدا شوێن پێی هەڵدەگرتەوە. ئەمانە هەمان نەزیلە ئێجگار کۆنەکانی مرۆڤن، لە گلگامێش، **پەرتوکی مردوان** ی میسرییەکانو هەڵبەت ئوستورەی ئۆرفئۆس. بە مەبەستی ژیان، بە گرێدانی شیعر و مەرگ، شیعری دەگوت.ئەو شانۆنامە، رۆمانو رەخنەگەلی هونەریی نووسی، فیلمی سازکرد، بالەی بەرهەڤ کرد، بەڵام بەردەوامو لە هەمو حاڵێکدا شاعیر مایەوە. جارێکیان لە گفتوگۆ لەگەڵ ئاندرە فرێنۆ ڕای گەیاند: "بە لای خۆمەوە لێبڕاوە. کاری شیعریی خۆمم لە (فیلمی*) خوێنی شاعیرێك درێژەداوە"و لە پەراوێزی لاپەڕەی کۆتایی دوایین دەفتەری شیعری (بە ناوی) **ئاوازی ماتەم** نووسی: "لە هەر ساتێکدا شیعر رەخساندن، کاری من نەبوو، کاری مەرگ بوو". زۆرجاران گوتبووی شاعیرێتی وەکو رەوشت دەزانێ، شتێك کە هەمیشە و لە هەموو جێیەك ئامادەیە، بەڵام خۆی دەشارێتەوە. لە بەرهەمەکانیدا هیچ رۆشن نیە کە تا چەند رەوشت، هونەر، چاکەو جوانی لە جێی یەکدی بەکار هاتون. هەر چەند ئەم رازە بۆتە بابەتی دەیان وتارنامەی زانکۆیی، وتار و پەرتوك، بەڵام هیچکام نیشان نادەن کە کوکتو، سەرەنجام هێڵی سنوریی

* تێبینی لە نووسەرە.



لە کوێدا دەکێشایەوە. کوکتوی پیر لە "دواندەریی ئاکسفۆرد" تێکۆشا تا کەوشەنی نێوان زمانو شیعر بکێشێتەوە و وەکو هەر کەسێکی دیکە کە ئەمە بکاتە ئامانج هەرەسی هێنا، بەڵام زەنای هەرەسی ئەویش بیستەنی‌یە: "شاعیرێتی تەنیاییەکی ترسناکە، جۆرە نەخۆشییەکی گیانە. شیعر یەکسەر بە پێچەوانەی ئەو شتانەیە کە خەڵکی پێیان وایە شاعیرانەیە، لە چەکێکی وەشێراو و ترسناك دەچێ، جاروبار لە مەودایەکی دوورەوە ئامانجی خۆی دەپێکێ".

لە ئورفە، داوەرانی جیهانەکەی دی کە لە شیعر و شاعیرێتی بێ‌ئاگان لە ئورفە دەپرسن کە شاعیر کێیە و وڵام دەدرێنەوە: "جۆرە نووسەرێك، نووسەرێك کە شتێك نانوسێ". شت نووسین ئەگەر پێڕەوی لە لۆژیکێکی بەڵگەهێنەرانە بێت، کاری شاعیر نیە. کوکتو لە زاری شیعرەوە دەڵێ: "من ئەو درۆیەم کە بەردەوام راستی دەڵێ". ئەم قسەیەی ئەو رەنگە لە بەرئەوەی کە نیچەییترین قسەی ئەو و نیچەییترین پێناسەیەك کە لە شیعر خستویەتیە گۆڕێ، وەدڵ بنیشێ. بە پێی ئەم "پووچەڵنوێن"ە، میتافۆرەکان هەڵبەت ڕاست نالێن، بەڵام بە هەرحاڵ خوازەگەلی شاعیرانەن و دەچنە نێو نێواخنی هەقیقەتەوە.

شاعیربوونی کوکتو کتومت لەوێدا کە دەبێ، دەردەکەوت: "بە جۆرێکی دی دنیا دیتن". ئەم دیتەیە روانینێکی توخسانە و گەمژانە، تاودانەوەی سوحبەتچیەتیی لە کۆتانەهاتوی مۆسیقای فەرەنسی یە. کوکتو بەم چەکی مەودای خشتەبەر لەگەڵ کەتوار، توانی دژوارترین مەسەلە فەلسەفییەکانی مرۆڤی رۆژگاری خۆی لە هەر بەرهەمێکی هونەریدا بکاتە شیعر. رۆمان، شانۆ، بالە و فیلمی سازکرد تا شیعر بڵێتو نیشان بدا کە رەخساندن، یا بە گوتەی یونانییەکان Poesis، شیعرە. تەنیا لەو رێگەوە دەتوانی بزانیت کە بۆچی بەلای یونانییەکانەوە لە تراژێدیدا رێگەی هەڵاتن نەدەمایەوە. رێگە دادەخرا، نەك لە بەر ئەوەی کە پارادۆکسی خوایانو یاسای زەمینی شێلگیر بوو، بەڵکو بۆ ئەوەی کە مەرگ دەیتوانی کۆتایی بە هەموو شتێك بێنێو تیتاڵی بە گەڕانەوەی کۆتایی دەکرد. هۆی هۆگریی کوکتو بە ئوستورە یونانییەکان، بە تایبەت ئۆدیپۆسو ئۆرفئۆس، باڵادەستیی نەسازەکان بوو.یەکەمیان، یاساگەلی سپیتای لەم ژیانە بچوکە زەمینیەی خۆی پێشێل دەکرد و لە وڵامی هەر نارِازییەك وڵامی دەدایەوە کە بێجگە لەوە

ڕێگەیەکی دیکەی نیە، چونکە قسمەتو چارەنووس وەهایەو دوەمیان گەڕانەوە بۆ ژیان لە گرەوی ئەڤین دادەنێ، ئەڤینێك کە پەیوەست بوو بە ژیانەوە.

نیگای ڕکێش کراوی کوکتو بۆ خواوەندی شیعری یونانیان بە بارتەقای نیگای پەسنکەری منالێك بۆ دایکی نەزیلە بێژی بەر لە خەوتن بوو. منالان نەزیلە تا کۆتایی لە هالاویك لە باوەڕ و ناباوەڕی دەبیسنو زۆرجاران کۆتایی و خەوتن پێکەوە دەبەسنەوە.کوکتو لە هیچ جێیەك لە( فیلمی) **دیۆ و دڵبەردا** ئەم شاعیرێتیی منالی ڕۆشن نەکردەوە. خۆی بە هێماکردن بەم فیلمە دەیگوت: "ئەڤین بە نەزیلەکانی پەرییەکان بەبێ پەرییەکانە". یەك جار لەمەڕ کیژۆڵەیەك بە ناوی مینو درۆئە کە بە شێوەی کۆن شیعرگەلێکی بە لاساییکردنەوە لە فرانسوا مالرب دەگوتو حەوتونامەکان ئەویان دۆزیبوویەوە و بەناوبانگیان کردبوو، گوتی: "هەموو منالان شاعیرن بێجگە مینۆدرۆئە". هەموو منالان شاعیرنو ناتوانی شیعرێك بۆ منالان بێژیت کە شیعر نەبێو ئەوان قبوولی بکەن. نەزیلەی منالان بە شێوەیەك لە شێوەکان وەبیرخەری مێتۆدی ڕۆمانتیکخوازانی ئالمانییە و بە شیعر و ئوستورەوە گرێ دەدرێ. ڕازی ئەم هاوبەستەییوگرێدانە، خولیاو مۆتەکەیە (**منالانی تۆقێنەر** دەتوانی بە شتێك بیجگە لە مۆتە کە بزانیت؟). وەلێ کوکتو کلیلی خولیای لەوەیدا کە سوریالیستەکان بە ڕێخۆشکەر دەزانی، بەدی نەدەکرد. کاری بەسەر خالی تێك کردنەوەی ڕەگەزداریو سیمبۆلسازی نەبوو. گوێی بە سیمبۆلسازیی فرۆیدی نەدەدا. ڕەنگە لە بەر ئەمە، لە مێژوی ئەدەبیات (ئەو پەرتوکانەی کە لێیان بێزار بوو) ئەمڕۆ ئەو هاوپێناو لەگەڵ ژول سوپرویلو مارکس ژاکۆب"لە پەراوێزی سوریالیستەکان" بنەجێ دەکەن. چ پێناسەیەك لەمە باشتر؟ چ شتێك باشتر لە پەراوێزمانەوە؟ وەك بلێی دێڕە شیعرێك، لە پەراوێزی دەقێکی زانایانە یاداشت بکرێ، یا بیرەوەرییەکی سپیتا لە دەقی ژیانی ڕۆژانە.

ئەگەر کوکتو توانی سیمبۆلسازیی فرۆیدی پشتگۆی بخات و نەهێڵی کە خولیا بۆ دۆزینەوەی ڕەمز دابەزێو نەهێڵی کە خەو لە ئوستورەکان دوور بکەوێتەوە، لە بەر ئەمە بوو کە توانی بە یاریدەی ئوستورەگەلی یونانی کەونارا و یەك یا دوو کەسیەتی و سەرنموونە، خولیا بە خەیاڵ، ئارەزو، تامەزرۆییو لە یەك ئاخاوتەدا بە ئۆمێدی گەڕانەوە گرێ بدات. گەڕانەوە هەوێنی سەرەکیی بەرهەمەکانی ئەوە، گرنگترین وانە کە لە زمانی نیچە لە قوتابخانەو ڕێبازی فەیلەسوفان فێربوو. فیلمنامەیەکی جوانی لەبارەوە نووسیو



بە ناوی **گەڕانەوەی هەرمان** و لە هەر بەرهەمێکیدا بە جەختەوە لە نەزیلەی گەڕانەوە دوا. بۆ نموونە، لە گرنگترین کاری سینەمایی خۆیدا ئورفە سەفەرێکی هەبوو بۆ جیهانی مردوان و لەوە گرنگتر گەڕانەوە بۆ ژیان. لە تێکڕای بەرهەمەکانیدا ئەم نموونەیەی گرتە بەر: گەڕانەوە وەکو ویستی گەیشتن بە نەناسراو، بە شتێکی ئەزموون نەکراو، فام نەکراو، ڕاڤە نەکراو. ڕۆمانی **تۆماسی خشتەبەر** ئەم شتە وەپشتسەرنراو و ئەزمون نەکراوە، بە تامەزرۆییەوە بە گەڕانەوە بۆی نیشان دەدا. هەر بەرهەمێکی کوکتو وەبیرخەری خەفەتباریی چێخوف ئاسای ئەڤینێکە کە هەرگیز نەهاتە دەربڕین و سالانێك دواتر ڕازی سەربەمۆریی دۆزرایەوە: هیوا بە گەڕانەوە، نائۆمێدی، زۆرەملێی مانەوە لە هەلکەوتی هەنوکەییو خەفەتباری تایبەتمەندیی بەرهەمەکانی ئەون کە بۆ هەموو یەك ڕێگە چارەی شك دەبرد: گریمانی مردنو هەمدیس زیندو بوونەوە. شیعرەکانی ئەو، ئەو وشە جادوییانەی کە لە سەر پەڕاوەکان چاپ دەکرانو ئەمڕۆش لە قالبی پەرتوکگەلی بچووك هەروا زیندون، لە بیرەوەرییەکانی کەسێك دەڵێن کە لە پاش یەکەمین جەنگی جیهانی لێی تێدەهزری و لە ئاقاری ترسهێنەری شتێك وەچنگی نەکەوتو پاشان دنیا و ژیانی ئەزموون کرد و دیتی کە ناکرێ ئەمانەت خۆش بوێ، یا تەنانەت سەریان بۆ نەوی بکەیتو پاشان پیر ببیو ببینی کە ئێستا دەکرێ شتێك بێژیت، هەواڵێك بدەیت، هیوات بە گەڕانەوە هەبێو بە نێو ئاوێنەیەکدا تێپەڕیتو ڕێ بۆ جیهانی مردوان خۆش بکەیت.

کوکتو هەرگیز لە ئارەزوی دووپات کردنەوە نەبوو، چاوەڕێی هەلێك نەبوو کە "ئەمجارە بکرێ ئەزموون بکەیت". پێشتر شتێك ڕووی نەدابوو کە دووپات بکرێتەوە. ئەوەی ئەمڕۆ ڕوودەدا تامەزرۆیی بە ڕوودانی شتێکە کە جارێکیان دەرفەتی بۆ ڕەخسا و لەبارچوو. هەرجۆرە گەڕانەوەو هەر چەشنە تامەزرۆییەك، هاوپێناو لەگەڵ ئەم چەمکی لەبارچوونە. دوایین وشەی ڕۆمانی **منالانی تۆقێنەر** ئەمەیە: "کە ڕەویوەتەوە". کاری کوکتو لە نووسەرێك دەچێ کە کەمتر لێی دەدوا، مارسێل پروست، دەیهەویست لە ڕێگەی نووسینەوە، ئەوەی کە بەڕاستی ڕووی نەداوە سازبکا، بەلام واخۆبنوێنێ کە خەریکە شتێك کە ڕووی داوە وەیاد دێنێتەوە. ئەرکی یادەوەریی کوکتو و پروست بەر لەوە وەیادهێنانەوە بێت، ڕەخساندنە. گێڕانەوەیەکی تازە لە ڕابردو، واتە ڕابردو بەو جۆرەی کە ڕووی نەداوە باسکردن. کاتی ونبوو و لە دەستچوو، تەمەنی بە سەر چوو، ئەزموونگەلی ئەنجام نەدراو تێکڕا کاروبارێکن بۆ هەمیشە درك نەکراو. مەرگیان بە ئەزموونێکی

ئەمرۆیی قەرەبوو دەکەینەوە. بە نووسین، رەخساندن. بەمجۆرە بۆ جیهانی زیندوان دەگەڕێتەوە.

ئۆرفە ناوی شاعیرێکی فەرەنسی‌یە کە هەمان ئۆرفئۆسی یونانی‌یە، بە یاریدەی لۆژیکی شیعر(ئەوەی کە کوکتو "نەسازە نوێنیی شیعر"ی پێدەوت) واتە بە یاریدەی ئێرتیبز، فریشتەی رێنوێن، بە نیشتمانی مەرگو پێگەی دڵبەری هەرمان دەگات. لە پێشکەش کردنو نواندنی شانۆی ئۆرفە لە ١٩٢٧ کوکتو خۆی دەوری فریشتەی رێنوێن، (واتە) ئێرتیبێزی گێڕابوو و ئەو سەردەمەش تازە چوارساڵ لە مەرگی ئازیزترین هەڤاڵی، رادیگە تێدەپەڕی. شاعیر تەنیا ئۆرفە نیە، رێنوێنیشە. شیعر وەکو شەماڵێکە کە لەنێوان مەرگ و ژیاندا دەشنێ. ناکرێ بە لۆژیکی ژیان واتایەك کە شیعر بۆ مەرگ هەیەتی، تێبگەی. هەندە دەتوانی بزانی کە هەر شیعرێك هەواڵێك لە مەرگ دێنێ، رەنگە لە بەر ئەمە کە مردوانیش بە شیعر لە ژیانیش هەواڵ دەبیسن. ئاوێنە کە تا ئەم ئاستە لە فیلم و لە شیعرەکانی کوکتو گرنگ دەبێت، تاودەرەوە نیە. لە دوو دنیا دەدوێ، بێ ئەوەی کە هەمدیسنوێنیو تاودانەوە بێت. هەر بەو جۆرەی کە دەمامکەکانیش لە دوو دنیا، لە مەرگو ژیان، دەدوێنو هەواڵ دەدەن. یەکەمین جار کە فریشتەی رێنوێن، لە جیهانی شاعیرانەی کوکتو دەردەکەوێ، لە شیعرێکدایە لە کۆمەڵەی ئۆپێرا (هەمدیس لە ساڵی ١٩٢٧)، ئەم شیعرە بە ناوی "چڕپاوی خۆی"، جۆرێك خۆ دواندنی شاعیرانەیە، کە لەودا فریشتەیەك هەواڵ لە جیهانی دیکەوە دێنێ.

لە ساڵانی پاش جەنگی دووەمی جیهانی، ئەم تامەزرۆیی‌یە بە روبەڕووبوونەوەی لەگەڵ مەرگو ئەم پێداویستییە بە ئێرتبیز، فریشتەی رێنوێن یا فریشتەی مەرگ، بە هێزتر بوو. لاوێتی نەیدەهێشت کە شاعیر قووڵایی بەلای مەرگی بە کۆمەڵو جەنگ بناسێت. لە پاش مەرگی رادیگە ئیمانی بە گەڕانەوە هێنا، بەڵام لە بە ساڵاچووندا باشتر دەیتوانی مەرگ وەك خۆی هەست بکات. ئۆرفە، هەواڵێکە لەم بەخەبەری‌یە، تا ئەو جێیەی کە بکرێ لێی بدوێی.

## تەنیایی بێرگمان

دەتوانین بڕیاری مۆریس بلانشۆ لەبارەی ئەدەبیات بۆ بیچمگەلی دیکەی دەربڕینی هونەریش بەرین بکەینەوە: "خۆ وێدەچێ ئەدەبیات بە شێوەیەکی بنچینەیی (بەڵام نەك بە جۆرێکی قۆرخکراو و نەك بە ئاشکرا) وزەی نارەزایەتی دەربڕین بێت: دەنگ هەڵبڕینی ناڕازییانە لە بەرانبەر هێزە پتەو و قایمەکان، نارەزایەتی لەوەی کە هەیەو لە کەتواری هەبوون، نارەزایەتی بە زمانو بیچمەکانی زمانی ئەدەبیو سەرەنجام نارەزایەتیو دەنگ هەڵبڕین لە خۆی کاتێك لە پلەو پایەی هێزێکدا دەردەکەوێ".[1] لەگەڵ خۆجەنگانی هونەر رەنگە گرنگترین و لە یادچووترین خاڵەکان لە بانهەڵکشانی ئەفراندنی هونەری بێت. بەردەوام لە جەرگەی بەربەرەکانێی هونەرمەند لەگەڵ بیچمگەلی قاڵبیی دەربڕینی هونەریو لەگەڵ رەمزگەلی زاڵ لە ڕێبازە باوە هونەرییەکان و لە شێوازی ناودەرکرد و بە "ناسیاوی سڕینەوە" کورتی دەکەنەوە. بەڵام ئەمانە بەس نین تا ململانێیەك کە لە جەرگەی بەرهەمی هونەریی نێوان پێناسە پەسندکراوەکان لە هەقیقەت و پاڵنەری دروستکردنی پێناسەیەکی تازە هەڵدەگیرسێو تەشەنە دەکا، بناسین. باسەکە لە خەباتی بەرهەمی هونەری لە بەرانبەر هونەر قەتیس نابێتەوە، ئاخێو لە بەربەرەکانێی بەرهەمی هونەری لەگەڵ خۆیەتی. هەوڵدانی هونەرمەند بۆ شکاندنی بیچمگەلی سواوی دەربڕینو وێنەگەلی قاڵبی لە هەقیقەت کە چەشنی هەرامەیەکی سپیتا دەپەرسترێن، چەندان لەگەڵ نیاز، نەخشە، ویست و ئاگایی ئەو پێوەندیی نیە. ئەمە تێکۆشان یا ئەزموونێکە کە ناخودئاگایانە بە زەبری پێویستیی بەرهەم بە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ خۆی لە پلەوپایەی هێزێك و لە بەر سەمەدی پڕهەژیانی دەربڕین لە تێپەڕین لە سنورەکانو قەدەغەکراوەکان و ئارەزو و بیانگەگرتنی خەیاڵ لە سەرترچوونەکانی پەیتاپەیتا لە قەڵەمڕەوی بووندارانەی خۆی، بیچم دەگرێ.

یەکێك لە گرنگترین لایەنەکانی پێویستی و سەمەدی دیهاوێژی لە کاری سینەماکار، هەڵاتن لە چوارچێوە و پەرژینێکە کە "دانەر"ێك لەو دروست دەکا. شتێك پڕ ژانتر لەوە نیە کە سینەماکار تێبگا ڕاڤە یا فەرمانێك ئەو لە زیندانی پەستاوتوی بەرهەمەکانی رابردویو لە خەیاڵکردی بوونی "جیهانێکی نێواخنی و زەینی" دەورە داوە. هونەرمەند بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێ کە تێبکۆشێ تا لە هەرچی پێشتر ئافراندویەتی بانتر بچێو ئاسۆگەلی تازە بدۆزێتەوە. چوارچێوەی راڤەگەلی ڕێسابەندی کراوی وەکو "سینەماکاری دانەر" لەسەر بنەمای

(1) M.Blanchot, LAmite, Paris, 1971, P.80.



یەك ئاسۆی بەرتەسكو داخراو لەگەڵ هەژیانی ئازادیخوازانەی هونەری ناسازێ. لە دیدی زۆرێك لە رەخنەکاران، سینەماکاری دانەر یەکسانە بە ئینگمار بێرگمان. ئەمڕۆ کەمتر نووسەرێکی سینەمایی یا رەخنەکارێك لە دروستیی ئەم هاوسانی‌یە دڕدۆنگی دەکا. سینەماکاری سویدی چەندین دەیەیە کە باشقەی "دانەری فیلم" بووەو وەهاش ماوەتەوە، چ ئەوەی ساڵێك دوو فیلمی دروست کردبێ، یا یەك دەیە خامۆش مابێتەوە، یاخۆ دوایین کاری لە چاوی رەخنەکارانەوە شاکارێکی حاشاهەڵنەگر بوو بێ یان نا. بێرگمان نموونەی تەواوی هونەرمەندێکی سەرکەوتو زانراوە کە دنیای تێکچڕژاوی زەینیی لە جەرگەی میتۆدێکی دەربڕینی کەسی، تایبەتو ئێجگار بەهێز خستۆتە ڕوو. پەیداکردنی مۆری ئەم مێتۆدی دەربڕین و نیشانەکانی ئەوجیهانە لە بەرهەمەکانی گەورەترین سینەماگەران کە لەپاش ئەو کاریان کرد(ئاندری تارکۆفسکی، کریستۆف کیشلۆفسکیو...) بەردەوام رەخنەکارانی کەیفخۆش و رازی کردوە. پەسنکەرانی بێرگمان دووپات دەکەنەوە کە ئەم میراتگری رۆنانی پێکناکۆکنوێنی پیڕەوادیتن و دەمارگرژیی پرۆتستانی و گوتەبێژی ماندونەناسی سەهۆڵ بەستنی ژیانی بێخوا، بێتوانایی مرۆڤی مودێرن لە دەستڕاگەیشتن بە مەعنەوییەت، خامۆشیی ترسهێنەری خوا، دڵەڕاوکێ میتافیزیکییەکان، نەلواوبوونی پێوەندی مرۆیی، لە "تێکڕای بەرهەمەکانی" راگەیاندراوانی میتافیزیکیو رەوشتی دەرکردوە و بەردەوام فیلم بە فیلم چۆتە پێشێ و مێتۆدی دەربڕینی خۆی لە هەسان داوە. ئەم رۆخسارگەری‌یە لە بێرگمانی دانەر وەها کامڵ دەبێ کە سینەماگەر لە ئامانجی کارێکدا سەرکەوتوە کە هونەرەکانی دیکە لە بەر هۆی سنوردارییە پێکهاتەییو ئامرازییەکانی خۆی توانای ئەنجامدانی ئەوەیان نەبووە و لە بەرەنجامدا بە سینەمای مودێرن بە وەها کارامەییو هێزێکەوە برەوداریی بەخشیوە کە هەر تازەگەری و رەمزشکێنییەکی مامۆستایانی سینەمای کلاسیك دەباتە ژێر پرسیار.

بە سەرنجدان لە هاوچڕیی‌یەکی رەخنەگرانە کە نیوسەدەی خایاندوە، دەبێ بپرسی کە ئایا لە بەرانبەر وێنەیەك کە لە بێرگمانی دانەر نیگار کراوە بلیمەتیی هونەریی ئەو کە بەردەوام بە شێوەیەکی ماندونەناسانە نوێخواز و تازەخواز بووە کەم رەنگو ڕەویو نەبۆتەوە؟ بۆچی بێهیچ دڕدۆنگییەك ئەویان بە دانەر زانیوە و لە سەکۆی هەڵبەت پایەبڵیندی بەڵام بە ڕاستی بێکەڵکی هونەرمەندێکی پێناسەکراو و ناسراو ریزبەند کردوە؟ بۆچی پێیان وایە کە ئەو لەو داهێنەرانەیە کە یەكجار و بۆ هەمیشە بەرهەمی جیهانی نێوەکی و ڕێبازی هەساندراو دەدۆزنەوە و ئیدی کارێکیان نیە جگە لە بەخشینی فراژووبوون پێی؟ بۆچی بەردەوام گریمان دەکەن کە بێرگمان

قسانێك دەبێژێو ناتوانن تێبگەن کە زمان لە رێگەی بەرهەمەکانی بێرگمانەوە دێتە قسە؟ بۆچی خودئاگایی لە پێگەیەکی سەرتر لە وزە و پاڵنەری خودئاگا ریزبەند دەکەن؟ هەڵبەت ڕاڤەگەلی جیاوازی زۆر و زەوەند لە هەر بەرهەم یا لە کۆمەڵەی کارەکانی بێرگمان خراوەتە ڕوو و تێکۆشاون تا ئەو لەگۆشەی جیاوازەوە نیگار بکەن. بەڵام تێکڕای ئەو وێنانە لە سەر بنەمای باوەڕی نارەخنەگرانە بە بەردەوامێتی و فراژووبوون کاری سینەماکارێکی دانەر دروستکراون. وەك بڵێی سەیری بەرجەوەنێکی تاقانەیان لە گۆشەگەلی جیاوازەوە کردبێ. نموونەکە لە نرخاندنی دوو سینەماکاری گەورە دەهێنمەوە کە ئەوانیش لە گێچەڵی پێناسەگەلی لە قاڵبدراو لە سینەماگەری دانەر پشکیان بەرکەوتوە و تازەگەرییەکانیان بەردەوام لە بەر چاو ونبووە. فدریکۆ فلینی لەمەڕ بێرگمانەوە گوتبووی: "بێرگمان لە هونەرمەندێکی چەرچی لە سەدەکانی ناڤین دەچێ کە دەتوانێ لە نێوەڕاستی ژوورەکە دابنیشێ و بەرامبەران (بیسەر ـ خوێنەر) لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە و هەموان بە نەزیلە بێژییەکان، گۆرانی چڕینەکان، گیتار ژەنینەکانو شیعر هۆنینەوەکانو تەڕدەستیەکانی ئەفسون بکا. ئەو شەڕاشۆیە و جادوت دەکا. تەنانەت ئەگەر لەگەڵ تێکڕای ئەو شتانەی کە دەیڵێ کۆك نەبیت، هەمدیس شەیدای شێوەکەی لە گوتنو نیگای پڕشۆر و هەژیانی ئەو بە دنیا دەبی. ئەو یەکێك لە کامڵترین سینەماکارانێکە کە من لە ژیانمدا دیتومە" ژان لۆك گێداریش لەمەڕ بێرگمانەوە گوتویەتی: "(سینەما)* هونەر و چالاکییەکی بەکۆمەڵە. مرۆڤ بەردەوام لە بەرانبەر دیمەنو یا لە بەرانبەر لاپەڕەی پەڕاوگی نەنووسراوە تەنیایە. بۆ بێرگمان ئەم تەنیاییە مەرجی سەرەکییە و تەنیابوون بە واتای گەلاڵەی پرسیاران و دروستکردنی فیلم بە واتای وڵامدانەوە بەو پرسیارانەیە. نالوێ کە بتوانی لەمە زیاتر بە واتای نەریتی وشە رۆمانتیك بێت".(٢) چ بێرگمان فرەزانی شۆخو شەنگی سەدە دوورەکان بزانین یا هونەرمەندێکی رۆمانتیك (هەڵبەت لەنێوان ئەم دوو پێناسەیە مەودایەکی قووڵ لە دوو گۆشە نیگای تەواو جیاواز ئاگادارمان دەکاتەوە) هەمدیس لە یەك دانەر دەدوێین، کەسێك کە لە سەری کۆڵەکەی گێڕانەوەیەکی باڵادەستیگەرا بە ژین و بەرهەمەکانی خۆی پێك بەسترانەوە و واتای بەخشیوە. لە هەردووك خاڵەکەدا ئەم پێشگریمانە کۆڵەکەی تێگەیشتنە کە بێرگمان لە بەرهەمەکانی خۆیدا رێچکەیەکی فراژووبوونی بڕیوە و پێشکەوتنی (واتە ویستی دەستڕاگەیشتن

* تێبینی لە نووسەرە. (و)

(2) P.Cowie, Swedish cinema, London, 1966, P.92.



بە ترۆپکی پێگەیشتن، بە ئاوەزی پەتیی عەقڵ باوەڕان) هەبووە. رەخنەگرانیش کاتێك کە لە نووسینو دانانی بەرهەمەکانی بێرگمان دەدوێن ئەو لە چوارچێوەی پێناسەیەکی بنەتایی ریزبەند دەکەن و لە راستیدا رێگەی گەڕانەوە، هەڵسەنگاندنە پەیتاپەیتا و ئەگەری ئەزموونگەلی تازە لەو دەستێنن. ئەم دۆش دامانە لە تازەگەری بە نرخی رەخساندنی وێنایەك دەلوێ کە بە گوێرەی ئەوە بێرگمان نیگایەکی تاڵ، نائۆمێدانە و رەخنەکارانەی بۆ دنیا هەیە و لە پلەوپایەی پەیامنێر (پلەو پایەیەك کە بە هونەرمەندی مودێڕن پێشکەش ناکرێ) جیهانی بە وردی ناسیوە و ناساندویەتی. وەك بڵێی هێژامەندیی هونەرمەند ئەم ناسینەیە. وەها وێنەیەك لە هونەرمەند ئەو بۆ پەیامنێری رووداوێکی کۆتاییهاتو دادەبەزێنێو شادی و سەرکێشیی بلیمەت ئاسا ئافرێنەری لەو درێخ دەکا. هونەر ئەگەر دروستکردنی ئازادانەی دنیایەکی تازە نەبێ کەوابوو چیە؟

ئایا دەتوانی پەسند بکەیت کە متمانە و برەوداریی بێرگمان لە هەمان سیفەت و وەسفکراوی "سینەماگەری دانەر" دەبڕێتەوە؟ ئایا شیاوە کە ئەم سیفەتە وەها بێخەیاڵو ئاسودە، بەدەر لە کەڵکەڵەی رەخنەکارانە بە کاربەرین؟ ئایا بە وەگەڕخستنی سیلەنیگایەك کە خاڵگەلی نایەکانگیر بە یەکسان دەناسێنێ ئەگەری هەنگاونان لە سەرزەمینی تازەیی‌یەکان لە خۆمان بستێنینەوە؟ ئایا بەسە کە هێڵێکی سوور پەیدابکەین کە بە پێی گریمان لە تێکڕای بەرهەمەکانی بێرگماندا بوونی هەیە؟ ئایا هەر ئەوەی کە لە دورگەیەکی تەریك کەوتو و بەتاڵ، مرۆڤانێکی داماو و سەرقاڵ بە وارسکەگەلی سەرکوت کراو پەیدا بکەینەوە، ئەو کەسیەتییە ناتەواوانەی کە لە بیرەوەرییەکانی خۆیان دەدوێن، ئەڤینداری دەکەن، ڕقو کینە نیشان دەدەن، دەست بۆ توندوتیژی دەبەن، لە مافەکانی خۆیانو لە تەنیایی خۆیان داکۆکی دەکەنو جاروبار بە شێوەیەکی منالانە ئارەزوی پێوەندی گرتنیان هەیە، ئارەزوی ورتەورتی میهرەبانی، دەستێکی بەزەیی و هاودڵی کە لە ژانە جەستەییو مەعنەوییەکان کەم بکاتەوە، ئایا هەر ئەمە کە نیوەشەوان دەنگی هۆڕنەی کەشتییەك لە دەریایەکی دوور دەبیسینو ئەلەندان لەگەڵ زیقەی مەلانی دەریایی بێدار دەبینەوە، هەر ئەمە کە ئەو دیمەنە نزیکە جاودییو خۆرە زەردەی بێگیانی باکووری ببینینو وشەگەلی هۆش رفێنێ سویدی بەرگوێمان بکەون جاروبار ئاوازێکی ناتەواو لە باخ یا مۆتزارت ببیسین، بەسە تا ڕابگەیەنین کە لەگەڵ سینەماگەرێکی دانەر سەروکارمان هەیە؟ ئایا دەتوانی چاو لەو هەموو تازەگەری و تازەییانەی دەربڕین لە **پێرسۆنا** بنووقێنی کە هیچ هاوشێوەیی‌یەك لە کارەکانی پێشوی بێرگمان نیە، یەك جار و نەك زیاتر ئەزموون کراونو ئیدی لە بەرهەمەکانیدا دووپات نەکراونەتەوە.

هەڵبەت لە بەرانبەر ئەو کەڵکەڵەی تازەگەری، تامەزرۆیی بناخەڕێژی شێوازی تاکەکەسیش بوونی هەیە. بێرگمان وەك زۆرێك لە سینەماگەرانی گەورە بەردەوام عەوداڵی پەیدا کردنی شێوەی دەربڕینی تایبەت بە خۆی بووەو ئەزموونگەلێکیشی لە فیلمەکانی خۆیدا دووپات کردۆتەوە. ئەمەیان یەکێك لە هۆیەکانی سەرهەڵدانی بەدحاڵیبوونێکە کە وردبوونەوە لە گشت بەرهەمەکانی ئەو لە پێگەیەکی سەرتر لەسەرنجدان لە فیلمەکانی نیشان دەدا. جیا لەوە، بێرگمان لە زۆربەی کارەکانیدا چەندلایەنێك لە ژیاننامەی خۆنووس دێنێتە گۆڕێ. ئەو لە گرنگترین فیلمەکانیدا خۆی وەکو ناسکارێکی نیوەندی هێناویەتە پێشێ‌و پەیامنێری ماندونەناسی ئەزموونەکان‌و ژیانی خۆی بووە. وا دێتە بەرچاو کە لە پێوەندییەکی دژواری ئەڤیندارانە کە لە هاوینێك لەگەڵ مونیکا بیچمی گرت تا توندوتیژیی حەپەسێنەری شەرم، لە زەوقی لەدایکبوونی بوونەوەرێکی تازە لە (بەرهەمی) لە سەروبەندی ژیاندا تا ترسی مامۆستای بە سالآچوو لە مەرگ لە **تووەفەرەنگییە کێویلەکان** لە پەیکەری دارینی مۆرانە لێدراوی **بەرکەوت** تا پێوەندییە قەدەغەکانی(:) **وەکو ئاوێنەیەك، هاوارەکان و ورتەورتەکان‌و بێدەنگی**، لە هیوابڕاویی قەشەی ئیمان دۆڕاوی **تیشکی زستانی** تا مۆتەکەی **کاتژمێری بوولێڵە** ئەم پیاوە بە راستگۆیی‌و ئاگایی لە پەرۆشییە هەمیشەییەکانی خۆی دواوە. وەك بڵێی دەکرێ پەرۆشییەکان بناسیتەوە و پاشان بە راستگۆیی‌و ئاگاییەوە سوراخیان بگریت. کارێکی ئاسانە کە لە **فانی‌و ئەلکساندێر** دا پەیجۆری بێرگمانی دانەر بکەین. بەڵام لەم ڕێگاوە بە کوێ دەگەین؟ جگە بە گێڕانەوەیەکی باڵادەست‌و لە گۆڕاننەهاتو لە ژیانێك، کە ڕێ لە گێڕانەوەکانی دیکە و لەم روەوە پرسیارانی ناکۆتا دەگرێ؟ چ کەڵکی هەیە کە سەیرانی دلخۆشانەی چنینەوەی تووەفەرەنگییەکان لە **بەرەو شادمانی**، بە فەرموو فەرمووی نۆشین و خواردنی شیر و تووی‌فەرەنگی بۆ سوارچاك لە (بەرهەمی) **مۆری حەوتەم** و بە بێ‌خەیاڵیی لاوانەی سارای بێ وەفای **تووەفەرەنگییە کێویلەکان** گرێ بدەین؟ لە بنەڕەتڕا بۆچ دەبێ واتایەك بۆ هەر شتێکی جوان‌و هەستەکی دابتاشین؟ بۆچی ناچار بین کە لە ڕێگەی راڤەی تاقانەی ژیانێك هەمو شتێك یەکدەست‌و یەکانگیر بکەین؟ بۆچی نەتوانین هەر شتێك بە تاك‌و تەرایی، بێگەردی‌و خدەی تاقانەی‌و پێگەکەی لە دژبەرایەتییە نێوەکییەکانی ژیانێکی تایبەتی‌و گێڕانەوەگەلی نایەکانگیر گرێ بدەین؟ بۆچی نەتوانین دانەدوی ئەفراندنی فرەچەشنییەکان‌و فرەفاقی‌یەکان بکەین؟ بۆچی هەر سیمبۆلێك سەربەخۆ ولە خۆیدا کامڵ نەبینین؟ سینەمای بێرگمان ڕێگە بەم شێوە نیگایە دەدا و ئێمە لە خۆڕا دانەدوی نیگاری گێڕانەوەیەکی ئۆتۆریتەگەرا دەکەین.



ئەوەی فۆرمالیستە روسی‌یەکان وەدوی دەکەوتن چ بوو؟ جگە "وێژەیی بوونی دەق"، واتە دۆزینەوەی ئەو توخمەی کە لە دەقێکی ئەدەبی سازی دەکا؟ هەنوکە بە بەرینکردنەوەی ئەو چەمکە دەتوانین "هونەریبوون"ی دەقیش باس بکەین، واتە توخمێك کە کارێك دەکات بە بەرهەمێکی هونەری. پەیداکردنی ئەم توخمە دەبێ بە زۆرترین سودوەرگرتن لە خودی دەق‌و چاونوقاندن لە ڕاست ئاسانکەرەوە، بەڵام تا هەمان ئاستی گومڕاکەری توخمەکانی دەرەوەی دەق سەر بگرێ. تەنیا لە ڕێگەی وردبوونەوەیەکی دیاردەناسانە دەتوانین بەدەر لە هەر پێناسەو دیاریکارییەکی پێشتر پەسند کراو، پەیجۆری باندۆرە هەستەکییەکانی بەرهەم‌و ئاماژە تازەکانی بکەین. مەگەر جگە لەوەیە کە ئێمە شاکارە شانۆیی‌یەکانی یونانی کەونارا بە کەمترین بارتەقای دانایی لە توخمگەلی باندەقی‌و بە زۆرترین سودوەرگرتن لە خودی ئەو بەرهەمانە بۆ رۆژگاری خۆمان دەگوازینەوە؟ هەڵبەت لەوێشدا هەمبەرگەلی نێواندەقی لە کاردان، بەڵام ئەم هەمبەرانە زاتی و گەوهەری نین، بەڵکو لە زۆرخاڵدا پێوەندیگەلێکن کە ئێمە بۆ هێنانە ئارای ڕاڤەگەلی تازە دەیانخولقێنین. وردبوونەوە لە بەرهەمەکانی ئاسخولۆس یا سۆفۆکلێس بۆ تێگەیشتن لە یەکێك لەو بەرهەمانە تەنیاوتەنیا یەکێك لە کایەگەلی هونەریی لواوە و مەرج نیە باشترینیان بێت. لەمەڕ هەرکام لە بەرهەمەکانی بێرگمانیش وەهایە. ئایا باشتر نیە کە ملکەچی گرێبەستی خۆرەخساوی هونەرمەند نەبین‌و لە جێی پێڕەوی لە گێڕانەوەی تاقانەی ئەو، خۆمان لە سەر بنەمای پێشگریمانگەلی تازە بە وەرگرتن، هەڵسەنگاندن، ڕاڤەو داوەریی هەر فیلمێکی ئەو خەریك بین؟

تا ئەو جێیەی کە پێوەندیی بە ئەزموونی زیندەگانیی بێرگمانەوە هەیە دەتوانی ببینی کە ئەویش مەحکوم بە ژیانکردن وەکو مرۆڤێکی مودێڕن بووە. ئەویش کت‌ومت وەکو کەسیەتیگەلی بەرهەمەکانی هەزار پارچەو مرۆڤێکی کەمدو، پڕ لە ڕەمزوراز، بێ‌سۆز و شاراوەگەرە کە نایهەوێ رازێکی تازەی خۆی ئاشکرا بکات. ئەویش وەکو هەر مرۆڤێکی مودێڕن تێدەکۆشێ تا بە پێی گێڕانەوەیەکی تاقانە بە ژیانی خۆی تەواوەتێکی خەیاڵی ببەخشێ و بۆ خۆی شوناسێکی نەزیلەئاسا دروست بکا. هەوڵدانی ئەو لە دوو پەرتوکی **فانۆسی خەیاڵ** و **گریمانخەیاڵەکان** کە یەکێکیان وەسفی ژیانی دژواری مرۆڤێکی هەمیشە نەخۆشە و ئەویدی باسلێکردنی تەنگژە زەینییەکانی ئەو مرۆڤە لە چرکەساتەکانی ئەفراندن، هیچ نیە مەگەر سازکردنی هەمان گێڕانەوەی تاقانە کە بە ڕواڵەت لە یاسای بنچینەیی، بێ‌بەزەیی‌و گیان سەختی مودێڕنیتە یەکانگیر نیە. بەڵام، گێڕانەوەیەکی ئاوەزدارانە لە ژیانی مرۆڤ ناتوانی بخەیتە ڕوو،

تەنانەت ئەگەر ئامانجی ئەم گێڕانەوەیە نیشاندانی نائاوەزمەندی ژیان بێت. هەزارپارچەیی ژیان ناسکاری مودێرن هەرگیز لە جەرگەی گێڕانەوەیەکدا ناگونجێ. ئەم یەکتاییەی گێڕانەوە تێك شکێنەری تاکایەتی راستەقینەی مرۆڤی مودێرنە. گێڕانەوەیەکی عەقڵانی لە ژیانێك کە لە داخوازی عەقڵانییەتێکی بزر بوو بە سەر بچێ بێ واتایە.

ئەم خودە تاقانە داهێنەرانەیەی بێرگمان بە بارتەقا "خود"ی کەسیەتییەکانی کاتێك کە وەقسەدێنو لەگەڵ گێڕانەوەگەلی گومانلێکراوی خۆیان رێنوێنی دۆزینەوەی هەقیقەتی دوورەدەست نابن، بایەخی هەیە. "من"ی داهێنەرانەی مودێرن شوناسێکە کە ئارەزوی بوونی هەقیقەتێکی رەها دەچرپێنی. مەزنایەتیی بێرگمان لەمەدا نیە کە بەردەوام یەك ئامانجی گرتۆتە بەر، لە بێدەنگیی خوایەکی یەکتا دواوە و کۆمەڵە کەسیەتییەکی ناچار بە بزوتن کردوە. کاری گەورەی ئەو ئەمەیە کە جاروبار ئاگایانەو هەندێجار سەرەڕای ویستی خۆی نیشانی داوە کە گێڕانەوەی تاقانە و مودێرن کە قەرار بوو شوناسێکی تاقانەی مودێرن ساز بکا،تا چ ئاستێك بێبنەماو گاڵتەجاڕانەیە. تەنزێکی تاڵتر لەمە نیە کە بمانەوێ ئەم جاڕدەری فرەفاقێتی و هەواڵدەری بێتوانایی گێڕانەوەیەکی تاقانە لە قاڵبی وێنایەکی داخراو، بەرتەسكو لە قووڵایی خۆیدا پووچەڵنوێن لە دانەرێك جێبکەینەوە. هەر کام لەو کەسیەتیانەی کە ئەو خولقاندنی (کتومت وەکو کەسیەتییەکانی نووسەری خۆشەویستی واتە ئێستریندبێرگ) بۆتە کەسێك کە لە هەڵکەوتێکی دووپات نەکراوە کردەیەکی چاوەڕواننەکراو لە خۆی نیشان دەدا. دەبێ رێسای بێقازانجی لێکچوون وەلابنێین تا بتوانین لە هەر بەرهەمێکی ئەودا و لە هەر کام لە کەسیەتییەکانی ئەودا "هەرامەی یەکبوو" پەیدا بکەین، یەکێکیان کە نموونە، باشقە و سەرنموونە نیە و تەنیا لە یەك هەڵکەوتو لە یەك هەوڵدا بۆ دیهاوێژیو وەئۆباڵخستن خۆیو گەڵاڵەرێژیی بوونی خۆی هەنتەشی هەیە. کەسێك کە بە سەرقاڵبوون بە تیمارگەریی بوونی خۆی لەگەڵ دڵەڕاوکێکانو دۆش داماویی‌یەکانی ژین بردنە سەر لەم دنیایەدا بەرەوڕوو دەبێ، جگە بە وزەی ئاوەزباوەڕی ناتوانی ئەم بوونەوەرە کە تەنانەت بەردەوامێتی کەسیەتیشی بە بێگار دەکێشێو مێژوی ژیانی تاکەکەسی بە هەودایەك لە واتاگەلی داهێنەرانە و ئانوساتی کورت دەکاتەوە، بکەیت بەویدی یا سەر نموونە و باشقە.

قەشەیەك کە ئیمانی خۆی لەکیس داوە و ئیدی هیچ هۆگرییەك بە مرۆڤان هەست ناکا بەڵکو دەبێت بە تاکێك، نەك بە واتای بەردەوامیی ژیانێك، بەڵکو بە واتای کەوتنە هەڵکەوتێکەوە، واتە لە بارودۆخی هەوڵدان بە مەبەستی خستنە ڕووی راڤەیەك لە خۆ و



دۆزینەوەی پێگەی خۆی لە جیهاندا. ئەم هەوڵدانە رەوشتی‌یە بە گێڕانەوەی تاكو تەرای مودێرن، چەواشە دەکرێ. سەدەکانی ناڤینی بێرگمان(**چاوەی کچێنی، مۆری حەوتەم، شمشاڵی ئەفسوناوی**) نەك سەبارەت بەوەی کە ترسەکانی جیهانی مودێرن زەق دەکەنەوە، بەڵکو لە بەرئەوەی کە بە ڕاستی لە مێژو وەك یەکێك لە گێڕانەوەگەلی لواو دەدوێنو ئەوە لە پێگەی گواستنەوەی ئاسۆکان دەناسێنن، برەوداریيان هەیە. هەنوکە هەرکام لەو فیلمە ئەمەك نەزانراوانەی "بەرایی" (**قەیران، کەشتی بەرەو هیند، بەرەو شادمانی، زیندان، بەسەر ئەڤینماندا دەبارێ** و...) کە بەردەوام خودان بایەخی "مێژوویی" و وەکو دەسپێکی ئەو شوناسە گریمانکراو و داهێنەرانەیە ناسێنراون، پێگەی شیاوی خۆیان لە تاکمەندیو شوناسی تاکەکەسیی خۆیان پەیدا دەکەن. بایەخی ئەوانە بە هیچ شێوەیەك لەوەدا نیە کە پێشگۆیی مێتۆدی دەربڕینی "دواتر"ن، ئەوانە لە خۆوە جوانو بێئۆقرەن. بەرهەمەکانی بێرگمان نە رێچکەیەکی ئارام و پەیتاپەیتانو نە بازنەگەلی چەق یەککگرتوو. ئەوان ئاژاوەی رەهای گۆماوێکن کە رەنگە خواوەندی شیعر و بیرەوەری، هەر بۆ یاری بەردێکی هاویشتبێتە نێوی. دەبێ بە شڵەقانو کایەی ئاوەکان لە دەرەوەی رێسای فیزیکی، میکانیکیو عەقڵانی بڕوانین، تا تێبگەین کە زیندوویە. کەسێك کە بیهەوێ لە پشت ئەوانەوە ریسای تاقانەو بڕیاری لێبڕاوانەی تێككردنەوەی شەپۆلەکان پەیدا بکات لە تەماشای سەمەرەیی‌یەکانی جیهان بێبەش دەبێ. ئەو تێناگا کە هەر شتێك لە پەڕژینی رێساکان، پێناسەکانو دەبوایەکان زیندانی نەکراوە شتێکە کە لە خۆیدا زیندوە. هراکلیتۆس راستی دەوت کە دنیا لە منالێك دەچێ کە یاری دەکات.

## ڕۆمێری فەرەنسی؟

ئەگەر لە ژان رنوار و ژانڤیگۆ گەڕێین، ڕەخنەگران کەمتر سینەماکارێکیان بە بارتەقای ئێریك ڕۆمێر بە "فەرەنسی" ناودێر کردوە. ئەم یارمەتی وەرگرتن لە "فەرهەنگی نەتەوەیی" لەمەڕ ئەویش وەکو هەردووك مامۆستاکەی دی، پشتی بە جۆرێك خۆشخەیاڵی بەستوە کە ڕەنگە لەم ڕێگەوە بتوانین شتێك لە تێکچڕژاویی بەرهەمەکانی ئەوان بدۆزینەوە. هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە تایبەتمەندیی بانگەشەکارانەی فەرەنسیبوونی فیلمەکانی ڕۆمێر و بە تایبەت تێکۆشان بۆ پەیداکردنی سنورێك کە تێپەڕین لێی، ئەم بەرهەمانە چیدی فەرەنسی نابن، دەتوانێ ڕۆشنگەری پانتاییو کەوشەنی ئەو خۆشخەیاڵییەش بێت. لەو فیلمە زۆر و زەوندانەی کە ڕۆمێر لە ماوەیەك زیاتر لە چل ساڵ دروستی کردن، توخمێك لە نەزیلە خەڵکی و کۆنەکانی فەرەنسی هەیە. ئەم توخمە جۆرێك راز و ڕەمزە کە لە پشتی ڕووداوە سادەکانی ژیانی ڕۆژانە شاراوە دەمێنێتەوە و سەرەنجام بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو و خافڵگیرکەر ڕوو دەدات. ئەم رازە وەکو کەتوارێکی بەرهەست بەڵام ناپەیدا لە کاردایە و سەربەخۆ لە ویستەکان، تامەزرۆیی‌یەکان، ڕقو کینەکان، دڵئازارییەکان، هزرەکانو نەخشەکانی کەسیەتییەکان درێژە بە ژیانی خۆی دەدا، تا لە جەرگەی تیرێژی زووگوزەری کەسك ڕەنگ لە خۆرنشینێکی کەناراو(**تیرێژی سەوز، ١٩٨٦**) یا یەك خولەك بێدەنگیی ڕەها لە ئەلەندی گوندییانە (**چوار بەسەرهاتی رینیت و میرابێل، ١٩٨٦**)، یا پێشهاتانێکی پەرجوئاسای لەمجۆرە خۆدەربخا. ئەم رازە بنەمای گێڕانەوەیی کارەکانی ڕۆمێری پێك هێناوە.

لە بەر گرێدرانی راز بە شێوەی گێڕانەوەیە کە پەرجوی دیداری بە تەواوی چاوەڕواننەکراو لە **نەزیلەی زستان** (١٩٩٦) ئێمە لە دنیای کەتوار بۆ جیهانی چیرۆکانی منالآنە دەبا و دەگەڕێنێتەوە. لە دەقی چیرۆکی **شەوێك کە لەلای مۆ مامەوە**(١٩٦٩) چیرۆك گێڕەوە دەڵێ: "من بە تەما نیم کە هەموو شتێك لەم هەقایەتەدا بگێڕمەوە". لە راستیدا ئەمە هەقایەتێك نیە، بەڵکو هەودایەکی هەڵبژاردە لە ڕووداوگەلێکی تەواوجیاواز، پێشهاتەکانو ڕێکەوتەکانە. کتومت وەکو خودی ژیانە. لە بنەڕەترا دیار نیە. ئەوەی دەیڵێم نەزیلە بێ. بە هەرحاڵ من ڕووداوەکان وەها باس دەکەم وەکو خۆی، چۆن دیتومە ئاوەها. ئەوەش بڵێم کە هەموو ئەم ڕووداوانە هیچ واتایەکیان نیە، مەگەر ئەوەی کە من بە هەموویان واتا ببەخشم". ئەم هەڵێنجانە پروستی‌یە لە گێڕانەوە لەسەر دەوری یەکلاکەرەوەی چیرۆك گێڕەوە و هەڵبەت لەسەر جیهانی زەینی، تاخودئاگایی، بیرەوەرییەکانو خەیاڵگەرییەکانی ئەو



جەخت دەکا. گوتنی ئەمە کە: "من ڕووداوەکان وەها کە باس دەکەم، وەك خۆی، چۆن دیتومە ئاوەها" وەبیر هێنەری ئەوەیە کە دیتنی ئێمە بەمانای هێنانە ئارای ڕاڤەی ئێمەو شێوەی ئێمە لە واتاکردنەوەی دنیا و ئاشکراکردنی پێگەی ئێمە لە ژیانە. بەڵام لە بەرئەوەی هەموو ئەمانە بە هەرحاڵ شتێك زیاتر لە یەکێك لە گێڕانەوە لواوەکانو یەکێك لە ڕاڤەگەلی شیمانکراو نین، هەروا جێگە بۆ گومانو دڕدۆنگی دەمێنێتەوە.

گزمانکاران پێغەمبەرێکی فەرەنسییان هەیە: مۆنتنی. بەرهەمەکانی ڕۆمێر کە لە ڕێگەی لۆژیکی گێڕانەوە بە سەروەریی دڕدۆنگی دەگەن، بە مانای پێڕەوی لەو بیرمەندەن. سینەمای فەرەنسا جگە لە ئەزموونی ئالێن رنە لە **ساڵی رابردولە مارین‌باد**، نموونەیەکی تا ئەم ئاستە کامڵ لە ژیان لە قەڵەمڕەوی دڕدۆنگی نیە. ئەم لاوە دەستوپێ سپیانە، بە خەیاڵی خۆیان وریا، بەڵام زیاتر گێژ و تووش لە فیلمەکانی ڕۆمێر لە زۆزانەکان، شارۆچکە کەناراوی‌یەکان کات بە فیڕۆ دەدەن، لەراستیدا متمانەیان بە شتێك نیە. لە ڕۆژانی پشو بەسەردەبەن، وێڵوێڵ دەسوڕێنەوە و لە وەڕەسیی ڕۆژانی بێکاریو لە هەڵاتن لە بەرپرسایەتی، بەڕواڵەت پێشهاتگەڕ بەڵام لەراستیدا ئێجگار پارێزکارن. زۆربەیان لە ڕێی زۆروێژیی ناکۆتا بۆ خۆیان کەسیەتیگەلی گێڕانەوەییو هەڵبەت درۆزنانە دەڕەخسێننو بەردەوام لە دۆخی داکۆکی لە خۆ دان.واخۆدەنوێنن کە دەیانەوێ کەتوار بگۆڕنو تەنانەت دەڵێن کە "هەر ئێستا، لێرە" خەریکن ئەم کارە دەکەن، بەڵام راست نالێن. دۆخی نارۆشنی و هەڵپەساردن بنەچەو بنەمای ژیانی ئەوانو سینەمای ڕۆمێرە. بەردەوام لەنێوان ویستن و نەویستن، تامەزرۆیی و بەرتەکدانەوە، خۆشویستنو خۆشنەویستن هەڵوەدان. وەکو پێوەندیی ئادرین لەگەڵ هایدە لە (فیلمی) **کیژۆڵەی کولکسیۆنێر ١٩٦٦**)، چیرۆك گێڕەوە لەگەڵ سیلۆی لە **نانەوای مۆنسۆ** (١٩٦٢)، چیرۆك گێڕەوە لەگەڵ مۆ و فرانسوا لە **شەوێك کە لە لای مۆ مامەوە**،فرێدریك لەگەڵ کلۆئە لە **ئەڤینی پاش نیوەڕۆ** (١٩٧٢)، بلانش لەگەڵ ئەلکساندێر لە **هەڤاڵی هەڤاڵی من**(١٩٨٧)، چیرۆك گێڕەوە لە **شەوێك کە لە لای مۆمامەوە** دەڵێ :" ئێمە هەمیشە بە هەڵەدا دەچین، بێ‌پسانەوە". ناتاشا لە **نەزیلەی بەهار** (١٩٨٩) ئەم قسەیە دووپات دەکاتەوە: "هەمیشە، بێ بەرتەکدانەوە، بە هەڵەدا دەچین"، لە بەرئەوەی کە هەمیشە لە ناسینی دنیاو ئەویدی، لە دیاریکردنی پێگەی خۆمانو لە گێڕانەوەکانماندا هەڵە دەکەین باشتر وایە بە پارێز بین، زۆر گومان بکەینو شتێك پەسند نەکەین. لوسی لە **هاوسەری فڕۆکەکان** (١٩٨١)دا دەڵێ کە ئەگەر قسەیەك ناکات سەبارەت بەوەیە کە سەرباقی وابیرنەکەنەوە کە بڕوای بە شتێك نیە. لە لایەکی دیکەوە لە دنیایەکدا کە پڕ لە مرۆڤانی فێڵباز و پاشقۆلگیرە (لە ریزی کەسانێك وەکو هانری لە **پولین لە پلاژ دا ١٩٨٢**)و

بابەتەکانی وەك ئالۆشگەری بەزۆری لەوە کە چاوی تێبڕاوە، بێئاگان، وەکو پولین لە فیلمی ناوبراو یا کلێر لە (فیلمی) **ئەژنۆی کلێر** (١٩٧٠)، مرۆڤ دەبێ زۆر ئاگای لە خۆ بێت. رەنگە لەبەر ئەم هۆیە، ئەو بنەواشە رەوشتییەی بە ڕواڵەت پتەوی کەسیەتییەکانی رۆمێر زۆر زوودەبن بە یاریچەگەلی هەرۆڵی درزبردو. یاسای ئاسنینی چێژخوازی ئەوان دەگۆڕێو دەیان رەوێنێتەوە.

زۆربەی کەسیەتییەکانی رۆمێری لاو، بەفەرهەنگو بیرمەندن. خوێندکارن یا مامۆستا، مامۆستای زانکۆ، ژەنیار، کارمەند... ئەوان پەیتاپەیتا لە فەیلەسوفانو هونەرمەندان هەمدیس وێژی دەکەن. لەگەڵ ئەوەی کە زۆربەیان زۆربلێن، هەمدیس تێدەکۆشن تا شتێك لە نیازە سەرەکییەکانی خۆیان نەدرکێنن. لەگەڵ ئەوەی کە ئێجگار چێژخوازن بانگەشە دەکەن کە بە "بنەواشە رەوشتییەکان" پێبەندن. پێیان ناخۆش نیە کە ژیانی خۆیان بە شێوەیەکی ناباو بیچم بدەن، بەڵام بوێریی ئەوەیان نیە. هەمیشە وزە و گوڕێکی سەرتر لە ویستو ئارەزوی ئەوان شیرازە بە ژیان دەدا، لە بەرەنجامدا ئەوەی کە دەمێنێتەوە جۆرێك پەیجۆری چێژ لە خەیاڵو بیرەوەری دایە.

ئەم مەیلە بۆ کەیفخۆشی کە ناتوانێ لە پشت رەوشت خۆی حەشار بدا، وەبیرخەری سوحبەتچییەتی لەکۆتانەهاتوی ورەی فەرەنسییە. پاسکال بۆنتیزێر نووسیویەتی: "تێکڕای فیلمەکانی رۆمێر کۆمێدین".[1] بومارشە و مولیر بەردەوام ئامادەن. رۆمێر خۆی لە بەراوردکردنی کەسیەتییەکانی لەگەڵ دۆنکیشۆت ماندو نابێ. ژمارەیەك لەوان لە پەیجۆری ئاواتێکی دەستڕانەگەیشتو دەکەونە هەڵکەوتگەلی گاڵتەجاڕانەو پێکەنیناوی. ترس لەم هەڵکەوتانە دەبنە هۆی ئەوە کە لە "ئەویدی" بترسن. ئەوان بە گوتەی فرێدریك لە **ئەڤینی پاش نیوەڕۆ** لە نوقمبوون لە شلۆقیی حەشیمەت هەڵدێن. ئەو خەڵك کاتێك لە وێستگەی مێترۆ دێنە دەرێ، بە دەریا دەچوێنێ: زۆرجوانە بەڵام تەنیا لە دەرەوە! هەمیشە "کەڵکەڵەگەر"ێك هەیە کە مرۆڤ ناچار دەکا کارێکی گەمژانە بکات. کەسێکی وەکو سوزان، هایدە، مۆ، کلێر، لکۆیە، ماریۆنو پیاوانی گەنج کە کاریان فریودانەو چێژوەرگرتن لە تەماشای جەنگی ناخی کەسێك کە دەبێ لە خشتە ببرێ. بەڵام شادیی تەواو وەدەستهاتو نیە. زۆربەی فیلمەکان بە گەڕانەوە بۆ تەنیایی "مرۆڤی زیادە" تەواو دەبن. ناکامی، قسەی کۆتایی دەکات.

رۆلان بارت لە پەسنی رۆمانەکانی ئالێن رۆبگرییە نووسیبووی کە هونەری ئەم نووسەرە ئەوەیە کە توانیویەتی دنیا بە بیچمێکی دیکە ببینێ. گوتەی بارت بیستەنییە: "**فیلمی ڕاو لە ژێر ئاو** بۆ خوێندکارانی ڕەش پێستی کۆنگۆییو خوێندکارانی بێلژیکی پیشان دەدرێ. خوێندکارانی کۆنگۆیی

(1) P.Bonitzer, Eric Rohmer, Paris, P.35.



لەوەی دیویانە کورتەیەکی سەر ڕاستو وەسفی، ورد و هەسپێکراو و بێ هیچ ئەفسانەسازییەك دەخەنە ڕوو، بە پێچەوانەوە، خوێندکارانی بێلژیکی هەژاریی دیداریی زۆر لە خۆیان نیشان دەدەن، ئەوان وردکارییەکان ناهێننەوە یاد، لە خۆیانەوە چیرۆك دروست دەکەن، لە پەیجۆری باندۆرگەلی ئەدەبین، هەوڵ دەدەن شۆرو سۆز بە بابەتەکە بدەن. کتومت هەر ئەم خولقاندنی بەسەرهاتە سۆزدارانەکانە بە شێوەیەکی لە خۆوە وروژاو کە لە سیستمی دیدەیی رۆبگرییە هەوڵ دەدرێ تا سات بە سات لە کار بخرێت".[2] خۆشبەختانە رۆبگرییە هەندێ فیلمیشی دروست کرد و ئاشکرا بوو کە ناتوانێ دەسکەوتی ئەدەبیی خۆی لە سینەمادا دووپات بکاتەوە. بەڵام ئێریك رۆمێر کتومت لێرەوە لە نەریتێك کە لە سەر "هەژاریی دیدەیی" ڕۆنراوە، جیادەبێتەوە. ئەم دیتنی دنیا بە جۆرێکی دی، کە کاری ئەو لە سینەمای نوێی فەرەنسا هەڵکەوتوو تاقانە دەکات، لە هەمان کاتدا لە بەرهەمەکانی سینەماگەرانی لە دڵاشیرینی ئەویشدا بێمێژینە نیە: (کە رۆمێر لە بەشی "فەزای فیلمی"ی وتارنامەی **خۆ ڕێکخستنی فەزا لە فاوستی مۆرنائۆ** هێمای بەم خاڵە کردوە[3])، درایر( کە فیلمێکی تەلەڤزیونی کە رۆمێر لە ساڵی **١٩٦٥** لەبارەی ئەو دروستی کرد لە" شێوەی تازەی دیتن" لە بەرهەمەکانی ئەو دوابوو)، رۆسێلینی، هیچکاك و هەڵبەت رنوار. رۆمێر لە گفتوگۆیەکدا لەگەڵ ژان ناربۆنی لە ژێر سەردێری " رۆژگاری رەخنەکاری" گوتویەتی کە لە بەرهەمەکانی مارسێل کارنە دەتوانی " لایەنێك لە بەرهەمەکانی مۆرنائۆ" بدۆزیتەوە:" چۆنایەتییەکی ئاڵمانی و پەیوەست بە دەیەی ١٩٢٠، وردبوونەوەیەکی وێنەیی... کە باندۆری لەسەر باشترین نموونەکانی سینەمای کلاسیکی فەرەنسا دانا".[4] لە تیۆریی بە ناوبانگی رۆمێر لە بارەی " سینەما وەکو هونەری فەزا"، دەتوانی هەڵاتنی ئەو لە " شێوەی روانین" و تێگەیشتنی تیۆریی زاڵ بەسەر سینەمای فەرەنسای پاش جەنگ بەدی بکەیتەوە.

شێوەی تازەی دیتنی رۆمێر کە هێشتاش بەلای زۆریك لە رەخنەکاران نارۆشن ماوەتەوە، نیشان دەدا کە بۆ دۆزینەوەی رازەکانی بەرهەمەکانی پێویستیمان بە ئامرازێکی چەندقات زیاتر لە گێڕانەوەی ڕووت، باڵادەستگەرا و لە راستیدا خەیاڵی‌یە کە لە رۆژگاری مودێڕندا" فەرهەنگی نەتەوەیی" پێدەڵێن.

(٢). م. کولی، **رولان بارت**، ترجمەی خ. دیهیمی، تهران، ١٣٦٧، ص ٢٤.

(3) E.Rohmer, Lorganisation de Lrspace dans Le Faustde Murnau, Paris, 1991, PP, 94-125.

(4) E.Rohmer, le gout de la beaute, paris, 1989, p.26.

## کەتوار لە فیلمدا

هەر چەند ناونیشانی ئەم باسە، کەتوار لە فیلمدایە، بەڵام بابەتەکەی چەندان هەمەکی نیە و بە شێوەیەکی تایبەت پێوەندی سینەمای بەڵگەنامەیی لەگەڵ سینەمای گێڕانەوەیی (سینەمای چیرۆکی یا نەزیلەبێژ) جێی مەبەستە. بە بۆچوونی بڕێك لە تیۆرەوانان، پێشکەوتن لە وەها باسێك هەنگاوێکی گرنگ لە ڕێچکەی تێگەیشتن لە پێوەندیی سینەما و کەتوار ئەژمار دەکرێ و منیش لەمبارەوە لەگەڵ ئەوان هاوڕام... بەم پێیە ڕەنگە بتوانین بێژین کە ئەم باسە دەروازەیەکە بۆ ناسینی پێوەندیی سینەما بە کەتوارەوە.

وێدەچێ ئێوە ئەم ئاخاوتەی ژۆرژ فرازژۆ (کە ژمارەیەك لە جوانترین فیلمە بەڵگەنامەییەکانی مێژوی سینەمای دروست کردوە) بیستبێ:" کەتوار نۆژەن دەکەنەوە، چونکە سڵەماوە. کەتوار، کەتوار بەرتەك دەداتەوە. دەبێ بەر لە هەر کارێك کەتوار راڤە و نۆژەن بکەنەوە. کاتێك فیلمی بەڵگەنامەیی دروست دەکەن تێدەکۆشن تا بە کەتوارگەرایی لایەنی دەستکرد و دروستکراو بدەن. من دۆزیومەتەوە کە جوانیناسیی دیکۆمێنتار هەر لە لایەنی دەستکردەیی، لە دروستکردن، سەرچاوە دەگرێ. فیلمی من دەبێ کامڵتر لە کەتوار بیچم بگرێ تا بتوانم واتایەکی دیکە بە کەتوار بدەم".[1] ئەوەی دروست دەکرێ، واتە فیلم یا " کەتواری سینەمایی"، هەمان کەتواری بەرهەست نیە و ناتوانێ هەبێ. بە بۆچونی من پەیڤی " نۆژەنکردنەوە"ش لێرە دەتوانێ بەدحاڵیبوونی لێکەوێتەوە. جوانیناسیی دیکۆمێنتار لە ئاقارگەلی دەستکرد واتە لە ڕێساکان و تەڵەکەکانی" دروستکردن" باس دەکا. ئەفراندنی هونەری( کە ڕەنێوهانینی فیلمگەلی بەڵگەنامەییش لەودا جێ دەکەینەوە) هەڵبەت لە دەسپێکی کاردا لەگەڵ کاروباری سروشتی سەروکاری هەیە، بەڵام سەرەنجام سەرهەڵدانی بەرهەمێکی هونەری لێ دەکەوێتەوە کە شتێکی دەسکرد یا دروستکراوە، کە لەودا وزەی ئافرێنەری زەینی مرۆڤ دەورێکی یەکلاکەرەوەی هەیە. هەر وەك ئەرەستۆ نیشانی داوە لاسایی کردنەوە لە کەتوار، کەتوارێکی تازە دەڕەخسێنێ و هەرگیز ئەوەی لێ ناکەوێتەوە کە هەرامەی ڕاستەقینەی یەکەم واتە هەرامەی بەرهەست هەمدیس ڕەنێوهانین بکرێ. فرانژۆ جەختی لەسەر خاڵێکی ئێجگار گرنگ کردوە کە گوتویەتی:" فیلمی من دەبێ کامڵتر لە

(1) G.ROY LEVIN , DO CUMENTARY EXPLORATIONS: fifteen interviews with film makers, new York, 1971, p.121,128.



کەتوار بیچم بگرێ تا بتوانم واتایەکی دی بە کەتوار بدەم". مەسەلەیەك کە ئاسان فەرامۆش دەکرێ ئەمەیەکە ئەوەی فیلمی بەڵگەنامەیی بە ئێمەی نیشان دەدا دەقاودەقی کەتوار نیە. لە نێوان فیلم ( تەنانەت ئەگەر هەوڵ درابێ کە هەمدیس ڕەنێوهانین بە هەرامەی راستەقینە وەفادار بێت) لەگەڵ ئەوەی بە کەتوار ناوی دەنرێ مەودایەکی زۆر هەیە. ئەم مەودایە یەکێك لەو مەسەلانەیە کە ئێمە مەبەستمانە لێی وردبینەوە.

باسەکەی ئێمە سەرنج لە دوو خاڵ دەدا. یەکێکیان ئەمەیە کە:" بۆچی و چۆن لە سینەمای بەڵگەنامەییدا و لە ڕەوتی دروستکردنی فیلمگەلی بەڵگەنامەیی، کەتوار بیچمی تازە یا بیچمێکی دیکە بە خۆوە دەگرێ؟" پرسیاری دووەم کە تا ڕادەیەکی زۆر عەودالی پرسیاری یەکەم دەگەڕێ، ئەمەیە کە: ئایا لە بنەڕەت ڕا جیاوازییەك لەنێوان سینەمای گێڕانەوەیی و سینەمای بەڵگەنامەیی هەیە؟ ئایا ئەم هەڵێنجانە باو و گشتی‌یە کە بە مکوڕی یەوە ڕادەگەیەنێ کە ئەم دوو سینەمایە پێکەوە جیاوازیی کلیلییان هەیە و درزێکی قووڵ و لێ دەرباز نەبوو ئەوانی لێکدی جیاکردۆتەوە، ڕاست و دروستە؟ ئەم تێگەیشتنە " هەمووانی"یە لە نووسینەکان و هزرەکانی تاقمێك لە بەناوبانگترین تیۆرەوانان و هەروەها مێژونووسانی سینەماش دووپات کراوەتەوە. بۆ نموونە کریستیان مێتز نیشانەناسی بەناوبانگ کە لە کۆتایی ژیانیدا لە بواری هەمبەری دەرونناسی و سینەماش لێکۆڵینەوەی ئەنجامدابوو، جارێکیان گوتبووی کە سینەمای نەزیلەبێژ گەورەڕێی سینەمایە و ناتوانی سینەمای بەڵگەنامەیی زیاتر لە قەراخ یا پیادەڕۆیەك لە تەنیشت ئەم گەورەڕێیە بزانی.[2] ئەو وەکو زۆرێك لە تیۆرەوانانی سینەما سەرباشقەی سەرەکیی فیلمسازی لە سینەمای نەزیلەبێژدا بەدی دەکرد. لە نیگای یەکەمیشدا وەها دێتە بەرچاو کە لەم چەشنە سینەمایەدا سەرمایەیەکی زۆر بەکار دێت، ژمارە و ئاستی فرۆشی فیلمەکان لە سەرەوەیە، نەزیلەکان و مرۆڤانی( بەتایبەت" ئەستێرەکانی") سەرچاوەی خەیاڵ و ئارەزوو و نموونەگەلی ڕەفتار و تەنانەت هزری کۆمەڵێکی هەرەمەزنی تەماشاوانان لە زۆربەی وڵاتانن. ئەمە سینەمایە کە بیچمی بە " پیشەسازیی سینەما" داوە و دەتوانێ گەورەڕێی شلۆق و پڕ هاتوچۆ، یا سەکۆی ژیانی راستەقینەی سینەما ناودەنرێ. لە بەرانبەردا سینەمای بەڵگەنامەیی بە ئەرکگەلی بە ڕێژە سنوردار و بە

(2) C.Metz, “ some points of the semiotics of the cinema” , in: film langug, trans. M.taylor , ox for university press, new York, 1974, p.94.

پشکێکی بچووك كه له سەرمایه و هێزی مرۆیی کارو هزر بۆی تەرخان کراوه، له باشترین دۆخدا یا ئەرکی فێرکارانه له قوتابخانه و زانکۆکان له ئەستۆیەتی، یا بەکاری هەواڵ گەیاندنی له راگەیێنەکان دێت، یا کەرەستەیەکه بۆ پڕوپاگەندەی روانگەکان و لەم لایەنەوه زیاتر لەدەزگای بە رەنێوهانینی ئایدیۆلۆژیدا بەکاردێت.

من لەگەڵ ئەم دابەشکارییەدا نەیارم. ڕام وایه که سنور یا هێڵیکی جیاکاری که لەنێوان سینەمای بەڵگەنامەیی و سینەمای چیرۆکی نیگار بکرێت لەسەر پێشگریمانگەلی چەوت و گریمانگەلی تیۆریی بەرتەسك و رێساگەلێ له روانگەی جوانیناسانەوه بەرتەکدراوه رۆنراوه. گرنگترین بانگەشەی سینەماگەری بەڵگەنامەیی که خەریکی" هەمدیس رەنێوهانین"ی کەتوار بۆ قوولبوونەوەی زیاتر له بارەوەیەتی، شیانی پەسند نیه و هەرکات بانگەشەکەی ئەمه بێ که ئێمه لەگەڵ" کت ومت کەتوار" واته کاروباری راستەقینه بەرەوڕووکردوه، هەمدیس بڕیارێکی نەشیاوی داکۆکی لێ کردنی هێناوەته پێشێ. له لایەکی دیکەوه، سینەمای نەزیله بێژیش به هەمان بارتەقای سینەمای بەڵگەنامەیی بەستراوەتەوه به کەتوار، ئەم سینەمایه به هەمان بارتەقا له دروستکردنی کەتوار (واته له تێگەیشتنی ئێمه له هەقیقەت، که بەشداریی ئێمه له دروستکردنی هەقیقەتدایه) له دروستکردنی فیلمی بەڵگەنامەیی دەوری هەیه. به گوتەی ویم وێندرێس هەر فیلمێکی چیرۆکی لانیکەم بەڵگەنامەیه که لەبارەی کەرەستەکانی فیلمسازی له قۆناخێکی مێژوییدا و له ژێر زاڵبوونی سەرباشقەکان، رێساکان و نۆرمه زاڵەکانی فیلمسازی. هەر فیلمێك چ گێڕانەوەیی یا دیکۆمێنتاری ناوبنێین، نیشان دەدا که کەوشەنەکانی دەربڕین کامەن و ئاخێوی سینەمایی دەتوانێ چ شتێك بڵێ و چ شتێك ناتوانێ بڵێ. هەر فیلمێك ئەم خاڵانەش دەهێنێتە پێشێ که بۆچی دەربڕینی سینەمایی به ناچار خوازەیی و له زۆر خاڵدا ئەلیگۆریکه، چۆن پشت ئەستوره به میتافۆر و...هتد.

کاتێك ئێمه لەو پرسیارانەی که له سەرەوه هاتنەگۆڕێ تێدەهزرین که له پراکتیکی فیلمسازی له سینەمای بەڵگەنامەیی، کەتوار به شێوەیەکی لێ دەرباز نەبوو واتایەکی تازه له خۆدەگرێ، یا باشتره بێژین دروست دەکرێ و ئەمه هەمان دۆخه که پراکتیکی سینەمای نەزیلەبێژدا دووپات دەبێتەوه. له گۆشەی باسی کەتوار، جیاوازییەکی گریمانی له نێوان دوو چەشنه سینەما شیانی داکۆکی نیه. دیکۆمێنتاریست ناتوانێ بانگەشه بکات که له کەتوار یا کەرەستەکانی هەمدیس رەنێوهانینی که له دروستکردنی فیلمی نەزیلەبێژ دەوری هەیه، نزیکه، هەرچەند که دەلوێ له خەیاڵی خۆیدا زۆر نرخی پێ دابێ. من لێرەدا ناچمه نێو



باسگەلی تکنیکی فیلمسازی و هەروەها باسگەلی مێژوویی‌یەوه و تێدەکۆشم تا مەسەلەکه تەنیا له ئاستێکی تیۆریك بێنمه پێشەوه و لەمبارەوەش نامەوێ خۆم به باسگەلی فەلسەفییەوه خەریك بکەم. تەنیا هێما بۆ سێ پێشگریمانی تیۆریك دەکەم که پێم وایه ئێمه یارمەتی دەکا له دوو پرسیاری سەرەکیمان تێهزرین و وێدەچێ وڵامانێکی سنوردار و هەروەها کاتی بەرهەڤ بکەن.

پێشگریمانی یەکەم ئەمەیه که له فەلسەفەی پاشینەدا، به تایبەت له پاش وەشانی بەرهەمەکانی فریدریش نیچه، ئەم خاڵه هاتۆته گۆڕێ که ئێمه به یاریدەی وزەوگوڕی زمانپاراویمان، هەقیقەت دەڕەخسێنین. هەقیقەتی دەرەوەی ژین، زانراوەکان، ئاسۆی تێگەیشتن و دانایی ئێمه، له بەرەنجامدا له دەرەوەی پانتایی زمانی ئێمه، بوونی نیه. هەقیقەت هەرامەیەکی بەرهەستی دەرەوەی ئێمه نیه که گوایه به پێی بڕیاری چارەنووس نەدۆزراوه دەمێنێتەوه تا بەڵکو رۆژێك ئێمه به یاریدەی توێژینەوه زانستییەکانمان دەستمان پێی ڕابگات. هەقیقەتیش وەکو تێگەیشتنی ئێمه له کاروباری راستەقینەی ژیانی رۆژانەمان، زادەی زمان، هزر، ویست و پاڵنەرەکانی سەرمەستی‌و تامەزرۆیی و ویستی ئێمه له دەستڕاگەیشتن به ئامانجگەلێگه که له زۆر خاڵدا خۆمان له بەردەم خۆمان داناوەو له سەر بنەمای سودو قازانجی ئەوەمان بۆ حاڵی خۆمان بەسود لێکمان داوەتەوه.له بەرەنجامدا هەقیقەت به واتایەکی تێکچڕژاو بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی و (هەنتەشی مێژویی) ئێمه دەگەڕێتەوه و له زۆر خاڵدا به شێوەیەکی تاکەکەسی دیاری ناکرێ‌و رەنگه له بەر ئەمه بێ که ئەم بەدحاڵیبوونەی لێ دەکەوێتەوه که گوایه به شێوەیەکی تەواو له ئێمه سەربەخۆیه و تەنانەت به سەرماندا زاڵه. ئەگەر ئەم پێشگریمانه که هەقیقەت نەك بەرهەست بەڵکو زادەی کار، کرده و ویستی ئێمەیه، ببێ به رێنوێنی توێژینەوەمان ئەو کات دەبێ پەسند بکەین که "جیهانی راستەقینه" جێیەك نیه که له دەرەوەی ئێمه بێت‌و ئێمه به واتای مەبەستی هایدگێر "هەبوون ـ له ـ جیهاندا"ین. هەروەها ئەم هەڵێنجانه پۆزەتیڤیستیه که ئێمه بەرەبەره پەی به کاروباری راستەقینه دەبەین‌و خۆ وێدەچێ له جێیەکدا لەگەڵ هەقیقەت بەرەوڕو بین. وەلادەنرێ. رۆشنه که لەم رێگاوه، ئەم گریمانه که سینەمای بەڵگەنامەیی جۆرێك نۆژەنکردنەوەی کەتواری بەرهەست‌و دەرەکی‌یه، له برەو دەکەوێ.

پێشگریمانی دووەم که کارەکەمم لەسەری بنیات ناوه، گرنگیی راڤەی بەرانبەر (بیسەر ـ خوێنەر) له هەرامەی راستەقینەیه.دەزانن که ماوەیەکی درێژخایەنه تیۆرەوانانی هونەر لەم

باوەڕە کە نیاز، ئامانج و مەبەستی ڕەژیدە و بیچمدەری واتاکانی بەرهەمە، دوور کەوتونەتەوە. ئیدی جێی پەسند نیە کە سەرنجدان لە نیازەکانی دانەر و بەسەرنجدانی قۆرخکراو لە بەستێنی مێژویی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت سەرنجدانی قۆرخکراو بە بیچم و سیمای بەرهەم، یا بە ڕاگەیێن، یا بە ڕەمزەکان و هتد ڕێخۆشکەری تێگەیشتن لە واتاکانی بەرهەم بن. هەڵبەت هەموو ئەمانە بە نۆرە و پشکی خۆیان گرنگن و بەوردبوونەوە لێیان ڕێخۆشکەری خاڵگەلی تیۆریك دەبن، بەڵام ئەم بانگەشەیە کە لە وەها ڕێگایانێکەوە بە ئامانجمان، ئەگەر تێگەیشتن لە واتاکانی بەرهەم بێت، دەگەین، جێی پەسند نیە. ئەگەر لە پێشگریمانی یەکەم کە لەسەرەوە باسکرا ورد بینەوە، تێ دەگەین کە واتاکانی بەرهەمی هونەری ناکرێ بە کەتوارگەلێ لە دەرەوەی (بەرهەم )بزانیت کە بە شێوەیەکی بەرهەست و ئۆبژەکتیڤ لە جێیەکدا( بۆ نموونە لە قەڵەمڕەوی بیرۆکەکان) جێیان خۆش کردوە و ئەرکی سەرشانی ئێمە لە دۆزینەوەیاندا دەبڕێتەوە. ئێمە بەرامبەرانی( بیسەر ـ خوێنەر) بەرهەم واتاکان نادۆزینەوە، بەڵکو دروستیان دەکەین. ئەم خاڵە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئێمە چۆن دەبینین. ئەوەی ڤیتگنشتاین" دیتن لە ژێر ناوی" ناودێری کردوە لێرەدا ئێجگار گرنگە. دیتنی بەرجەوەن بە هەمان بارتەقا کە پەیوەستە بە گۆشەیەکەوە کە ئێمە لەودا جێمان گرتوە، هەروەها بەم خاڵەشەوە پەیوەستە کە خۆمان چ دەبینین، واتە چۆن لێی تێبگەین. ئێمەمانان فیلمێك جگە لە ژێرناوی تەماشاوانێکی سەراسا نابینین. لە نێوان ڕوانگەگەلی ژنانە و پیاوانە جیاوازی هەیە. هەروەها، پێشفامەجیاوازەکان، پەیوەستبوونە کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی و چینایەتییە تایبەتەکان دەبنە هۆی ئەوە کە بە چ مەبەست و ئامانجێك سەرجی لێ دەدەن. دیتن لێرەدا لە گۆڕێدا نیە، " دیتن لە ژێر ناوی" لە ئارادایە. میشیل فۆکۆ وای گێڕاوەتەوە کە خۆوڵاتیانێك لە گوندێکی ئەفریقایی لە ڕەوتی دیتنی فیلمێك تەنیا سەرنجیان لە کایە و ڕووناکی و سێبەران دەدا، لە حاڵێکدا کە بەلای ئەو ئەوروپی‌یانەی کە ئەو فیلمەیان بە خۆوڵاتیان پیشان دەدا بەر لە هەر شتێك کەسیەتییەکان و گێڕانەوەکان گرنگ بوون.[٣]

بە تەواوی بەستراوە بەوەی کە ئێمە بمانەوێ چ ببینین، یا لە ئاسۆیەکی دانایی تایبەت ناچار بە جۆرێکی تایبەت لە دیتن بین، دەبینین.ئێمە لەسەر بنەمای پێشفامەکان،

---

(٣) . فوکو، " **گفتگو با فیلسوف نقاب دار**" ترجمەی ب. احمدی، در : کلك ٦٨-٧٠ ابان- دی، ١٣٧٤، صص ٥٠-٤٩.



پێشداوەری‌یەکان و هەڵبەت پاڵنەرەکانی ئاگایی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی و لەوە گرنگتر پاڵنەرەکانی ناخودئاگا ئاگاداری کاروبارەکان، شتان، ئاخێوەکان و بۆ نموونە بەرهەمگەلی هونەری دەبین و واتاگەلێکیان بۆ دروست دەکەین. ئەگەر ئەم هەڵێنجانە دروست بێت ئەوە ئێمەی تەماشاوانین کە ڕووداوەکانو کەسیەتییەکانی فیلمێك "ڕاستەقینە" یا "ناڕاستەقینە" ناودێر دەکەین. ئەوە ئێمەین کە کەتوار دروست دەکەین یا هەقیقەتێك گریمان دەکەین. لە بەرەنجامدا گریمانی ئەوە کە فیلمێك بەڵگەمەند بە کەتوار یان نا، گێڕانەوەیی‌یە یان نا، دەگەڕێتەوە بەوەی کە بەرامبەران (بینەر ـ بیسەر)ی فیلمەکە "چۆن ببینین". هەرگیز دوو کەس بەرجەوەنێك لە گۆشە و لە یەك چاوەوە نابینن. نیچە ڕاستی دەگوت کە ئێمە بە ژمارەی چاوانی دنیا، شێوەکانی دیتن، کەوابوو ڕاڤەگەلێ لە هەقیقەت، کەوابوو هەقیقەتگەلی جیاجیامان هەیە. دەبێ بێژین کە فیلمسازی بەڵگەنامەیی، یەکێك لە ڕاڤەکان دەخاتە ڕوو و باشترە کە ئەم خاڵە قبووڵ بکەیتو ئەگینا هەمان تاقانە ڕاڤەی خۆی ڕەها دەزانێو ئەم کارەش بە ناوی هەقیقەت ئەنجام دەدا، واتە لە پشت ناونیشانی فریودەری هەقیقەت خۆی حەشار داوە و یەك تێگەیشتن یا ڕاڤەی لواو لە جێی تێکڕای چەشنە هەمەجۆر و بێئەژمارەکانی تێگەیشتن دەخاتە ڕوو.

لێرەدا خراپ نیە کە لەمەڕ ڕاڤەوە زیاتر قووڵ بینەوە. ڕۆلان بارت لەمەڕ ڕاڤەی وێنە کە لە دواین پەرتوکی خۆیدا هۆبەی ڕووناك کە لەبارەی هونەری وێنەگری نووسیبووی لە نێوان دوو خدەی سەرەکیی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ وێنەیەك جیاوازیی دانا. یەکێکیانی بە "STUDIUM" ناودێر کرد و ئەویدی “PUNCTUM”. ئەم دوو زاراوە لاتینەشی بە فەرەنسی پاچڤە نەکرد بە پێی ڕووبەڕوویيەك کە بارت "ئۆستۆدیۆم"ی ناولێناوە هەر وێنەیەك خودان توخمگەلی فەرهەنگی و نیشانەیەکی ئاشنایەو ژمارەیەك لە واتاکانی دەشێ هەڵبێنیەوە. ئێوە وێنەیەك دەبینن‌و شیمان دەکەن کە بابەتەکەی چیە یا کێیە. بۆ نموونە وای بۆ دەچن کە ئەم مرۆڤە خەڵکی کوێیە، سەربەکام چینێکی کۆمەڵایەتی یاخۆ چ فەرهەنگێکە، یا ئەم بەرجەوەنە لە کوێیەو... هتد. ئێوە لە واتایەکدا خۆتان ملکەچی لایەنی گشتی ڕێککەوتویی نیشانە ئایکۆنی‌یەکانی وێنە دەکەن. بارت گوتەنی لەگەڵ وێنەگردا ئاشتەوایی دەکەنو لەگەڵ زۆرێك لە تەماشاوانانی سەردەم، یا بیاڤی فەرهەنگیی خۆتان هاوڕا دەبن. ئێمە بژیوانییە فەرهەنگی، عەقڵی و مێژویی‌یەکان تێدەگەن یا وێنای دەکەن. "ئۆستۆدیۆم" گۆڕەپانی دانایی تەماشاوان دێتە ئەژمار. بەڵام "پۆنکتۆم" لەم ئاراستە کۆمەڵایەتیو

هەمەكییە تێپەڕ دەبێ. ریشەی لاتینی ئەو وشەیە PUNGO بە واتای زامە. لێرەدا وێنە باندۆرێكی تاكەكەس لە سەرتان دادەنێ، وەك بڵێی بریندارتان دەكا، شتێك لە ئێوەدا بێدار دەكاتەوە كە یا لێی بێئاگا بوون، یاخۆ وابیرتان دەكردەوە بۆ هەمیشە خەوی لێكەوتوە كاریگەریی نەماوە. لێرەدا " هەرشتێك لە سروشتی مەتەڵیو تۆقێنەری بۆ من ئاشكرا دەبێ و من لەمەڕ ئەوەی كە دەبینم دڕدۆنگ دەكا". نموونەی زێدەڕۆیانەی پۆنكتۆم سەیركردنی وێنەكانی ئازیزێكی لە دەستچوویە. وێنەی ژەنێكی لاو لە فیلمی دووكەڵ رەخساوی واین‌وانگ لە سەر بنەمای فیلمنامەی پۆڵئاستێر بۆ تەماشاوانانی شیمانكراوی ئەو فیلمەو هەروەها بۆ ئێمەی تەماشاوانانی فیلم، شتێك زیاتر لە وێنەی رێبوارێك لە شەقامدا نیە، بەڵام بە لای پۆل بنجامینەوە یەكێك لە كەسیەتییە سەرەكییەكانی فیلمەكە واتایەكی دیكەی هەیە. ئەو وێنەیە هاوسەری خۆشەویستی ئەوە كە مردوە. ئەو لە تەماشای ئەم وێنەیە قولپی گریان دەیگرێ. هەستی ئەو تا ئاستی زێدەڕۆیانە تایبەتە بە خۆیو ئێمە تا ڕادەیەك لەگەڵ ئەو هاودەردی دەكەین، بێ ئەوەی لەو ئەزموونەی كە ئازاری دەدات بە شێوەیەكی بنچینەیی لەگەڵیدا هەمباز بووبین. پۆنكتۆم گێڕانەوە و هەقایەتێكی تاكەكەسی‌یە. شیمان دەكرێ ئەو رێبوارە زۆر و نەناسراوانەی كە لە وێنەكاندا هەنتەشیان هەیە، بابەتی گێڕانەوەگەلی تا ئەم ئاستە خەماویو هەژێنەرن، وەلێ ئێمە یەكسەر لێیان بێئاگاین. تەنیا یەك وێنەیە كە پۆل بنجامین بریندار دەكا. بۆ هەركام لە ئێمە لەكاتی تەماشای فیلمێك (چ بەڵگەنامەیی، چ چیرۆكی) ئەگەری ئەوە هەیە كە هەندێ سات بێنەپێشێ كە بارت گوتەنی برینمان لێ بدرێ. كت‌ومت وەكو نانا لە گوزەرانی ژیان ی ژان لوك‌گدار كاتێك چركەساتگەلێ لە **بەلای ژاندارك** ی كارێل تیۆدۆر درایر دەبینێ. لە نێوان شەهید بوونی ئەو قددیسەیە و ئەو رەنجە رۆحی مەعنەویە لەگەڵ ژیانی رۆژانەی سۆزانییەكی پاریسی هاوشێوەیی‌یەك دەست پێدەكا كە كلیلی رازەكانی شاكاری گێدارە.

لە كورتیدا بیبڕمەوە: كەتواری سینەمایی پەیوەستە بە بەرامبەری( بیسەر ـ بینەر)ی فیلمەوە. وێدەچێ نیشانەو هەرامەیەك لە فیلمێكی گێڕانەوەییدا بۆ تەماشاوانێك راستەقینە بێت. كەتوار و ناكەتوار كاروبارێكی بەرهەست، هەرمانو لێبڕاو و ئەرخەیانی نین كە پێوانەی لێك هاوێر كردنیان بن بە جیاكاریی فیلمی گێڕانەوەییو فیلمی بەڵگەنامەیی.

پێشگریمانی تیۆریكی سێیەم كە دەیهێنمە پێشەوە، چەمكی "جیهانی بەرهەم"ە. ئێوە وەكو بەرامبەر (بیسەر ـ بنیەر/خوێنەر) یا دێنە نێو جیهانی بەرهەمەوە، لە بەرەنجامدا زۆر



لە كاروباری ناڕاستەقینە بە لاتانەوە دەبێتە راستەقینە، یاخۆ ناچنە نێو ئەو جیهانەوە كە گەر ئاوابێ لە هەمبەر كەتوارەكانی بەرهەم بێگانەو باندۆرهەڵنەگر دەمێننەوە. ئێوە كاتێك لەگەڵ بەرهەمی هونەری بەرەوڕوو دەبن، بابەتو ملكەچی ئەو ڕووداوە سەمەرەخوڵقێنە دەبن كە لە جیهانی ژیانی رۆژانەتان بۆ جیهانێكی دیكە هاوێژراون. كت‌ومت وەكو كیژۆڵەیەك كە گەردەلول ئەوی لە كێڵگەیەكی بنەماڵەیی و لە ژیانی رۆژانەوە بۆ شاری زەمڕوت هاویشتبوو. بۆ ئەو كیژۆڵەیە مرۆئاسن، شێر و داهۆڵ كەتواریان هەبوو، دەدوان، هەستو سۆزی مرۆیی‌یەیان هەبوو و ئیدی هیچ گرنگ نەبوو كە بە پێی لۆژیكی ریالیستیی دنیای وەك دەوتری راستەقینە لە بنەڕەتڕا بە مرۆڤ ئەژمار نەدەكرانو نەیان دەتوانی هەستو بیرەوەرییان هەبێ یا بدوێن. ئەم چەمكی جیهانی بەرهەمە بەلای تراژێدی نووسانی یونانو تیۆرەوانی مەزنیان ئەرەستۆ بە تەواوی ئاشنا بوو. خاڵی نێوەندی ئەمەیە كە ئێمە لە جیهانی بەرهەمدا واتە ئەوە كە دەتوانین لەودا كار بكەین. هونەر هەمدیس خوڵقێنی كەتوار نیە، بەشداری لە كەتوار دایە. كەتواری سینەماییش ئەگەر قەرار بێ كە بە كەتوار بزانرێت، بە سەرنجدان لە بەرهەم (و لەراستیدا هەڵێنجانی بەرامبەر لە جیهانی بەرهەم) بە كەتوار دەزانرێت یا نازانرێت. ئیزن بدەن نموونەیەكی كەسی بێنمەوە. من وەكو تەماشاوانێكی **قوربانیدان** ی ئاندری تاركۆفسكی ئەو شەوەی جەنگی ئوتۆمی، ئەلكساندێر و كاردانەوەكانی، ئەڤینەكانو ڕقو كینەكانی، نیگای بۆ ژیان، باوەڕی لەمەڕ پەرجو و زۆر لە توخمەكانی ئەو "جیهان" بە راستەقینە دەزانم. من سالآنێكە لەگەڵ هەمو ئەمانەدا وەكو برێك لە كەتوارەكانی ژیانم، دەژیم. جیهانی وەك دەوترێ خەیاڵیی ئەو فیلمە چەندقات ڕاستەقینەتر لە جیهانی ژیانی ڕۆژانەم وەڕاست گەڕاون. كەتوار چەمكێكی سەخت، سفت، وشكو توخسو نەرمی هەڵنەگر نیە. من كەتوارم رەخساندوە بەوەوە بە ژیانم واتام بەخشیوە. لە راستیدا بەم دروستكردنە پەیتاپەیتایانەیە كە شێوەیەك لە ژین لەم جیهانەم وەكو ئەم مرۆڤە تایبەتە هەڵبژاردوە.

نموونەیەكی دیكە دەهێنمەوە: بەستراوە بە پێش زانراوەكان، تەرزی بیركردنەوەكان، باوەڕەكان، گرەوی هۆگرییەكان، هەڵكەوتگەلی چینایەتی، رەگەزی، تەمەنیو نژادیو... ئێمەیە كە فیلمێكی بەڵگەنامەیی كە لە هێڵەكانی پێشەوەی بەرەی جەنگ گیراوە، دەتوانێ كەتواری ئەو جەنگە دەرببڕێو نۆژەنی بكاتەوە یا ناتوانێ وەها بكات. واتە فیلم لەسەر كۆڵەگەی راڤەكانی بەرامبەر (بیسەر ـ بینەر/خوێنەر)ە كە بەیانگەر و هەواڵدەر یا بەڵگەی راستیەكانی پێوەندیدار بە جەنگ دەبێت یا نابێت. پڕكێشی یا ئەركی سەرشانی سینەماگەری

بەڵگەنامەساز کە دەیهەوێ لە چرکەساتەکانی جەنگێکی راستەقینە فیلم هەڵگرێتەوە، هێشتا بە مانای دەستەبەر یا بە واتای ڕێ پەیداکردنی ئەو و تەماشاوان بۆ جەرگەی کەتوارەکانی ئەو جەنگە نیە. دەلوێ کەسێك پەیدا ببێ کە فیلمێکی گێڕانەوەیی‌و نەزیلەبێژ زیاتر بەیانگەری هەقیقەتی جەنگێکی تایبەت بزانێ. هەر بەو چەشنەی کە بە لای منەوە **باشو، تەریدەی بچوك** ی بارامی بەیزایی چەندقات زیاتر لەو فیلمە بەڵگەنامەیی‌یە کە لە هێڵەکانی پێشەوەی جەنگ بەرهەڤ کرابوون، لەگەڵ کەتواری جەنگێك کە بە سەرماندا دەهات، بەو چەشنەی من لێی تێدەگەم، یەکانگیرە. جەخت دەکەم کە بە لای منەوە وەکو بەرامبەرێك (بیسەر ـ بینەر/خوێنەر) لەگەڵ ئەم هەڵکەوتی ژیانە، ئەم ویستانە و زانراوانە، ئەم باوەڕانە، ئەم ئاگایی‌یە، ئەم پیشەو هەڵبەت هەموو پاڵنەرەکان‌و سەمەدگەلی ناخودئاگا، وەهایە. لێرەدا پێشفامەکانی من لە جیهانە کە هەواڵێك یا بەڵگەیەك لەم جیهانە راستەقینە و هەواڵ یا بەڵگەیەکی دیکە ناڕاستەقینە دەنوێنێ. من بە دەستەبژێرکردن یا وردتر بێژم بە دروستکردنی شێوەی دیتنم و داهێنانی هەقیقەت‌و کاروباری راستەقینە کارێکم نەکردوە جگە دەستەبژێرکردنی بیچمێکی لواو لە جێ‌خۆش‌کردن لەم دنیایەدا.

کێ گوتویەتی کە تەنیا ئەو هەرامەیە راستەقینەیە کە هەموان لەبارەیەوە ڕایان کۆك بێت؟ کێ گوتویەتی کە تەنیا ئەو شتەی بە پێی رێککەوتنگەلی نیشانە ناسانە بە کەتوار ناودێر دەکرێ، راستەقینەیە؟ بۆچی نەتوانم ئەم گرێبەستانە بگۆڕم؟ ئایا وێنە یا نیگاری هاوشێوەکێشراوی دەستێك راستەقینەیە، یا وێنەیەکی پزیشکی (اشیعە) کە لە دەستی من بەرهەڤکراوە؟ ئایا مانگی ئاسمان کە من برێك لە شەوان دەیان بینم راستەقینەترە یا وێنەی لە تلێسکۆپ؟ ئایا ئەم گەڵایە راستەقینەترە یا وێنەی لە میکرۆسکۆپدا؟ گۆستاڤ یانۆش لە پەرتوکی **وتووێژ لەگەڵ کافکا دا** نووسیویەتی کە جارێکیان لە پیشانگای نیگارەکانی پیکاسۆ بە کافکای گوتبوو کە پێی وایە پیکاسۆ دەیهەوێ شمەکان لە بیچم بخات‌و کافکا وڵامی دایەوە کە نەخێر، پیکاسۆ شتان لە بیچم ناخات، تەنیا خەریکە ئەو بیچمانەی کە هێشتا دزەیان نەکردۆتە نێو قەڵەمڕەوی هۆشیاریی ئێمەوە، تۆمار دەکا.[٤]

ئەگەر دیناو لە بەرچاو دوور نەکەینەوە چەمکێکی تازە لە کەتوار وەدەست دێنین، چونکە پەیتاپەیتا شتانێکی تازە بە سەر دنیای راستەقینەی ئێمە زیاد دەبن. بە سەرنجدان لەم سازو

(٤) گ.یانوش، **گفتگو با کافکا**، ترجمەی ف. بهزاد، چاپ دوم، تهران، **١٣٥٧**، ص **١٨٩**.



کارەیە کە هونەرمەندێکی وەکو برێشت، دەتوانێ کارێك بکات کە ئیدی ئەو شتانەی کە تا هەنوکە راستەقینەو سروشتی دەماننناسی، راستەقینەو سروشتی نەیناسین، واتە وەهایان گریمان نەکەین. گرنگیی کاری ئەو لەمەدایە کە قەڵەمڕەوی باوەڕە زەینیەکانی ئێمە لە کاروباری راستەوانەو راستەقینە بگۆڕێتەوە، هەندێجار بەرینیان دەکاتەوە و کەتوارەکان زیاتر دەکاو جاروبار لێی کەم دەکاتەوە، بۆ نموونە تەکووزمەندیی ژیانی رۆژانە یا ژیانی بۆرژوایی ناڕاستەقینە، نیشانەناسانەو رێککەوتەیی دەنوێنێ. بەم شێوەیە باسی ئێمە لێرەدا تەنیا لایەنی ئەپستمیکی نیە، بەڵکو لایەنێکی بووناسانەو کردەکی هەیە کە ئێجگار گرنگە: بە گۆڕینی هەڵێنجانی تایبەتی من لە کەتوار و هەقیقەت، لە راستیدا شێوەی ژیانم دەگۆڕم، جیهان قبووڵ ناکەم و دەیگۆڕم. کاتێك کە شتێك بە بەڵگەمەند ناودەنێم، ناڵێم تاودانەوەی کەتوارە، بەڵکو کت‌ومت وەکو ریشەی "سند" لە زمانی عەرەبیدا، پشت بەو شتە دەبەستم، تەکووزمەندییەکی تازە بە ژیان دەبەخشم. (سند) بەرلەوەی کە گەواهیدەری هەرامەیەك لە دەرەوەی من بێت، دەبێتە رێخۆشکەری ژیانی من. هەربۆیە خراپ نیە کە لە ریشەی وشەی DOCUMENT کە لە زمانە ئەوروپییەکاندا بە واتای "بەڵگە"ش بە کار دێت ورد بینەوە. لە لاتیندا DECERE بە واتای "هیرابوون" بوو. چاوەڕوانیی ئێمە لە هونەری بەڵگەمەند ڕۆنراوی خدەی هیراگەرانەیەتی. دەمانەوێ تا زیاتر بزانین، تا دروستتر گەڵاڵەرێژی بکەین.

بە سەرنجدان‌و وردبوونەوە لەو پێشگریمانە تیۆریکەی کە تاکو ئێرە هێنامە پێشێ، رەنگە ئەم خاڵە رۆشنتر بکرێتەوە: پەیوەست بە کە نیگای ئێوە بۆ ژیان، جیهان، هەقیقەت، کاروبار و رووداوەکان (و هەڵبەت ئاخێوەکان، هونەرەکان، دەقەکان‌و..) توخمێکی راستەقینە یا ناڕاستەقینە ساز دەکا. نۆڕینی "پلەیەك" بوونی نیە. کەسێك بە بێ پێشفامەکان نابینێ. کەسێك رێگەیەك بە خودی شتان‌و کەتوارەکان پەیدا ناکات. کەوابوو بانگەشەی نۆژەنکردنەوەی کەتوار وەلابخەین. کەسێك کە لە جەنگ فیلم هەڵدەگرێتەوە، راپۆرتێك لە جەنگ ناخاتە ڕوو، جەنگێك نۆژەن ناکاتەوە، ئەو لە رێگەی ڕاڤەی کەسیی خۆیەوە لە جەنگێکی راستەقینەدا بەشداری دەکا. چ بیەوێ یا نەیهەوێ، چ ئاگادار بێ یان نا. هەر فیلمێکی بەڵگەنامەیی گێڕانەوەیی‌یە. هەڵبژاردنی قابی وێنە، هەڵبژاردنی گۆشەی دوربین، سنوردارییەکانی وەبارهاتو لە ماوە و کاتی بە هەرحاڵ سنوردار و بەرتەسکی سووڕانی فیلم لە دوربین‌و هەرەپێویستیی مۆنتاژ یا هاونشینی وێنەکان، شێوەی پێشگرتن لە لەرینەوەی دوربین، جووڵەی دوربین، هەڵبژاردنی دیمەنی نزیك، مام ناوەندی و دوور، چەشنەکانی تیشك

پڕژاندن، نۆژەنكردنەوەی ناچارانەی ڕەنگەكان، بە كارهێنانی موزیك، گوتاری فیلم، دەنگە زیاد كراوەكان،و... هتد خدەی بەڵگەداریی كەمڕەنگ دەكەنەوە. لە هۆكارگەلی بەناوبانگ بە هۆكارانی تكنیكی بگرە تا هەڵبژاردنی بابەت، شێوەی هێنانەگۆڕیو چیرۆكبێژیی ناچارانە كە لە هەڵبژاردنی تانو پۆی گێڕانەوەییدا خۆی دەسەپێنێ، هەموویان ئێمە لە سینەمای بەڵگەنامەیی دوور دەخەنەوە.

ئەگەر بانگەشەی سینەمای بەڵگەنامەیی ئەمە بێ كە بەڵگەیەكی تاك واتایی لە مەڕ كەتواری دنیای دەرەوە دەخاتە ڕوو( كە ئەگەر وابێ باوەڕ بە تاك واتایی بوونی هەقیقەت دەكاتە پێوەر و پایەی كارەكەی) هەر بەرامبەر (بیسەر ـ بینەر /خوێنەر)ێك بە هێنانە ئارای ڕاڤەیەكی تازە دەتوانێ ئەو بانگەشەیە پووچەڵ بكاتەوە. سینەمای بەڵگەمەند بە هەمان بارتەقا دنیای دەرەوە دەناسێ كە سینەمای گێڕانەوەیی دەیناسێ. ئەگەر لە دەسپێكی سینەمادا شەمەندەفەری لۆمیر خەڵكی ترسناندبوو، بۆ ئەوە بوو كە ئەوان لە ڕاڤەی خۆیان لە كەتوار دەترسان. لە بەرانبەر سینەمای ڕیپۆرتێر، ریالیست، بەڵگەمەند و شێلگیری لۆمیرییەكان كە لە تاج لە سەرنانی مرۆڤانی بۆ نموونە گرنگ، یا لە هاتنە دەرەوەی كرێكاران لە كارخانەو لە هەزار شتی دیكە كە بە راستەقینە ناودێر دەكران، فیلمیان دەگرت، سینەمای گاڵتەچی، شەنگ، تەڕدەستو زیندوی (ملی‌یس)یش هەبوو كە كەتواری وەها كە دەبێ هەبێ، نەك بەو چەشنەی كە دەهاتە بەرچاو دەڕەخساند. مانگ بە ڕووی ڕێبوارانی زەمینی پێدەكەنیو ئەم ڕووداوانە كە لە چیرۆكە منالآنەكاندا بۆ ئێمە لواو و ئاشنایە، سینەما بە جیهانی كەتوار دا تێدەپەڕێنێ. وەها دەنوێنێ كە هەر سینەماگەرێك، جیا لە هەر ناونیشانێك كە بە یەدەگ ڕای دەكێشێ، چ كاری بە بەڵگەنامەیی ناو بنرێ چ ریالیست یا نەزیلەبێژ یا ... سەرەنجام هەڵێنجانگەلێ لە كەتوار دەخاتە ڕوو و لە هەمان كاتدا چیرۆكانێكیش دەڵێ. سینەماگەر لە كەتوارگەلی تایبەت دەدوێو ئەم كارە لە نەزیلەبێژییەكانی نیەو بە هەرحاڵ هەندێ تەڵەكە ئێمە بۆ هێنانە ئارای ڕاڤەكانمانو ئەفراندنی ئاسۆی ئاماژەكانی فیلم ركێش دەكا.

كەوابوو باشترە بە پەیڕەوی لە ژان ڕۆش لە جێی سینەما ـ هەقیقەت، لە سینەما ـ راستبێژی بدوێین. پەسند بكەین كە تەنیا ڕێگەمان بۆ راڤەكان، ناسینەكانو تێگەیشتنەكان خۆش كردوە. ئەگەرمان ڕەخساندوە تا تەماشاوانمان دنیا دروست بكەن، نەك ئەوەی تەنیا بەوەوە لە ڕێگەی نۆژەنكردنەوە و هەمدیس ڕەنێوهانینی ئێمە لە كەتوار، ئاشنا بن. دان بەوە



دابنێین كە: من كەتواری دنیای دەرەوەم بەوجۆرە دیوەو لەم ڕێگا تایبەتەوە ئەوەم بۆ ئێوە گواستۆتەوە. ئێوە لەگەڵ دنیایەك بەرەوڕوون كە من دیومەو هەواڵم لێداوە، ئێستە دنیای خۆتان ساز بكەن، واتە راڤە ئەزموون بكەن. شێوەیەك كە پێتان دروست دێتە بەرچاو، هەڵبژێرن. ئازادیی خۆتان ئەزموون بكەن. ئەگەر كەسێكی دیكە فیلمەكەی دروست كردبا دنیا وەها دەرنەدەكەوتو بەم بیچمە نەدەبوو. ئەمە كەتوار نیە كە تۆمار دەكرێ، ئەم هەقیقەت نیە كە بە یاریدەی هێڵی مەودا( ـ) بە سینەماوە دەلكێ، ئەمە دنیای منە، تەنیا من. ئەوەتان پێ‌نیشان دەدەم تا هەركامتان دنیای خۆتان ساز بكەنو تاكایەتیو سنوری ئازادیی خۆتان ئەزموون بكەن. من پێشفامەكانم لە هەرامەی راستەقینەو لە تێگەیشتنی ئەم كەتوارە تایبەتەم هێناوەتە پێشەوە و بەم هێنانەپێشەوە خاڵە لاوازەكانیانم ئاشكرا كردوە. من بە شێوەیەكی ڕەخنەگرانە ڕەفتارم كردوە، چونكە بەرهەمێكی هونەریم ڕەخساندوە. هەنوكە لە ئەستۆی ئێوە دایە كە پێشفامەكانتان بەشێوەیەكی ڕەخنەگرانە تاقی بكەنەوە.

## فەرهەنگۆك

| فارسی | ڕوونکردنەوە | کوردی |
|---|---|---|
| حچور | لە ئارادابوونی شتێك نەك کەسێك ،کەس ئامادەیە و وشیارە لە ئامادەبوونی و شت ناوشیارە. | ئارایی |
| گفتمان | discurs | ئاخێو |
| گوینده | | ئاخێوەر |
| شهوت | لێرەدا واتای ئیدیۆمی مەبەستە، زۆرتر لەمەڕ ژنانەوە بەکار دێت، بەڵام واتاکەی گشتگیر کراوە. | ئالۆش |
| دلالت | **زۆرجار بە هەڵە ئاماژە بە واتای "اشارە: بەکار دێت، بەڵام لە ڕاستیدائاماژە ئەگەر لێی ورد بینەوە لە هێڵی ستونیی زماندایە و هێما لە هێڵی ئاسۆیی زماند کار دەکات.ئاماژەم پێ کرد، هێمام بۆ کرد.پێ:ستونی،بۆ:ئاسۆیی.** | ئاماژە |
| درونمایە | **لە زاری هەورامی وەرگیراوە** | ئامیان |
| مرشد | ئامۆچیار ،موچیاری،ئامۆژگاری، ئامۆژ+یار | ئامۆژیار |
| نسخەی بدل | | ئەسکاڵت |
| نمایشگر | **لە زاری هەورامی وەرگیراوە.** | ئەرمانەر |
| سپیدەدم،سپیدەدمان | ئەلند،بەرەبەیان | ئەلەند |
| موچوع و محمول | | بابەت و بارکراو |
| تقابل،مقابلە | بۆنمونە باشاری لەگەڵ ناکەم. | باشار |
| الگو | دەردێکم هەیە **باشقەی** دەردانە/لوقمانی حەکیم لێی سەرگەردانە "فۆلکلۆر" | باشقە |
| قبولاندن | دنەدانی کەسێك بۆ پەسندکردنی شتێك یا بڕیارێك چ راست یا چەوت. | بەڵیاندن |
| چشم انداز | دیمەنی دوورەدەست کە چاو تا ئاسۆ | بەرجەوەن |



| | | |
|---|---|---|
| | دەبیینیٚ،لە کەڵ بەرژەوەندی جیاوازە. | |
| تیز شامە | کەسیٚ کە هەستی بۆنکردنی بەهێز بێت. | بۆزەن |
| شیء و شدگی | بەتاڵبوونەوەی کەسێتی و دیاردەی خووگرتن بە شمەکەکان و دوورکەوتنەوە لەرۆحی بەرهەمهێنانی هزری.بەسترانەوەی بە جیهانی رووکەشی دیاردە. لێکەوتەی دیاردەی کاڵاپەرەستی (فیتیشیزم) کە مارکس لە رەخنە لە سەرمایەداری کەڵکی لەم چەمکە وەرگرت و پۆست مودێڕنەکان لە رەخنە لە مودێنیتە بەکاریان هێنا. | بوونەشمەك |
| گویا | | بێژیار |
| بسیار عمیق، ژرف | ئێجگار قووڵ،بیٚ بن | بیٚ بگار |
| معلول | وەبەرهۆکەوتن | بەرهۆ |
| معلولی | | بەرهۆیی |
| اصلاح ، تعمیر | کرمانجیی ژوورو | بیراز |
| اصلاح کردن، تعمیرکردن | | بیرازتن |
| تقابل های دوتایی | | باشارگەلی دوانی |
| فرا رفتن | | بان هەڵکشان |
| فرارفتن از خود | | بان هەڵکشان لەخۆ |
| کارازمودە | لەزاری هەورامی وەرگیراوە | بکار |
| اصل،پرنسیپ | | بنەواشە |
| نهایت | | بنەتا |
| نهایی | | بنەتایی |
| بی نهایت | | بیٚ بنەتا |
| | | بیٚ بنەتایی |
| گرایش(ف) انتماو(ع) | مەیل بۆ بەرەیەك، رێگوزارێکی دوورێیان کە لەبەردەم رێبوار بێت و ناچار بێت رێگەیەك هەڵبژێریٚ.بارێکی واتایی تازەی پیٚ دراوە | بەریان |

| | | |
|---|---|---|
| ابژه، موجوعشناسایی object | ئەوەی بەر ناسین دەکەوێ | بەرناس |
| دامنە | ناوقەدی شاخ،داوێنگەی چیا، کە نزیکە لە نسار و بنار | بەرزاخ |
| محصول | بەر= بەرهەم /بووم (خاك) زەوی، وەکو بوومەلەرزە | بەروبووم |
| محصول نهایی | | بەروبوومی بنەتایی |
| اپر، اپرهنری ،ادبی و غیرە | باری واتایی گۆڕاوە و لەبەرانبەر کار و بەرهەمی مەعنەوی و فکری بەکار هاتوە،وەکو بەرهەمی هونەری و ئەدەبی. | بەرهەم |
| تعالی | | بڵیندهەڵکشان |
| قیاس | | بەرهەڤدان |
| قیاس کامل | | بەرهەڤدانی تەواو |
| مصرف کنندە | | بەرخۆر |
| مصرف | | بەرخۆری |
| مؤخرە، افزونە | | پاشبار |
| چمیمە | | پاشکۆ |
| محیگ ، حیگە | | پەڕانبەر |
| بالقوە | | پەنگراو |
| سهم | پشکێکی بەرکەوت،پشکی خۆی وەرگرت | پشك |
| اصرار | پڕکێشیمان لە سەر نەکرد( رشتەی مرواری،عەلائەدین سەجادی) | پڕکێشی |
| معجزە | | پەرجو |
| باگل نما | دەرخستنی بێ مایەیی و بێ سودیی شتێك.هاوکێشەیەکی لۆژیك کە ئەنجامی پووچەڵی دیاردەیەك یا بابەتێك بسەلمێنێ. | پووچەڵنوێن |
| مقدمە ، درامد | | پێشبار |
| غیاب | هەر سەوزەی موراد من نادیارەن هەرنەو گوڵاڵەم ها نە **پێوارەن** (مەولەوی | پێوار/ پیوار |



| | | |
|---|---|---|
| | تاوەگۆزی) | |
| جزو | | پاژ |
| غرور، تکبر | لووتبەرزی، لەخۆباییبوون | تامساری |
| مغرور، متکبر | لووتبەرز،لە خۆبایی | تامسار |
| انعکاس نور،بازتابش | تاو، هەتاو،تیشك، خۆر، تیشکی خۆر | تاودانەوە |
| تحمل ناپڑیر | | تاقەت پروکێن |
| منقم | تۆ دانەری هەر سەر و بەرێکی داتنا بە تەکوز و رێك و پێکی(مەم و زین، خانی/ هەژار) | تەکووز |
| نظم/order | | تەکووزمەندی |
| شگرد | | تەڵەکە |
| اوج | | تەشق |
| مایع | | تراو |
| مسخرە کردن | ئەردەلانی/سنەیی | تیتاڵی |
| مسخرە | | تیتاڵ |
| نگرش | | تێڕوانین |
| **تغیر منش انسانی، مسخ** | تەشك:فۆرمی هەستەکی/ دەرونیی مرۆڤ نەك فیزیۆلۆژیك."تەشکم گۆڕاوە"واتە هەست بە گۆڕانی خراپ و ناجێگیری دەرونی دەکەم. | تەشك گۆڕان |
| حکمت | | دانایی |
| دازاین،دازین | لە فەلسەفەی هایدگێردا بە واتای "هەبوون ـــلەوێ = مرۆڤ" واتا دەدات. | دازاین |
| ادامە،پیروی،استمرار، دنبال کردن | | دانەدوو |
| سخنرانی، خگابە | | دواندەر |
| قچیە | | دۆز |
| پوان، امتیاز | قان | دەسەر |
| لحن | بەپێی ئاوازی (بانگەواز) دارێژراوە. | دەنگەواز |
| زخمە | دەنگی لەرینەوەی سازە ژێدارەکان،دەنگی | درینگە |

| | | |
|---|---|---|
| | نۆتە | |
| ولگرد | لەزاری هەورامی ورگیراوە | دەرگێڵ |
| اعتراج | | دەنگ هەڵبڕین |
| بینش | | دیتە |
| فرافکنی | | دیهاوێژی |
| متقابل | | دووسەرە |
| ادراك حسي | | درك پێکردنی هەستەکی |
| مکاشفه | هەنبانەبۆرینە/ هەژار | دیناو |
| متعهد، ملتزم | | دەروەست |
| راست نمایی | | راستنوێنی |
| تولید | شوکورمستەفا، (ئەندێشە و هونەر لە پێچشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا) | رەنێوهانین |
| مگلق اگاهی | | رەهای ئاگایی |
| ریسنده و بافنده | عەلائەدین سەجادی، رشتەی مرواری. | رێسەمان |
| محوشده | | رەویو |
| سازنده | گیوی موکریانی ( فەرهەنگی کوردستان) | رەژیدە |
| بازتاب، انعکاس | | رەنگدانەوە |
| افول، وقت زوال،انحگاگ | هەنبانە بۆرینە/ هەژار | رۆژداگەران |
| نسبی نگری | | رێژەبینواری |
| پژواك | | زایەڵە |
| علامت | | زناك |
| سراج | | زیندرو |
| سفیدی | | چەرموویی |
| انقراج | لەبن دەرهاتن،تۆوبرینەوە، لەنێوچوونی تێکرایی. | خاشەبڕ |
| پندار | دروستکراوی خەیاڵ،بیروبۆچوونی بەگومان،بۆچوونی مەزندەیی. | خەیاڵکرد |
| خودکفا، خودبسنده | کەسێك کە بتوانێ خۆی بژیێنێ،بە بێ یارمەتی کەسانی دیکە. | خۆبژێو |
| مرفه | کەسێك کە خۆش دەژی و خۆش | خۆش بژێو |



| | | |
|---|---|---|
| | رادەبوێرێ. | |
| رفاه | | خۆش بژێوی |
| بومی | خەڵکی رەسەنی وڵاتێك | خۆوڵاتی |
| پاك باخته | زاری هەورامی کەسێك کە سا | سامان سا |
| توهم | هەنبانە بۆرینە/ هەژار | ساویر |
| پارادایم | باشقەی باشقەکان،کەورەترین مودێلی نمونە و زناك.سەرترین باشقە | سەرباشقە |
| اختیار | | سەرپشکی |
| مختار | | سەرپشك |
| تداوم | زاری هەورامی | سەرەمرە |
| انگیزه | هەنبانە بۆرینە/هەژار | سەمەد |
| اختصاصي | هەنبانە بۆرینە/هەژار | سەراسا |
| سرشناس | | سەرناس |
| سرنمون | | سەر چەشن |
| مقدس | زاری کەڵهوڕ /کورتکراوەی (سپندمینۆ) ی ئاڤێستایی/زەردەشتی | سپیتا |
| استانه | زاری هەورامی | شیپانە |
| تکامل،تگور | شوکورمستەفا، (ئەندێشە و هونەر لە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا) | فراژووبوون |
| نهار | نانی نیوەرۆ | فراڤین/فراوینە/فراوین |
| حلزون | گیوی موکریانی ( فەرهەنگی کوردستان) | قەپوشکە |
| حلزونی | گیوی موکریانی ( فەرهەنگی کوردستان) | قەپوشکەیی |
| نقب | | کارێز |
| شوخی، تفریح ، سرگرمی | هەنبانە بۆرینە/هەژار | کازە |
| واقع، واقعیت | کەت+وار (کرمانجیی ژوورو) | کەتوار |
| نڤارت | هەنبانە بۆرینە/هەژار | کەتوانە |
| ناڤر | هەنبانە بۆرینە/هەژار | کەتوان |
| داس بلند | داسێکی گەورە بە دەسکێکی درێژ | کەرەمتو |
| سوواستفاده | | کەڵکئاوەژوو |
| وسوسه | | کەڵکەڵە |

| | | |
|---|---|---|
| باستان، باستانی | | کەونارا |
| شدن | | کران |
| گوفان دریایی | | گەرداو |
| صرف کردن | لە بابەتی زمان و ڕێزماندا | گەردانگەری |
| صرف | لە بابەتی زمان و ڕێزماندا | گەردان |
| یاوەگویی،خرافەگویی | قسەی پووچ و بێ نێوەرۆك | گۆترە بێژی |
| خرافە باوری | باوەڕی پووچ بە شتانی نەبوو | گۆترە باوەڕی |
| مجموع، مجموعە | | گشتکۆ |
| (معچل ) problematic | | گرێ کوێرە |
| ممکن/ممکن است | | لواو/ دەلوێ |
| ناگسستنی | | لەپساننەهاتو |
| رویکرد | | لێڕوانین |
| موشکاف | | موئەنگێو |
| فاعل شناسایی،سوژەsubject | بکەری کرداری ناسین | ناسکار |
| استپناو | ڕێزپەڕ | ناوێزە |
| متانت/ متین | زاری هەورامی | نتمی/نتم |
| ابزی/ ابزیان | گیانەوەر یا گیانەوەرانێك لە ئاودان و بە بن ئاودا دەڕۆن. | نۆقار/نۆقاران |
| باگن | | نێواخن |
| شهود | | نێواخندۆزی |
| بازیگر، هنرپیشە | ئەکتەر/ هەنبانە بۆرینە/هەژار | نیارڤان |
| قیاس ناپژیر | | نەشیان بەراورد |
| نیت | وەك: نیازم وایە | نیاز |
| غریزە | زاری هەورامی | وارسکە |
| وانمودکردن | | واخۆنواندن |
| قارە | شوکورمستەفا، (ئەندێشە و هونەر لە پێشکەوتنی کۆمەلآیەتیدا) | وشکارۆ |
| صدق کردن | وەك: لەمبارەوە وەڕاست دەگەڕێ. | وەڕاست گەڕان |



| | | |
|---|---|---|
| شامگاه | زاری هەورامی / ئێوارەدرنگان | وێرەگا |
| تحول یافتە،متحول | | وەرچەرخاو |
| نهفتە | | وەشێراو |
| جامعیت | | وێکڕایی |
| شریك | کەڵهوڕ | هامباز |
| همراه | هاوڕێگە و هاوپێناو | هامڕا |
| ملحق | | هاوپێچ |
| هستی | کەڵهوڕ/بوونی پەتی | هایدن |
| حس کردنی | زاری هەو | هەست کەردەیی |
| تحریك،تحریك کردن | وەك:هەڵیان خڕاند بوو. | اندن هەڵخڕان/هەڵخڕ |
| تحریك شدە | | هەڵخڕاو |
| سفسگە،مغلگە | | هەڵپەتەکاری |
| سست،شکنندە | | هەرۆڵ |
| شرایگ | جیاواز لە بارودۆخ (وچعیت) | هەل و مەرج |
| علیت | | هۆبەند |
| اموزش دادن | گیوی موکریانی ( فەرهەنگی کوردستان) | هیراگەری |
| بازنمایی | | هەمدیسنوێنی |
| کلی | | هەمەکی |
| جزئی | | هەندەکی |
| **درحچور وی بودم/درحچور کسی بودن** | د هەنتەشێ وی دا بووم.هەنبانە بۆرینە/ هەژار | هەنتەش |